# ( شەرحی )

# (حیکمەتەکانی ئیبن عەتا)

نووسینی:
ماموستا عبدالکریم فتاح

چاپی یەکەم ١٤٣٦ ك - ٢٠١٥ ز

**ناوی کتێب**: شەرحی (حیکمەتەکانی ئیبن عەتا)

**نووسینی**: مامۆستا عبدالکریم فتاح.

**نەخشەسازی ناوەوە**: االحمد خالد

**تایپ**: نووسەر.

**نۆرەو ساڵی چاپ**: یەکەم ٢٠١٥ زایینی.

**تیراژ**: (١٠٠٠) دانە.

**نرخ**: ( ١٣٠٠٠) دینار

**چاپخانە**:

**بەسەرپەرشتی**:

**ژمارەی سپاردن**: ( )ی ساڵی ٢٠١٥ لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکانی دراوەتێ.



٥

**نووری حەقیقەت**

Nuri.haqeeqat@gmail.com

أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ

﴿ وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ فِينَا لَنَهۡدِيَنَّهُمۡ سُبُلَنَاۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ٦٩ ﴾

العنكبوت: ٦٩

# پێشەکی

لە کۆتایی هەشتاکاندا "حیکمەتەکانی ئیبن عەتا"م بەردەست کەوت، دەستم بەخوێندنەوەی کردو تام و چێژی تایبەتم لێ بینی، دواتر **"مذكرات في منازل الصديقين والربانيين–سعيد حوى"**م- بەردەست کەوت کە شەرحی حیکمەتەکان دەکات- و سەردەمێکی زۆر لە خزمەتیدا ژیام، لەم ساڵانەی دواییدا شەرحی حیکمەتەکانی مامۆستا **"البوطي"**م کڕی و ماوەکیش لە خزمەتی ئەو دا ژیام، لای خۆمەوە بڕیارم دا ئەم حیکمەتە بەرزو باڵانەی ئیبن عەتا وەربگێڕمە سەر زمانی کوردی شیرین و شەرحێکی کورت و دروستیان بۆ بکەم، خودا کۆمەکی کردم و توانیم دەست بەکارەکە بکەم و هاندانی دۆستانیش کاریگەرییان لەسەرم هەبوو، بۆیە دەبێت دوای شوکری خودا شوکری دۆستانی ئازیزم بکەم بۆ ئەو هاندان و سووربوونەی لە بەرهەم هێنانی ئەم کتێبەدا هەیان بوو، خودا پاداشتی گەورەیان بۆ بنوسێت و بەشداری ئەم خێرە گەورەیان پێ بکات، دەتوانم بڵێم زۆربەی شەرحەکانی "حیکمەتەکانی ئیبن عەتا"م خوێندۆتەوەو دواتر بۆخۆم تێڕامانی وردم لەدەقی حیکمەتەکەدا کردووەو بەو ئەزموونەی لەم مەیدانەدا خودا پێی بەخشیوم کۆمەڵێك مانام لێیانەوە بەردەست کەوتووە کە لە شوێنانی تر (جگە لەم شەرحە) نابینرێنەوە، ئەوەش ئەو فەزڵ و کۆمەکییە خوداییە بوو کە بەم بەندە هەژار و دەستەوسانەی بەخشی، هەزاران حەمد و شوکر بۆ خودای موتەعال کە منی کرد بە ئامرازێك بۆ شەرحی ئەم حیکمەتە بەرز و باڵانە.

حیکمەتەکانی ئیبن عەتا تێڕامان و قووڵبوونەوەو وەستانی گەرەکە، کتێبێك نییە وەك زیاد کردنی رۆشنبیری دەستی بۆ ببرێت و بخوێنرێتەوە، بەڵکو سەرچاوەیەکە تەنها ئەوانە لێی تێدەگەن بڕیاری سەفەریان بۆ لای خودای موتەعال دابێت.

لەبیرمان نەچێت: **"ابن عطاء السكندري"** فەقیهێکی مەزنی سەردەمی خۆی بووە بەر لەوەی رێگەی سەیروسلوك بگرێتەبەر، دەتوانم بڵێم یەکێکە لەو فەقیهە مەزنانەی توانیویەتی پێوەر و ترازوو بۆ تەسەوف و سەیروسلوك دابنێت و ئەوانەی بۆ لای خودا سەفەر دەکەن سەفەرەکەیان لە چوارچێوەی شەریعەت و سەرچاوەی قورئان و سوننەتە

شیرینەکانی پێغەمبەری خودادا بێت، بۆیە لەپاڵ زانستی عیرفانی قووڵدا زانست و زانیاری لە قورئان و فەرموودە مەرجی ئەو کەسەیە لە حیکمەتەکانی ئیبن عەتا تێبگات.

بە ئومێدی ئەوەی ئەم کارە بچووکەی بەندە بەشێك لەو بۆشاییە رۆحی و ئەخلاقییە پڕبکاتەوە کە خەڵکی بە گشتی پێیەوە دەناڵێنن و لاوان و گەنجانی ئایینداریش بەدوای چارەسەرێکدا دەگەڕێن تاکو رۆحی خۆیانی پێ زیندوو بکەنەوەو رشتەی ئەخلاقی خۆیانی پێ دابڕێژن و لەم هێرشە توندو بەربلاوەی سەردەم کە دەکرێتە سەر ئیمان و ئەخلاق خۆیان قوتار بکەن.

خوێنەری بەڕێز، ئەم کتێبە دەیان و سەدان شەوو رۆژی تەمەنی لە پێناودا بەخت کراوە، گەر سوودت لێ بینی لە دوعای خێر بێبەشمان مەکە، بەڵکو بە دوعایەکی ئێوە ئێمەش بەر میهرەبانی خودای موتەعال بکەوین.

خودا کۆمەکتان بێت بۆ دەستەبەر کردنی ئایین و ئیسلامێك لای خۆی قبووڵ بێت و بەختەوەری دونیا و سەرفرازی دوارۆژی لێوە بەدەست بێت.

✍

**عبدالكريم فتاح**

**سلێمانی**

٢٠١٥/٥/٢٨

۞ ۞ ۞

# کورتەیەك لە ژیانی ئیبن عەتای سكەندەری

## (٦٥٨ه/١٢٦٠ز-٧٠٩ه/١٣٠٩ز)

**ئیبن عەتای السكندەری:**

ناوی **"تاج الدین أبو الفضل أحمد بن محمد بن عبدالكریم بن عبدالرحمن بن عبدالله بن أحمد بن عیسی بن الحسین بن عطاء الله"**یە، لە شاری ئەسكەندەریەی مصر(٦٥٨ه/١٢٦٠ز) لەدایك بووە، فەقیهێكی مالیكی و عاریفێكی ئەهلی تەصەوف بووە لەسەر تەریقەتی شازلی، بەڵكو یەكێك بووە لە پایەكانی تەریقەتی شازلی و بە زانستە شەرعییەكانەوە سەرقاڵ بووە.

ئیبن عەتا لە سەرەتاوە (وەك فەقیهێك) رێگەی ئەهلی تەصەوفی رەد كردۆتەوە، چونكە دەیوت"هەر كەس پێی وابێت زانستێكی تر هەیە جگە لەوەی لەبەردەستی ئێمەدا هەیە(مەبەستی زانستی فیقه بووە) ئەو كەسە درۆی بە دەم خوداوە كردووە" بەڵام كاتێك هاوەڵی **"أبو العباس المرسي"** دەكات و گوێی بۆ دەگرێت پێی سەرسام دەبێت و رێگەی عیرفانی لێوە وەردەگرێت و دەبێت بە یەكێك موریدە پێشینەكانی **"أبو العباس"**، دواتر لەسەر قسە كۆنەكەی خۆی دەیوت: "پێكەنینم بە خۆم دێت بۆ ئەو قسەی كردوومە"، پاشان ئیبن عەتا لە پلە و پایەی زانست و مەعریفەدا بەرز دەبێتەوەو **"أبو العباس"** پێی دەڵێت: "پابەند و بەردەوام بە سوێند بە خودا دەبیت بە موفتی هەردوو رێگەكە(مەبەستی رێگەی فیقه و زانست و رێگەی مەعریفەی عیرفانە)"

**لە قوتابییەكانی ئیبن عەتا**

"ابن الملیق السكندري و تقي الدین السبكي"ن.

**لەو كتێبانەی كە نووسیونی:**

**"لطائف المنن، القصد المجرد، التنویر، أصول مقدمات الوصول، الطریق الجادة، عنوان التوفیق، تاج العروس، مفتاح الفلاح، الحكم العطائیة"**

لە شاری قاهیرە لە (٧٠٩ه/١٣٠٩ز) كۆچی دوایی كردووە.

**زانایان لەسەر ئیبن عەتا دەڵێن:**

١."**أحمـد زروق**" دەڵێت: زانستەکانی تەفسیر و فیقھ و فەرموودە و ئوسوڵی لە خۆیـدا کۆکردبوەوە.

٢."**ابن حجر العسقلاني**" لە کتێبی "**الدرر الكامنة**"دا لەسەر ئیبن عەتا دەفـەرموێت: هـاوەڵی "**أبـو العبـاس المرسـي**" کـردووە کـە هـاوەڵی "**الشـاذلي**" بـووە، کـار و سەروەرییەکانی ئـەو دوو کەسـەی کۆکردۆتـەوە و نووسـیونی، لـە سـەردەمی خۆیـدا قسەکەری ئەھلی تەصەوف بووە.

٣.ئیمامی "**الذهبي**" دەفـەرموێت: کەسـێکی مـەزن و شـکۆمەند بـووە، کاریگـەری گەورەی لەسەر دڵ و دەروون هەبووە، و نموونەی چاکەخوازی و رەوشتی بەرز بـووە، لـە "**الجامع الأزهر**"دا لەسەر کورسییەك دادەنیشت و بە قسەکانی رۆحی ئارام و ئاسـوودە دەکرد.

٤."**ابن الأهدل**" دەڵێت: شێخێکی خوداناس بووە، شێخ و ئیمـامی هـەردوو رێگەکـە بووە، فەقیهێکی زانا بووە کۆمـەڵێك شتی سۆفییەکانی رەد دەکـردەوە... تـا دەڵێـت: چەندین نووسراوی هەیە لەوانە"**الحكم العطائية**" کە نهێنی و مەعاریف و حیکمـەت و مانای ورد لە ئامێز دەگرێت.

**راڤەکەرانی کتێبی "الحكم" دەڵێن: ئەم حیکمەتانە سێ رەهەندی گرنگ لە ئامێز دەگرن:**

**رەهەندی یەکەم:** دەربارەی یەکتاپەرستی و خۆپارێزییە لە هاوەڵدانانی گەورەو بچووك.

**رەهەندی دووەم:** باس لە بنەما و پایـەکانی تەزکیـەی نـەفس و نەخۆشـییەکانی دڵ و دەروون دەکات.

**رەهەندی سێیەم:** باس لە رەفتار و ئاکاری جۆراوجۆر و ئەحکامەکانیان دەکات.

# حیکمەتی یەکەم

((مِنْ عَلاَمَاتِ الاعْتِمَادِ عَلَى الْعَمَلِ: نُقْصَانُ الرَّجَاءِ عِنْدَ وُجُودِ الزَّلَلِ العلية))

## راڤەی وشەکان:

**علامة:** نیشانە

**الاعتماد:** پشتپێبەستن، شان لەسەر دادان

**نقصان:** کەم، کەچ، ناتەواو

**الرجاء:** ڕجا، ئومێد و هیوابوون بە لێبوردەیی و بەزەیی خودا

**الزلل:** هەڵە، تێکەوتن

**واتا ((لە نیشانەکانی پشت بەستن بە کردار: کەمی ڕجا و ئومێدە بە خودا لە کاتی بوونی هەڵە و تێکەوتندا))**

## شرۆڤە:

❁ مرۆی باوەڕدار بۆ گەیشتن بە ڕازی بوونی خودا پشت بە بەزەیی و میهری خودا دەبەستێت، نەك پشت بە کردارەکانی خۆی، بەدەستهێنانی بەهەشت و ڕەزامەندی خودا لە کارە چاکەکانی ئێمە مەزنترەو مرۆڤ تەنها بە بەزەیی پەروەردگار بەدەستیان دەهێنێت، لەگەڵ ئەم باوەڕەشدا کەسی باوەڕدار لە ئەنجامدانی کرداری چاکەدا لە پێشبڕکێدایە و دەست لە کاری چاکە ناکێشێتەوە﴿لِمِثْلِ هَٰذَا فَلْيَعْمَلِ ٱلْعَٰمِلُونَ﴾ الصافات: ٦١، لە پێناوی ئەمە و بۆ نموونەی ئەمە کارکەران کارەکانیان ئەنجام دەدەن، هەروەها ﴿وَنُودُوٓاْ أَن تِلْكُمُ ٱلْجَنَّةُ أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ الأعراف: ٤٣، بانگیان لێ دەکرێت: ئەمە ئەو بەهەشتەیە بە میرات وەرتان گرت بە هۆی ئەو کارە باشانەوە کە ئەنجامتان دا، چونکە خودا فەرمانی بە ئەنجامدانی کرداری چاکە کردووە، واتە کردار ئەنجام دەدات وەك بەئەنجام گەیاندنی فەرمانی خودا و بۆ نزیکبوونەوە لە ئەو، لە فەرموودەیەکی قودسیدا هاتووە بەندەکەم بە هیچ شتێك لێم نزیك نابێتەوە خۆشەویستتر لە فەرزەکانی

سەری، بەندەکەم بەردەوام بە نەوافیلەکان (سوننەتەکان) لێم نزیك دەبێتەوە تا خۆشمدەوێت: (عن أبي هريرة قال ((قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: إن الله قال: من عادى لي ولياً فقد آذنته بالحرب، وما تقرب إلي عبدي بشيء أحب إلي مما افترضت عليه، وما يزال عبدي يتقرب إلي بالنوافل حتى أحبه..)[1]، پێویستە بەندە لە فەرزەکانەوە دەست پێبکات و روو لە جێبەجێ کردنی نەوافیلەکان بکات بە مەبەستی رازیکردنی خودا و جێبەجێ کردنی ئەرکی بەندایەتی، نەك پێیوابێت دەبێ خودا بەو کارانە بیخاتە بەهەشتەوە، وشەی "دەبێ" لەگەڵ خودا بەکار ناهێنرێت ﴿وَهُوَ ٱلْقَاهِرُ فَوْقَ عِبَادِهِۦ ۚ وَهُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْخَبِيرُ﴾ الأنعام: ١٨، ئەو زاڵ و دەسترۆیشتووە بەسەر بەندەکانیدا، ئەو(ﷻ) بەبەزەیی خۆی لە بەندەکانی دەبورێ و کردارەکانیان لێوەردەگرێت، کردارەکانمان تەنها وەسیلەیەکن بۆ لای خودا تاکو بمانخاتە بەر بەزەیی خۆی، نەك پێمان وابێت ئامانجی کۆتایین و لەسەر خودا بەهەشت بۆ ئێمە پێویست دەکەن.

❁ لەم حیکمەتەدا "ئیبن عەتا" ئاماژە بە حاڵەتێك دەکات و دەفەرموێت:: نیشانەی پشتبەستنت بە کردارەکانت کەمبوونەوەی هیوا و رجاتە بە بەزەیی خودا لە کاتی ئەنجامدانی هەڵە و گوناهدا، کەسی باوەڕدار ئاساییە گەر بەهۆی کردارە چاکەکانییەوە بە تەمای بەزەیی خودا بێت، بەلاّم لەسەر خودا پێویست ناکرێت بەو کردارانە "دەبێ" لێی ببورێت، چونکە لێبوردن تایبەتە بەخۆی(ﷻ) هەرکات گوناهەکان مرۆڤی لە بەزەیی خودا بێهیوا کرد نیشانەی ئەوەیە کە ئەو کەسە پشتی بەکرداری خۆی بەستووە نەك بە بەزەیی خودا ﴿وَلَا تَاْيْـَٔسُوا۟ مِن رَّوْحِ ٱللَّهِ ۖ إِنَّهُۥ لَا يَاْيْـَٔسُ مِن رَّوْحِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْقَوْمُ ٱلْكَـٰفِرُونَ﴾ یوسف: ٨٧، لە رەحمەتی خودا بێهیوا و نائومێد مەبن، تەنها بێباوەڕان لە بەزەیی خودا نائومێدن، هەروەها﴿قُلْ يَـٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ﴾ الزمر:٥٣، بڵێ: ئەی ئەو بەندانەی زیادەڕەویتان کردە سەر نەفسی خۆتان، لە بەزەیی خودا نائومێد مەبن، خودا لە هەرچی گوناهە دەبورێت، ئەو لێخۆشبوو و بە بەزەییە.

---

[1] رواه البخاري:٦٥٠٢.

❁ ئەم حیکمەتە هەڵمان دەنێت بۆ کردارێك تیایدا بەزەیی خودا کرابێتە ئامانج، نەك کار و کردەوەکانمان، هەموو چاکەکانمان بری پێدانی چاوێك نییە پێیدەبینین، چ جای ڕەزامەندی خودا و پێدانی بەهەشت و ژیانی هەتاهەتایی.

❁ لێرەدا تەنها نەمانی هیوا و ئومێد(ڕجا) لە کاتی ئەنجامدانی هەڵە و گوناهدا کراوە بە نیشانەی پشتبەستن بە کردار نەك بە بەزەیی خودا، ئەم حیکمەتە ئەوە ناگەیەنێت مرۆڤ بە چاوی کەم تەماشای گوناه بکات و لە کاتی ئەنجامدانیدا بیر لە تەوبە نەکاتەوە، ئەوەش ناگەیەنێت کرداری چاکە بە سووك تەماشا بکرێت و لە ئەنجامدانیدا کەمتەرخەمی بکەین، چونکە ئەنجام نەدانی کرداری چاکە و تلان لە گوناه و تاوانەوە نیشانەی دوورکەوتنەوەی مرۆڤە -لەو ساتانەدا- لە بەزەیی خودا، بۆیە میزانی دروست بریتییە لە ئەنجامدانی کرداری چاکە و دوورکەوتنەوە لە خراپە و تاوان، بەڵام نە کرداری چاکە مەغرورمان بکات و تووشی لوتبەرزیمان بکات، نە هەڵە و تێکەوتن و گوناه تووشی بێهیواییمان بکەن، چونکە دەرگای تەوبەکردن والآیە و دەتوانین لە کارە خراپەکانمان پەشیمان ببینەوە و لە خراپە دەست بکێشینەوە.

❁ ئەنجامدانی کرداری چاکە و دوورکەوتنەوە لە خراپە تەنها لە خودا بناسین و بۆ ئازایەتی خۆمانی نەگێڕینەوە، خودا ڕێزی لێناوین کاتێك توانای ئەنجامدانی چاکەی پێ بەخشیوین، خۆشیویستووین لە خراپە دوورمان دەخاتەوە.

هەندێ لە ساڵحان دەڵێن: (گەر خودا حەزی بە دیدارت بێت بۆ نوێژی بەیانی بەئاگات دەهێنێت)، بۆیە ئەنجامدانی نوێژی بەیانی بە ئازایەتی خۆمان نییە و بۆ بەزەیی خودا دەگەڕێتەوە، ئەم ئایەتەش دەکەنە بەڵگەی ئەو قسەیان کە دەفەرموێت:

﴿وَلَٰكِن كَرِهَ ٱللَّهُ ٱنۢبِعَاثَهُمۡ فَثَبَّطَهُمۡ وَقِيلَ ٱقۡعُدُواْ مَعَ ٱلۡقَٰعِدِينَ﴾ التوبة: ٤٦،

بەڵام خودا هەستانەوەی ئەوانەی پێ خۆش نەبوو بۆیە کۆسپ و لەمپەری راستبوونەوەی بۆ دروست کردن.

**به پوختی ئەم حیکمەتە پێمان دەڵێت:**

Ê ئەنجامدانی کرداری چاکە دەبێ بە مەبەستی جێبەجێکردنی ئەمری خودا و نزیك بوونەوە بێت لە خودا، نەك پێمان وابێت بەو کردارانە "دەبێت" خودا لێمان ببورێت، ئەو خودایە و ئێمەش بەندە، ئەو فەرمانی بەسەردا نادرێ و هیچ لەسەری پێویست ناکرێت و "دەبێ" و "نابێ" ی عەبد هیچ لە بڕیاری ئەو ناگۆڕێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَفۡعَلُ مَا يُرِيدُ﴾ الحج: ١٤ ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَفۡعَلُ مَا يَشَآءُ﴾ الحج: ١٨ ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَحۡكُمُ مَا يُرِيدُ﴾ المائدة: ١، بۆ هەر سێ ئایەتەکە: خودا ئەوەی دەیەوێ دەیکات، ئەوەی ویستی بێت ئەنجامی دەدات، فەرمان دەردەکات بەو شتەی بیەوێت، بەڵکو لە بەزەیی خۆیەتی لێمان دەبورێ و کردارە چاکەکانمان لێ قبوڵ دەفەرموێت:.

Ê شان دانەدان لەسەر کردار بە تەنها، چونکە خودایە ویست و توانای ئەنجامدانی کرداری چاکەی پێ بەخشیوین و بە ئەنجامدانی ئەو کارانە ڕێزی لێناوین.

Ê مرۆڤ تووشی هەڵە و خراپە دەبێت و جگە لە پێغەمبەران(علیهم السلام) هیچ کەس لە گوناه مەعصوم نییە، بوونی گوناه نابێت مرۆڤ دەستەئەژنۆ و نائومێد بکات و لە بەزەیی خودا بێهیوا ببێت، بەڵکو باوەڕداری ژیری ڕاستەقینە دەتوانێت بەهۆی گوناهەکانییەوە لە خودا نزیك ببێتەوە، ئەوەش بە تەوبەکردن و پەشیمانی و دەربڕینی زەلیلی و بەندایەتی بۆ پەروەردگاری، ئەو جۆرە مرۆڤانە بەر مژدەی ئەو ئایەتە پیرۆزە دەکەون کە دەفەرموێت: ﴿إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلٗا صَٰلِحٗا فَأُوْلَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمۡ حَسَنَٰتٖۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورٗا رَّحِيمٗا﴾الفرقان:٧٠، جگە لەوانەی تەوبە دەکەن و کرداری چاکە ئەنجام دەدەن، خودا خراپەکانی ئەوانە بە چاکە جێدەگرێتەوە، خودا لێخۆشبوو و بە بەزەییە.

# حیکمەتی دووەم

**((إِرَادَتُكَ التَّجْرِيدَ مَعَ إِقَامَةِ اللهِ إِيَّاكَ فِي الأَسْبَابِ مِنَ الشَّهْوَةِ الْخَفِيَّةِ، وَإِرَادَتُكَ الأَسْبَابَ مَعَ إِقَامَةِ اللهِ إِيَّاكَ فِي التَّجْرِيدِ انْحِطَاطٌ عَنِ الْهِمَّةِ))**

## راڤەکردنی وشەکان:

**التجريد:** خۆداڕنین و خۆدوورخستنەوە

**الأسباب:** هۆگەلێك بۆ گەیشتن بە ئامانجەکان

**الشهوة الخفية:** حەز و ئارەزووی شاراوە

**انحطاط:** داڕووخان و داڕمان و بەربوونەوە

**الهمة العلية:** ویست و توانای بەرز و بڵند

**واتا ((ویستی خۆداڕنینت لە هۆکارەکان لەگەڵ هێڵانەوەی تۆدا لە دونیای هۆکاردا لە لایەن خوداوە لە حەزە شاراوەکانە، ویستی گرتنەبەری هۆکاریش لەگەڵ هێڵانەوەت لە دونیای دابڕان لە هۆکار لە لایەن خوداوە بەربوونەوە و دابەزینە لە ویست و توانای بەرز و بڵند))**

## شرۆڤە:

❁ ڕێبواری ڕێگەی بەرەو خوداچوون لە یەکێك لەم دوو بارەدایە: باری مانەوە لە دونیای هۆکارەکاندا، و باری دابڕان و دوورکەوتنەوە لە هۆکارەکان، گرتنەبەری هەرکام لەم دوو بارە لە لایەن کەسی باوەڕدارەوە دەبێ بە حەز و ئارەزووی ئەو نەبێت، گەر بەبێ هۆکار ژیان و گوزەرانی خۆی و ئەوانەی ئەو لێی بەرپرسە نەدەچوو بەڕێوە ئەوە پێویستە تەواوی هۆکارەکان بۆ گەیشتن بە ئامانجەکان بگرێتەبەر، چونکە خودا وای بۆ ئەو ویستووە و دەیەوێت لە دونیای هۆکارەکاندا بمێنێتەوە، خۆ گەر ئەوەندە لە خودا نزیك بوویەوە بە بێ هۆکار بە ئامانجەکانی بگات و ژیان و گوزەرانی خۆی دابین بکات

ئەوە خودا ئەو بارەی بۆ هەڵبژاردووە و گەرەکە لەو ویستە بەرز و شکۆدارە دانەبەزێت، چونکە دابەزین لەو بارەدا بۆ ڕێبواری ڕاستەقینە نەنگییەکی گەورەیە..

❁ **ڕێبوارانی ڕێگەی خودا سێ جۆرن:** ڕێبوارانی سەرەتای ڕێگەی خودا، و ڕێبوارانی ناوەڕاستی ڕێگە، لەگەڵ گەیشتووان بە دیداری خودا:

**ڕێبوارانی سەرەتای ڕێگەی بەرەوخوداچوون** لەدونیای هۆکاردا دەژین و خۆدانین لە هۆکارەکان لە حەزو ئارەزووەوە سەرچاوەی گرتووە، ئەو جۆرە خۆدانینە لە هۆکار مشەخۆری(**تواکل**) لێوە بەرهەم دێت و باوەڕداری ڕاستگۆ لەو جۆرە ڕەفتارە خۆی بەدوور دەگرێت.

**دەستەی دووەمی ڕێبواران** ئەوانەن کە لە هەندێ هۆکار بێنیاز بوون و دابڕاون، بەلاّم ئاتاجی هەندێ هۆکاری ترن، ئەوان لە هەردوو بارەکەدا(دابڕان- گرتنەبەری هۆکار) ژیان بەسەر دەبەن، لە هەندێکیدا هۆکار دەگرێتە بەر، چونکە خودا لەو مەودایەدا داینلوە، بۆ هەندێکیش لە هۆکار دابڕاوە، چونکە خودا بێنیازی کردووە لە هۆکار.

**دەستەی سێیەم** کە بە پەنجەی دەست دەژمێررێن ئەوانەن خودا لە هۆکار دووری خستوونەتەوە و لە باری بەرز و بڵندی خۆدانین لە هۆکار ڕایگرتوون، ئەم کەسانە پێغەمبەران(علیهم السلام) و ئیمامانی مەزنن، ئەوان بۆ فێرکردنی مرۆڤ زۆرجار هۆکاریان بۆ ئامانجەکان گرتۆتە بەر، یاخود وازهێنانیان لە هۆکار لە شوێنکەوتوانیان قەدەغە کردووە، هەرچەندە خۆیان لە ناخەوە لەهۆکارەکان بێنیاز بوون، پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆژووی ویساڵی (ڕۆژووی ویساڵ ئەوەبوو بۆ چەندین ڕۆژ بە بەردەوامی و بەبێ شکانی ڕۆژووەکەی بەڕۆژوو دەبوو) دەگرت و هەندێ لە یارانی چاویان لێدەکرد و هەمان ڕۆژوویان دەگرت، لێرەدا پێغەمبەر(ﷺ) ئەوانی لەو جۆرە ڕۆژووە قەدەغە کرد٠

((لە ئەنەسەوە ڕەزای خودای لەسەر بێت وتی: پێغەمبەر(ﷺ) کۆتایی مانگی کرد بە ڕۆژووی ویساڵ -واتە لەو ڕۆژانەدا ڕۆژووی نەدەشکاند و هیچی نەدەخوارد- هەندێك لە خەڵکی لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ) ڕۆژووی ویساڵیان گرت، ئەم هەواڵەش بە پێغەمبەر(ﷺ) گەیشت و فەرمووی "من گەر مانگێکیش درێژە بکێشێت دەتوانم ڕۆژووی ویساڵ بگرم، با زیادەڕەوان واز لە زیادەڕەوی خۆیان بهێنن -واتە با چاو لە

من نەکەن و ئەو جۆرە رۆژووە نەگرن- من وەکو ئێوە نیم، من بەرۆژوو دەبم، بەلاّم خودا خواردن و خواردنەوەم پێدەبەخشێت))

**(عن أنس رضي الله عنه قال:واصل النبي (صلى الله عليه وسلم) آخر الشهر، و واصل أناس من الناس، فبلغ النبي صلى الله عليه وسلم فقال: لو مُدَّ بي الشهر، لواصلت وصالاً يدع المتعمِّقون تعمُّقهم، إني لست مثلكم، إني أظلُّ يطعمني ربي ويسقين)،** مەریەم (سلامی خوای لەسەربێ) لە خەلّوەگەی خۆیدا خودا خواردن و خواردنەوەی بۆ ڕەوانە دەکرد ﴿كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيْهَا زَكَرِيَّا الْمِحْرَابَ وَجَدَ عِندَهَا رِزْقًا قَالَ يَا مَرْيَمُ أَنَّىٰ لَكِ هَٰذَا قَالَتْ هُوَ مِنْ عِندِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يَرْزُقُ مَن يَشَاءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٣٧﴾﴾ آل عمران: ٣٧، "هەرکات زەکەریا (عليه السلام) دەچووە ژوورەوە بۆ لای (بۆ لای مەریەم) ڕۆزی لا دەبینی، دەیپرسی: ئەمەت لە کوێ بوو؟ وتی: لە لای خوداوە بۆم هاتووە"، دابەزینی خوانێکی خۆراك بۆ حەوارییەکانی حەزرەتی عیسا (سلامی خوای لەسەربێ) دیسان لەو جۆرە ڕۆزییانەیە خودا بە بێ گرتنەبەری هۆکار بە باوەڕدارانی ڕاستەقیەی بەخشیوە..

❁ نەمانی حەزی دونیایی لە نیشانەکانی دابڕانە لە هۆکار، تا حەزەکانی مرۆڤ زۆرتر بن گرتنەبەری هۆکارەکان زۆرتر و زیاترە، تا ئەو جێگەی بەتەواویی مرۆڤ لە هۆکاردا نوقم دەبێ و خودای لەبیردەچێتەوە کە دروستکەری هۆکارەکانەو بکەری ڕاستەقینەیە، بەڵکو هۆکارەکان بە بێ ویستی ئەو هیچ کاریگەرییەکیان بۆ نامێنێتەوە، کاتێك خودا فاعیلییەت لە ئاگر وەردەگرێتەوە ناتوانێت ئیبراهیم (عليه السلام) بسوتێنێت، چونکە فەرمانی پێکراوە بە ﴿قُلْنَا يَا نَارُ كُونِي بَرْدًا وَسَلَامًا عَلَىٰ إِبْرَاهِيمَ ﴿٦٩﴾﴾ الأنبياء: ٦٩، وتمان ئەی ئاگر سارد ببەرەوە بە ساربوونەوەیەکی سەلامەت لەسەر ئیبراهیم، کاتێك فاعیلییەت لە زەمەن وەردەگیرێتەوە، سێ سەدونۆ ساڵ دەستەیە باوەڕدار لە ئەشکەوتێکدا خەویان لێدەکەوێ و هیچ گۆڕانێك لە پیری و تیاچوون روویان تێناکات، چونکە بەزەیی خودا بەسەریاندا داباریوە ﴿وَإِذِ اعْتَزَلْتُمُوهُمْ وَمَا يَعْبُدُونَ إِلَّا اللَّهَ فَأْوُوا إِلَى الْكَهْفِ يَنشُرْ لَكُمْ رَبُّكُم مِّن رَّحْمَتِهِ وَيُهَيِّئْ لَكُم مِّنْ أَمْرِكُم مِّرْفَقًا ﴿١٦﴾﴾ الكهف: ١٦، پشتیان تێکردن و کەناریان لێگرتن جگە لە خودا هیچ کەسێکی تر ناپەرستن، روو لە ئەشکەوتەکە بکەن خودا بەزەیی خۆی بەسەرتاندا دادەبارێنێ و دەروو و چارەیەکتان بۆ دەبینێتەوە،

ڕێبواری گەیشتوو بە دیداری خودا لە حەز و ویستی خۆی فەنا بووە و وەك مردوویەك لە بەردەم ویستی خودادا ڕاکشاوە، ئەو لەگەڵ خودادایە و جووڵە و وەستانی بۆ ئەو دەگەڕێتەوە، فەنا بوون لە ویستی مرۆیی ویستێکی باڵا بە مرۆی باوەڕدار دەبەخشێت کە ویستی خودای موتەعالە، ئەم ویستە باڵا و ڕەهایە لەو فەرموودە قودسییەدا ئاماژەی پێکراوە کە ئەمە بەشێك لە دەقەکەیەتی: (**فإذا أحببته:كنت سمعه الذي يسمع به، وبصره الذي يبصر به، ويده التي يبطش بها، ورجله التي يمشي بها، وإن سألني لأعطينَّه، ولئن استعاذني لأعيذنَّه**)، "کاتێك بەندەیەکم خۆشویست دەبم بەو گوێیەی پێی دەبیستێ، بەو چاوەی پێی دەبینێ، بەو دەستەی دەیوەشێنێت، بەو لاقەی پێی دەڕوات، گەر داوام لێبکات پێی دەبەخشم، گەر پەنام پێبگرێ پەنای دەدەم"

## پوختە

- Ê ڕێبوارانی ڕێگەی خودا یان لەناو هۆکاردان یان دابڕاون لە هۆکار، هەردوو بارەکە دەبێت حەز و ویستی کەسی باوەڕداری تێدا نەبێت و خودا بڕیاری لەسەر بدات، ئەو وەك کرێکارێك وایە کە لە بەیانییەوە خۆی بە خاوەن کار تەسلیم دەکات و ئەوە بڕیاری شوێن و جۆری کاری بۆ دەدات..
- Ê گەر خودا گرتنەبەری هۆکاری بۆ تۆ بڕیار دابێت ئەوا ویستی خۆدارنین لە هۆکار حەز و ئارەزوویەکی شاراوەیە و دەبێ ڕێبواری ڕاستەقینە خۆی لێ بەدوور بگرێت.
- Ê ویستی گەڕانەوە بۆ ناو هۆکار لە کاتێکدا خودا دابڕانی لە هۆکار بۆ تۆ پێباشە دابەزینە لە مەزنی و شکۆداری لە پلەکانی باوەڕدا.

# حیکمەتی سێیەم

((سَوَابِقُ الْهِمَمِ لاَ تَخْرِقُ أَسْوَارَ الأَقْدَارِ))

**راڤەی وشەکان:**

**سوابق:** پێشینە

**الهمم:** کۆی "الهمة"یە، واتە هەوڵ و لێبڕان

**لا تخرق:** نابڕێ

**أسوار، جمع السور:** ئەو دیوارە بەردینەیە بە دەوری شاردا کێشراوە

**أقدار:** قەدەر ئەو ئەندازەگیرییەیە خودا بۆ سەراپای بوون دیاری کردووە

**واتا ((هەوڵ و لێبڕانی پێشینە دیوارەکانی قەدەر نابڕن))**

## شرۆڤە:

ئەم حیکمەتە تەواوکاری حیکمەتی دووەمە، تەواوی هەوڵ و کۆشانی مرۆڤ دەکەوێتە ناو بازنەی بەرینی قەدەرەکانی خوداوە، ئەگەر ویست و لێبڕانی مرۆڤ بازنەیەك بێت، ئەوا بە بازنەی بەرینی ویستی خودا دەورە دراوە، واتە ویستی مرۆڤ بازنەیەکی زۆر بچووکە لە ناو بازنەی ڕەها و بێ چێوەی خودای موتەعالدا، ئەم حیکمەتە پەلکێشمان دەکات بۆ قسەکردن لە قەزا و قەدەر یاخود قەدەر و قەزا کە دەیان و سەدان پرسیار بەدوای خۆیدا دروست دەکات:

مرۆڤ سەرپشك و موخەییەرە، واتە دارای ویستە، یاخود موسەییەر و ژێربارە، ئایا کاری شەڕی مرۆڤ دەکەوێتە کوێی ویستی خوداوە؟ ئێمە لێرەدا خۆمان لەو جەدەلە کەلامییە لادەدەین و هەوڵمان بۆ قسەکردن لەسەر ویستی بەرەوخوداچوون چڕ دەکەینەوە.

۞ ڕێبواری ڕێگەی بەرەوخواچوون ویست و هەوڵی بێوچان بەگەڕ دەخات و دەیەوێت خۆی بگەیەنێتە ترۆپکی پلە بالاَکانی باوەڕ، ئەم ویست و تێکۆشانە لای خودا بە گەورە تەماشا دەکرێ و خاوەنەکەی مەزنترین پاداشتی بۆ دەنوسرێت، بەلاَم پێویستە لەم مەیدانەدا راستییەك لە یاد نەكات ئەویش ئەوەیە تۆ هەرچەندە تەکان بەخۆت بدەی و بتەوێ لە پلەکانی باوەڕدا بەرز ببیەوە لە ناو بازنەی قەدەرەکانی خودادای و ناتوانیت لە سنووری ئەو بازنەیە دەربچیت، ئەم باوەڕە کەسی باوەڕدار وا لێدەکات هەرچەندە کار و کردەوەکان گەورە بن بە کەم تەماشایان بکات و پێیان لە سنوور دەرنەچێت، چونکە بەرزبوونەوە بە پلەکانی باوەڕدا قەدەری باشی خودایە بۆ بەندەکەی خۆی، نەك بە ئازایەتی ئەو بێت، ئەم باوەڕە وادەکات کەسی باوەڕدار لە ئاست ئەنجامدانی کارە باشەکان شوکری خودا بکات کە ویستی چاکەی پێ بەخشی و توانای پێدا تاکو چاکە ئەنجام بدات، ئەمەش چاکەکانی زۆر مەزنتر دەکات و فەڕ و پیتیان تێدەکەوێت، چونکە ئەو باوەڕە حەقیقەتی شوکری خودایە کە بەڵێنی داوە بەبەندەکانی ﴿ وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكُمْ لَئِن شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ ۖ وَلَئِن كَفَرْتُمْ إِنَّ عَذَابِي لَشَدِيدٌ ۝٧ ﴾ إبراهيم: ٧، گەر شوکری خودا بکەن بۆتان زیاد دەکەم.. لەمەش بالاَتر ئەوەیە بەندەی راستەقینەی خودا بە دڵ بڵێت: ئەی خودایە من نازانم چۆن شوکری تۆ بکەم، ئەو دڵ و زمانەی شوکری تۆی پێدەکەم لە سەر ئەوەی ویست و توانای کرداری چاکەت پێ بەخشیم دیسان لە بەهرەکانی تۆیە و پێویستیان بە شوکرکردن هەیە..

۞ ئەوەی ڕێبواری ڕێگەی خودا لە هەنگاوهەڵگرتن رادەگرێ و ناهێڵێت بەردەوام بێت ئەو بیرکردنەوەیە کە پێیوایە بە ئازایەتی و هەوڵی خۆی کارە چاکەکانی ئەنجام داوە، بۆیە دەبینین قۆناغێك هەنگاو بەرەو خودا هەڵدەگرێ و پاش ماوەیەك رووی بە دەرگایەکی داخراودا هەڵدەشاخێ و رادەوەستێ، ئەو پێویستە لە پاڵ ئیرادەی مەزن و کرداری چاکەدا خۆی بە خودا بسپێرێت، بە ئەو تەسلیم بووبێت، تەسلیم بوون بە خودا تەسلیم بوونە بە قەدەرەکانی بە خۆش و ناخۆشەوە، قەدەرگەلێك خودا دەیهێنێ و دەستی ئەوی تێدا نییە، تاقیکردنەوەی بەندەکان لە زەمینەی صەبر و زەمینەی

شوكردا، واته به ناخۆشی و بەخۆشی، ئەو سوننەته نەگۆڕە خواییەیه كه بەسەر هەموو باوەڕدارێكدا گوزەر دەكات، ئەو له كاتی بەلاَ و ناخۆشیدا گەرەكه ئارام بگرێ و سكالاَ و گلەیی له قەدەر بەرز نەكاتەوە، له كاتی دابارینی بەهرەكان و هاتنی خۆشییەكاندا پێویسته له خودایان بناسێ و به دڵ سوپاسگوزاری خۆی بۆ خودا دەربڕێت..

۞ هاتنی وشەی **"سوابق"** له پێش **"الهمم"**ەوە جۆرێك له پرسیار و سەرسامی لای شرۆڤەكارانی "حیكمەتەكانی ئیبن و عەتا" دروست كردووە، كه به پشتیوانی خودا لێرەدا هەوڵدەدەین لێكدانەوەیەكی دروست بۆ هاتنی ئەم وشەیه بكەین، ئیبن عەتا دەفەرموێت:: بوونی هەوڵ و لێبڕانیش بۆ كرداری چاكه -لای رێبواری رێگەی خودا- دیسان قەدەرێكی پێشینەیه، بەلاَم قەدەرێك كه دیواری شورا پۆلاَیینەكانی قەدەری بالاَ نابەزێنێت، با پێمان وانەبێت ئیرادەی خێر و كاری خێر لەو ساتەوە خەلق دەبن مرۆڤ بۆیان دەكۆشێت، نەخێر، ئەوانەش قەدەر له پێشیانەوەیه، بەلاَم ئەو قەدەرە له ئەنجامه كۆتاییەكان هیچ ناگۆڕێ و هەموو گەردوون و بوون و رووداوەكانی ناویان نوقمی قەدەری رەهای پڕ عەدل و حیكمەتی خودای موتەعالن..

**پوختە:**

- هەوڵ و كۆشانی مرۆڤ قەدەرێكی پێشینه دەینەخشێنێت.
- پێویسته دارای مەزنترین ویست بین و گەورەترین چاكه ئەنجام بدەین، بوونی ویست و چاكەشمان له خودا بناسین و نەیكەین به ئازایەتی خۆمان..
- ویست و لێبڕانی بێوچانی كەسی باوەڕدار هیچ له ئەنجامه كۆتاییەكانی قەدەر ناگۆڕێت.

۞ ۞ ۞

# حیکمەتی چوارەم

((أَرِحْ نَفْسَكَ مِنَ التَّدْبِيرِ فَمَا قَامَ بِهِ غَيْرُكَ عَنْكَ لاَ تَقُمْ بِهِ لِنَفْسِكَ))

## راڤەی وشەکان:

**أرح نفسك**: دەروونت ئاسوودە بکە

**التدبير**: تەگبیر

**قام**: ئەنجامی دەدات، پێیهەڵدەستێت

**واتا ((دەروونت ئاسوودە بکە لە تەگبیر، ئەوەی کەسانی تر لە جێگەی تۆ ئەنجامی دەدەن، تۆ بۆ خۆتی ئەنجام نادەی))**

## شرۆڤە:

❁ ئەم حیکمەتە زۆر کەس بە هەڵە لێی تێگەیشتوون، پێیان وایە "ئیبن عەتا" داوا لە رێبوارانی رێگە دەکات تەگبیر واز لیٚ بهێنن و دەستبەرداری بیرکردنەوەی دروست بن لە هەڵسوڕاندن و بەئەنجام گەیاندنی کار و باری دین و دونیایان، مانای ئەم حیکمەتە دروست پێچەوانەی ئەو تێگەیشتنەیە، بەرزترین ڕەوشت و ئاکارێك خودا بە مرۆڤی بەخشیبێت بریتییە لە حیکمەت، یەکێك لە ماناکانی حیکمەت تەگبیر و بەرنامەڕێژییە بۆ تەواوی وردەکارییەکانی ژیانی رۆحی و مادی مرۆڤ و بەئەنجامگەیاندنی هەموو ئەو وردەکارییانە بە درروستترین و شیاوترین شێوە، خودا حیکمەتی بە لوقمان(عليه السلام) بەخشی ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا لُقْمَٰنَ ٱلْحِكْمَةَ أَنِ ٱشْكُرْ لِلَّهِ ۚ وَمَن يَشْكُرْ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ حَمِيدٌ ﴿١٢﴾﴾لقمان: ١٢، حیکمەتمان بە لوقمان بەخشی شوکری خودا بکە لەسەری، هەر کەس شوکری خودا بکات شوکری خۆی کردووە، هەر کەسێکیش کوفر بکات خودا دەوڵەمەند و حەمدکراوە، "لوقمان"یش لەسەر ئەو بەهرە خواییە کە حیکمەتە شوکری خودای کرد..

۞ ئەم حیکمەتە ئاماژە بە وەلانانی چ جۆرە تەگبیرێك دەكات و كێن ئەوانەی پێویستییان بە تەگبیری ئەقڵی نامیێنێت و پابەند دەبن بە جۆرێکی تر لە تەگبیرەوە؟ سالیکی سەرەتای ڕێگەی بەرەو خودا پێویستە لەسەری بە وردی تەگبیری ژیانی ماددی خۆی بکات، تاکو ئاتاج بە دەرەوەی خۆی نەبێت، ئاتاجیی سالیك بە غەیری خۆی لە سەرەتای هەنگاوەکانی بەرەوخوداچووندا کاردانەوەیەکی خراپ لەسەر دەوروبەر و خانەوادە و خودی خۆشی بەجێدەهێڵێت، ئەو هەنگاو بەرەو کەماڵ هەڵدەگرێت، بۆیە نابێت ڕێگە بە ناتەواوییەکی گەورە بدات بێتە ناو ژیانییەوە، ڕێبواری ڕێگەی خودا لە بەرزبوونەوە و بەرەو کەماڵچوونی خۆی بەردەوام دەبێت تا ئاستێکی بەرز و بڵند کە گەیشتنە بە مەقامی ڕابەری و پێشەوایەتی کردنی موسڵمانان، تەگبیر لەم مەقامەدا تەنها تەگبیری ئەقڵی نییە بۆ کاروباری دین و دونیا، بەڵکو مەقامێکە تیایدا نوور و ڕەحمەتی خودا بەردەوام بەسەریدا دادەبارێت، وەرگرتنی ئەو نوور و ڕەحمەتە لە لایەن کەسی عاریفەوە ئاراستەیەکی تر بە تەگبیر وەردەگرێت، ویستی کەسی عاریف لەگەڵ ویستی خودادا بە ئەندازەیەك نزیك دەکاتەوە کە وەك لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە (**فإذا أحببته: كنت سمعه الذي يسمع به، و بصره الذي يبصر به، و يده التي يبطش بها، و رجله التي يمشي بها، وإن سألني لأعطينَّه، ولئن استعاذني لأعيذنَّه**) پێشتر لێکدانەوە بۆ فەرموودەکە کراوە، ئەم مەقامە بەرزە لە باوەڕ داوا لە خاوەنەکەی دەکات دەستبەرداری تەگبیرگەلێك ببێت کە لە قۆناغەکانی پێشتردا پێیەوە پابەند بووە، دەستبەرداربوونی ئەو بە ویستی خۆی نییە، چونکە ئەوە خودایە لە بازنەی هۆکار(**دائرة الأسباب**) دەری دەهێنێت و بە بازنەی خۆدارنین و یەکلابوونەوە(**دائرة التجريد**) شادی دەکات، وەك لە حیکمەتی یەکەمدا ئاماژەی پێکراوە..

۞ ئەو بە ڕۆحی بڵندی و ویستی نزیکی بە ویستی خودا لە کارکردن لە ناو بازنەی بەشەکی (**الجزئي**)دا هاتۆتە دەرەوە و ویستی ڕوو بە گشت (**الكليات**) تەکان بەخۆی دەدات، ئەم مەقامە تەنها کەسانێك پێی دەگەن کە خودا بۆ مەقامی ئیمامەت هەڵیاندەبژێرێت: ﴿وَٱجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا ٧٤﴾الفرقان: ٧٤، خودایە بمانکە بە ئیمامی لە خوداترسان، ئەو مەقامەش لە هەر سەردەمێکدا کەسانێك پێیدەگەن کە بە پەنجەی

دەست دەژمێررێن﴿ وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ذُو حَظٍّ عَظِيمٍ ﴿٣٥﴾ ﴾فصلت: ٣٥، تەنها ئارامگران پێی شاد دەبن و تەنها خاوەن بەشێکی مەزن پێی دەگەن، لەم مەقامەدا هەموو دەوروبەر بەو جۆرە دەبزوێن و ئاراستە وەردەگرن کە سەرئەنجام و دەرئەنجامی کارەکانیان هەماهەنگ و راستەوانە لەگەڵ ویست و پەیامی خاوەن مەقامدا دەوەستێتەوە، دەوروبەر بەئاگا یان بێئاگا بەجۆرێك دەبزوێن کارەکانیان تەواوکاری ئەو پەیامە بێت خاوەن پەیام لەو مەقامەدا دەیەوێت بیگەیەنێت با لە رووالّەتدا دوژمنکاری و میحنەت و ململانێ بێت لەگەڵ کەسی خاوەن پەیام و شوێنکەوتووانی، ئەو حالّەتە نهێنییەکە لە نهێنییەکانی دونیای عیرفان و لەوە زیاتر قسە لەسەر کردنی لە مەداری تێگەیشتنی مرۆڤ دەردەچێت و باسکردنی بەزیان بۆ خوێنەر دەگەڕێتەوە..

**پوختە:**

- تەگبیر بۆ راپەڕاندنی کار و فەرمانەکان بیرکردنەوەی بەردەوامی کەسی باوەڕدارە و بەشێکە لە بەندایەتی ئەو بۆ خودا.
- ژیانی رۆحی مرۆڤیش دیسان پێویستی بە تەگبیرە و گەرەکە وەك چۆن لە تەگبیری دابینکردنی زیندەگییەکی ماددیدا بۆ خۆمان و خانەوادەمان کەمتەرخەمی ناکەین بە هەمان پێودان پێویستە لە خەمی تەگبیرکردنی ژیانی رۆحی و زیندەگی مەعنەوی خۆماندا بین.
- ئەو کەسانەی بۆ مەقامی ئیمامەت و رابەری کردن بەرز دەکرێنەوە بەهۆی نزیکییان لە خوداوە جۆرێك لە تەگبیری مەعنەوی بەدەست دەهێنن و لەو تەگبیرە ئەقلّییە رێژەییە دێنە دەرەوە، ئەمەش بە ویستی خودا نەك بە حەز و ویستی مرۆڤ..

❁ ❁ ❁

# حیکمەتی پێنجەم

**((اجْتِهَادُكَ فِيمَا ضَمِنَ لَكَ، وَتَقْصِيرُكَ فِيمَا طَلَبَ مِنْكَ: دَلِيلٌ عَلَى انْطِمَاسِ الْبَصِيرَةِ مِنْكَ))**

## ڕاڤەی وشەکان:

**إجتهاد:** هەوڵ و کۆشان

**ضمن لك:** بۆت دەستەبەر بووبێت

**تقصير:** کەمتەرخەمی

**إنطماس:** سڕانەوە و کوژانەوە

**البصيرة:** بینینی چاوی دڵ، ڕۆشنبینی

**واتا ((هەوڵت بۆ ئەوەی -لە لای خوداوە- بۆت دەستەبەرکراوە و کەمتەرخەمیت بەرانبەر ئەوەی داوات لێکراوە بەڵگەی سڕانەوەو کوژانەوەی نووری بەصیرەتە لە تۆ))**

## شرۆڤە:

❁ خودا دەستەبەری ڕۆزی بۆ سەرجەم گیانداران و زیندەوەران کردووە، مرۆڤیش بەشێکی گرنگ و دانەبڕاوە لەو گیان پێبەخشراوانە و ئەو بەشە ڕۆزییەی مرۆڤی پێ دەژی و بەهۆیەوە زیندەگی دەکات خودا بۆی دەستەبەر کردووە، بەرانبەر بەم دەستەبەرکردنی ڕۆزییە خودا داوای ئەنجامدانی بەندایەتییەکی ڕاستەقینەی بۆ خۆی لێدەکات، ئەمەش لە مانای ئەو ئایەتە پیرۆزە وەرگیراوە کە دەفەرموێت:﴿ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴿٥٦﴾ مَآ أُرِيدُ مِنْهُم مِّن رِّزْقٍ وَمَآ أُرِيدُ أَن يُطْعِمُونِ ﴿٥٧﴾ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلرَّزَّاقُ ذُو ٱلْقُوَّةِ ٱلْمَتِينُ ﴿٥٨﴾ ﴾الذاريات: ٥٦–٥٨، ئینس و جینم بۆ بەندایەتی کردنی خۆم دروست

کردووە، رۆزی و خواردن پێدانم بۆ خۆم لەوان گەرەك نییە،  خودا بۆ خۆی رۆزیدەرە و خاوەن هێزی مەزن و توندوتۆڵە.

۞ کاتێك مرۆڤ بە پێچەوانەی ئەوەی خودای موتەعال داوای لێکردووە هەنگاو هەڵدەگرێ و ئەوەی بۆی دەستەبەرکراوە دەکات بە خەمی شەو و رۆژی و دەکەوێتە هەوڵ و پەلکوتان بۆ گەیشتن پێی، لەو سەرەوەش واز لەو ئەرکە خوداییە دێنێت کە لەسەری پێویست کراوە و بۆی دروستکراوە، ئیتر ئەو مرۆڤە نووری بەصیرەتی دەکوژێتەوە و دەکەوێتە ناو تاریکستانی نەفامی و حەز و ئارەزووەوە..

۞ ئەم حیکمەتە داوا ناکات بە ناوی خۆ یەکلاکردنەوە بۆ بەندایەتی مرۆڤ واز لە کەسپی حەلاڵ بهێنێت، چونکە کەسپی حەلاڵ جۆرێکە لە بەندایەتی بۆ خودای موتەعال، بەڵکو هۆشداریدان و ئاگاادارکردنەوەی کەسی باوەڕدارە  لە چەند حاڵەتێك، لەوانە:

**أ**- وازهێنان لە بەندایەتی خودا و تیابردنی ئەرکە ئیسلامییەکان کە لە دروشمەکانی پەرسشدا (نوێژ- رۆژ- زەکات- حەج) خۆیان دەبیننەوە -لە پێناوی کار و کەسابەتی دونیاییدا- کارێکی  ناپەسەندە و وەرنەگیراوە با ئەو کەسابەتەش لە رێگەی حەلاڵەوە بێت و بنەماکانی ئیسلامی تیادا پارێزراو بێت.

**ب**- ئەوانەی لە مەقامی بەرزی باوەڕدان و قەدەرە ئیلاهییەکان بەرەو ئاراستەیەکیان دەبات کە تیایدا دەبن بە پێشەوای ئیمانی و ئەخلاقی و ئەرکی رابەریەتیکردنی موسڵمانان دەکەوێتە سەر شانیان ئەو دەستە مرۆڤە پێویستە بە کەمترین زیندەگی دونیا قەناعەت بهێنن و بەشێکی زۆر لە کاتەکانیان بۆ خۆ پێگەیاندن و گەیاندنی پەیام تەرخان بکەن، ئەوان دەبێت بە متمانەیەکی گەورە بە خودای خۆیان و یەقینێکی مەزنەوە بە رۆزیدەر(**الرزاق**)ی پەرروەردگاریان ژیان بەرێ بکەن، ئەو جۆرە کەسانە لەوانەن بەر ئەم ئایەتە پیرۆزە دەکەون کە دەفەرموێت: ﴿**وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مَخۡرَجٗا ٢ وَيَرۡزُقۡهُ مِنۡ حَيۡثُ لَا يَحۡتَسِبُۚ وَمَن يَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسۡبُهُۥٓ**﴾الطلاق: ٢– ٣، هەر کەس لە خودا بترسێت خودا دەرووی لێ دەکاتەوە و بە جۆرێك رۆزی دەدا بە بیریدا نەهاتبێت، هەر کەس تەوەکولی بە خودا بێت خودا بۆ ئەو بەسە، ئەوانەی خۆیان لە مەقامی

ئیمامەتدا دادەنێن یاخود دەیانەوێت هەنگاو بەرەو ئەو مەقامە مەزنە هەڵبگرن لەسەریان پێویستە لە کەمترین ئاستی زیندەگیدا بن، نابێت بەناوی ئەوەی کە ئەوان بۆ گەیاندنی پەیامی خودا یەکلابوونەتەوە (بەسەر موسڵمانانەوە) ببنەچینێکی مشەخۆری پارە خڕکەرەوە، گوایە ئەوان سەرقاڵی کارە مەزنەکانی موسڵمانانن، بۆیە پێویستە لەسەریان خزمەتیان بکەن و لە ماڵ و ژیان و دارایی خۆیان بەشیان بدەن، کەسانێك ئەوە بیرکردنەوەو تێگەیشتنیان بێت ناگەنە مەقامی ئیمامەت و خودا بانگەشەکەرانی ئەو مەقامە دەناسێنێ و ناتوانن تا سەر درۆ لەگەڵ خۆیان و موسڵماناندا بکەن، بۆیە پەردەی حورمەتی خۆی لەسەریان هەڵدەگرێت و جاڕچییەکی نادیار بانگ بە گوێی راستگۆیانی ئیسلامدا دەدات و پێیان دەڵێت ئەو کەسانە خاڵین لە رۆحی ئیمامەت و پێیان ناگاتە ئەو مەقامە پیرۆزە، گەر دەوترێت ئەو کەسانەش خاوەنی ژن و منداڵن و پێویستە ژیان و زیندەگییان بۆ دابین بکرێت، دەڵێین ئەوانەی دەبنە ئیمام پێویستە لە هەموو رووەکانەوە ئیمام بن، یەکێك لەو مەیدانانە مەیدانی خێزان و خانەوادەیە، ئەوان دەبێت خێزانەکانیان نموونەی خێزانی پێغەمبەری ئیسلام بن(ﷺ)، کە لە نێوان دونیا و پێغەمبەردا (ﷺ) پێغەمبەریان هەڵبژارد و بوون بە دایکی هەموو باوەڕداران بۆ هەتا هەتایە، ئەوان بانگەشەی ئیمامەت بکەن و کۆشکەکانیشیان وەکو کۆشکەکانی "فیرعەون و هامان" بن و ژن و منداڵەکانیان لە چێژ و زەخرەفەی دونیادا چەقیبن لە کوێ ئیمامەتیان پێدەکرێت و چۆن سیتری خودا لەسەریان هەڵناگیرێت؟!

**ت**- هەندێك لە موریدان و سالیکانی رێگەی بەرەو خوداچوون، خۆیان بۆ بەندایەتی یەکلا دەکەنەوە، لێرەدا دەبنە چەند دەستەیەك:

**دەستەیەك** لەناو **بەندایەتی و زیکر و یادی خودادان،** بەلاَم دڵ و دەروونیان بە دونیا داگیرکراوە، واتە تەنها رووالەتیان ملکەچی خودا بووە، وەلێ ناخیان بە دونیا لێوان لێوە، ئەم دەستەیە هەر زوو ناخیان بەسەر شاخ دەرەوەیاندا زاڵ دەبێت و دەگەڕێنەوە بۆ ناو کار و باری دونیایی و بەندایەتی راستەقینە وازلێدەهێنن.

**دەستەی دووەم** دەیەوێت لەناو بەندایەتیدا بمێنێتەوە، بەلاّم ئەو بەشەی لە دونیا کە بە زەرورەتی ژیانی دەزانن لە دەوروبەر بەدەستی دەهێنن، بۆ نموونە برایەکی دەوڵەمەندی هەیە و کاروباری دونیای ئەو و منداڵەکانی بەڕێوە دەبات، ئەم دەستەی دووەمەش کەمێك لەسەرو دەستەی یەکەمەوەن و ئەو بارەی تێیکەوتوون بە پەسەند تەماشا ناکرێت.

**دەستەی سێیەم شان لەسەر دەوروبەر دانادەن و نایانەوێت دەست لە هیچ کەسێك پان بکەنەوە**، بەلاّم دڵەڕاوکێ- بۆ ئەو بەشە زەرورەی رۆزی- لە ناوەوە داگیریان دەکات، چونکە هێشتا بە تەواوی دەرگای یەقینیان لێ نەکراوەتەوە و دڵیان لە پەنای خودادا ئارامی نەگرتووە.

**دەستەی چوارەم دڵیان پاڵی داوەتەوە و بە یەقین و تەوەکولی راستەقینە لێوانلێو بوون**، بەلاّم بۆ ئەو بەشە رۆزییە لە خودای خۆیان دەپاڕێنەوە و دەست بەرز دەکەنەوە، هێشتا ئەو پرسیارەشیان لەلا ماوە چۆن چۆنی خودا ئەو بەشە لە رۆزیان بۆ دەنێرێت، ئەوان دەزانن و یەقینیشیان بەوە هەیە خودا رۆزیان بۆ دەنێرێت، بەلاّم پێیان وایە پێویستی بە پاڕانەوە هەیە و دوای پاڕانەوەش بیر لەوە دەکەنەوە دەبێت خودا بە چ رێگەیەك ئەو بەشە لە رۆزییان بۆ رەوانە بکات!

**دەستەی پێنجەم ئەو بەشە لە رۆزی بە بیردا نایەت و شەرم دەکات لە خودای خۆی داوای ئەو بەشە لە رۆزی بکات کە خودا بۆخۆی بەڵێنی بەخشینی بە بەندەکانی داوە**، ئەم دەستەیە ئیمانی مەزنن و بە پەنجەی دەەست دەژمێررێن.

**رووی حیکمەتەکەی "ئیبن عەتا" لە دەستەی یەکەم و دووەم و سێیەمە..**

## پوختە:

- خودا داوای بەندایەتی لە مرۆڤ کردووە و بەرانبەر بەوەش بەڵێنی رۆزی پێداون.
- مرۆڤ دەبێت دڵی بە بەڵێنەکانی خودا دابمەزرێ و ئەو بە رۆزیدەری راستەقینە تەماشا بکات و بە ئەرکی بەندایەتی خۆی هەڵبسێت..

Ê کاتێك خەمی دونیا دەبێتە مەزنترین خەم و بەڵێنەکانی خودا بۆ پێدانی ڕۆژی پشتگوێ دەخرێت ئیتر مرۆڤ لە تێگەیشتنی دروست خاڵیدەبێتەوەو لە نووری هیدایەت بێ بەش دەبێت ئەمەش بەهۆی کوژانەوەی نووری بەصیرەت و کوێربوونەوەی چاوی دڵییەوە.

Ê بەناوی یەکلابوونەوە بۆ بەندایەتیکردن نابێت ملك و ماڵی خەڵکی بخورێت، یاخود دەستەیەك ببنە مشەخۆر بەسەر موسڵمانانەوە.

# حیکمەتی شەشەم

((لاَ يَكُنْ تَأَخُّرُ أَمَدِ الْعَطَاءِ مَعَ الإِلْحَاحِ فِى الدُّعَاءِ مُوجِبًا لِيَأْسِكَ، فَهُوَ ضَمِنَ لَكَ الإِجَابَةَ فِيمَا يَخْتَارُهُ لَكَ، لاَ فِيمَا تَخْتَارُ لِنَفْسِكَ، وَفِى الْوَقْتِ الَّذِى يُرِيدُ، لاَ فِى الْوَقْتِ الَّذِى تُرِيدُ))

## راڤەكردنی وشەكان:

**أمد:** كات و دەم و سەردەم

**تأخر العطاء:** دواكەوتنی بەخششەكانی خودا

**الإلحاح في الدعاء:** پێداگری لە داوا و دوعادا

**يأس:** بێهیوایی و رەشبینی

**ضمن:** دەستەبەری كردووە

**الإستجابة:** وەڵامی داوا و دوعاكان

**واتا ((با دواكەوتنی دەمی هاتنی بەخششە خوداییەكان لەگەڵ پێداگری لە دوعادا (بۆ بەدەستهێنانیان) سەرنەكێشێ بۆ بێهیوابوونت، ئەو(ﷻ) وەڵامی دوعاكانی تۆی دەستەبەر كردووە لەو شوێنەی كە ئەو دیاركردووە، نەك لەو جێگەی تۆ بۆ خۆت هەڵتبژاردووە، لەو كاتەی ئەو دەیەوێت نەك لەو كاتەی تۆ دەتەوێت))**

## شرۆڤە:

❁ سەرەتا دەبێت ئاماژەیەك بەو قەدەرە خوداییە بكەم لە پشتی كاتی شرۆڤەكردنی ئەم حیكمەتەوەیە(واتە حیكمەتی شەشەم): دوای شرۆڤەكردنی حیكمەتی پێنجەم ماوەیەكی زۆر لە شرۆڤەكردنی "حیكمەتەكانی ئیبن عەتا" دووركەوتمەوە، لەو ماوەیەدا كۆمەڵێك داوا و پێویستیم لە خزمەتی خودای موتەعالدا هەبوو، بە بەردەوامی دوعام بۆ دەكردن و لەبەر خودا دەپاڕامەوە تاكو ئەو داوایانەم قبووڵ بفەرمویّ و

پێویستییەکانم بۆ جێبەجێ بکات، بەڵام پێویستییەکان وەکو خۆیان مانەوە و منیش پێداگریی و پاڕانەوەم کەم بوویەوە، کەوتمە لێواری تاریکستانی بێهیوایی، بەرلەوەی خۆم بهاومە ناو ئەو دۆزەخەوە(دۆزەخی بێهیوایی) بەیانییەك هات بە یادمدا بگەڕێمەوە بۆ ناو "حیکمەتەکانی ئیبن عەتا" بەڵکو شیفای ئەو نەخۆشییەم بدۆزمەوە و ئاسۆیەك بە روومدا بکرێتەوە، تەماشام کرد گەیشتوومەتە "حیکمەتی شەشەم" و ئەم حیکمەتەش وەك دەرمانخانەیەك وایە بۆ ئەو دەردە دەروونییەی تووشم هاتووە، حیکمەتەکە باس لە حاڵی شەکەتی من دەکات و پێم دەڵێ ئەوەی خودا بۆت هەڵدەبژێرێ لەوەی خۆت دەتەوێت چاکتر و پاکترە، بۆیە بڕیارم دا سنووری ئەدەب لەگەڵ پەروەردگارم نەبەزێنم و دوعا و داواکانم وەك دەربڕینی گەردنکەچی و عیبادەت دەرببڕم و سەرئەنجامی دوعاکان رادەستی خودا بکەم، [2]

ئەم حیکمەتە:

- مرۆڤی باوەڕدار هەڵدەنێت بۆ تەسلیمبوونی تەواو بە خودای موتەعال، تەسلیمبوونێك بەرەکەی بریتییە لە ئارامی و دووركەوتنەوە لە دڵەراوکێ و دوودڵی، ئەم حیکمەتە باس لە پایەی شەشەمی باوەڕ دەکات کە ئیمانە بە قەزاوقەدەر، ئیمان بە قەزاوقەدەر واتە تەسلیمبوونی تەواو و یەکجاری بەو ئەقدارانەی خودا بەسەر تۆدا تێیدەپەڕێنێت، ئەم بابەتەش زانستێکی فرە وردە و زۆرن ئەوانەی تیایدا تووشی هەڵچوون و داچوون بوون، بۆیە بەرلەوەی مرۆڤ شان لەسەر ویست و لێبڕانی خۆی دابدات پێویستە رووی دڵی بکاتە خودا و لەبەری بپاڕێتەوە تاکو بەر رەحمەتی خۆیی بخات و ئەو ئایەتە پیرۆزەش ئەو بگرێتەوە کە دەفەرموێ: ﴿وَأَدْخَلْنَٰهُ فِى رَحْمَتِنَآ ۖ إِنَّهُۥ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٧٥﴾﴾الأنبياء: ٧٥، ئێمە "لوت" پێغەمبەرمان خستە ناو رەحمەتی خۆمانەوە، ئەو یەکێك بوو لە ساڵحان، خودایە ئێمە شەرم دەکەین بڵێین بمانبەرە ناو رەحمەتی خۆتەوە، چونکە ئەوە شوێن و مەقامی پێغەمبەران(علیهم السلام) و صددیقین

---

[2] لە کاتی پاکنووس کردنی ئەم کتێبەدا کە چوار ساڵ دوای ئەو پێویستی و دوعا و پاڕانەوەیە خودا وەڵامی دوعاکانی دامەوە و پێویستییەکانم بۆ جێبەجێ بوو، بۆیە لە داوا و دوعا بێهیوا مەبە و رادەستی پەروەردگاری بکە، چونکە ئەو حەکیمە و دەزانێت کەی و لە کوێ وەڵامی دوعاکانت دەداتەوە.

و صالّحانە، بەلاّم پەروەرگار تنۆكێك لە رەحمەتی بێپایانی خۆتمان بەسەردا داببارێنە و لە گێژاو و تاریکستانی گومان و دلّەڕاوكیّ قوتارمان بکە و باوەڕ و ئاینێکمان پێببەخشە کە لەلای خۆت مەقبوول بێت و شەرمەزاری لای پێغەمبەر(ﷺ) نەبین و بەر ئەو سکالاّیەی ئەو-ص- نەکەوین کە قورئان ئاماژەی پێکردووە و دەفەرموێت: ﴿وَقَالَ ٱلرَّسُولُ يَٰرَبِّ إِنَّ قَوۡمِي ٱتَّخَذُواْ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانَ مَهۡجُورٗا ٣٠﴾الفرقان: ٣٠، خودایە هۆز و نەتەوە و شوێنکەوتووانم کۆچییان لەم قورئانە کرد.. تەسلیمبوونی تەواو بە خودا مەقامێکی گەورەی باوەڕە و لەو قۆناغانەی ئیمانە کە دوای سەردەمێك لە موجاهەدە دێتە ئاراوە، خودا بە ئیبراهیم (عليه السلام) دەفەرمویّ (**أأسلمت**)، ئایا تۆ بە تەواوی بە پەروەردگار تەسلیمبوویت؟.. بەلّیّ، ئیبراهیم(علیه السلام)بە دلّ و گیان و بیرو جەستە بە خودای خۆی تەسلیم بوو بوو، تەسلیمبوونێك ئامادە بوو هاوسەرەکەی و رۆلّە تاقانەکەی لە سارایەکدا بە خودا بسپێریّ و بەجێیان بهێللێت، ملکەچبوونێك ئامادە بوو جگەرگۆشەی خۆی بۆ فەرمانی خودا سەرببڕێت..

❖ پێویستییە مادی و مەعنەوییەکانی مرۆی باوەڕدار لە بن نایەن، بۆیە بە بەردەوامی رووی دلّی دەکاتە خودای خۆیی و لەبەری دەپاڕێتەوە تاکو تێری بکات و پێویستییەکانی بۆ بەدەستبهێنێت، ئەم پاڕانەوەیە گەرەکە چەند مەرجێکی تێدا بێت:

**یەکەم:** داوایەکی رەوا و بەجێبێت و لە سنووری ئەقلّ و شەرع و ئاداب بەدەرنەبێت.

**دووەم:** داواکانی لە تەمبەلّی و دەستەوسانییەوە نەبێت.

**سێیەم:** هەموو هەولّ و کۆششێکی خۆی بخاتەگەڕ و بۆ دەستەبەر کردنی و بە ئەندازەی پێویست هۆکارەکان بگرێتەبەر.

**چوارەم:** هەموو ئەو هۆکارانەی دەبنە هۆی قبوولّنەبوونی دوعا لە ناوەوەو دەرەوەی خۆی دووربخاتەوە: لە خواردنی حەرام و بڕینی سیلەی رەحم و پێشێلکردنی مافی دەوروبەر.

**پێنجەم:** کاتە شیاوەکان بۆ دوعاکردن هەلّبژێرێت بەتایبەت بەرەبەیان و ئێواران.

**شەشەم:** رووی دلّی لە خودا بکات و بپاڕێتەوە تاکو تێکۆشانەکانی و گرتنەبەری ئەو هۆکارانە ئەنجامێکی چاوەڕوانکراوی لێوە بەرهەم بێت.

**حەوتەم:** بەردەوام بێت لە دوعا و پێداگری بکات لەسەری بە مەبەستی ئەداکردنی بەندایەتی خۆی بۆ خودای موتەعال، چونکە دوعا کرۆك و مۆخی عیبادەتە.
**هەشتەم:** پەلە نەکات و بێهیوا نەبێت لە دوعاکانیدا و کات و شوێنی هاتنی بەری دوعاکانی بە خودا بسپێرێت، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((**یستجاب لأحدکم مالم یعجل، یقول: قد دعوت فلم یستجب لي**))[3]، ((وەلامی داوای هەریەك لە ئێوە دەدرێتەوە گەر پەلە نەکات، دەڵێ: داوام کرد و وەلامم نەدرایەوە))
**نۆیەم:** دڵنیا بێت لەوەی کە ئەوەی خودا بۆ ئەوی هەڵدەبژێرێت خێرتر و چاکترە لەوەی خۆی بۆ خۆیی هەڵدەبژێرێت.

❖ گرتنەبەری ڕێگەی خودا و کەوتنە مەیدانی سەیروسلوکەوە کەسی باوەڕدار دەهێنێتە ژێر چاودێرییەکی وردی خوداییەوە، بەجۆرێك ئەم چاودێرییە لەسەری چڕدەبێتەوە خواردن و خواردنەوە و خەوتن و ئاگایی و تەواوی جووڵە و وەستانی دەکەوێتە ژێر ئەو چاودێرییە خوداییەوە، ئەو دەگاتە قۆناغێك کەمترین ویست و بڕیاری بۆ نامێنێتەوە و تەنها خودایە جووڵە بەو دەکات و ئاراستەی پێوەردەگرێت، ئەمە ئەو قۆناغەیە قورئان باوەڕدارانی پێ وەصف دەکات﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ وَمَن يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا مُّبِينًا ﴿٣٦﴾﴾ الأحزاب: ٣٦، ویست و بڕیار و هەڵبژاردن بۆ هیچ باوەڕدارێکی پیاو و ژن نییە کاتێك خودا و پێغەمبەرەکەی بڕیاریان دەرکردبێت، ئەم مەقامەی باوەڕ ئەو مەقامەیە کە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((ئیمانی کەسێك تەواو نابێت تاکو خۆشەویستی و رقی بۆ خودا نەبێت))، لێرەدا هەندێ جار سرووشتە مررۆییەکەی مرۆڤ لە حەز و لاوازی و پەلەکردن و نەزانی دەستێوەردان بۆ ئەم مەقامە دەکەن و ڕووبەڕووی دابەزینی دەکەنەوە، لەم جێگەدا تەنها چارەسەر یادی خودایە تاکو دڵ ئارام ببێتەوە و لە سرووشتە ناپەسەندەکەی نەفسی خۆی دووربکەوێتەوە..

---
٣ رواه الشيخان و أبوداوود و الترمذي و ابن ماجة رواه الشيخان و أبوداوود و الترمذي و ابن ماجة.

# حیكمەتی حەوتەم

**((يُشَكِّكَنَّكَ فِي الْوَعْدِ عَدَمُ وُقُوعِ الْمَوْعُودِ وَإِنْ تَعَيَّنَ زَمَنُهُ لِئَلاَّ يَكُونَ ذَلِكَ قَدْحًا فِي بَصِيرَتِكَ، وَإِخْمَادًا لِنُورِ سَرِيرَتِكَ))**

## راڤەی وشەكان:

**لا يشككنك:** نەتخاتە گومانەوە

**الوعد:** بەڵێن

**الموعود:** بەڵێندراو

**تعين:** دیاریكرابێت

**قدحا:** نەنگی و ناتەواوی

**بصیرتك:** بینینی چاوی دڵت، بەصیرەت

**إخمادا:** كوژانەوە و دامركانەوە

**سریرتك:** ناوەوەت، پەنهانت، نهێنیت

**واتا ((روونەدانی بەڵێندراو (با كاتەكەشی دیاری كرابێت) لە خودی بەڵێن نەتخاتە گومانەوە، بۆئەوەی ئەوە نەبێتە نەنگی بۆ بەصیرەت و كوژانەوەی نووری پەنهانت))**

## شرۆڤە:

❁ حیكمەتەكانی ئیبن عەتا بەدوای یەكدا تەواوكەری یەكترن، ئەم حیكمەتە تەواوكەری حیكمەتی شەشەمە، لە حیكمەتی شەشەمدا دوای سەردەمێك پێداگری لە دوعا بەڵێنت پێدەدرێت داوایەكت یاخود چەند دااوایەكت یان هەموو داوایەكانت جێبەجێ بكرێت و لەوانەشە كات بۆ ئەو جێبەجێكردنە دیاری بكرێت[٤]، بەڵام ئەو

---

٤ لەوانەیە كەسەكە لە خەونێكەوە بەڵێنەكەی پێدرابێت، لەسەر زمانی پێغەمبەر، یان بە خزمەتی خودای موتەعال گەیشتبێت، یان لە رێگەی موشاهەدە و ئیلهامەوە بەڵێنەكە هەڵبدرێتە ناو دڵییەوە، یان زانا و عاریف و خوداناسێك هەواڵێكی لەو جۆرە بە گوێیدا دەدات، هەموو ئەمانە بۆ ئیماندارانی پلە باڵاكانی ئیمان روودەدەن.

کاتە دێتەبەرەوە و داوایەکانت وەك خۆیان دەهەمێننەوە و جێبەجێ ناکرێن، لەم حێگەدا کەسی باوەڕدار ڕووبەڕووی تاریکستانی شك و گومان دەبێتەوە، بۆیە ئیبن عەتا لەم حیکمەتەدا باسی ئەو بارە دەروونییە دەکات و چارەسەری بۆ دادەنێت..

❁ باوەڕدار هەمیشە لەژێر تاقیکردنەوەی خودادایە، لە تاقیکردنەوەیەکەوە بۆ تاقیکردنەوەیەکی تر، تاقیکردنەوەکانی خودا بۆ مرۆڤ ئەوە ناگەیەنێت کە خودا زانست و زانیاری بە حەقیقەتی مرۆڤ نییە و دەیەوێت ڕاستێتی ئەو کەسەی بۆ دەربکەوێت، نەخێر بەڵکو بۆ ئەوەیە وێستگە لە دوای وێستگە کاژ و توێکڵی سرووشتە مرۆییەکەی (لە نەزانی و پەلەکردن و دەستەوسانی و بەرچاوتەنگی و دەستدرێژکاری) پێ فڕێبدات، خودا بەو تاقیکردنەوانە کەسی باوەڕدار پاڵفتە دەکات و لە تەواوی دەرد و نەخۆشییە دەروونییەکان و حەز و تەپوتۆزە دونیاییەکان خاوێنی دەکاتەوە، ئەگەر دوعاکردنی زۆر و نەهاتنی وەڵاَم بۆ دوعاکان (وەك لە حیکمەتی شەشەمدا هاتووە) تاقیکردنەوەیەك بێت بۆ لابردنی دەردی پەلەکردن(**العجلة**) هەروەك قورئان دەفەرموێت: ﴿وَكَانَ ٱلۡإِنسَٰنُ عَجُولٗا ١١﴾الإسراء: ١١، مرۆڤ زۆر پەلەکەرە، ئەوا لەم حیکمەتی حەوتەمەدا ڕوونەدانی بەڵێن لە کاتی دیاریکراودا بۆ بنبڕکردنی نەزانی(**جهل**) کەسی باوەڕدارە، قورئان ئاماژە بەم سروشتەی مرۆڤ دەکات و دەفەرموێت:﴿إِنَّهُۥ كَانَ ظَلُومٗا جَهُولٗا ٧٢﴾الأحزاب: ٧٢، مرۆڤ زۆر ستەمکار و زۆر نەزانە.

❁ دەبێت کەسی باوەڕدار لەو ڕاستییە گەیشتبێت کە خودا خودایە و هیچ شتێك لە خوار خوداوە ناتوانێت بەسەر خودادا زاڵ ببێت: ﴿وَهُوَ ٱلۡقَاهِرُ فَوۡقَ عِبَادِهِۦۚ وَهُوَ ٱلۡحَكِيمُ ٱلۡخَبِيرُ ١٨﴾الأنعام: ١٨، خودا بەسەر بەندەکانی و تەواوی بووندا زاڵ و دەسترۆیشتووە، کەس ناتوانێت فەرمان لەسەر خودا پێویست بکات، تەنانەت بەڵێنەکانیش ناتوانن ببنە زاڵگەیەك بەسەر خودادا، خودا لە گەورەیی خۆیەتی بەڵێنەکانی دەباتە سەر، ئەگینا خودی بەڵێن ناتوانێت ببێتە یاسایەك و ئیرادەی ڕەهای خودای موتەعال سنووردار بکات و بەسەر خودادا زاڵ ببێت، پێغەمبەر(ﷺ) لەم باوەڕە بەرز و بڵندەوە بوو دەیفەرموو((منیش نازانم دەچمە بەهەشت یان نە، مەگەر خودا لە ڕەحمی خۆیم

هەڵبژەنێت))، راستە باوەڕ و کرداری چاکە ڕێگەی ئەهلی بەهەشتە، بەلاَم پێمان وابێت ئێمە باوەڕدارین و کرداری چاکەمان ئەنجامداوە دەبێت خودا بمانخاتە بەهەشتەوە، لێرەدا بەهەڵەدا دەچین، چونکە "دەبێت" بۆ خودا بەکار ناهێنرێت و هیچ شتێك نییە لە خوارخواوە بتوانێت بەسەر ئەودا زاڵ ببێت، بەڵکو باوەڕ دەهێنین و کرداری چاکە لەسەر ئەو مەنهەجەی پێغەمبەر(ﷺ) هێناوییەتی ئەنجام دەدەین و دواتر رووی دڵمان دەکەینە دەرگای خودا و دەڵێین خودایە ئەمە ئیمان و کرداری چاکە کە تۆ بە لوتفی خۆت بە ئێمەت بەخشی و هیدایەتت داین و توانای ئەنجامدانی کرداری چاکەت پێ بەخشین، دەیسا ئەی خودایە دوای ئەوەی ئەو دوو نیعمەتە گەورەیەت پێ بەخشین (نیعمەتی باوەڕ و نیعمەتی ئەنجامدانی کرداری چاکە) دوو نیعمەتی ترمان پێ ببەخشە کە نیعمەتی قبوولکردنی ئیمان و کرداری چاکەیە و دواتریش نیعمەتی چوونە بەهەشتمان پێ عەتا بفەرموو..

❁ کەسی باوەڕدار دڵی بە بەڵێنەکانی خودا خۆشە، خودای موتەعال بۆخۆی رەحمەتی لەسەر خۆی نووسیووە﴿ كَتَبَ عَلَىٰ نَفْسِهِ ٱلرَّحْمَةَ ﴾الأنعام: ١٢، خودا لەسەر نەفسی خۆی رەحمەتی نوسیوە، ئەمە بەڵێنێکە و دڵمان پێی خۆشە، بۆخۆی(ﷻ) فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُخْلِفُ ٱلْمِيعَادَ ۝٩﴾آل عمران: ٩، خودا هەرگیز بەڵێن شکێنی لێ ناوەشێتەوە، ئێمە دڵمان بە خودا خۆی و بەڵێنەکانی خودا خۆشە نەك لامان وابێت لەسەر خودا پێویستە بە باوەڕ و کرداری چاکە بمانخاتە بەهەشتەوە، ئەو پێویستکردنە لەسەر خودا نەزانییە و نەناسینی خودایە و بەندە ناتوانێت و بۆی نییە لەسەر گەورەکەی هیچ شتێك پێویست بکات، بەڵکو هەمیشە لەبەری دەپاڕێتەوە و داوای لوتف و بەزەیی ئەو دەکات و هەر بەخششێکی بەدەستهێنا لە گەورەکەی خۆی دەناسێت، نەك لە ئازایەتی و خەمخۆری و ئەنجامدانی کاری مەزن بۆ گەورەکەی..

❁ لە قورئاندا ئاماژە بە چیرۆکی هۆزەکەی موسا(علیە السلام)کراوە کە بەهۆی دواکەوتنی گەڕانەوەی موسا—لە کاتی دیاریکراودا-بەنی ئیسرائیلییەکان دەست بە پەرستنی گوێرەکەیەك دەکەن، هەروەها ئاماژە بەوە کراوە و لە سیرەشدا هاتووە کە پێغەمبەر(ﷺ) دوای بینینی خەونێك بە یارانی دەفەرموێت:: ئەم ساڵ فەتحی مەککە

دەکەین، بەلاّم ئەو ساڵە "سولّحی حودەیبییە"ی لیّ پەیدا دەبیّت و ناچنە ناو مەککەوە، ئەم رووداوە پرسیاری لای هەندیّك لە هاوەلاّن دروست کرد، چۆن پیّغەمبەر(ﷺ) فەرمووی ئەم سالّ فەتحی مەککە دەکەین و کەچی فەتحی مەککە دواکەوت؟! لای ئەوان مانای "فەتح" تەنها چوونە مەککە بوو، بەلاّم راستییەکە ئەوەیە کە "سولّحی حودەیبییە" بوو بە هۆی فەتحی—نەك تەنها مەککە— بەلّکو سەرجەم نیمچە دوورگەی عەرەبی و دواتریش فەتحی ئایینی ئیسلام بۆ دەرەوەی جەزیرەی عەرەبی.. خودا بەلّیّن بە پیّغەمبەران(علیهم السلام) و باوەڕداران دەدات کە بەسەر بیّباوەڕاندا سەرتان دەخەم﴿ إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَالَّذِينَ آمَنُوا فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَيَوْمَ يَقُومُ الْأَشْهَادُ (٥١) ﴾غافر: ٥١، ئیّمە بیّ هیچ شك و گومانیّك پیّغەمبەرانی خۆمان و ئەوانەی ئیمان دەهیّنن -لە ژیانی دونیا و دوارۆژدا- سەردەخەین، کات تیّدەپەڕی و بیّبباوەڕان شاخیان دەکردو دەکەوتنە ئەشکەنجەدان و ئاوارەکردنی پیّغەمبەرەکە و شویّنکەوتووانی، ئەوانیش دەهەژان و دەکەوتنە پاڕانەوە و دەیانوت: کوا سەرخستنی خودا بۆ ئیّمە، وەك دەفەرمویّت:﴿ أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُوا الْجَنَّةَ وَلَمَّا يَأْتِكُم مَّثَلُ الَّذِينَ خَلَوْا مِن قَبْلِكُم ۖ مَّسَّتْهُمُ الْبَأْسَاءُ وَالضَّرَّاءُ وَزُلْزِلُوا حَتَّىٰ يَقُولَ الرَّسُولُ وَالَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ مَتَىٰ نَصْرُ اللَّهِ ۗ أَلَا إِنَّ نَصْرَ اللَّهِ قَرِيبٌ (٢١٤) ﴾ البقرة: ٢١٤، پیّتان وایە بچنە ناو بەهەشتەوە و نموونەی ئەوانەی پیّش خۆتان بەسەردا نەیەت، بەلا و ناخۆشی و هەژاری و برسیّتی و ئازار و مەینەتییان چەشت، هاتنە لەرزین و هەژان، تا پیّغەمبەرەکە و ئەوانەی لەگەلّی ئیمانیان هیّنابوو دەیانوت: کوا سەرخستنی خودا بۆ ئیّمە، دەزانن-ئا لەو کاتەکە- سەرخستنی خودا زۆر نزیکە، دەبیّ سەرخستنی خودایی بۆ ئایینەکەی و باوەڕداران کەی بیّت؟! ئەوان دەهەژان و ئەشکەنجەی ستەمکاران و دەسەلاّتی بیّباوەڕان دەیهیّنانە لەرزە، بەلاّم ئا لەو جیّگەدا کە مرۆڤی باوەڕدار لە لیّوارەکانی کالّبوونەوەی هیوا نزیك دەبیّتەوە خودا بە هانایانەوە دیّت و دەفەرمویّت: (أَلَا إِنَّ نَصْرَ اللَّهِ قَرِيبٌ) بزانن سەرخستنی خودا بۆ ئایینەکەی و پیّغەمبەرەکەی و باوەڕداران نزیکە.

۞ بەڵێنە تایبەتییەکانی  خودا کە بە باوەڕدارێکی راستەقینەی دەدات—لە رێگەی خەونێکی ساڵحەوە بێت یاخود ئاگادارکردنەوەی لە لایەن کەسێکەوە، یان هەر رێگەیەکی تر کە خودا بۆخۆی دەیزانێت- گەرەکە دروست لێی تێبگەین و بە هەڵە حاڵیبوون رێگە نەدات بە کردنەوەی دەرگای شك و گومان لە بەڵێنە  خوداییەکان، چونکە ئەوە نووری زانستی خودایی دەکوژێنێتەوە و ناوەوە بە تاریکستانی نەزانی لێوانلێو دەکات، ئەگەر دڵنیابوون نەبێت لە بەڵێنی خودا چۆن دایکی موسا دەتوانێت جگەرگۆشەکەی فڕێبداتە ناو رووبارەوە؟! ئەو دڵی بە بەڵێنە خوداییەکە خۆش بوو کە پێی وترابوو: مەترسە و خەم مەخۆ، بۆتی دەگێڕینەوە و دەیکەین بە پێغەمبەر: ﴿ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ أُمِّ مُوسَىٰٓ أَنْ أَرْضِعِيهِ ۖ فَإِذَا خِفْتِ عَلَيْهِ فَأَلْقِيهِ فِى ٱلْيَمِّ وَلَا تَخَافِى وَلَا تَحْزَنِىٓ ۖ إِنَّا رَآدُّوهُ إِلَيْكِ وَجَاعِلُوهُ مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٧﴾ ﴾القصص: ٧، بۆیە هەرچەندە لە ناوەوە هەستی بە خاڵیبوونەوە دەکرد لە رۆح ﴿ وَأَصْبَحَ فُؤَادُ أُمِّ مُوسَىٰ فَٰرِغًا ﴾القصص:١٠، بەلاّم لە بەڵێنە خوداییەکە نەکەوتە گومانەوەو ئارامی گرت و چاوەڕوان بوو تا بۆیان گێڕایەوە، ئەمەیە نموونەی باوەڕداری راستەقینە و راستگۆ لەگەڵ بەڵێنە خوداییەکاندا.

۞ ۞ ۞

# حیکمەتی هەشتەم

((إِذا فَتَحَ لَكَ وِجْهَةً مِنَ التَّعَرُّفِ فَلاَ تُبَالِ مَعَهَا أَنْ قَلَّ عَمَلُكَ فَإِنَّهُ مَا فَتَحَهَا لَكَ إِلاَّ وَهُوَ يُرِيدُ أَنْ يَتَعَرَّفَ إِلَيْكَ، أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ التَّعَرُّفَ هُوَ مُورِدُهُ عَلَيْكَ، وَالأَعْمَالَ أَنْتَ مُهْدِيهَا إِلَيْهِ؟ وَأَيْنَ مَا تُهْدِيهِ إِلَيْهِ مِمَّا هُوَ مُورِدُهُ عَلَيْكَ؟))

**راڤەی وشەکان:**

**فتح لك:** بۆ تۆی کردەوە

**وجهة من التعرف:** روویەك لە ناسین، یاخود دەرگایەك، ئاراستەیەك لە ناسینی خودا و نهێنییەکانی تر

**فلا تبال:** گوێی مەدەرێ

**قل عملك:** کردارت کەم بوو

**یتعرف إلیك:** خۆیت پێدەناسێنێت

**مهدیها:** پێشکەشی دەکەیت

**واتا ((گەر دەرگایەکی ناسینی خودات بە روودا والآبوو، گوێی مەدەرێ و بیر لەوە مەکەرەوە کە کردارەکانی تۆ کەمن، خودای موتەعال بۆیە ئەو دەرگای بە رووی تۆدا کردۆتەوە تاکو خۆیت پێ بناسێنێت، نازانی ناساندنی ئەو بۆ تۆ و کردارە پێشکەش کراوەکانیشت هەر هەموو رەوانەکراوە(مورد)ە؟!، ئەوەی تۆ پێشکەشی دەکەی لە کوێ و ئەوەی خودا بۆ تۆی دەنێرێت لە کوێ؟!))**

**شرۆڤە:**

❁ خودا بە لوتف و فەزڵی خۆی دەرگای ناسینی خۆی لە بەندەکانی دەکاتەوە، با مرۆی باوەڕدار بە هەڵەدا نەچێت و پێی وابێت بەهۆی کردارە چاکەکانی ئەوەوەیە خودا دەرگای ناسینی خۆیی لێکردۆتەوە..

۞ هەندێك جار کردارەکانی کەسی باوەڕدار زۆر کەمن و لەگەڵ ئەوەشدا دەرگای گەورەی ناسینی خودای لێدەکرێتەوە، لەم جێگەدا کەسی باوەڕدار تووشی پرسیار دەبێت: چۆن بەو کەمە لە کرداری چاکەوە ئەو دەرگا گەورەیەی ناسینی خودای لێ کرایەوە؟! ئەم پرسیارە لەو باوەڕەوە دروست بووە کە بە کرداری زۆر دەرگای ناسینی خودا دەکرێتەوە، ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کە ئەو کەسە شانی لەسەر کردارەکانی خۆی داداوە نەك تەمابوونی لوتف و بەزەیی خودا، لەم جێگەدا یەکێك لەم دوو جۆرەی خلیسکان ڕووبەڕووی ئەو کەسە دەبێتەوە، یان خۆی لێدەگۆڕێ و غروور دایدەگرێ و پێیوایە ئەو کەسێکی فرە مەزنە و تاکو ئێستا بەخۆی نەزانیوە بۆیە خودا بەم جۆرە مامەڵەی لەگەڵ دەکات، کە ئەمە دەبێتە سەرچاوەی زۆرێك لە ئافەت و نەخۆشی تر بۆ ئەو کەسە و بەخشینەکە(کردنەوەی دەرگاکە) ئەوەندە هەڵنان(**إستدراج**)ە ئەوەندە ناسینی خودانییە، یاخود قەدری کردنەوەی ئەو دەرگای خودا نازانێت و تەفسیری تری بۆ دەکات و لێی دەکەوێتە گومان و پێیوایە ئەوە شەیتانە بەو ئاراستەیەدا دەیبات و هەڵیدەخەڵەتێنێت، لە هەردوو بارەکەدا تووشی هەڵدێر دەبێت و ناگاتە حەقیقەتی نیعمەتەکە و شوکر کردنی..

۞ گەر ئەو دەرگایەمان بەڕوودا کرایەوە با تەماشای فەزڵ و گەورەیی خودا بکەین نەك ئاوڕدانەوە بە لای کردارەکانی خۆماندا، خودا بۆخۆی بەرانبەر تۆ بەبەزەییە و دەیەوێت نیعمەتی ناسینی خۆیت پێ ببەخشێت، ئەوە ئازایەتی و لێبڕانی ئێمە نییە دەرگای خودامان بە ڕوودا دەکاتەوە، بەڵکو لوتف و بەزەیی خودایە و نابێت پەی بەو نهێنییە مەزنە نەبەین..

۞ ئاوڕنەدانەوە بەلای کرداری چاکەدا مانای سوك تەماشاکردن نییە بۆ کرداری چاکە، خودا بۆخۆی فەرمانی بە ئەنجامدانی کرداری چاکە کردووە ﴿ **وَقُلِ ٱعۡمَلُواْ فَسَيَرَى ٱللَّهُ عَمَلَكُمۡ وَرَسُولُهُۥ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ** ﴾التوبة:١٠٥، بڵێ کرداری چاکە ئەنجام بدەن، خودا و پێغەمبەر و باوەڕداران کاروکردەوەکانتان دەبینن، ﴿**وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ** ﴾البقرة: ٢٥، مژدە بدە بەوانەی ئیمان دەهێنن و کار و کردەوەی چاکە ئەنجام

دەدەن، بۆیە میزانی دروست ئەمەیە کە کرداری چاکە ئەنجام بدەین و رووی دڵمان بکەینە خودا تاکو قبووڵی بفەرمویّ، ئیتر دەرگای ناسینی خودا چەندە گەورە و مەزن بێت پەیوەستە بە لوتف و بەزەیی خوداوە نەك کردارەکانی ئێمەوە..

۞ هەندێك جار کردارێکی کەم بە نییێت و ئیخلاصی مەزنەوە لە لای خودا زۆر مەزن دەبێت، ئەگەر چەندێتی کردار چۆنییەتی کرداری لەگەڵ نەبێت کارێکی زۆر و بۆرە و خاوەنەکەی تەنها ماندووبوونی بۆ دەمێنێتەوە﴿ عَامِلَةٌ نَّاصِبَةٌ ﴿٣﴾ ﴾ الغاشية: ٣، کارکەری ماندوو، نییێت و ئیخلاص بریتییە لە چۆنییەتی کردار..

۞ خۆ ناساندنی خودا بە تۆ لە خوداوەیە و ئەنجامدانی کرداری چاکە لە تۆوەیە، تۆ چەندیت بەرانبەر مەزنی خودای موتەعال کردارەکانی تۆش ئەوەندەیە بەرانبەر بە خەلاّتەکانی خودا، خودا مەزنە و خەلاّتەکانیشی مەزنن، ئێمە بەندەیەکی هەژار و بچووکین و کردارەکان و بەخششەکانیشمان وەکو خۆمان بچووکن، لە مەزنی خوداوە سەیری خەلاّتەکانی بکە و لە بچووکی و هەژاری خۆتەوە سەرنجی کردارە چاکەکانت بدە، مرۆڤێك دەتوانێت هەزاران تەن گەنم بۆ شارە مێروولەیەك هەڵبڕێژێت، مێروولەیەکیش دەتوانێت یەك دەنکە گەنم بە دەمییەوە بگرێت، ئەم پەندە بەسە بۆ کەسی خاوەن هۆش، ئەی دەبێت مرۆڤ بەرانبەر بە خودا لە کوێدا بوەستێت؟!

۞ ۞ ۞

# حیكمەتی نۆیەم

((تَنَوَّعَتْ أَجْنَاسُ الأَعْمَالِ لِتَنَوُّعِ وَارِدَاتِ الأَحْوَالِ))

## راڤەكردنی وشەكان:

**تنوعت:** هەمەچەشن بوو(جۆراوجۆر بوو)

**أجناس:** كۆی(جنس) واتە رەگەزەكان، شێوەكان

**واردات:** كۆی(**واردة**)یە، واتە ئەو هاتووە مەعنەوییانەی روو لە دڵی باوەڕدار دەكەن

**الأحوال:** كۆی(حال)ە، واتە ئەو دۆخە مەعنەوییەی باوەڕدار تێی دەكەوێت و بەهۆیەوە دڵی دەكەوێتە وەرگرتنی واریدات.

**واتا ((جۆراوجۆری لە كار و كردەوەكاندا بەهۆی جۆراوجۆری واریداتی حاڵەوەیە))**

## شرۆڤە:

❁ لە كتێبی"**المصطلحات الصوفية**"دا لەسەر زاراوەی "وارد" دەڵێت: ((وارد بریتییە لە هەر شتێك لە "مانا" كە روو لە دڵ دەكات بەبێ ئەوەی كاری مرۆڤی تێدا بێت)).

❁ دڵ لەتیفەیەكە كە جەستە و رۆحی هەیە، جەستەكەی روو بە جیهانی خەلقە و بریتییە لەو پارچە گۆشتەی دەكەوێتە لای چەپی مرۆڤ و لەناو قەفەسەی سنگیدایە، رۆحی دڵ سەر بە جیهانی ئەمرە و روو بە مەلەكووتە.

❁ سەراپای بوون نغرۆی ناو شەپۆلە مەعنەوییەكانە كە لە عەرشی خودای موتەعالەوە دادەبارێن بەسەر هەموو بووندا.

❁ كاتێك دڵی باوەڕدار ساز دەبێت و دەكەوێتە گەردەش و گەڕان واریدات وەردەگرێت و حاڵ و دۆخێكی تایبەت بە كەسەكە دەبەخشێت.

❁ **كە مرۆڤی باوەڕدار بەهۆی وەرگرتنی واریداتەوە حاڵی گۆڕا كردەوەكانیشی دەگۆڕێن.**

۞ جۆراوجۆری لە واریداتی حاڵدا کار و کردەوەی جۆراوجۆر بەرهەم دەهێنێت.

۞ کرداری چاکە(**الأعمال الصالحات**) گەر بۆ خودا و بەپێی ئەمری خودا و لە شوێنکەوتنی پێغەمبەرەوە(ﷺ) ئەنجام بدرێن خاوەنی رۆحی تایبەت بەخۆیانن، رۆحی کردار سەر بەجیهانی ئەمرە و لەشێوەی واریداتدا دادەبارێنە سەر دڵی کەسی باوەڕدار، جۆراوجۆری ئەو شەپۆلە رۆحییانەیە جۆراوجۆری کار و کردەوەی چاکەی لێدەکەوێتەوە.

۞ هەتا شەپۆلە هاتووەکان (واریدات) تێر و تەواوتر بن کردارەکان جۆراوجۆرتر دەبن، بۆیە هەمەجۆری لە کرداری چاکەدا نیشانەی باوەڕی تێر و تەواوە، لە شەودا شەونوێژ دەکات و لە رۆژدا بەیادی خوداوە تێدەکۆشێت و ژیان ئاوەدان دەکاتەوە.

۞ خۆ کورتهەڵهێنان لەسەر یەك جۆر کردار نیشانەی کەمی و لاوازی واریداتە، بۆیە لەو بارەدا کەنارگرتن بۆ خۆبەهێزکردن لەسەر کەسی باوەڕدار پێویستە، تاکو جارێکی تر بگەڕێتەوە مەیدانی کار و بەهۆیەوە هەمەچەشن کرداری چاکە ئەنجام بدات.

۞ ۞ ۞

# حیکمەتی دەیەم

**((الأَعْمَالُ صُوَرٌ قَائِمَةٌ، وَأَرْوَاحُهَا وُجُودُ سِرِّ الإِخْلَاصِ فِيهَا))**

## راڤەی وشەکان:

**الأعمال:** کۆی(عمل)ە، کردەوەکان

**صور:** کۆی (صورة)یە، وێنە، رووالەت، بەرجەستە

**قائمة:** وەستاو، بینراو

**أرواحها:** کۆی (روح)ە، رۆح، جەوهەر، کرۆك

**سر:** نهێنی

**الإخلاص:** دڵسۆزی، پاڵفتەبوون و یەکلابوونەوە بۆ خودا

**واتا ((کردارەکان وێنە و رووالەی وەستاو و بەرجەستەن، رۆح و جەوهەری ئەو کردارانە بریتییە لە نهێنی ئیخلاص تیایاندا))**

## شرۆڤە:

❁ پێشتر لە حیکمەتی نۆیەمدا ئاماژەی بە "واردات" کرد کە دۆخەکان(**الأحوال**) دەگۆڕن و لەوێشەوە گۆڕان بەسەر کار و کردەوەکاندا دەهێنن.

❁ لەم حیکمەتی دەیەمەدا باس لەوە دەکات کە کردار دوو رەهەندی هەیە: رەهەندێکی بەرجەستە و بینراو کە بریتییە لە جەستەی کردارەکە، لەگەڵ رەهەندێکی نەبینراو کە رۆح و جەوهەری کردارەکەیە، رۆح و جەوهەری کردار بریتییە لە ئەو نهێنییەی لە نێوان بەندە و خودادایە، ئەوەش بریتی لە هەوێنی ئیخلاص.

❁ دوای پاڵفتەبوون و خاوێنبوونەوەی مرۆڤ لە حەز و کردەوە ناپەسەندەکانی دەرەوە و ناوەوە ئیخلاص سەرهەڵدەدات، تا پاك نەبییەوە بۆ خودا ساغ نابییەوە، تا بەشی خۆت لە خۆتدا هەبێت ناگەیە سەر کانیاوی ئیخلاص، تا هەوێنی ئیخلاصیش

بەدەست نەهێنیت شیری کردەوەکانت نامەیەت، بەڵکو خراپ هەڵدەگەڕێن و بەر هەڕەشەی ئەو ئایەتە دەکەویت کە دەفەرمویت:﴿ **وَقَدِمْنَآ إِلَىٰ مَا عَمِلُوا۟ مِنْ عَمَلٍ فَجَعَلْنَـٰهُ هَبَآءً مَّنثُورًا (٢٣)** ﴾الفرقان: ٢٣، کردارەکانیان دەکەین بە تۆزی بەربا، بۆچی؟ چونکە باوەڕی دامەزراو و هەوێنی ئیخلاص لە پشتیانەوە نەبووە، واتە کردەوەکانیان بێ ڕۆحە و جگە لە جەستەیەکی مردوو هیچی تر نین، ئەوانە تەنها ماندووبوونیان بۆ ماوەتەوە، بۆیە قورئان ئەو جۆرە کەسانە بە﴿ **عَامِلَةٌ نَّاصِبَةٌ (٣)** ﴾ الغاشیة: ٣، واتە کارکەری ماندوو ناودەبات، خودا بمانگێڕێت لەوانەی بە نهێنی ئیخلاص کار و کردەوەکانیان لێوانلێو دەکەن، **أللهم آمین یا رب العالمین**.

❁ وەك لە فەرموودەی شیرینی پێغەمبەردا(ﷺ) هاتووە "خودا تەماشای جەستە و وێنەکان ناکات، بەڵکو سەیری دڵەکان دەکات"، دڵەکان شوێنی ئیخلاص و یەکلابوونەوەن بۆ خودا(ﷻ)، ئەو سەیر دەکات بزانێت قسە و گوفتارەکان و کار و کردەوەکان بۆ ئەو ئەنجامدراوە، یان بەشی حەز و ئارەزووی مرۆڤی تێدایە، خودا بێنیازە لە هاوەڵ بۆ دانان، جا هاوەڵەکە حەزی مرۆڤ بێت یان شتێکی تر﴿ **أَفَرَءَيْتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَـٰهَهُۥ هَوَىٰهُ (٢٣)** ﴾الجاثیة: ٢٣، ئەوانە دەبینیت کە حەز و ئارەزووی خۆیان کردووە بە خودا و دەیپەرستن.. حەزپەرستی هیچی لە بتپەرستی کەمتر نییە، هەردووکیان کراون بە مەعبوود و لە جێگەی خودا دانراون.

❁ **خوداناسان دەڵێن:** ئیخلاص نهێنییەکە لە نێوان بەندە و خودادا، نەفس پێی نازانێت تێکی بدات، شەیتان نایبینێت تا دەستی تێبخات، فریشتەکانیش لێی بێئاگان تاکو بۆی بنووسن، تەنها و تەنها خودا پێی ئاگادارە و لێی ئاگادارە و لەلای خۆی پاراستوویەتی و لە ڕۆژی دواییدا ئەو چەکە گرانبەهای بۆ ڕادەکێشێت و پاداشتی دەداتەوە، بۆیە هەندێکی کەم لە کرداری چاکە بە ئیخلاصەوە کەسی باوەڕدار بەهۆیەوە ڕزگاری بەدەست دەهێنێت، بەڵام کردارگەلێکی زۆری بێ ئیخلاص لە ڕۆژی دواییدا مرۆڤ گیرۆدە دەکەن.

❁ کاتێك کەسی باوەڕدار نهێنی ئیخلاص بەدەست دەهێنێت لەگەڵ مرۆڤ و ژیان و

گەردووندا ئاشتدەبێتەوە، ئەم تەبایی و ئاشبوونەوەیە مرۆڤ و ژیان و گەردوون بەئاراستەیەکدا دەبات کە خزمەت بە ئەو و ژیانی ئەو بکەن، ئەمەش مەزنترین سەرمایەیە بەدەست مرۆڤی باوەڕداری خاوەن ئیخلاصەوە.

۞ ئیخلاص پلەی جۆراوجۆر و ئاستی لەیەکتر جیاوازی هەیە، سەرەتای ئیخلاص ئەوەیە بۆ خۆ رزگارکردن لە ئاگر و بەدەستهێنانی بەهەشت کردارەکانت ئەنجام بدەیت، ناوەڕاستی ئیخلاص بریتییە لە ئەنجامدانی کرداری چاکە، چونکە خودا فەرمانی پێداوە، ئاستی سێیەم لە ئیخلاص لەو جێگەدایە کە کرداری چاکە بەخۆشەویستی خوداوە ئەنجام بدەیت، تۆ خودات خۆشدەوێت و لەبەر خۆشەویستی ئەوە کردارەکانت بە ئەنجام دەگەیەنیت، وەك رابیعەی عەدەوی لە دێڕێك هۆنراوەدا دەڵێت:

**ليس لي بالجنان و النار حظ**
**أنا لا أبتغي بحبي بديلا**

(بەشم نییە لە بەهەشت و ئاگر، بەخۆشەویستییەکەم جگە لەخودا هیچ داوایەکی تــرم نییە).

لوتکەی ئیخلاصیش ئەوەیە کە ئیخلاصەکەت لە خودا بناسیت، خودا بۆ خۆی و بە فەزڵی خۆی تۆی گێڕاوە لە موخلیصان، واتە پێشەکی لە موخڵەصین(**المخلصين**-بفتح اللام) بووی ئەوجا چوویە ریزی موخلیصیینەوە(**المخلصين**-**بكسر اللام**)، بۆیە خودای موتەعال کە باسی پێغەمبەران و چاکان دەکات دەفەرموێت: ئەوانە بەندەی موخڵەص بوون: بۆ رزگارکردنی یوسف(عليه السلام)لە داوی ئافرەتانی مصر دەفەرموێت: ﴿ وَلَقَدْ هَمَّتْ بِهِۦ وَهَمَّ بِهَا لَوْلَآ أَن رَّءَا بُرْهَـٰنَ رَبِّهِۦ ۚ كَذَٰلِكَ لِنَصْرِفَ عَنْهُ ٱلسُّوٓءَ وَٱلْفَحْشَآءَ ۚ إِنَّهُۥ مِنْ عِبَادِنَا ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿٢٤﴾ ﴾ يوسف: ٢٤، لە سوورەتی (**الصافات**)دا بەندەکانی خۆی لەچەندین جێگەدا بەموخەڵەصین(**المخلصين**) ناودەهێنێت: ﴿ إِلَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿٤٠﴾ ﴾ الصافات: ٤٠، جگە لەو بەندانەی خودا کە خودا بۆ خۆی پاك و پاڵفتەی کردوون و لە دەستی شەڕی نەفس و شەیتان قوتاری کردوون، شەیتانیش —لەعنەتی خودای لێبێت- بەڵێن بە خودا دەدا کە هەرچی مرۆڤە گومڕای بکات جگە لەو بەندانەی کە

موخلەصن و خودا هەڵیان دەبژێرێت و پاڵفتەیان دەكات ﴿إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ ٱلْمُخْلَصِينَ ۝٤٠﴾ الحجر: ٤٠، لوتكەی ئیخلاص ئەوەیە هەموو كار و كردەوەكانت لە خوداوە ببینیت، بۆ كردارە چاكەكانت شوكری خودا بكەی و شوكرەكەشت لە خودا بناسیت، بۆ بێئاگایی و تێكەوتنەكانیش رازی بیت بەو قەدەرەی بەسەرتدا گوزەر دەكات و دڵگران بیت بەو بێئاگایی و تێكەوتنە، لەوانەیە كەسێك بپرسێت و بڵێت: چۆن رازی ببم بەو قەدەری بێئاگاییە و لەگەڵ ئەوەشدا دڵگران ببم بە بێئاگاییەكە؟! ئەم بابەتە بابەتێكی ورد و هەستیارە تاكو پێ لە قۆناغی چوارەمی ئیخلاص نەنێین تێیناگەین، ئەوە خودایە ئێمە و كردارەكانی ئێمەی خولقاندووە ﴿ وَٱللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ ۝٩٦﴾ **الصافات: ٩٦،** بۆیە لەسەر هەموو كردارەكان چاك و خراپ رەزامەندی بۆ قەدەرەكە نیشان بدە، ئەمە رووی كردار وەك لە خوداوە ببینرێت و تەماشا بكرێت، بەڵام رووی دووەمی وەك ئەوەی تۆی مرۆڤ كەسبی ئەو كردارە خراپەت كردووە پێویستە تەوبە و ئیستیغفاری لێ بكەی و تەوبە و ئیستیغفارەكەش لە خودا بناسە و شوكری بكە كە وای لێكردی لەسەر گوناه بەردەوام نەبیت، دەركی ئەم حەقیقەتەش دیسان لە خوداوەیە و پێویستە لەو بناسرێت و شوكری بكرێت.

# حیكمەتی یازدەیەم

((ادْفِنْ وُجُودَكَ فِي أَرْضِ الْخُمُولِ، فَمَا نَبَتَ مِمَّا لَمْ يُدْفَنْ لاَ يَتِمُّ نِتَاجُهُ))

## راڤەكردنی وشەكان:

**إدفن:** بیشارەوە، بیخە ژێر خاكەوە

**وجودك:** بوونت، نەفست، ناوبانگت

**أرض الخمول:** زەوی خامۆشیی

**فما نبت:** ئەوەی سەوز دەبێت

**لم يدفن:** نەشاررێتەوە

**لا يتم نتاجه:** بەر نادات

**واتا ((بوونی خۆت لە زەوی خامۆشیدا بشارەوە، چونكە ئەوەی دەڕوێت گەر لە زەویدا نەشارابێتەوە هیچ بەروبوومێك نادات))**

## شرۆڤە:

ئیبن عەتا لە حیكمەتەدا ئاماژە بەوە دەدات كە چەندە رۆحی ئیخلاص بۆ كار و كردەوەكانمان پێویستە، لێرەشدا وەلاّمی ئەو پرسیارە دەداتەوە كە لەسەر حیكمەتی دەیەم دروست دەبێت: چۆن بگەمە رۆحی ئیخلاص؟ گەر بزانم كردارەكانم بەشی حەز و ئارەزووی تێدایە چۆن خۆم لەو حەزانە خالّی بكەمەوە و نهێنی ئیخلاص لە كاروكردەوەكاندا بەجێبهێنم؟ لەم حیكمەتەدا ئیبن عەتا چارەسەر دەخاتە روو، چارەسەرەكەش خۆكەناردانە لە ناو و ناوبانگ و خەریكبوون بەخۆوە تا خاڵیبوونەوە لە حەزە دزێوەكان و دەستەبەركردنی رۆحی ئیخلاص، چونكە ناو و ناوبانگ بەر لە خاوێنبوونەوە و گەیشتن بە رۆحی ئیخلاص گەورەترین ئافەتە بۆ باوەڕ.

❁ هەموو پێغەمبەران(عليهم السلام) سەردەمێك گۆشەنشین بوون و خۆیان لە دونیای دەرەوە دابڕیوە، موسا (عليه السلام)دە ساڵ شوان بووە و بەدەشت و سارادا سووڕاوەتەوە، عیسا (عليه السلام)شوانی مەڕ بووە، پێغەمبەرمان **محەمەد** (ﷺ) لە ئەشکەوتی حیرادا کەنارگیر بووە، ئەم کەنارگیرییە بۆ خاوێنبوونەوە یان ئامادەکردن بووە، ئامادەکردن بۆ رۆڵ و ئەرکی پەیامداری، لە ئیسلامدا سوننەتی ئیعتیکاف رێگەیەکە بۆ خۆ خاوێنکردنەوە و گەڕانەوە بۆ ناو ئامێزی یادی خودا و بەدەستهێنانی ئیخلاص، خەڵوەت و گۆشەگیریش بۆ سەردەم و کاتێکی دیاریکراو رێگەیەك بووە خوداناسان پەنایان بۆ بردووە بەتایبەت لەو کاتانەدا کە بارەشی فیتنە هەڵدەکات و شەوەزەنگی تاریکی گوناه هەموو سووچێك دەئاخنێت.

❁ ئەوەی کە دەڕوێت مەرج نییە بەروبوومی هەبێت، تەنها ئەو رووەك و درەختانە بەروبووم دەدەن کە رەگوریشەیان بە زەویدا داکوتیوە، قورسایی درەخت و بەری درەخت رەگ و ریشکێکی پێویستە کە بە ناخی زەویدا ریشەی داکوتیبێت، بۆیە خودای موتەعال نموونەی حەق بەدرەختی رەگوریشکدار دەهێنێتەوە و باتڵیش بە رووەکێك دەشوبهێنێت کە بێ ریشەیە:﴿ أَلَمْ تَرَ كَيْفَ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا كَلِمَةً طَيِّبَةً كَشَجَرَةٍ طَيِّبَةٍ أَصْلُهَا ثَابِتٌ وَفَرْعُهَا فِى ٱلسَّمَآءِ ﴿٢٤﴾ تُؤْتِىٓ أُكُلَهَا كُلَّ حِينٍۭ بِإِذْنِ رَبِّهَا ۗ وَيَضْرِبُ ٱللَّهُ ٱلْأَمْثَالَ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٢٥﴾ وَمَثَلُ كَلِمَةٍ خَبِيثَةٍ كَشَجَرَةٍ خَبِيثَةٍ ٱجْتُثَّتْ مِن فَوْقِ ٱلْأَرْضِ مَا لَهَا مِن قَرَارٍ ﴿٢٦﴾ ﴾ إبراهيم: ٢٤– ٢٦، نابینی چۆن خودا نموونەی کەلیمەی پاك و شیرین و جوان وەك درەختێکی پاك و شیرین و جوان دەهێنێتەوە، رەگوریشکی لە ناخی زەویدا جێگیرە و لق و پۆپەکانی روویان لە ئاسمان کردووە، بە هەمیشەیی بەر دەدات، خودا نموونە بۆ خەڵکی دەهێنێتەوە تاکو بە بیریان بهێنێتەوە و بیربکەنەوە، نموونەی وشەی پیس و ناشیرینیش وەك درەختێکی پیس و ناشیرین وایە، رەگ و ریشکی نەچووە بە ناو زەویدا و لەسەر رووی زەوییە و ناتوانێت جێگیر ببێت و خۆی رابگرێت..

لەم حیکمەتەشدا ئیبن عەتا ئاماژە بەوە دەدات گەر دەتەوێت ئیمانی راستەقینە بەدەست بهێنیت و لە ریا و رووپامایی پاك ببیتەوە و نهێنی ئیخلاص بەدەستبهێنیت ئەوا وەك رووەکێکی قەشەنگ بنج دابکوتە و رەگ و ریشکت بەناخی زەویدا شۆڕبکەوە

تاکو بتوانی بەر بدەی و رەشەبای حەزەکان و فیتنە و فێڵی شەیتان لە رەگوریشك دەرتنەهێنێت.

# حیکمەتی دوازدەیەم

**((مَا نَفَعَ الْقَلْبَ شَيْءٌ مِثْلُ عُزْلَةٍ يَدْخُلُ بِهَا مَيْدَانَ فِكْرَةٍ))**

## راڤەکردنی وشەکان:

**عزلة:** کەناگیریی

**میدان فکرة:** مەیدانی بیرکردنەوە

**واتا ((هیچ شتێك بەئەندازەی کەناگیری بۆ دڵ بەسوود نییە کە بەهۆیەوە بچێتە ناو مەیدانی بیرکردنەوە))**

## شرۆڤە:

۞ کەنارگیری یاخود گۆشەنشینی لەخۆیدا پێویست نییە، بەڵکو تەنها هۆکارێکە بۆ بەدەستهێنانی ئامانجێك، تۆ دەبێت دوو جار گۆشەنشین ببیت، جارێك جەستەت لە دەوروبەر دادەبڕیت و تێکەڵ بوون زۆر کەم دەکەیەوە، جارێکیش هەست و نەست و بیرکردنەوەت لە خەڵکی دادەبڕی و لەبیری خۆتیان دەبەیەوە، ئەوەی یەکەمیان وشەی (**عزلة**)ی بۆ بەکارهێناوە، ئەوەی دووەمیش بە تەعبیری (**یدخل بها میدان فکرة**) تەعیری لێداوە.

۞ ئەوانەی کە بەرهەمی تێکەڵی و بەدەستهێنانی ناو و ناوبانگ نەخۆشی روو لە دڵ و دەروونیان دەکات کەنارگیری لەسەریان پێویستە، ئەم کەنارگیرییە بۆ کەوتنە ناو مەیدانی بیرکردنەوەیە لە خۆ و لەوێشەوە چارەسەری نەخۆشییەکانی خۆ لە خۆشەویستی بۆ پلە و پایە و حەزی ناوبانگ و خۆدەرخستن و لوتبەرزی و فەخرکردن بە خۆوە.

۞ کەسانێك هەن بە بیری خۆیان چوونەتە ناو خەڵوەتەوە و خۆیان لە خەڵکی کەناگیر کردووە، بەڵام تەنها بە جەستە لە خەڵکی دابڕاون ئەگینا هەست و ناخیان لەگەڵ خەڵکیدایە، گفتوگۆیان لەگەڵ دەکەن، لە مەجلیسەکانیاندا دادەنیشێت، چێژ دەبینێت

لەوەی کە خەڵکی ئەو بە زاهید و خەڵوەنشین دەزانن، هەموو ئەمانە کەنارگیرییەکەی لە مانا و مەرامی دروست خاڵیدەکەنەوە، بەڵکو لە جێگەی پاکبوونەوە دەرد و ئافەتی زۆرتر روو لە دەروونی دەکەن.

۞ مەیدانی بیرکردنەوە بریتییە لە گەڕان بەدوای خۆدا، تۆ تا خۆت نەدۆزیەوە خودا نادۆزییەوە، تا حەزەکانی خۆت بەسەرتدا زاڵ بن خۆتت نەبینیوەتەوە، مەیدانی بیرکردنەوە بە خۆپشکنین دەستپێدەکات، لەسەرەتاوە چەند پرسیارێك لە خۆت دەکەی و دەپرسیت: ئایا من بەندەی خەڵکیم، یان بەندەی خۆ یان بەندەی خودا؟ ئەرکی من لەم ژیانەدا چییە؟ بۆ ئەوە هاتووم خەڵکی لە خۆم رازی بکەم یان حەزەکانی خۆ تێر بکەم، یان رەزامەندی خودا بەدەست بهێنم؟ ئەو کۆسپ و لەمپەرانە چین ناهێڵن ببم بە بەندەیەکی راستەقینەی خودا؟ چۆن ئەو لەمپەرانە ببڕم؟ بە یارمەتی خودا نەخۆشییەکانی دڵ و دەروونت دەبینییەوە، بۆ چارەسەریش روو لە خودا بکە و خۆتی رادەست بکە و بەبەردەوامی لەبەری بپاڕێوە تاکو لەو نەخۆشییانە رزگارت بکات، لەم مەیدانەدا ژیان لەگەڵ قورئان و فەرموودەی شیرینی پێغەمبەر(ﷺ) و ئامۆژگاریی خوداناسانت لەبیر نەچێت، چارەسەرەکان هەنگاوی کردارییان پێویستە، تۆ دەبێت پێچەوانەی حەزەکانت هەنگاو هەڵبگریت، ئەو حەزە ناشەرعییانەی دنیایەك ئافەت و دەردیان لە ناختدا خولقاندووە.

۞ وتمان کەنارگیریی و گۆشەگیری لە خۆیدا پێویست نییە، بۆیە هەر کاتێك سازی و پاکی رووی لە ناخی مرۆڤ کردەوە و نهێنی ئیخلاصی بەدەستهێنایەوە پێویستە بگەڕێتەوە سەر ئەو ئەسڵەی کە هەموو پێغەمبەران لەسەری بوون، ئەوەش ژیانە لەگەڵ مەردوومان‌دا و بانگکردنیان بۆ چاکە و چاکسازی لەسەر زەوی.

۞ ۞ ۞

# حیكمەتی سیازدەیەم

((كَيْفَ يُشْرِقُ قَلْبٌ صُوَرُ الأَكْوَانِ مُنْطَبِعَةٌ فِي مِرْآَتِهِ؟ أَمْ كَيْفَ يَرْحَلُ إِلَى اللهِ وَهُوَ مُكَبَّلٌ بِشَهَوَاتِهِ؟ أَمْ كَيْفَ يَطْمَعُ أَنْ يَدْخُلَ حَضْرَةَ اللهِ وَهُوَ لَمْ يَتَطَهَّرْ مِنْ جَنَابَةِ غَفَلاَتِهِ؟ أَمْ كَيْفَ يَرْجُو أَنْ يَفْهَمَ دَقَائِقَ الأَسْرَارِ وَهُوَ لَمْ يَتُبْ مِنْ هَفَوَاتِهِ؟))

**واتا ((چۆن دڵ ڕۆشن دەبێتەوە لەكاتێكدا وێنەی بوونەكان لە ئاوێنەكەیدا نەقشیان گرتووە، چۆن دەتوانێت بۆ لای خودا كۆچ بكات كە ئەو بە ئارەزووەكانی كۆت و پێوەند كراوە؟، چۆن بەتەمایە بچێتە خزمەتی خودا لە كاتێكدا لە لەشپیسی بێئاگاییەكانی پاك نەبووەتەوە؟ چۆن دەبێت هیوای تێگەیشتنی نهێنی وردی هەبێت كە هێشتا لە هەڵە و تێكەوتنەكانی تەوبەی نەكردووە؟))**

**ئەم حیكمەتە چەند بەشێكە و ئێمەش بەش بەش لەسەری دەوەستین:**

((كَيْفَ يُشْرِقُ قَلْبٌ صُوَرُ الأَكْوَانِ مُنْطَبِعَةٌ فِي مِرْآَتِهِ؟))

## ڕاڤەكردنی وشەكان:

**يشرق:** ڕۆشن دەبێتەوە

**صور:** كۆی (**صورة**)یە واتە وێنە

**الأكوان:** كۆی (كون) واتە گەردوون، بوون

**منطبعة:** نەقشكراو

**مرآة:** ئاوێنە

## شرۆڤە:

❁ لەم حیکمەتەدا ئیبن عەتا باس لە ئافەتی تێکەڵبوون بە دەرەوە دەکات و دەیەوێت پێمان بڵێت کە هەتا ناخی مرۆڤ پڕبێت لە وێنەی مەخلوق ئاوێنەی دڵ ڕۆشن نابێتەوە و ناتوانێت نووری ئەسمائو صیفات پەخش بکاتەوە، جا ئەو تێکەڵبوونە تێکەڵبوونی جەستەیی بێت یاخود بە هەست و نەست لەگەڵیاندا بژی.

❁ لە کەنارگیرییدا مرۆڤ یەکلادەبێتەوە بۆ تێڕامان لە خۆ و پاککردنەوەی ئاوێنەی دڵ لە تەپوتۆزی دونیا و ئەوەی تێیدایە، خەلق -خۆت بیت یان غەیری خۆت- پەردەیەکە لە نێوان تۆ و خودادا، هەتا ئەو پەردە ئەستوورە لانەدرێت نووری خودا نایەتە ناو ژووری دڵتەوە.

❁ کاتێك ئاوێنەی دڵ پاك دەبێتەوە نووری ئەسمائو صیفاتی لەسەر دەشکێتەوە، هەرچی گەردیلەیی وجوودی مرۆڤە نوورانی دەبێت، دڵ وێستگەی وەرگرتنی نوورە و بەسەر هەموو لەتیفەکانی تردا دابەشی دەکات، ئەم نوورانی بوونە جێگەی مشتومڕی زۆرێك لەو زانایانەیە کە قسە لە دڵ و نوورانی بوونی دڵ دەکەن، هەندێکیان نووری ناو ئاوێنەکەیان لێ دەبێت بە نووری حەقیقی و جیاوازی ناکەن لە نێوان نووری ئەسمائو صیفات و نووری بینراوی ناو ئاوێنەی دڵ، هەندێکیان خۆیان لێ دەبێت بە نوورەکە و جۆرێك لە تێگەیشتنی هەڵە سەرهەڵدات.

((أَمْ كَيْفَ يَرْحَلُ إِلَى اللهِ وَهُوَ مُكَبَّلٌ بِشَهَوَاتِهِ؟))

## راڤەی وشەکان:

**یرحل الی الله:** کۆچ دەکات بۆ لای خودا

**مکبل بشهواته:** بەئارەزووەکانی کۆت و پێوەند کراوە

**شرۆڤە:**

۞ زۆرن ئەو کۆت و پێوەندانەی دەیانەوێت ڕێبواری ڕێگەی خودا لە گەردەش و گەڕان بوەستێنن، لەوانە: حەزەکان (**الشهوات**): حەزی دەسەڵات و خۆسەپاندن بەسەر خەڵکیدا، حەزی خۆدەرخستن و ناو و ناوبانگ، حەزی ماڵ و سامان و کۆکردنەوە و دەستبەسەرداگرتنی، حەزی ئافرەت و رابواردن، حەزی خواردن و خواردنەوە و چێژوەرگرتن، هەموو ئەم حەزانە لە سنوورێکی دیاریکراودا ئیسلام ڕێگەی پێداون، بەلاّم سنووربەزێنی لەم حەزانەدا دەبێتە کۆتوپێوەند و گەشتیاری ڕێگەی خودا لە جووڵە دەخات.

۞ ڕۆیشتن بەرەو خودا ڕۆیشتنی دڵە نەك جەستە، ئەم گەردەشە ڕۆحییە دوای تەمەنێك لە گوێڕایەڵی و بەندایەتی دروست بۆ خودا دێتە ئاراوە، لەوانەیە کەسێك هەموو تەمەنی بەفیڕۆ بدات و وابزانێت بەرەو خودا هەنگاو هەڵدەگرێت لەگەڵ ئەوەشدا هەنگاوێك لە خودا نزیك نەبووبێتەوە، ئەڵێن پیاوێك هاتە خزمەتی شێخی گەیلانی و وتی (قوربان من ڕێگەی دوورودرێژم بڕیوە تا هاتوومەتە لای تۆ!) ئەویش لە وەلاّمیدا فەرمووی(ئەم ڕێگەیە نەوەستاوە لەسەر بڕینی ڕێگەی دوور و درێژ، یەك هەنگاو لە حەزەکانی نەفست دووربکەوە ئەوەی بەدوایدا دەگەڕێیت دەیبینییەوە، ڕۆیشتن ڕۆیشتنی دڵە)، لێرەوە کۆتایی قسەکەی شێخی گەیلانی بوو بە دروشمێك و هەموو ڕێبوارانی ڕێگەی خودا دووبارەیان دەکردەوە(**السير سير القلب**)، ڕۆیشتن ڕۆیشتنی دڵە.

۞ لەپاڵ دەستبەرداربوون و وازهێنان لە حەزەکان دوو خاڵی تر لە پێویستییەکانی ڕۆیشتن و کۆچکردنە بەرەو خودا، ئەو دوانەش: (زانست و هاوەڵی)ن، سەرەتاکانی زانست بریتییە لە زانست بە پایەکانی ئیسلام لە باوەڕ و دروشمەکانی پەرستن لە نوێژ و ڕۆژ و حەج و زەکات و پاشان زانست بە حەلاڵ و حەرام، ناوەڕاستی زانست بریتییە لە قووڵبوونەوە لە سەرەتاکانی زانستدا بەجۆرێك مانا و مەرامی هەریەك لەو بەشانەی زانست بەدروستی بژنەوێت و پەی پێ ببات، لوتکەی زانست بریتییە لە ناسین و

زانینی ڕێگەی "بەرەو خودا چوون" بەجۆرێك وردەكارییەكان و كۆسپ و لەمپەر و هەڵخلیسكانەكان بزانێت، هاوەڵی چاكان و صاڵحان خاڵێكی پێویستی ترە بۆ بەردەوام بوون لەسەر ڕێگە، ئەوانەی بە كاروان سەفەر دەكەن سەلامەترن لەوانەی بە تەنها دەیانەوێت ڕێگەی بیابان بگرنە بەر، بۆیە خودا فەرمان دەدات و دەفەرموێت:﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَكُونُوا۟ مَعَ ٱلصَّـٰدِقِينَ ﴿١١٩﴾ ﴾التوبة: ١١٩-ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە لە خودا بترسن و لەگەڵ "صادیقان"دا بن، لە دوای باوەڕهێنان(ءَامَنُوا۟) خۆپارێزی لە گوناه (ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ) و ژیان لەگەڵ ڕاستگۆیاندا(وَكُونُوا۟ مَعَ ٱلصَّـٰدِقِينَ) دوو پایەی گەورەی ڕۆیشتنە بەرەو خودا.

**((أَمْ كَيْفَ يَطْمَعُ أَنْ يَدْخُلَ حَضْرَةَ اللهِ وَهُوَ لَمْ يَتَطَهَّرْ مِنْ جَنَابَةِ غَفَلاَتِهِ؟))**

## ڕاڤەی وشەكان:

**يطمع:** بەنیازە

**حضرة الله:** خزمەتی خودا

**لم يتطهر:** پاك نەبووەتەوە

**جنابة:** لەشپیسی

**غفلاته:** بێئاگاییەكانی

## شرۆڤە:

❁ چوونە خزمەتی خودا چوونە خزمەتە بە دڵ نەك بە جەستە، هەتا ئاگاهیی كەسی باوەڕدار زۆرتر و زیاتر بێت نزیكبوونەوەی لە بارەگای خودایی زۆرتر و زیاترە، بێئاگایی كە بەهۆی حەزەكان و سەرقاڵی دونیاوە دروست دەبێت هۆیەكە بۆ دووركەوتنەوە لە خودا، ئەوەی ئاگاهی ڕێبواری ڕێگەی خودا زیاد دەكات بریتییە لە یادی خودا(**ذكر الله**)، پایەكانی یادی خودا سیانن: یاد(**ذكر**): بریتییە لە كەلیماتی زیكر و تەسبیحات كە لە قورئان و فەرموودەدا هاتوون، یادكەر(**ذاكر**) بریتییە لەو

کەسە باوەڕدارەی کە یادی خودا دەکات، یادکراو(**مذكور**) خودای موتەعالە کە ئەویش(ﷻ) دەکەوێتە یادکردنی ئەو بەندانەی یادی دەکەن.

۞ یادی خودا سیٚ ئاستی هەیە:

❖ ئاستێك یادی خودا لەسەر زمانە و بۆ ناخ شۆڕنەبۆتەوە.

❖ ئاستێك یادی خودا لە دڵدایە و دڵە یادی خودا دەکات.

❖ ئاستێك تیایدا یاد(**ذكر**) و یادکەر(**ذاكر**) و یادکراو(**مذكور**) لە نزیکبوونەوەدا لە یەکتر وەك یەك حەقیقەتیان لیٚ دێت، بوون بە یەك حەقیقەت مەبەست لێی توانەوەی ئەو سیانە نییە لە یەکتردا، چونکە خودا خودایە و لە مەخلوقەکانیدا ناتوێتەوە، ئەم ئاستی سێیەمە زۆر دەگمەنە و جێگەی هەڵخلیسکانی زۆرێك لەو یادکەرانەیە کە پێی تێدەنێن، چونکە گەر زانست و ئاگاهی وردی لا نەبێت وڕێنە(**شطحات**) سەرهەڵدەدات و هەندێك جار بەرگی قەداسەت دەکات بەبەر خۆیدا و دەگاتە ئەوەی بڵێت (**سبحاني ما أعظم شأني**-پاکێتی بۆ من چەندە شانوشکۆم مەزنە!).

یەکێك لەو خواناسە مەزنانەی لەم قۆناغەدا رووبەڕووی هەڵە بۆتەوە بریتییە لە حەللاجی کوڕی مەنصور، دەربارەی ئەم خواناسە مەزنە شێخی گەیلانی دەفەرموێت: (گەر لە سەردەمی حەللاجدا بوومایە نەمدەهێڵا تووشی ئەو هەڵە ببێتەوە، چونکە دەزانم لە کوێدا هەڵەی کردووە).

۞ ئەگەر کەسێك بیەوێت سەردانی مەلیکێك بکات یەکەمین کارێك بیری لێدەکاتەوە بریتییە لە ناسینی مەلیك و زانینی ئەوەی چی پێخۆشە و چی پێناخۆشە پاشان خۆشۆرین و خۆخاوێنکردنەوە لە هەر چڵك و چەپەڵییەك و دواتر خۆرازاندنەوە بە جوانترین جلوبەرگ، پرچ داهێنان و بۆنی خۆش لە خۆدان، دۆزینەوەی جوانترین و باشترین وشە تاکو لە خزمەتی مەلیکدا دەریانبڕێت، ترس و ئاگاهی لە یەك بە یەکی قسە و رەفتاری، بردنی هەدیەیەك کە شایستەی مەلیك بێت، رۆیشتن بۆ خزمەتی خوداش-نموونەی بەرز و بڵند بۆ خودایە- هەر بەو جۆرەیە: دوای باوەڕهێنان بە خودا و ناسینی خودا و چی پێخۆشە(**الواجبات**) و چی پێناخۆشە(**المحرمات**) سەرهەڵدەدات، پاشان پاکژیی و خۆ خاوێنکردنەوە(**التزكية**) دەست پێدەکات، تەزکیەش دوو بەشە: خۆ

خاڵیکردنەوە لە خووخدە دزێوەکان یان صیفەتە ناپەسەندەکان (**الرذائل أو الصفات المذمومة**) و خۆڕازاندنەوە بە خووخدە باشەکان یان صیفەتە پەسەندەکان (**الفضائل أو الصفات المحمودة**)، پاشان خۆپارێزی (**التقوى**) لە هەرچی قسە و گوفتار و کار و کردەوەیەك کە ببێتە هۆی نارەزایی خودا، ئەوجا پێشکەشکردنی باشترین هەدیە بە خودای موتەعال کە بریتییە لە ئیخلاص بۆ خودا و ئیحسان لەگەڵ بەندەکانی خودا.

❁ بە بێئاگایی لە خودا مرۆڤ ناگاتە خزمەتی خودا، چۆن ڕێگە بە مرۆڤی لەشپیس دەدرێت بڕواتە خزمەتی مەلیك؟! پێشەکی لە لەشپیسی غەفلەت خۆی دەشوات ئەوجا بەتەمای لیقای خودایە، یەکێك لە صالحان دەفەرموێت: (چل ساڵ لەبەر دەرگای دڵدا ڕاوەستام تاکو غەیری خودای تێنەچێت)، واتە چل ساڵ لە یادی خودادا بووم و نەمهێڵاوە بێئاگایی رووم تێبکات.

**((أَمْ كَيْفَ يَرْجُو أَنْ يَفْهَمَ دَقَائِقَ الأَسْرَارِ وَهُوَ لَمْ يَتُبْ مِنْ هَفَوَاتِهِ؟))**

## ڕاڤەی وشەکان:

**يرجو:** بەهیوایە یاخود هیوای وایە

**يفهم:** تێبگات

**دقائق الأسرار:** نهێنییە وردەکان

**لم يتب:** تۆبەی نەکردووە

**من هفواته:** لە هەڵە و تێکەوتنەکانی

## شرۆڤە:

❁ نهێنییە وردەکانی ڕێگەی باوەڕ نایەنە هەژماردن، بە ژمارەی ئەستێرەکان نهێنی ورد لەسەر ئەو ڕێگەیە سەرهەڵدەدەن، بەلاٌم کێن ئەوانەی لە نهێنی ورد تێدەگەن؟ ئەوانەی بەیادی خودا ئاگاهییان زۆر دەبێت و غەفلەتیان کەم دەبێتەوە، هەروەها ئەوانەی بڕی خۆپارێزیان زۆر دەبێت و لە گوناه و هەڵەی گەورە خۆیان دەپارێزن و بەشێك لەو نهێنییە وردانە دەستگیر دەکەن.

ئەو نهێنییانە چین و باس لە چی دەکەن؟ ئەو نهێنییانە بریتین لە نهێنی ناسینی خودا، هەروەها نهێنی ڕۆح کە حاجیزەکانی کات و شوێن دەبڕێت و بەرەو جیهانی مەلەکوت لەشەقەی باڵ دەدات، ناسینی پێغەمبەر(ﷺ) و وەرگرتنی حەقیقەتەکان لە شوێنپێ هەڵگرتنی هەنگاوەکانی ئەو، بەکورتی ئەو نهێنییانە بۆیە نهێنین، چونکە باس لێوەرکردنیان شیاو نییە و هەرکاتێك ویستت ئەو مانا ڕۆحییە قووڵانە بە زمانێکی کەم و کورتی مرۆیی دەربڕیت لێڵی و تەمومژ سەرهەڵدەدەن، لەبەر ئەوەیە زانایانی ئەم مەیدانە بێدەنگیان هەڵبژاردووە و وتوویانە ڕێگەی ئێمە ڕێگەی پڕ لە نهێنییە و بێدەنگیش ئادابی هەموو ئەوانەیە ئەم ڕێگەیە دەگرنەبەر، ئەو نهێنیانە قسە نین، بەڵکو حەقیقەتگەلێکن تەنها ئەوانە لێیان تێدەگەن کە بە بەرزبوونەوە لەو مەیدانەدا بەدەستی دەهێنن.

# حیکمەتی چواردەیەم

**((الْكَوْنُ كُلُّهُ ظُلْمَةٌ، وَإِنَّمَا أَنَارَهُ ظُهُورُ الْحَقِّ فِيهِ، فَمَنْ رَأَى الْكَوْنَ وَلَمْ يَشْهَدْهُ فِيهِ أَوْ عِنْدَهُ أَوْ قَبْلَهُ أَوْ بَعْدَهُ فَقَدْ أَعْوَزَهُ وُجُودُ الأَنْوَارِ، وَحُجِبَتْ عَنْهُ شُمُوسُ الْمَعَارِفِ بِسُحُبِ الآثَارِ))**

## راڤەکردنی وشەکان:

**ظلمة:** تاریکی

**أناره:** رۆشنی کردۆتەوە

**ظهور الحق فيه:** دەرکەوتنی حەق(خودا) لەناویدا

**لم يشهده فيه:** تیایدا خودا نەبینێت

**أعوز وجود الأنوار:** پێویستی بە بوونی نوورە

**حجبت:** لێی شاراوەتەوە

**شموس المعارف:** "**شموس**" کۆی "**شمس**"ە، "**معارف**" کۆی "**معرف**"ە، واتە خۆری مەعریفەت.

**سحب الآثار:** "**سحب**" کۆی "**سحابة**"ە، "**آثار**" کۆی "**أثر**"ە، واتە هەوری ئاسار(شوێنپێ-مەخلوقات)

**واتا ((سەراپای بوون تاریکییە، دەرکەوتنی حەق تیایدا رۆشنی کردۆتەوە، هەرکەسێك گەردوون ببینێ و خودای لە"ناو، لەپاڵ، لەپێش، لە دوا"دا نەبینێت ئەوا بەدڵنیاییەوە ئاتاجی بوونی نوورە، ئەو کەسە خۆری مەعریفەتی بە پەردەی مەخلوقات لێشاراوەوەتەوە))**

**شرۆڤە:**

❁ لە بەشی کۆتایی حیکمەتی سیازدەهەمدا ئیبن عەتا ئاماژەی بەوە کرد کە ناگەین بە نهێنییە وردەکان گەر دڵمان لە خودا بێئاگا بێت، لەم حیکمەتەشدا پێمان دەڵێت کە سەرچاوەی بێئاگایی لە خەریکبوونەوەیە بە مەخلوقاتەوە، لەبیرچوونەوەی خالیقە بەهۆی مەخلووقەوە.

❁ ئەسڵ لە بووندا تاریکییە، دەتوانین بڵێین ئەگەر نەبوون (عدم) مانای هەبێت تەنها بریتییە لە تاریکی، هەڵبەت تاریکییەك کە بوون(وجود) لەئامێز نەگرێت، ئەگینا ئەو تاریکیانەی بوونی هەسارە و مانگەکان دەگرنە خۆ مانادارن و بە نەبوون ناژمێررێن، لە ئەمرۆدا زانایانی گەردوون دەڵێن بۆشایی نێوان ئەستێرەکان و کەشکەشانەکان وزەی رەشە، بۆیە پێی ناوترێت بۆشایی.

❁ ئەم تاریکییە بێسنوورە بە نووری ئەسمائو صیفاتی خوای موتەعال رۆشن بوویەوە و بوون(الوجود) -لە خۆر و هەسارە و مانگ و گەلەئەستێرەکان- سەریهەڵدا.

❁ هەر کەسێك بوون (گەردوون) ببینێت و خودای بیرنەکەوێتەوە ئەو کەسە نووری مەعریفەی لەلا نییە و هەوری مەخلوقات خۆری ئەسمائو صیفاتی خودای موتەعالی لیێ شاردۆتەوە.

❁ بیرکەوتنەوەی خودا چەند ئاستێکی هەیە: ئاستێك لەودیو بوونەوە خودا ببینێت، ئاستی دووەم، لەناو بووندا خودا ببینێت، ئاستی سێیەم، لەپاڵ بووندا خودا ببینێت، ئاستی چوارەم، لەپێش بووندا خودا ببینێت، ئاستێك تەنها خودا ببینێت کە ئەم ئاستەیان ئیبن عەتا ئاماژەی پێنەداوە، چونکە دەزانێت ترسناکی ئەم ئاستە-بۆ سالیکان و موریدان- چەندە گەورەیە.

❁ بۆ ئەوەی هەست بە بوونی خودا بکەی و درکی نووری ئەسمائو صیفاتی ئەو بکەیت پێویستە خاوەنی نوور بیت، ئەو نوورەش بریتییە لە نووری ئیمان بە خودا و خۆ رادەستکردن(**التسليم**) بە ئەو(ﷻ)، هەتا متمانەت بە خودا زۆرتر بێت زیاتر لە ئەو نزیك دەبییەوە، هەتا لە خودا نزیك ببیەوە باشتر خۆت و ژیان و گەردوون

دەناسیت، لەوە تێدەگەیت کە تۆ و ئەو هەسارەی لەسەری دەژیت هیچی تر نین جگە لە گەردێکی بچووك لەناو بێشومار گەرددا کە لە بۆشاییدا مەلە دەکەن.

# حیکمەتی پازدەیەم

((مِمَّا يَدُلُّكَ عَلَى وُجُودِ قَهْرِهِ سُبْحَانَهُ أَنْ حَجَبَكَ عَنْهُ بِمَا لَيْسَ بِمَوْجُودٍ مَعَهُ))

## راڤەی وشەكان:

**يدلك:** دەبێتە بەڵگە بۆت، ڕێنموونیت دەكات

**قهره:** زاڵی دەسەلاتی

**حجبك عنه:** پەردەی خستۆتە نێوان تۆ و ئەو

**ليس بموجود معه:** لەگەڵ ئەودا بوونی نییە

**واتا ((ئەوەی دەبێتە بەڵگە بۆت و ڕێنموونیت دەكات بۆ بوونی زاڵیی دەسەلاتی خودا(ﷻ) ئەوەیە كە تۆی لە بینینی ئەو بە شتێك پەردەپۆش كردووە كە لە پاڵ بوونی خودادا بوونی نییە))**

## شرۆڤە:

❁ لە حیكمەتی چواردەیەمدا ئاماژەی بەوەكرد بێئاگایی لە خودا لە خەریكبوون بە مەخلوقاتەوە پەیدادەبێت، لێرەشدا پێمان دەڵێت مەخلوقات ناتوانن بوونی خودا بشارنەوە ئەوە صیفەتی زاڵ "القهار"ی خودایە وایكردووە تۆ نەتوانی خودا بینیت، ئەگینا چۆن شتێكی كاتی و دروستكراو(مەخلوق) دەتوانێت خوایەكی مەزنی دروستكەر بشارێتەوە، هەندێ لەوانەی سەر بە قوتابخانەی زاهیرین خاوەنی تەفسیری **"في ظلال القرآن"** بە یەكێتی بوون(**وحدة الوجود**) تۆمەتبار دەكەن ئەوەش بە هۆی ئەو چەند رستەیەی لە تەفسیری سوورەتی **"الإخلاص"**دا دەریبڕیوە كە ئەمە دەقەكەیەتی ((ئەوە بریتییە لە یەكتایی لە بووندا، هیچ حەقیقەتێك بوونی نییە جگە لە حەقیقەتی بوونی ئەو(بوونی خودا)، هیچ بوونێك بوونی نییە جگە لە بوونی ئەو، هەرچی بوونە بوونی خۆی لەو بوونە راستەقینەوە وەردەگرێت و حەقیقەتی خۆی لە

حەقیقەتی ئەوەوە بەدەست دەهێنێت، لێرەوە حەقیقەتی کاربەرێکەری و بکەریی (فاعیلییەت) دێتە ئاراوە، جگە لە خودا هیچ کەسێکی تر کاریگەری لەسەر شتەکان و لەناو شتەکاندا نییە، هیچ حەقیقەتێك بۆ بوون(گەردوون) بوونی نییە جگە لە حەقیقەتی خودایی، هیچ حەقیقەتێك بۆ کار و کاریگەریی بوونی نییە جگە لە کاریگەری ویستی خودایی، ئیتر بۆ دەبێت دڵ وابەستەی شتێك ببێت کە نە حەقیقەت بۆ بوونی هەیە، نە بۆ فاعیلییەتی؟!) لەڕاستیدا خاوەنی تەفسیری **"في ظلال"** بەئاگاتر و زاناترە لەوەی ئەو جۆرە باوەڕەی هەبووبێت، ئەم دەقە ئاماژە بۆکراوە باس لە دۆخێکی ئیمانیی باڵایە کە خوداناسان تێیدەکەون، ئاستێکە تیایدا تەنها فاعیلییەتی خودا هەست پێ دەکرێت، ئەم چەند ئایەتە ئاماژەیان بەو هەستە باڵا تێدایە ﴿**وَمَا رَمَيْتَ إِذْ رَمَيْتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ رَمَىٰ**﴾ الأنفال: ١٧، هەروەها ئایەتی ﴿**وَمَا يَذْكُرُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ ۚ هُوَ أَهْلُ ٱلتَّقْوَىٰ وَأَهْلُ ٱلْمَغْفِرَةِ ﴿٥٦﴾**﴾ المدثر: ٥٦، هەروەها ﴿**وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿٣٠﴾**﴾ الإنسان: ٣٠

❁ کە بوونی ڕاستەقینە بۆ غەیری خودا بوونی نییە ئیتر بۆچی بە مەخلوقاتەوە وابەستە دەبین؟ کە هەرچی وەستان و جووڵەیە لە بووندا لە خوداوە کاریگەریی وەردەگرن ئیتر مرۆڤ لە چی بترسێت و ڕەغبەتی و ڕەهبەتی بۆ لای چ شتێك بێت؟! کاتێك خودا تەنها حەقیقەتێکە لە بووندا ئیتر چۆن نەبوون دەتوانێت بیشارێتەوە؟! خودا بەسەر هەموو بووندا زاڵە و صیفەتی زاڵی ئەوە پەردەیەکی خستۆتە نێوان ئەو و دروستکراوەکانییەوە، خودا بەسەر ئەو پەردەشدا زاڵە و وێنەی مادیت لەلا دروست نەبێ و وانەزانیت خوا سنووردارە و بە پەردەیەك داپۆشراوە یاخود دەورە دراوە ﴿**وَهُوَ ٱلْقَاهِرُ فَوْقَ عِبَادِهِۦ ۚ وَهُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْخَبِيرُ ﴿١٨﴾**﴾ الأنعام: ١٨، هەر ئەوە زاڵە بەسەر بەندەکانیدا و ئەوە دانا و بەئاگا.. مردن و ژیان و خێر و شەڕ لەدەستی خودای موتەعالدایە.

❁ ئەگەر هیچ شتێك بوونی ڕاستەقینەی نییە و تەنها حەقیقەتێك بریتییە لە خودا و بوونی خودا، ئەی بوون و حەقیقەتی ئەم گەردوونە لە کوێدایە؟ خودا هەبوو هیچ شتێك بوونی نەبوو، "لەوح و قەڵەم، عەرش و کورسی، بەهەشت و دۆزەخ، ئاسمان و

زەوی، جین و مرۆڤ، فریشتە و نوور" بوونیان نەبوو، تەنها خودا بوونی هەبوو، ئەم بوونە تاکو تەنهایە ناو و صیفەتە ئەزەلییەکانی کەوتنە جیلوە(**تجلي**) کردن، یەکتایی خودا (**الأحدیة**) جیلوەی دەکات و پاشان ناوی **"الأحد"**، کە دەڵێین **"پاشان"** مەبەستمان ئەوە نییە خودا لە ئەزەلەوە ئەو ناوەی نەبووە و دواتر بۆی پەیدا بووە، پاکێتی بۆ خودا لەو جۆرە وەصف و پیاهەڵدانە، خودا بەرلەوەی خەلق بکات خالق بووە و لەدوای پێچانەوەی ئاسمانەکان و زەویش هەر بە خالقی خۆی دەمێنێتەوە، ناوی **"الله"** جیلوەیەکی ترە و لەم ناوەوە تەواوی ناوە جوانەکانی خودا سەرچاوە دەگرن، ناوی "الرحمن" لە جیلوەیەکی تردایە، ناوی"الخالق" و "الرب" و سەرجەم ناوەکانی تر جیلوەکردنی تری ئەو زاتە شکۆمەند و مەزنەیە.

## حیکمەتی شازدەیەم:

((كَيْفَ يُتَصَوَّرُ أَنْ يَحْجُبَهُ شَيْءٌ وَهُوَ الَّذِى أَظْهَرَ كُلَّ شَيْءٍ؟
كَيْفَ يُتَصَوَّرُ أَنْ يَحْجُبَهُ شَيْءٌ وَهُوَ الَّذِى ظَهَرَ بِكُلِّ شَيْءٍ؟
كَيْفَ يُتَصَوَّرُ أَنْ يَحْجُبَهُ شَيْءٌ وَهُوَ الَّذِى ظَهَرَ فِى كُلِّ شَيْءٍ؟
كَيْفَ يُتَصَوَّرُ أَنْ يَحْجُبَهُ شَيْءٌ وَهُوَ الَّذِى ظَهَرَ لِكُلِّ شَيْءٍ؟
كَيْفَ يُتَصَوَّرُ أَنْ يَحْجُبَهُ شَيْءٌ وَهُوَ الظَّاهِرُ قَبْلَ وُجُودِ كُلِّ شَيْءٍ؟
كَيْفَ يُتَصَوَّرُ أَنْ يَحْجُبَهُ شَيْءٌ وَهُوَ أَظْهَرُ مِنْ كُلِّ شَيْءٍ؟
كَيْفَ يُتَصَوَّرُ أَنْ يَحْجُبَهُ شَيْءٌ وَهُوَ الْوَاحِدُ الَّذِى لَيْسَ مَعَهُ شَيْءٌ؟
كَيْفَ يُتَصَوَّرُ أَنْ يَحْجُبَهُ شَيْءٌ وَهُوَ أَقْرَبُ إِلَيْكَ مِنْ كُلِّ شَيْءٍ؟
كَيْفَ يُتَصَوَّرُ أَنْ يَحْجُبَهُ شَيْءٌ وَلَوْلَاهُ مَا كَانَ وُجُودُ كُلِّ شَيْءٍ؟
يَا عَجَبًا كَيْفَ يَظْهَرُ الْوُجُودُ فِى الْعَدَمِ؟
أَمْ كَيْفَ يَثْبُتُ الْحَادِثُ مَعَ مَنْ لَهُ وَصْفُ الْقِدَمِ؟))

### ڕاڤەی وشەکان:

**كيف يتصور**: چۆن وێنادەکرێت

**يحجبه**: پەردەپۆشی بکات

**أظهر**: دەریخستووە

**ظهر**: دەرکەوتووە

**الحادث**: ڕووداو کە لێرەدا مەبەستی هەڵقولاْنی بوونە

**القدم**: دێرین کە لێرەدا مەبەست لێی خودای موتەعالە

**واتا ((كَيْفَ يُتَصَوَّرُ أَنْ يَحْجُبَهُ شَيْءٌ وَهُوَ الَّذِي أَظْهَرَ كُلَّ شَيْءٍ؟))**

((چۆن وێنادەكرێت شتێك پەردەپۆشی بكات لەكاتێكدا هەر ئەوە هەموو شتەكانی دەرخستووە؟))

**((كَيْفَ يُتَصَوَّرُ أَنْ يَحْجُبَهُ شَيْءٌ وَهُوَ الَّذِي ظَهَرَ بِكُلِّ شَيْءٍ؟))**

((چۆن وێنادەكرێت شتێك پەردەپۆشی بكات لەكاتێكدا هەر ئەوە لە هەموو شتێكدا دەردەكەوێت؟))

**((كَيْفَ يُتَصَوَّرُ أَنْ يَحْجُبَهُ شَيْءٌ وَهُوَ الَّذِي ظَهَرَ فِي كُلِّ شَيْءٍ؟))**

((چۆن وێنادەكرێت شتێك پەردەپۆشی بكات لەكاتێكدا هەر ئەوە لەناو هەموو شتێكدا دەردەكەوێت؟))

**((كَيْفَ يُتَصَوَّرُ أَنْ يَحْجُبَهُ شَيْءٌ وَهُوَ الَّذِي ظَهَرَ لِكُلِّ شَيْءٍ؟))**

((چۆن وێنادەكرێت شتێك پەردەپۆشی بكات لەكاتێكدا هەر ئەوە بۆ هەموو شتێك دەردەكەوێت؟))

**((كَيْفَ يُتَصَوَّرُ أَنْ يَحْجُبَهُ شَيْءٌ وَهُوَ الظَّاهِرُ قَبْلَ وُجُودِ كُلِّ شَيْءٍ؟))**

((چۆن وێنادەكرێت شتێك پەردەپۆشی بكات لەكاتێكدا ئەو بەر لە بوونی هەموو شتێك دەركەوتووە؟))

**((كَيْفَ يُتَصَوَّرُ أَنْ يَحْجُبَهُ شَيْءٌ وَهُوَ أَظْهَرُ مِنْ كُلِّ شَيْءٍ؟))**

((چۆن وێنادەكرێت شتێك پەردەپۆشی بكات لەكاتێكدا ئەو لە هەموو شتێك دەركەوتووترە؟))

**((كَيْفَ يُتَصَوَّرُ أَنْ يَحْجُبَهُ شَيْءٌ وَهُوَ الْوَاحِدُ الَّذِي لَيْسَ مَعَهُ شَيْءٌ؟))**

((چۆن وێنادەكرێت شتێك پەردەپۆشی بكات لەكاتێكدا ئەو تاكوتەنهایەكە كە هیچ شتێكی تری لەگەڵ نییە؟))

((كَيْفَ يُتَصَوَّرُ أَنْ يَحْجُبَهُ شَيْءٌ وَهُوَ أَقْرَبُ إِلَيْكَ مِنْ كُلِّ شَيْءٍ؟))

((چۆن وێنادەکرێت شتێك پەردەپۆشی بکات لەکاتێکدا ئەو لە هەموو شتێك زیاتر لە تۆوە نزیکە؟))

((كَيْفَ يُتَصَوَّرُ أَنْ يَحْجُبَهُ شَيْءٌ وَلَوْلاَهُ مَا كَانَ وُجُودُ كُلِّ شَيْءٍ؟))

((چۆن وێنادەکرێت شتێك پەردەپۆشی بکات لەکاتێکدا گەر ئەو نەبوایە هیچ شتێك بوونی نەدەبوو؟))

((يَا عَجَبًا كَيْفَ يَظْهَرُ الْوُجُودُ فِي الْعَدَمِ؟))

((چ سەرسوڕمانێکە! چۆن لە عەدەمەوە بوون پەیدادەبێت و دەردەکەوێت؟!))

((أَمْ كَيْفَ يَثْبُتُ الْحَادِثُ مَعَ مَنْ لَهُ وَصْفُ الْقِدَمِ؟))

((یان چۆن ڕووداو جێگیر دەکرێت لەگەڵ کەسێکدا کە بە کۆن و هەرهەری وەصف دەکرێت؟!))

### شرۆڤە:

❁ خودای موتەعال سەرچاوەی هەموو بوونە، بوون لە نووری ئەسمائو صیفاتی ئەوەوە هەڵقوڵاوە، بۆیە بوون ناتوانێت خودای موتەعال بشارێتەوە و پەردەی بەڕوودا بدات، هەرچی بوونە ئەو دەریخستووە، بۆ هەرچی بوونە دەرکەوتووە، پێش هەموو بوون دەرکەوتووە، لە هەرچی بوونە دەرکەوتووترە، تەنهایە و هیچ شتێك لەپاڵ بوونی ئەودا بوونی نییە، لە هەموو شتێك نزیکە و نزیکترە بە هەموو شتێك لە هەموو شتێك، ئەو نەبوایە هیچ شتێك دەرنەدەکەوت، ئەی بۆ ئێمە نایبینین؟ ئێمە دەیبینین، بەڵام چاومان ناکەینەوە، تۆ گەر چاوت نەکەیەوە لە ڕۆژێکی هاویندا کە خۆر لە ناوەڕاستی ئاسماندایە ناتوانیت بیبینیت، چاوت بکەوە و نووری ئەسمائو صیفاتی خودای موتەعال لە ئاسۆی گەردوون و دەروونددا ببینە، چۆن چاومان بکەینەوە؟ ئێمە چاوێکی ترمان هەیە، ئەو چاوەیە دەرکی ئایاتی ئافاق و ئەنفس دەکات، ئەو چاوە

بریتییه له **"بصیرة"**، تا چاوی بەصیرەتمان نەکرێتەوە تیشکی خۆری خودا نابینین، چۆن چاوی بەصیرەتمان بکەینەوە؟ وەلاّمی ئەم پرسیارە درێژە دەکێشێت و لێرەدا تەنها ئەوەندە دەڵێین کرانەوەی چاوی بەصیرەت بەخششێکی خوداییە و تەنها بە یادی خودا و بەندایەتی و ئیخلاص بۆ خودا بەدەست دێت.

هەندێ جار کەسەکە نیعمەتی بەصیرەتی پێ دەدرێت و دواتر بەهۆی نەزانی خۆیەوە لەدەستی دەدات، ئەوەی چاوی بەصیرەت کوێر دەکاتەوە نیگەرانی و دڵەڕاوکێ و هەڵچوون و پەلەکردنە.

۞ ئیبن عەتا لەکۆتایی ئەم حیکمەتەدا پرسیارێکی زۆر گرنگ و هەستیار دەهروژێنێت کە دەڵێت (چ سەرسوڕمانێکە! چۆن لە عەدەم بوون پەیدادەبێت و دەردەکەوێت؟! چۆن رووداو جێگیر دەکرێت لەگەڵ کەسێکدا کە بە کۆن و هەرهەری وەصف دەکرێت؟!) وەلاّمی ئەم پرسیارە بابەتی زانستی کەلامە و نامەوێ لێرەدا باس لە بارەیەوە بکەم.

۞ ۞ ۞

# حیکمەتی حەڤدەیەم

**((مَا تَرَكَ مِنَ الْجَهْلِ شَيْئًا مَنْ أَرَادَ أَنْ يُحْدِثَ فِي الْوَقْتِ غَيْرَ مَا أَظْهَرَهُ اللهُ فِيهِ))**

## راڤەی وشەکان:

**الجهل:** نەزانی

**يحدث:** رووبدات

**أظهره:** دەریبخات

**واتا ((هەرچی نەزانییە لەو کەسەدا کۆبۆتەوە کە دەیەوێت لەناو کاتدا شتێك رووبدات خودا نەیەوێت دەریبخات))**

## شرۆڤە:

❁ لە حیکمەتی پێشوودا ئیبن عەتا پرسیارێکی سەرسوڕمان ئامێزی خستەڕوو وتی (چ سەرسوڕمانێکە! چۆن لە عەدەمەوە بوون پەیدادەبێت و دەردەکەوێت؟! چۆن رووداو جێگیر دەکرێت لەگەڵ کەسێکدا کە بە کۆن و هەرهەری وەصف دەکرێت؟!، خۆ تەسلیم کردن بە خودا و وتنی(**آمنت بالله**) و پێدانی متمانە بەو(ﷻ) هەروەها رازی بوون بەوەی خودا لە کتێبە ئاسمانییەکانیدا بۆی بەیان کردووین تەنها وەڵام و رێگە چارەیەکە بۆ پرسیارە سەراسیمەکەی ئیبن عەتا.

❁ خۆ تەسلیمکردن بە خودا واتە تەسلیمبوون بە قەدەری براوەی خودا، تەسلیمبوون بە قەدەری خودا واتە پەلە نەکردن و نیگەران نەبوون بۆ کارێك کە هێشتا روونەداوە و خودا رووداونەکەی بۆ کات و شوێنێکی تر هەڵگرتووە، هەروەها دڵگران نەبوون و خەم نەخواردن بۆ کارێك کە روویداوە، چونکە خودا ئەو کات و شوێنەی تەقدیر کردووە و تۆ تەنها تەسلیمبوونت لەسەرە بە قەدەرەکان.

۞ لێرەدا پرسیارێك دروست دەبێت: ئەقڵ چ ڕۆڵێكی هەیە لە دروستكردن و لادانی قەدەرەكاندا؟ سەرەتا دەبێ بزانین ئەم مەقامەی كە ئیبن عەتا باسی لەبارەوە دەكات تەنها كەسانێك تێیدەگەن كە پێیان تێناوە و لەگەڵیدا دەژین، لە سەرەتاكانی باوەڕدا مرۆڤ ناتوانێت دەستبەرداری ئەقڵ و تەگبیر ببێت، پێیوایە ئەو قەدەرەكان دروست دەكات، بێئاگایە لەوەی لەپشتی هەر قەدەرێكەوە كە ئەقڵی ئەو تاوتوێی دەكات نەخشەیەكی ورد خۆی حەشارداوە، بێئاگایە لەوەی هەرچەندە بەئەقڵ و ئیرادەی خۆی بەناو قووڵایی ئاسماندا بفڕێت ناتوانێت ئەو داوە بپسێنێت كە بە پێیەكانییەوە گرێدراوە، تەسلیمبوون بە خودا دوای قۆناغێك لە تەكانی بەردەوامی باوەڕ دێت، خودا فەرمان بە ئیبراهیم(ﷺ) دەكات و پێی دەفەرموێ تەسلیم ببە، ئەویش دەفەرموێت:: بە پەروەردگاری جیهانەكان تەسلیم بووم ﴿ إِذْ قَالَ لَهُۥ رَبُّهُۥٓ أَسْلِمْ ۖ قَالَ أَسْلَمْتُ لِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٣١﴾ ﴾ البقرة:١٣١، مەقامی تەسلیمبوون بە خودا و متمانەدان بە قەدەرەكانی خودا باوەڕێكی شهوودی گەرەكە، باوەڕێك جێگەی شك و گومانی تێدا نەبێتەوە و لەئاستی یەقیندا بێت، باوەڕێك كە تەنها لەسەردا (لەناو زەیندا) ڕەنگی گرتبێت و قووڵ نەبووبێتەوە بۆ ناو دڵ باوەڕێكی سادە و سەرەتایە و ناتوانێت لە ئەقدارە تاڵ و شیرینەكاندا خۆی رابگرێت، هەندێك لە عاریفان دەڵێن: (ماوەی چل ساڵە خودا لە حاڵەتێكدا داینەناوم پێمناخۆش بووبێت، نەیگواستوومەتەوە بۆ حاڵێكی تر پێم گران بووبێت)

۞ ۞ ۞

# حیکمەتی هەژدەیەم

((إِحَالَتُكَ الأَعْمَالَ عَلَى وُجُودِ الْفَرَاغِ مِنْ رُعُونَاتِ النَّفْسِ))

**راڤەی وشەکان:**

**إحالتك:** گواستنەوە و دانەدەست

**الفراغ:** بێکاری

**رعونات:** گەمژەیی، شلگیری

**واتا ((گواستنەوە و دواخستنی کار (کاری سەفەر بەرەو خودا) بۆ کاتێك کە بێکار بیت (لەمەشغەڵەتی دونیا) لە گەمژەیی و شلگیریی دەروونە))**

**شرۆڤە:**

۞ لە حیکمەتی پێشوودا باسی تەسلیمبوونی کرد، ئیبن عەتا لەم حیکمەتەشدا لەفێڵێکی دەروون ئاگادارمان دەکاتەوە، نابێت رۆچوونمان لە دونیادا ناو بنێین تەسلیمبوون بەخودا و بڵێین خودا ئەم سەرقاڵی و غەفڵەتەی بۆ من پێباشە و منیش تەسلیمم بەو قەدەرە، لێرەوە کارە گرنگەکانی سەفەر بەرەو خودا وازلێبهێنین و روو لە دونیا بکەین، هەر کاتێك وازت لە کارێك هێنا کە لە پێویستییەکانی سەفەرە بەرەو خودا بۆ کارێکی دونیایی ناپێویست ئەوە بزانە نەفست فێڵی لێکردوویت.

۞ کاری رۆحانییەت هیچی لە داهاتوودا نییە، هەر پلان و بڕیارێك بۆ سازکردنی دڵ و ئامادەبوونی لەگەڵ خودا ئێستا دەست بە جێبەجێکردنی نەکەیت هەرگیز لەداهاتوودا ئەنجامی نادەیت، بۆچی؟ کاری سازکردنی دڵ بەئامادەبوون لەگەڵ خودادا کار نییە تا بیری لێ بکەیەوە و پلانی بۆ دابڕێژی و بتەوێ لە داهاتوودا جێبەجێی بکەیت، ئامادەبوونی دڵ دوورکەوتنەوەیە لەو فەوزا فیکرییەی هەموو بوونی تۆی داگیرکردووە، ئەو فەوزا فیکرییەی جەستەی تۆی شەکەت و رۆحی قورس و ماندوو

کردووی، تۆ پێویستە لە "ئێستا"دا ئەم فەوزایە رابگریت، پێویستە خەفەت بۆ رابردوو و خۆزگە بۆ داهاتوو وازلێبهێنیت، رۆحت لە "ئێستا"دا ئامادە بکەی و لەگەڵ خۆتدا ئاشت ببیەوە، تۆ دەبێت ئەو چەندین "تۆ"یە بکەیەوە بە یەك "تۆ"، نابییەوە بە یەك "تۆ" یان بە یەك "من" تا دوو جەمسەرەکەی زەمەن(رابردوو-داهاتوو) وازلێنەهێنی، ئەو جەمسەرەی زەمەن تۆی کردووە بە چەندین "تۆ"، تۆی کردووە بە هەموو شتێك و هەموو کەسێك جگە لە "تۆ"، کاتێك تۆ دەبییەوە بە خۆت ئەو هەموو "تۆ" تەزویرکراوە کۆتاییان پێدێت، یەك "تۆ" بوونی هەیە ئەویش "تۆ"یەکە کە لەگەڵ خۆت و لەگەڵ خودا ئاشتبووەتەوە، تۆیەکی ئامادە لە "ئێستا"دا، تۆیەکی کەنارگیر لە دوو جەمسەرەکەی زەمەن.

❁ ❁ ❁

# حیکمەتی نۆزدەیەم

**((لاَ تَطْلُبْ مِنْهُ أَنْ يُخرِجَكَ مِنْ حَالَةٍ لِيَسْتَعْمِلَكَ فِيمَا سِوَاهَا، فَلَوْ أَرَادَكَ لأَسْتَعْمَلَكَ مِنْ غَيْرِ إِخْرَاجٍ))**

## ڕاڤەی وشەکان:

**لا تطلب منه:** داوای لێ مەکە

**أن يخرجك:** دەرتبهێنی

**حالة:** دۆخ، بار، حاڵەت

**يستعملك:** بەکارتبهێنێ

**فيما سواها:** لە شتێکی تردا، لە دۆخێکی تردا

**فلو أرادك:** گەر تۆی بوێت، واتە گەر تۆ مورادی خودا بیت

**لاستعملك:** بەکارت دەهێنێت

**من غير إخراج:** بەبێ دەرچوون لەو دۆخە

**واتا ((داوا لە خودا مەکە لە حاڵێك دەرتبهێنێت و لە بار و دۆخێکی تردا بەکارت بهێنێت، چونکە گەر مورادی ئەو بیت بەبێ هاتنە دەرەوە لەو دۆخە بەکارت دەهێنێت))**

## شرۆڤە:

❁ لەم حیکمەتەدا ئیبن عەتا باس لەو دۆخانە(**الأحوال**) دەکات ڕێبواری ڕێگەی خودا پێی تێدەنێت، ئەو بە وێستگەیەکەوە ناوەستێتەوە و بەبەردەوامی لە تەکان و گەردەشی ڕۆحیدایە، هەندێك دۆخ و حاڵ هەیە کە بۆ ماوەیەکی درێژ سالیکی ڕێگەی خودا تیایدا دەمێنێتەوە، بۆیە وادەزانێ لە تەکانە ڕۆحییەکانی وەستاوە و ئیتر ئەو

دۆخە دواین مەنزڵیەتی، بۆیە دەکەوێتە پاڕانەوە و داواکردن لە خودا تاکو لەو دۆخە دەریبهێنێت و بەرەو حاڵێکی بەرزتر تەکان بەخۆی بدات، ئەو بەم داوایەی چەند ئەسڵێکی سەیر و سلوکی پێشێل کردووە، لەوانە:

❖ ئەو بڕیار بوو لەسەر ئەم ڕێگەیە تەسلیم بەو قەدەرانە ببێت کە خودا بۆی دیاری دەکات و بەسەر ئەودا تێیدەپەڕێنێت، بەڵاّم بەو داوایە ڕووبەڕووی قەدەرەکان دەبێتەوە و ململانێیان دەکات.

❖ ئەو پێی وایە دۆخی داهاتوو باشترە بۆ ئەو لەم دۆخەی پێی تێناوە، ئەمەش هەڵبژاردنە بەسەر هەڵبژاردنی خودادا بۆ ئەو کە لەسەرەتاوە بڕیاری دابوو هەڵبژاردنەکانی هەڵبژاردنی خودا بێت.

❖ ئەو بێئاگایە لە ئامادەیی و توانا ڕۆحییەکانی خۆی، بەڵاّم خودا ئەو دەناسێ و دەزانێت چەندەی پێهەڵدەگیرێت، بۆیە هەر حاڵەتێك خودا بۆ تۆی دیاری بکات و هەر کۆڵێك خودا بەسەر تۆیدا بدات یارمەتیت دەدات لە بەئەنجام گەیاندنی، بەڵاّم هەر دۆخ و بارێك خۆت هەڵتبژاردبێت خودا دەیداتە دەست تواناکانی خۆت، بۆیە زۆرجار هەڵبژاردەکەی مرۆڤ شکستی بەدوادا دێت.

۞ نابێت ئەوەمان لەبیر بچێت کە ئیبن عەتا باس لە بار و دۆخێك دەکات کە لەلای شەرع پەسەندە، بەڵاّم ئەو بار و دۆخانەی مرۆڤ تێی دەکەوێت و لە دیدی شەرعەوە ناپەسەندە پێویستە بۆ دەرچوون و هاتنە دەرەوە لێی ئیرادە بەگەڕ بخەیت و داوای کۆمەکی و یارمەتی لە خودا بکەیت تاکو بەسەر خۆتدا زاڵ ببی و لەو دۆخە ناشەرعییە بێیە دەرەوە.

۞ ئیبن عەتا لە داڕشتنی ئەم حیکمەتەدا ئاماژەیەکی ناڕاستەوخۆ بە زاراوەیەکی فەرهەنگی تەصەوف دەدات ئەوەش بریتییە لە زاراوەی "مراد" کە لە ئاماژەی **"أرادك"** وەردەگیرێت، موراد لە زمانی عەرەبیدا و لە فەرهەنگی تەصەوفدا بە کەسێك دەوترێت کە لەلایەن خوداوە "داواکراو" بێت، قاموسی **"المعاني"** لەسەر ئەم زاراوەیە دەڵێت (**مُراد: اسم علم مذكر، من الفعل "أراد"، معناه: المرغوب فيه، المأمول،**

**المطلوب**)، لای عاریفان سالیکی ڕێگەی خودا دوو جۆرە: **یەکەمیان** مورید (**مريد**)ە و **ئەوی تریان** موراد(**مراد**)، **مورید** سالیکێکە کە ڕێگەی سلوکی گرتۆتەبەر و خەریکی خوادۆزییە، **بەڵام موراد** ئەو کەسەیە خودا هەڵیبژاردووە و بووە بە بەشی خودا، بە ئەم چەند ئایەتە پیرۆزە بخوێنینەوە﴿وَٱصۡطَنَعۡتُكَ لِنَفۡسِي ﴿٤١﴾﴾ طه: ٤١ ﴿إِنَّ ٱللَّهَ ٱصۡطَفَىٰٓ ءَادَمَ وَنُوحٗا وَءَالَ إِبۡرَٰهِيمَ وَءَالَ عِمۡرَٰنَ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٣٣﴾﴾ آل عمران: ٣٣.

## حیکمەتی بیستەم

**((مَا أَرَادَتْ هِمَّةُ سَالِكٍ أَنْ تَقِفَ عِنْدَمَا كُشِفَ لَهَا إِلاَّ وَنَادَتْهُ هَوَاتِفُ الْحَقِيقَةِ الَّذِي تَطْلُبُ أَمَامَكَ، وَلاَ تَبَرَّجَتْ ظَوَاهِرُ الْمُكَوَّنَاتِ إِلاَّ وَنَادَتْكَ حَقَائِقُهَا ﴿إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ فَلَا تَكْفُرْ﴾ البقرة: ١٠٢))**

**راڤەی وشەکان:**

**همة السالك:** لێبڕانی سالیك(ڕێبواری ڕێگەی خودا)

**كشف لها:** پەردەی لەسەر لابرا

**نادته:** بانگی لێکرد

**هواتف الحقيقة:** دەنگی حەقیقەت

**الذي تطلب أمامك:** ئەوەی داوای دەکرێت لەبەردەمتایە

**تبرجت:** خۆی دەرخست(خۆی ڕووت کردەوە، جوانییەکانی خۆی دەرخست، خۆی پەتیارە کرد)

**ظواهر المكونات:** ڕووالەتی بوونەکان

**حقائقها:** حەقیقەتی بوون

**واتا ((هەردەمێك توانا و لێبڕانی ڕێبواری ڕێگەی خودا ویستی لەبەردەم ئەوەی پەردەی لەسەر لادراوە بوەستێت بانگی حەقیقەت هاواری لێدەکات و–پێی دەڵێت–: ئەوەی داوا دەکرێت و بەدوایدا عەودالڵن لەبەردەمتایە(لەپێشەوەیە)، هەرکاتێك ڕووالەتی بوون جوانییەکانی خۆی نمایش کرد ئەوا حەقیقەتی بوون بانگی لێدەکات– و پێی دەڵێت–: ئێمە بۆ ئێوە فیتنە و تاقیکردنەوەین بۆیە بێباوەڕ مەبن﴿إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ فَلَا تَكْفُرْ﴾البقرة: ١٠٢))**

## شرۆڤە:

۞ لە سەیروسلوکدا ڕێبواری ڕێگەی خودا نهێنی زۆری بۆ دەردەکەوێت، پەردە لەسەر چەندین ئەسرار لادەدرێت و خۆیانی بۆ دەخەنەروو، ڕووالەتی بوون جوانییەکانی خۆی نمایش دەکات بە مەبەستی سەرنج ڕاکێشانی سالیك، لێرەدا ئیبن عەتا هۆشداریمان پێدەدات و ئاگادارمان دەکاتەوە تاکو بەو نهێنی و جوانییە ڕووالەتیانە فریونەخۆین، لە سەیر و سلوك و بەرەوخوداچوون بەردەوام بین، هیچ وێستگەیەك ڕامان نەگرێت، هیچ بوونێك جگە لە بوونی خودا سەرنجمان ڕانەکێشێت، سالیك لە یەکەم هەنگاوەوە بڕیاری نەوەستانی داوە، ئەو خودای کردووە بە ئامانج و هەرچی شتی ترە وەلای ناوە﴿ قُلِ ٱللَّهَ أَعۡبُدُ مُخۡلِصٗا لَّهُۥ دِينِي ﴿١٤﴾ ﴾ الزمر: ١٤، تەنها خودای موتەعال دەپەرستم و ملکەچی و دینداریم تەنها بۆ ئەوە.

۞ ئەوەی ڕۆحانییەتی ئیسلام لە یۆگا جیادەکاتەوە سێ جیاوازییە:

**یەکەم:** گرتنەبەری ڕێگەی ڕۆحانییەت لە ئیسلامدا مەبەست تیایدا پەرستنی خودا و ڕازیکردنی ئەوە بەتەنها، بەڵام لە یۆگادا مەبەست بەدەستهێنانی کۆمەڵێك هێز و نهێنییە کە مەبەستی کەموکورت لە پشتیانەوەیە.

**دووەم:** ئەو هێزە ڕۆحییەی لە ڕۆحانییەتی ئیسلامدا بەدەست دەهێنرێت بۆ کار و مەبەستی دونیایی بەکارناهێنرێت، بەڵکو تەنها لە پەرستنی خودا و ڕازیکردنی ئەودا بەکاردەهێنرێت، لە یۆگادا بەو جۆرە نییە و بەکارهێنانێکی دونیایی لە پشتییەوە خۆی حەشارداوە.

**سێیەم:** پارێزگاری لەو نهێنییە پەردە لەسەر لادراوانە و باس نەکردن و بڵاوە پێنەکردنی یەکێکە لە خەسڵەتەکانی ڕۆحانییەت لە ئیسلامدا، لەکاتێکدا کەسی یۆگی نهێنییەکان پەخش دەکات و لای خۆی ناپارێزێت.

۞ ئیبن عەتا ئاماژە بە بەشێك لە ئایەتی (١٠٢) سورەتی (البقرة) دەکات کە لە باسی (هاروت و ماروت)دا هاتووە، پێم باشە لێرەدا هەندێك لەسەر ئەو ئایەتە پیرۆزە ڕابوەستین: خودای موتەعال بۆ تاقیکردنەوەی بەندەکانی دوو فریشتەی بەناوی(هاروت

و ماروت) ڕەوانەی سەر زەوی کرد، ئەم دوو فریشتەیە بە فرمانی خودا سیحریان لەگەڵ خۆیان هەڵگرتبوو، بەناو خەڵکیدا دەگەڕان و دەیانووت ئێمە سیحرمان لەلایە بەلاّم سیحرە و ئێمە بۆ ئێوە تاقیکردنەوەین، هەر کەس ئەم سیحرەمان لێوەربگرێت بێباوەڕ دەبێت بە خودا، بۆیە لێمان وەرمەگرن و بێباوەڕ مەبن﴿وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنْ أَحَدٍ حَتَّىٰ يَقُولَا إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ فَلَا تَكْفُرْ ﴾البقرة: ١٠٢، بەلاّم کۆمەڵێك کوفریان بەسەر باوەڕدا هەڵبژارد و سیحرەکەیان وەرگرت، لێرەوە شاری "بابل"ی کۆن بە سیحر و جادوو بەناوبانگ بوو، لەلایەن پاشای بابلییەکانەوە (نەبوخوزنەصر) هێرش کرایە سەر ئۆرشەلیم و بەنی ئیسرائیلییەکانی ژێردەستە کرد و بەدیلی هێنانی بۆ شاری بابل، لەم شارەدا بەشێك لە بەنی ئیسرائیلییەکان فێری سیحر و جادوو بوون، کاتێك ئازاد کران و گەڕانەوە فەلەستین گەشەیاندا بەم کارە شەیتانییە و کەوتنە بلاّوە پێکردنی بەناو مەردووماندا، ساحیرەکان و جادووبازەکانی بەنی ئیسرائیل دەسەلاّتیان پەیدا کرد و کەوتنە بانگەشەی بەدرۆزانینی هەموو ئەو پێغەمبەرانەی بۆیان ڕەوانە دەکران، گەر پێغەمبەرەکە ئایەتێك لەسەر دەستی ڕوویبدایە ساحیرەکان بە چەندین کاری سەیر و سەمەرەی جادووبازانە سەریان لە مەردوومان دەشێواند و ئایەتە ڕاستەقینەکەیان کەم بایەخ دەکرد و پێغەمبەرانیان بە دەسەلاّتداران بە کوشت دەدا، ویستی خودا وابوو سولەیمان(عليه السلام) بە هێزێکی مەزنەوە ڕەوانە بکات و هەرچی جین و شەیاتینە بکەوێتە ژێر دەسەلاّتی و بۆ کاری چاکە ڕامیان بهێنێت(موسەخەر بکات)، قورئان ئاماژە بەم تەسخیرکردنە دەکات و دەفەرموێت:﴿وَمِنَ ٱلشَّيَٰطِينِ مَن يَغُوصُونَ لَهُۥ وَيَعْمَلُونَ عَمَلًا دُونَ ذَٰلِكَ ۖ وَكُنَّا لَهُمْ حَٰفِظِينَ ﴿٨٢﴾ ﴾الأنبياء: ٨٢، هەندێ لە شەیتانەکان بۆ کاری سولەیمان دەچوونە قولاّیی دەریا و کاری تریان جگە لەوە بۆ ئەنجام دەدا، ئێمە پارێزگاریمان دەکردن و لێیان بەئاگابووین، سەرچاوەی سیحر و جادووی ساحیرەکان و جادووبازەکان -کە جینن و شەیاتین بوون- وشکی کرد، چونکە بە فەرمانی سولەیمان(عليه السلام) نەیاندەتوانی یارمەتی ساحیرەکان بدەن، هەر یەکێکیان پێچەوانەی فەرمانی ئەو کاری بکردبایە و سەرپێچی بنواندبایە گەورەترین سزای بۆ دەبڕایەوە ﴿وَمِنَ ٱلْجِنِّ مَن يَعْمَلُ بَيْنَ يَدَيْهِ بِإِذْنِ رَبِّهِۦ ۖ وَمَن يَزِغْ مِنْهُمْ عَنْ أَمْرِنَا نُذِقْهُ مِنْ عَذَابِ

ٱلسَّعِيرِ ﴿١٢﴾ ﴾سبأ: ١٢، سولەیمان(عليه السلام) هەرچی کتێبی سیحر و جادوو بوو کۆی کردەوە و لەژێر عەرشەکەیدا شاردییەوە، چونکە عەرشەکەی سولەیمان(عليه السلام) بە فەرمانی خودا پارێزراو بوو، دەستی هێزی شەڕ نەیدەتوانی بگاتە ئەو جێگەیە، لەدوای مردنی سولەیمان(عليه السلام) شەیتان هات و بە ساحیر و خەڵکەکەی وت کە سولەیمان ساحیر بووە و بە سیحر ئەو هێز و دەسەڵاتەی پەیدا کردووە، بەڵگەش لەسەر ساحیر بوونی هەموو ئەو کتێبانەی سیحرە کە لە ژێر عەرشەکەیدا شاردوویەتەوە، دەسەڵاتداران و ساحیرەکان هاتن و ژێر عەرشەکەیان پشکنی و بینییان کتێبی سیحری تیادا حەشار دراوە، لێرەوە بێباوەڕان کەوتنە فریودانی خەڵکی و دروست کردنی تۆمەت بۆ سولەیمان(عليه السلام) خودای موتەعال لە قورئاندا دەمکوتییان دەکات و ئەو تۆمەتە لەسەر پێغەمبەرەکەی خۆی لادەدات و دەفەرموێت:﴿وَٱتَّبَعُوا۟ مَا تَتْلُوا۟ ٱلشَّيَـٰطِينُ عَلَىٰ مُلْكِ سُلَيْمَـٰنَ ۖ وَمَا كَفَرَ سُلَيْمَـٰنُ وَلَـٰكِنَّ ٱلشَّيَـٰطِينَ كَفَرُوا۟ يُعَلِّمُونَ ٱلنَّاسَ ٱلسِّحْرَ ﴾البقرة: ١٠٢، یەهوودییەکان شوێنی ئەوە کەوتن کە شەیتانەکان دەربارەی موڵکی سولەیمان دەیانوت و دووبارەیان دەکردەوە (دەیانوت سولەیمان ساحیر بووە)، سولەیمان کوفری بە خودا نەکرد (واتە جادووی نەکردووە و ساحیر نەبوو) ئەوە شەیتانەکان (ساحیرەکان و شەیتانەکانی جن) بوون کوفریان کرد و سیحریان فێری خەڵکی دەکرد. ئیبن عەتا ئاماژە بە قسەکەی هاروت و ماروت دەکات کە دەیانوت "ئێمە بۆ ئێوە فیتنە و تاقیکردنەوەین خۆتان بێباوەڕ مەکەن و ئەم سیحرەمان لێوەرمەگرن"، جوانییەکانی بوون خۆی بۆ رێبواری رێگەی خودا نمایش دەکات، بەڵام حەقیقەتەکانی وەك هاروت و ماروت بە سالیکی رێگەی خودا دەڵێن: ئێمە بۆ ئێوە فیتنەین و بە ئێمەوە مەوەستن و لەسەر رێگەی بەرەو خوداچوونی خۆتان بەردەوام بن، خودا چۆن خەڵکی بە هاروت و ماروت تاقیکردەوە هەر بەو جۆرە رێبوارانی رێگەی خۆی بەو نهێنی و جوانییانەی بوون تاقیدەکاتەوە و پێویستە خۆی بەو وێستگانەوە نەبەستێتەوە و لە تەکانی بەرەو خوداچوونی خۆی بەردەوام بێت.

❁ ❁ ❁

# حیکمەتی بیست و یەك

((طَلَبُكَ مِنْهُ اتِّهَامٌ لَهُ، وَطَلَبُكَ لَهُ غَيْبَةٌ مِنْكَ عَنْهُ، وَطَلَبُكَ لِغَيْرِهِ لِقِلَّةِ حَيَائِكَ مِنْهُ، وَطَلَبُكَ مِنْ غَيْرِهِ لِوُجُودِ بُعْدِكَ عَنْهُ))

**راڤەی وشەکان:**

**طلبك منه:** داواکردنت لێی

**إتهام له:** تۆمەتبارکردنییەتی

**طلبك له:** داواکردنت بۆی

**غيبة منك عنه:** دیارنەمان و بزربوونتە لای ئەو

**طلبك لغيره:** داواکردنی شتێك جگە لە ئەو

**لقلة حيائك منه:** بەهۆی بێشەرمیتەوە لە ئەو

**طلبك من غيره:** داواکردن جگە لە ئەو

**لوجود بعدك عنه:** بەهۆی بوونی دوورییەوەیە لە ئەو

**واتا ((داواکردنت لە ئەو تۆمەتبارکردنی ئەوە، داواکردنت بۆی دیارنەمان و بزربوونتە لای ئەو، داواکردنی شتێك جگە لەو بەهۆی بێشەرمیتەوەیە لە ئەو، داواکردنت جگە لە ئەو بەهۆی بوونی دوورییەوەیە لە ئەو))**

**شرۆڤە:**

❁ لەم حیکمەتەدا ئیبن عەتا باس لە چوار جۆر داوا لە خودا دەکات:

❖ **داواکردنی پێویستییە مادی و مەعنەوییەکانت لە خودا:** گەر سالیکی ڕێگەی خودا پێیوابێت خودا تەنها بە داواکاری بەندەکانی پێویستییەکانیان جێبەجێ دەکات، یان خودی داواکەی لە خودا بە دەستەبەرکەری پێویستییەکانی خۆی بزانێت

ئەوە خودای خۆی تۆمەتبار کردووە و ئەو باوەڕەشی لە نەناسینی خوداوەیە، بەلاّم گەر داوا و دوعاکانی بە مەبەستی ئەنجامدانی بەندایەتی بێت ئەوە فەرمانێکی قورئانیی جێبەجێ کردووە و سوننەتێکی پێغەمبەری زیندوو کردۆتەوە، خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدْعُونِىٓ أَسْتَجِبْ لَكُمْ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِى سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ ﴿٦٠﴾ ﴾غافر: ٦٠، لە فەرموودەی شیرینی پێغەمبەردا هاتووە(دوعا مۆخی بەندایەتییە)، کەوابوو داوایەك تۆمەتبارکردنی خودایە کە پێت وابێت تەنها بەداوا خودا پێویستییەکانت جێبەجێ دەکات، یان کاریگەری دوعا و پاڕانەوەکەتە بووەتە هۆی ئەوەی پێویستییەکانت دەستەبەر ببێت، بەلاّم گەر دوعا و داوا بۆ نواندنی ملکەچی و بەندایەتی بێت ئەوە بەو کارەی خودای پەرستووە و لە خودا نزیکبووەتەوە.

❖ **گەڕان بەدوای خودادا (خوادۆزی) و داواکردنی ئەو(ﷻ) نیشانەی ئەوەیە کە سالیك خودای لێ بزر بووە،** بەلاّم خودا مەزنترە لەوەی لە بەندەکانی بزر ببێت، ئەو هەمیشە وەك خۆرێکی پرشنگدار دەدرەوشێتەوە و هیچ هەورێکی چلّکن ناتوانێت بەری بگرێت، بۆیە پێویستە لەسەر سالیك ئەو وەهمە لەلای خۆی بڕەوێنێتەوە کە خودا لە ئەو دوورە و ئەم دەیەوێت لێی نزیك ببێتەوە، لێرەوە ئەندێشەیەکی بۆ دروست دەبێت کە خودا لە شوێنێکە و ئەویش لە شوێنێکی تر و دەیەوێت لەو خودا مەزنە نزیك ببێتەوە، ئەو(ﷻ) بە هەمیشەیی لە ڕەگی بناگوێ لە بەندەکانی نزیکترە﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ وَنَعْلَمُ مَا تُوَسْوِسُ بِهِۦ نَفْسُهُۥ ۖ وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْ حَبْلِ ٱلْوَرِيدِ ﴿١٦﴾ ﴾ق: ١٦، ئێمە مرۆڤمان ئەفراند و دەزانین چ خەون و خەیالّێك بە دەروونیدا گوزەر دەکات، ئێمە لە ڕەگی بناگوێ لە ئەو نزیکترین.

❖ **گەڕان و عەودالّ بوون بۆ شتێك جگە لە خودا،** و داواکردنی شتێك لە خودا جگە لە خودا خۆی (لای ئیبن عەتا) بە بێشەرمی تەماشا دەکرێت، چونکە بڕیارە سالیکی ئەم ڕێگەیە جگە لە خودا شتێکی تری نەوێت، گەر شتێکی ویست بۆ خودا و لەبەر خودا دەیەوێت و دەیکات بە وەسیلەیەك بۆ ڕازیکردنی خودا لە خۆی، سالیك خۆی و مالّی بە خودا فرۆشتووە و خۆی بە خاوەنیان نازانێت، ئیتر چۆن

دەبێت جگە لە خودا شتێكی تری بوێت؟! چۆن دەبێت خۆی بە شتێكی تر بدات جگە لە خودا؟!

❖ **داواكردنی شتێك لە غەیری خودا** (لای ئیبن عەتا) **نیشانەی دووری ئەو كەسەیە لە خودا،** ئەو كە دەكەوێتە سەر رێگەی بەرەو خوداچوون هەموو داواكانی لای خودایە و بۆ خودایە، داواكردن لە غەیری خودا —بەبێ ئیزنی خودا- نیشانەی نەناسینی خودایە.

۞ ئەم مەقامە بەرزانەی باوەڕ تەنها كاتێك بەڕاست دەگەڕێن كە باوەڕدار پێی تێدەنێت، ئەم پلە بەرزانەی باوەڕ پەیوەستن بە بەرزی دڵ و دەروونەوە، بۆیە گەر حاڵت بەو جۆرە نەبوو تەنها متمانەت هەبێ و بەدرۆی مەزانە و دەستمەدە هێنانەوەی بەڵگەی رواڵەتی كە زۆرجار بەڵگەكانی تۆ بەڵگەی راستێتی بوونی ئەم پلە بەرزانەی باوەڕن.

۞ لەوانەیە بوترێت پێغەمبەر(ﷺ) بەو جۆرە نەبووە و چۆن دەبێت شوێنكەوتووانی پێغەمبەر(ﷺ) بانگەشە بۆ شتێك بكەن كە ئەو نەیكردبێت! سەرەتا دەبێ بزانین ئەو قسەیە بەو جۆرە نییە، چونكە پێغەمبەر(ﷺ) بە ئیبن عەبباس دەفەرموێت: (**فإذا سألت فاسأل الله**) گەر داوایەكت هەبوو تەنها لە خودا داوای بكە، (**وإذا استعنت فاستعن بالله**) گەر داوای كۆمەكی و یارمەتیت كرد تەنها لە خودا داوای بكە، پرسیارەكە ئەوەیە: ئایا یارانی پێغەمبەر(ﷺ) داوایەكیان لە خودا هەبووە بۆ حەزی دەروون و رازاندنەوەی دونیا، یاخود داواكانیان نواندنی ملكەچی و بەندایەتی بووە بۆ خودا و داوای شتێك كە وەك وەسیلەیەك لە بەندایەتی خودادا بەكاری بهێنن؟ بەدڵنیاییەوە یارانی تایبەتی پێغەمبەر(ﷺ) دوور بوون لەو جۆرە داوایانەی بۆ دونیا و حەزی نەفس بووبێت.

۞ كەوابوو ئەوەی خودا فەرمانی پێدەكات و دەفەرموێت:﴿ وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدۡعُونِيٓ أَسۡتَجِبۡ لَكُمۡ ﴾غافر: ٦٠، دوعا و داوایەكە دوو مەرجی تێدا هەبێت:

**یەكەم:** وەك بەندایەتی و ملكەچی بۆ خودا دوعا و داوایەكە پێشكەش بكات، چونكە دوعاكردن مۆخی عیبادەتە.

**دووەم:** داوای شتێك بكات كە بۆ خودا و لەپێناو رازیكردنی خودادا بێت، نەك تێركردنی حەزەكان و زەخرەفەی دونیایی، بۆیە باشترین داوا لە خودا ئەوەیە بڵێیت:
((**أللهم أعنا على ذكرك وشكرك وحسن عبادتك**-خودایە كۆمەكیمان بكە لە یادی خۆت و شوكری خۆت و بە باشی بەندایەتی كردنت))

# حیکمەتی بیست و دوو

((مَا مِنْ نَفَسٍ تُبْدِيهِ إِلاَّ وَلَهُ قَدَرٌ فِيكَ يُمْضِيهِ))

## ڕاڤەی وشەکان:

**نفس(بفتح الفاء)**: هەناسەدان

**تبديه**: دەریدەخەیت(هەڵیدەمژی و دەیدەیەوە)

**قدر**: بڕیار و نەخشەی خودایی

**يمضيه**: تێیدەپەڕێنێت

**واتا ((هیچ هەناسەیەکت نییە-کە هەڵیدەمژی و دەیدەیەوە- نەخشە و بڕیارێکی خودایی لەگەڵ نەبێت و بەسەر تۆدا تێینەپەڕێنێت))**

## شرۆڤە:

۞ دەبێ باوەڕمان وابێت کە نەخشەیەکی ورد لەودیوی بوونەوەیە، هەرچی جووڵە و وەستانە، مردن و ژیانە، قسە و کار و کردەوەی مرۆڤە لەناو ئەو نەخشە گشتگیرەدان، قورئان دەفەرموێت:﴿وَعِندَهُۥ مَفَاتِحُ ٱلْغَيْبِ لَا يَعْلَمُهَآ إِلَّا هُوَ ۚ وَيَعْلَمُ مَا فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ ۚ وَمَا تَسْقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلَّا يَعْلَمُهَا وَلَا حَبَّةٍ فِى ظُلُمَٰتِ ٱلْأَرْضِ وَلَا رَطْبٍ وَلَا يَابِسٍ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ مُّبِينٍ ﴿٥٩﴾﴾الأنعام: ٥٩، کلیلەکانی غەیب لەلای ئەوە و جگە لە ئەو کەس نایزانێت، دەزانێ چی لە وشکانی و دەریادایە، گەڵایەك ناکەوێتە خوارەوە زانستی پێی نەبێت، دەنکۆڵەیەك نییە لەناو تاریکاییەکانی زەویدا، تەڕی و وشکییەك نییە لە کتێبێکی ڕوون و ئاشکراکەردا نەبن.

۞ مرۆڤ و ویستی مرۆڤ ناتوانێت لەم نەخشە گشتگیرە لابدات، ئەوپەڕی تەکان بەخۆی دەدات و هەڵبژاردن ئەنجام دەدات و ویست و بڕیاری خۆی دەخاتەگەڕ، بەڵام لە چوارچێوەی نەخشە خوداییەکە ناچێتە دەرەوە، چۆن دەبێت چەندین ویست(الإرادة)

لەناو بووندا لەپاڵ ویستی خودادا بەرز ببێتەوە، چۆن دەکرێت ئیرادەیەك بوونی هەبێت لەدەرەوەی ئیرادەی خودای موتەعالەوە؟! مرۆڤ بۆخۆی چییە تا ویستەکەی ململانێی ویستی خودای موتەعال بکات؟! بۆ چەسپاندنی ئەم باوەڕە قورئان دەفەرموێت: ﴿وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٢٩﴾التكوير: ٢٩، ئێوەی مرۆڤ هیچ ویستێکتان بۆ نییە جگە ویستی "رب العالمين".

❁ ئەی خودای موتەعال لەسەر چی دادگا و بەهەشت و دۆزەخی داناوە ئەگەر هەموو ویستەکان لەناو ویستی بەرینی ئەودایە؟ خودای موتەعال خاوەنی ئیرادەیەکی گەردوونی گشتگیرە، هیچ بوونێك ناتوانێت لەو ویست و نەخشە خوداییە لابدات، وەك لە خاڵی پێشوو ئاماژەمان پێکرد، لەپاڵ ئەم ئیرادە گەردوونییەدا ئیرادەیەکی شەرعیش بۆ خودا بوونی هەیە کە لە ئایین و کتێبە ئاسمانییەکاندا بەیانی کردووە، ئێمە دەتوانین لە چیرۆکی ئادەمەوە(عليه السلام) ئەم دوو جۆرە ئیرادەیە تێبگەین، خودای موتەعال ئادەم و هاوسەرەکەی دروست دەکات و لە باخچەیەکی بەهەشت ئاسادا کە هەرچی خواردن و خواردنەوەیە تێیدا بوو نیشتەجێیان دەکات، لەو بەهەشتەدا ئازادیان دەکات و هەموو شتێکیان دەخاتە بەردەست جگە لە تەنها یەك درەخت کە ئاگاداریان دەکاتەوە تاکو لەبەری ئەو درەختە نزیك نەبنەوە و لێی نەخۆن، چونکە بەو کارەیان ئەو شوێنە خۆشە لەدەست دەدەن و خۆیان رووبەڕووی شەقاوەت دەکەنەوە، شەیتان وەسوەسەی بۆ دروست کردن و بە ئادەمی وت: بۆیە خودا نەهی لێکردوون لە خواردنی بەری ئەو درەختە تاکو نەبن بە فریشتە و نەمریی بەدەست نەهێنن ﴿فَوَسۡوَسَ لَهُمَا ٱلشَّيۡطَٰنُ لِيُبۡدِيَ لَهُمَا مَا وُۥرِيَ عَنۡهُمَا مِن سَوۡءَٰتِهِمَا وَقَالَ مَا نَهَىٰكُمَا رَبُّكُمَا عَنۡ هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةِ إِلَّآ أَن تَكُونَا مَلَكَيۡنِ أَوۡ تَكُونَا مِنَ ٱلۡخَٰلِدِينَ ٢٠﴾الأعراف: ٢٠، دەتەوێت درەختی نەمریی و مولکی هەتاهەتاییت پێ نیشان بدەم؟﴿فَوَسۡوَسَ إِلَيۡهِ ٱلشَّيۡطَٰنُ قَالَ يَٰٓـَٔادَمُ هَلۡ أَدُلُّكَ عَلَىٰ شَجَرَةِ ٱلۡخُلۡدِ وَمُلۡكٖ لَّا يَبۡلَىٰ ١٢٠﴾طه: ١٢٠، هەردووکیان بە قسەکانی شەیتان باوەڕیان کرد و لەبەری درەختەکەیان خوارد﴿فَأَكَلَا مِنۡهَا فَبَدَتۡ لَهُمَا سَوۡءَٰتُهُمَا وَطَفِقَا يَخۡصِفَانِ عَلَيۡهِمَا مِن وَرَقِ ٱلۡجَنَّةِۚ وَعَصَىٰٓ ءَادَمُ رَبَّهُۥ فَغَوَىٰ ١٢١﴾طه: ١٢١، هەموویان لە بەهەشت دەرکران و رەوانەی سەر زەوی کران، لێرە و

لەسەر ئەم زەوییە ململانێکانی نێوان خێر و شەڕ دەستی پێکرد، خودا بە ناردنی پێغەمبەران(علیهم السلام) و شەیتانیش بە ناردنی سەربازەکانی خۆی﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱلطَّٰغُوتِ فَقَٰتِلُوٓاْ أَوۡلِيَآءَ ٱلشَّيۡطَٰنِۖ إِنَّ كَيۡدَ ٱلشَّيۡطَٰنِ كَانَ ضَعِيفًا ﴿٧٦﴾ ﴾النساء: ٧٦

تێڕامانێك لەم چیرۆکە دەمانگەیەنێتە چەند ڕاستییەك: خودای موتەعال بە ئیرادە گەردوونییەکەی بڕیاری دابوو ئادەم لەسەر زەوی وەك جێنشینێك نیشتەجێ بکات، ئەو(ﷻ) بەر لە خەلقی ئادەم بە فریشتەکانی فەرموو:دەمەوێت جێنشینێك لەسەر زەوی دابنێم" ﴿وَإِذۡ قَالَ رَبُّكَ لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٞ فِي ٱلۡأَرۡضِ خَلِيفَةٗۖ ﴿٣٠﴾ ﴾البقرة: ٣٠، ئادەم دروست دەکات و لەو بەهەشتە تایبەتەدا نیشتەجێی دەکات و درەختێکی لێ قەدەغە دەکات، ئەم قەدەغە کردنە بۆ تاقیکردنەوەی مرۆڤە و بریتییە لە ئیرادەیەکی شەرعی، لەناو ئیرادە گەردوونییەکەدا بڕیاردراوە ئادەم لەسەر زەوی نیشتەجێ ببێت، بەلاّم هۆی ئەو دەرچوونەی لە بەهەشت و ڕەوانەکردنی بۆ سەر زەوی ئەو فەرمان شکێنییەیە کە لێیان دەوەشێتەوە، ئەوان بەهۆی گوناهێکەوە لە بەهەشت دەرکران، بەلاّم دەرکردنیشیان دیسان لەناو ئیرادە گەردوونییە گشتگیرەکەدایە، ئایا ئادەم و حەوا دەیانتوانی باوەڕ بە وەسوەسەی شەیتان نەکەن؟ بەڵێ، دەیانتوانی بەلاّم لە ئیرادە گەردوونییە خوداییەکە دەرنەدەچوون و هەر ئەوە دەردەچوو کە خودا نەخشەی بۆ کێشابوو، بەلاّم بۆچی ئادەم و هاوسەرەکەی بەگوێی شەیتان دەکەن و مرۆڤ ڕووبەڕووی ئەم چارەنووسە دەکەنەوە؟ چونکە ئەوان تا ئەو ساتەی شەیتان بە گوێیاندا دەچرپێنێت ئەزموونی قسەی درۆیان لەلا نەبوو، کەسێکیان نەبینی بوو درۆ بکات، هەموو قسەیەك لەلایان ڕاست و دروست بوو، بەلاّم خۆ خودای موتەعال هۆشداری پێدان دەربارەی شەیتان و پێی فەرموون شەیتان دوژمنی ئێوەیە﴿ فَدَلَّىٰهُمَا بِغُرُورٖۚ فَلَمَّا ذَاقَا ٱلشَّجَرَةَ بَدَتۡ لَهُمَا سَوۡءَٰتُهُمَا وَطَفِقَا يَخۡصِفَانِ عَلَيۡهِمَا مِن وَرَقِ ٱلۡجَنَّةِۖ وَنَادَىٰهُمَا رَبُّهُمَآ أَلَمۡ أَنۡهَكُمَا عَن تِلۡكُمَا ٱلشَّجَرَةِ وَأَقُل لَّكُمَآ إِنَّ ٱلشَّيۡطَٰنَ لَكُمَا عَدُوّٞ مُّبِينٞ ﴿٢٢﴾ ﴾الأعراف: ٢٢، بەڵێ، خودا پێشتر هۆشداری پێدابوون، بەلاّم دیسان مانای "دوژمن"یان نەدەزانی و ئەزموونی دوژمنکارانەی شەیتانیان لەلا نەبوو، کە گوناهەکە ئەنجام دەدەن ئەوجا تێدەگەن "دوژمن"، "درۆ"، "فریوخواردن" چ مانایەکی هەیە.

❁ خودا بۆ هەڵبژاردەکانی خۆی قەدەری تایبەتی دارِشتووە، ئەوان موورادی خودان و بۆ کاری مەزن هەڵیبژاردوون، خودای موتەعال بە موسا(عليه السلام) دەفەرموێت: "تۆ بە قەدەرێك هاتوویە ئێرە"، لەدایکبوونت و دانەدەم ئاو و چوونە ماڵی فیرعەون و گەورەبوون لەناو کۆشکی فیرعەوندا و کوشتنی کەسێك لە فیرعەونییەکان و هەڵهاتن بۆ مەدائین و دە ساڵ شوانی و ئاوارەبوون و دواتر برِیاری گەرِانەوە بۆ لای خزم و کەسوکار تا گەیشتنە ئەم دۆڵە و دامێنی ئەم چیایە هەمووی بە قەدەرێکی تایبەت بووە:

﴿إِذْ أَوْحَيْنَا إِلَىٰ أُمِّكَ مَا يُوحَىٰ ﴿٣٨﴾ أَنِ اقْذِفِيهِ فِي التَّابُوتِ فَاقْذِفِيهِ فِي الْيَمِّ فَلْيُلْقِهِ الْيَمُّ بِالسَّاحِلِ يَأْخُذْهُ عَدُوٌّ لِّي وَعَدُوٌّ لَّهُ ۚ وَأَلْقَيْتُ عَلَيْكَ مَحَبَّةً مِّنِّي وَلِتُصْنَعَ عَلَىٰ عَيْنِي ﴿٣٩﴾ إِذْ تَمْشِي أُخْتُكَ فَتَقُولُ هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَىٰ مَن يَكْفُلُهُ ۖ فَرَجَعْنَاكَ إِلَىٰ أُمِّكَ كَيْ تَقَرَّ عَيْنُهَا وَلَا تَحْزَنَ ۚ وَقَتَلْتَ نَفْسًا فَنَجَّيْنَاكَ مِنَ الْغَمِّ وَفَتَنَّاكَ فُتُونًا ۚ فَلَبِثْتَ سِنِينَ فِي أَهْلِ مَدْيَنَ ثُمَّ جِئْتَ عَلَىٰ قَدَرٍ يَا مُوسَىٰ ﴿٤٠﴾ وَاصْطَنَعْتُكَ لِنَفْسِي ﴿٤١﴾﴾

طه:٣٨-٤١، خودای موتەعال دەیەوێت بە هەڵبژاردەکەی خۆی (موسا)(عليه السلام) بفەرموێت: هەموو ئەوانەی لە منداڵییەوە بەسەر تۆدا هاتووە تا ئێستا بە نەخشەیەکی خودایی بووە و تۆ لەناو قەدەرێکی خوداییدا جوولاّویت، لێرە بەدواوەش لەناو هەمان قەدەری خوداییدایت، پێویستە ئەو ئەرکە مەزنە رابپەرێنیت کە خودا بۆت دیاری دەکات، من تۆم بۆ خۆم و بۆ کاری مەزنی خۆم ئامادە کردووە ﴿وَاصْطَنَعْتُكَ لِنَفْسِي ﴿٤١﴾﴾، سالیکانی رێگەی خوداش لەوانەن خودا منەتی پلە بەرزەکانی ئیمانی پێبەخشیون، بۆیە لەژێر قەدەرێکی تایبەتی خوداییدان و هەناسەیەك بەسەریاندا تێناپەرێت قەدەرێکی خودایی بەسەریاندا گوزەر نەکات، ئەوان پێویستە ئاگاداری قەدەرەکان بن، بزانن چۆن مامەڵە لەگەڵ قەدەرە خوداییەکاندا دەکەن، لەبەردەم قەدەرە تاڵ و ناخۆشەکاندا ئارام بگرن و بۆ قەدەرە باش و شیرینەکانیش شوکری خودا بکەن، متمانەیان بە خودا هەبێت کە هەردوو جۆرە قەدەرەکە بۆ ئەوان پێویستە و بەشێکە لە پێویستییەکانی بەرەوخوداچوون، ململانێ لەگەڵ قەدەرەکاندا سالیکی رێگەی خودا رووبەرِووی لادان دەکاتەوە و باری ئیمانی کامڵی ناگاتە مەنزڵ.

۞ خودای موتەعال هەر رۆژێك لە مەزنی و شانوشكۆیەكدایە﴿ يَسۡـَٔلُهُۥ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ كُلَّ يَوۡمٍ هُوَ فِي شَأۡنٖ ﴿٢٩﴾ ﴾الرحمن: ٢٩، كات بەسەر خودادا گوزەر ناكات، كات بۆ خۆی مەخلوقە و لەگەڵ بووندا سەریهەڵداوە، بوون و گەردوون لە خەزێنەی نەبڕاوەی خوداوە هەڵقولاون، هەرچی لە بووندایە وابەستەی بوونی خودایە، بوون بەبێ خودا بوونێكی راستەقینە نییە و لەسەر خودی خۆی رانەوەستاوە، خودای موتەعالە رایگرتووە و بوونی پێبەخشیوە﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُمۡسِكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ أَن تَزُولَاۚ وَلَئِن زَالَتَآ إِنۡ أَمۡسَكَهُمَا مِنۡ أَحَدٖ مِّنۢ بَعۡدِهِۦٓۚ إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورٗا ﴿٤١﴾ ﴾ فاطر: ٤١-خودا ئاسمانەكان و زەوی راگرتووە تاكو تیانەچن و زەوالیان بەسەردا نەیەت، گەر زەوالیان بەسەردا هات كێ هەیە جگە لە ئەو بوونیان پێ ببەخشێتەوە و رایانبگرێت، خودا حەلیم و لێبوردەیە..

فیزیای چەندێتی دەڵێت: گەردوون لە شێوەی تۆپێكدایە، بنچینەی ئەم تۆپە زەبەلاحە بریتییە لە وزە، ئەم وزەیە كەمتر لە هەزاران بەشی چركەیەك دەكوژێتەوە و دادەگیرسێتەوە، هەروەك كوژانەوە و پێبوونەوەی ئەو گڵۆپەی ئێمە لەبەریدا دادەنیشین و وادەزانین بە بەردەوامی دەگرێت، لە راستیدا گڵۆپەكە بەبەردەوامی دەكوژێتەوە و دادەگیرسێتەوە، بەڵام ئەوەندە ماوەی نێوان كوژانەوە و پێبوونەوە كەمە ئێمە وەهمی ئەوەمان بۆ دروست دەبێت كە گڵۆپەكە بەبەرداوامی لە پێبوون و بەخشینی رووناكیدایە، كەوابوو صیفەتی "القیوم"ی خودایە ئەم بوونەی راگرتووە﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُ ﴾البقرة: ٢٥٥، مرۆڤ بەبەرداوامی لەگەڵ بووندا جەستەی زەوالی بەسەردا دێت، بەڵام خودا جارێكی تر بوون و شێوەی پێ دەبەخشێتەوە، تەنانەت بەخشینەوەی بوون بە ئەو مرۆڤانەی باوەڕیان بە بوونی خودا نییە یاخود هاوەڵی بۆ بڕیار دەدەن، یان ئەهلی تەوحیدن، بەڵام گوناهان ئەنجام دەدەن، لێرەوە مرۆڤ لە حەلیمی و لێبوردەیی خودا حاڵی دەبێت، خەلقێك زەوالی بەسەردا دێت و دەچێتە جیهانی نەبوونەوە، بەڵام خودا خەلقی پێ دەبەخشێتەوە و دەیهێنێتەوە بۆ ناو بوون، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو خەلقە(مرۆڤ و جین) بێباوەڕی بە خودا دەكەن و سەرپێچی فەرمانەكانی دەكەن، ئەمەیە نهێنی كۆتایی ئایەتە پیرۆزەكە(فاطر:٤١) كە دەفەرموێت:

(إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا فَمَن، جێگەی سەرنجە لە باسی ئاسمانەکان و زەویدا خودا بفەرموێت: (إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا )، بەلاَم کە تێدەگەین ئێمە بەبەردەوامی زەوال و تیاچوونمان بەسەردا دێت و خودا بە هەمیشەیی بوون بە ئێمە دەبەخشێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا ئێمەی مرۆڤ ملکەچی ئەو خودا مەزنە نابین، تێدەگەین ئەوە صیفەتی (الحلیم) و (الغفور)ی ئەو خودا مەزنەیە ئێمە نغرۆی جیهانی عەدەم ناکات، چ کەسێك هەیە جگە لە خودا بوون بە مەخلوقێك ببەخشێت سەرپێچی فەرمانەکانی بکات و دان بە مەزنی و شکۆمەندی ئەودا نەنێت؟! ئەوە تەنها خودای حەلیم و لێبوردەیە ئەو مەزنی و شکۆمەندییەی لیّ دەبینرێت.

❁ هەر کاتێك سالیکی رێگەی خودا درکی ئەم نهێنییە مەزنەی کرد، ئیتر لەبەردەم ئەو خودا مەزنەدا تەخت دەبێت و بەشی خۆی و خەڵکی لە خۆیدا لادەبات و دەبێت بە بەندەیەکی گوێڕایەڵی ئارام و ملکەچ، تێدەگات بوونی راستەقینە تەنها بۆ خودایە و ئەو بەشێك لە هەزاران بەشی چرکەیەك کات ناتوانێت بەبیّ خودا بژی، خودایە هەناسەی پیّ هەڵدەمژێت و خودایە هەناسەی پێدەداتەوە، خودایە لە نێوان ئەو دوو هەناسەدا وەستانێکی پیّ دەکات، هەر بەو جۆرە لێدانی دڵ و بینین و بیستنی، بیرکردنەوە و ژنەوتنی، خواردن و خواردنەوە و خەوتنی، قسە و کردار و رەفتاری، لەساغی و نەخۆشی، دەوڵەمەندی و هەژاری، ناوبانگ و بێناوی، تەواوی جووڵە و وەستانی لەژێر دەسەلاّتی خودادایە و ئەوە بەندەکەی خۆی هەڵدەسوڕێنێت.

❁ ❁ ❁

# حیکمەتی بیست و سێیەم

((لاَ تَتَرَقَّبْ فُرُوغَ الأَغْيَارِ فَإِنَّ ذَلِكَ يَقْطَعُكَ عَنْ وُجُودِ الْمُرَاقَبَةِ لَهُ فِيمَا هُوَ مُقِيمُكَ فِيهِ))

**ڕاڤەی وشەکان:**

**لا تترقب**: چاودێری مەکە

**فراغ الأغيار**: کۆتاهاتنی نەیار

**يقطعك**: داتدەبڕێت

**المراقبة**: چاودێری

**مقيمك فيه**: تۆی تیا داناوە

**واتا ((چاودێری کۆتاهاتنی نەیار مەکە، چونکە ئەو کارە داتدەبڕێت لە چاودێری ئەوەی کە خودا تۆی تیا داناوە))**

**شرۆڤە:**

نەیار(أغيار) بریتییە لە هەموو ئەو شتانەی سالیکی ڕێگەی خودا سەرقاڵ دەکەن و لە کارە سەرەکییەکە لای دەدەن، ئیبن عەتا داوامان لێدەکات سەرنجی ئەو سەرقاڵیانە نەدەین و چاودێری کۆتاهاتنیان نەکەین، چونکە بەو چاودێری و چاوەڕوانییە خۆمان سەرقاڵ دەکەین و لە کارە سەرەکییەکە -کە بریتییە لە یادی خودا و ئامادەبوونی دڵ لە خزمەتیدا- دووردەکەوینەوە، هەندێ لە ساڵحان دەگەنە قۆناغێك لابەلای شەیتانیشدا -کە گەورەترین دوژمنی مرۆڤە- ناکەنەوە، چونکە پێیان وایە خەریك بوون بەو دوژمنەوەو بیرکردنەوەی بەردەوام لە فێڵ و پیلانەکانی لە یادی خودا و ئەنجامدانی کارو کردەوەی چاکە دایان دەبڕێت، لێرەدا مەبەست ئەوە نییە مرۆڤ شەیتان بە دوژمنی خۆی تەماشا نەکات، نەخێر، لەوانەیە زۆر سەرقاڵ بوون بە شەیتانەوە و

دابڕان لە یادی خودا لە بنچینەدا فێڵێکی شەیتان بێت، واتە شەیتان خۆیمان لێ گەورە بکات و بە هەمیشەیی بیرکردنەوە لە ئەو داگیرمان بکات، ئەمەش لە یادی خودا دوورمان دەخاتەوە و دەکەوینە ناو یادی شەیتانەوە با بۆ رق لێبوونیش بێت، یان بۆ سەرنجدان بێت لە فێڵ و پیلانەکانی.

۞ ۞ ۞

# حیکمەتی بیست و چوارەم

((لاَ تَسْتَغْرِبْ وُقُوعَ الأَكْدَارِ مَا دُمْتَ فِى هَذِهِ الدَّارِ فَإِنَّهَا مَا أَبْرَزَتْ إِلاَّ مَا هُوَ مُسْتَحِقٌ وَصْفِهَا وَوَاجِبُ نَعْتِهَا))

## راڤەی وشەکان:

**لا تستغرب:** لات نامۆ نەبێت

**وقوع:** روودان

**الأكدار:** کۆی"کدر"ە، لێڵی، هەموو ئەو بار و دۆخانەی دێتە بەردەم سالیکی ڕێگەی خودا و لێڵی دەکات و صەفای لێ دەشێوێنێت

**ما دمت:** هەتا بمێنیتەوە

**هذه الدار:** ژیانی دونیا

**أبرزت:** دەریخست

**نعتها:** وەصفی(ئەو شتە)

**واتا ((هاتن و روودانی لێڵییەکانت لا نامۆ نەبێت تا لەم خانەی دونیایەدا بمێنیتەوە، شتێك دەرناکەوێت و وەصفێك نابێت بەناو مەگەر ئەو وەصفە شایستەی شتەکە بێت و پێیەوە لکابێت))**

## شرۆڤە:

۞ ڕێگەی بەرەو خوداچوون بە گوڵ فەرشڕێژ نەکراوە، پڕە لە کۆسپ و لەمپەر و ئازار، ئەوانەی ئەم ڕێگەیە دەگرنەبەر پێویستە هەر لە سەرەتاوە خۆیان بۆ ئازار و مەینەتی ئامادە بکەن.

۞ لە قاموسی **"لسان العرب"**دا لەسەر وشەی**"الفتنة"**هاتووە(**الفتنة: الإبتلاء و الإمتحان و والإختبار، وأصلها مأخوذ من قولك "فُتنت الذهب" إذا اذبتها بالنار لتمييز**

**الرديء من الجيد**)، واته: فتنه بریتییه له موبتەلاكردن و تاقیكردنەوه و تاوتوێكردن، بنچینەكەی له دەستەواژەی"زێڕەكەم تاقیكردەوه" هاتووه، كاتێك بتەوێت به ئاگر بیتوێنیتەوه تاكو خەوش له زێڕه پالْفتەكه جیاببێتەوه. بۆ دەبێت خودای موتەعال خۆشەویستان و هەلْبژاردەكانی خۆی رووبەڕووی بەلاَ و نارەحەتی بكاتەوه؟ له قورئاندا هەموو ئەو بەلاَیانه به "فتنة" ناوبراون﴿ أَحَسِبَ ٱلنَّاسُ أَن يُتْرَكُوٓاْ أَن يَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا وَهُمْ لَا يُفْتَنُونَ ﴿٢﴾ وَلَقَدْ فَتَنَّا ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۖ فَلَيَعْلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَلَيَعْلَمَنَّ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٣﴾ ﴾ **العنكبوت:٢–٣**، خەلْكی واحساب دەكەن هەر ئەوەنده بلێن "باوەڕمان هێناوه" رووبەڕووی فیتنەیان ناكەینەوه؟ ئەوانەی پێش ئەوانمان تاقیكردەوه تاكو راستگۆیان و درۆزنان لەیەكتر جیاببنەوه.. ئەو بەلاَیانه سەرچاوەی پاكبوونەوەی باوەڕدارانن، رێگەیەكه بۆ دەرخستنی بانگەكارانی باوەڕ و باوەڕدارانی راستەقینه، جیاكردنەوەی ریزی خواناسان و خواویستانه له ڕیزی خۆپەرستان و دونیاپەرستان.

❁ ئیبن عەتا زۆر بەكورتی و تاڕادەیەكیش تەمومژاویی ئاماژه بەحەقیقەتێك دەكات كه بەشێك له راڤەكارانی حیكمەتەكانی ئیبن عەتا بەدروستی لێی حالّی نەبوون و هەندێ جار دوور بۆ شەرحی حیكمەتەكه دەچن، ئەویش ئەم بەشەی حیكمەتەكەیه كه دەلێت (**فإنها ما أبرزت إلا ما هو مستحق وصفها، وواجب نعتها**)، له قورئاندا ئەم ژیانەی ئێمه تیایدا دەژین به﴿ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا ﴾ ناوبراوه، له چەند شوێنی قورئاندا كاتێك وشەی (**حياة**) لەگەلْ (**دنيا**) دێت هەردوو وشەكه (**أل**)یان لەسەره، واته ئەم دوو وشەیه (**صفة و موصوف**)ن نەك (**مضاف و مضاف إليه**)، چونكه ئەگەر (**مضاف و مضاف إليه**) بوونایه وشەی (**حياة**) ئەلف و لامی وەرنەدەگرت، وەك ئاشكرایه له زمانی عەرەبیدا(**مضاف**) ئەلف و لام وەرناگرێت، بۆیه وشەی (**الدنيا**) دەبێته وەصف بۆ وشەی (**الحياة**) و ماناكەی دەبێت به "ژیانه نزمەكه" نەك "ژیانی دونیا"، بەرانبەر ئەم ژیانه نزمه خودای موتەعال باسی ژیانێكی تێرو تەواومان بۆ دەكات و دەفەرموێت:﴿وَمَا هَٰذِهِ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَآ إِلَّا لَهْوٌ وَلَعِبٌ ۚ وَإِنَّ ٱلدَّارَ ٱلْءَاخِرَةَ لَهِىَ ٱلْحَيَوَانُ ۚ لَوْ كَانُواْ يَعْلَمُونَ ﴿٦٤﴾ ﴾ **العنكبوت: ٦٤**، ئەم ژیانه نزمه هیچی تر نییه جگه له یاری و گالْته و گەپ، خانه كۆتاییەكه بریتییه له ژیانی تێر و تەواو، گەر بیانزانیبایه.. ئیبن

عەتا دەفەرموێت:: وشەی (**الدنیا**) کە وەصفە دەرکەوتووە و هاتۆتە پێشەوە و خۆی کردووە بە "ناو" بۆ ژیانێکی کەموکورت، ئەم گۆڕینی وەصفە بۆ ناو ڕوونادات مەگەر وەصفەکە پڕاوپڕی ناوەکە بێت و وەك صیفەتێك هەمیشە لەگەڵیدا بێت و لێی جیانەبێتەوە، جا گەر وەصفی کەموکورتی و ناتەواویی ببێت بە ناوی ئەم جۆرە ژیانە کەوابوو هەمیشە خۆت بۆ ئازار و مەینەتی ئامادە بکە، چونکە ئێرە ژیانی کامڵ و تێروتەواو نییە.

۞ ۞ ۞

# حیكمەتی بیست و پێنجەم

((مَا تَوَقَّفَ مَطْلَبٌ أَنْتَ طَالِبُهُ بِرَبِّكَ، وَلاَ تَيَسَّرَ مَطْلَبٌ أَنْتَ طَالِبُهُ بِنَفْسِكَ))

**راڤەی وشەكان:**

**ما توقف:** نەوەستاوە

**مطلب:** داوایەك

**طالبە بربك:** بە خوداوە داواكاری بیت

**ولا تیسر:** ئاسان نەبووە

**طالبە بنفسك:** بە حەزەكانتەوە داواكاری بیت

**واتا ((داوایەك نەوەستاوە (لەلای خودا) گەر بەخوداوە داواكاری بیت، داوایـەك ئاسان نەبووە گەر بە حەزەكانتەوە داواكاری))**

**شرۆڤە:**

۞ لە حیكمەتی بیست و یەكدا ئیبن عەتا ئاماژەی بە چوار جۆر داوا كرد، لە راڤەكردنەكەیدا وتمان داوا لە خودا پێویستە دوو مەرجی تێدابێت: **یەكەمیان** وەك بەندایەتی و ملكەچی بۆ خودا داوا لە خودا بكەیت، چونكە دوعا و پاڕانەوە عیبادەتە، **دووەمیان:** پێویستە ئەو داوایە پێویستی گەلێك بێت كە بكرێنە وەسیلەیەك بۆ رازیكردنی خودا و هەنگاونان بەرەو خودا، واتە داوای حەز و شەهەوات نەبێت.

۞ لـەم حیكمەتەشـدا ئـیبن عـەتا تەئكیـد لەسـەر ئـەوەی پێشـتر دەكاتـەوە و دەفەرموێت:: هەر داوایەك بۆ خودا و لەبەر خودا بێـت لـەلای خـودا رەدناكرێتـەوە و وەستانی بۆ نییە، بەپێچەوانەوە هەر داوایەك بۆ حەزی نەفس و دونیا بێت ئاسـانكاری بـۆ ناكرێـت و ناگاتـە ئـەنجام، داوا و دوعاكەشـی ناچـێتە خانـەی ملكەچـی و بەندایەتییەوە.

۞ لەم حیکمەتەدا مانایەکی تر دەردەکەوێت ئەویش ئەوەیە: کاتێك مرۆڤ تەزکیە دەبێت و بۆ پلەی بەرزی پاڵفتەبوون(**مزکی**) بەرزدەبێتەوە بە نووری ئەسمائو صیفاتی خودای موتەعال رۆشن دەبێتەوە و خۆی بەو ناوە جوانانە دەڕازێنێتەوە ئا لەو ئاستە بەرزەی ئیماندا داواکانی دەبێت بە داوای خودا و بە فەرمانی **"کن فیکون"** بۆی جێبەجێ دەبێت، لە فەرموودەی شیرینی پێغەمبەردا(ﷺ) هاتووە: دەبم بەو گوێیەی پێی دەبیستێ، دەبم بەو چاوەی پێی دەبینێت، دەبم بەو دەستەی دەیوەشێنێت، دەبم بەو لاقەی پێی دەڕوات، گەر داوام لێ بکات پێی دەبەخشم، گەر پەنام پێ بگرێت پەنای دەدەم.[٥]

۞ ۞ ۞

---

٥ (عن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (صلى الله عليه وسلم ) إن الله تعالى قال: من عادى لي ولياً فقد آذنته بالحرب، وما تقرب إلي عبدي بشيء أحب إلي مما افترضته عليه، ولا يزال عبدي يتقرب إلي بالنوافل حتى أحبه، فإذا أحببته كنت سمعه الذي يسمع به، وبصره الذي يبصر به، ويده التي يبطش بها، ورجله التي يمشي بها، ولئن سألني لأعطينه، ولئن استعاذني لأعيذنه، وما ترددت عن شيء أنا فاعله ترددي عن نفس المؤمن يكره الموت وأنا أكره مساءته) رواه البخاري.

# حیکمەتی بیست و شەش

((مِنْ عَلاَمَاتِ النُّجْحِ فِي النِّهَايَاتِ: الرُّجُوعُ إِلَى اللهِ تَعَالَى فِي الْبِدَايَاتِ))

## راڤەی وشەکان:

**علامات:** کۆی (علامة)یە، نیشانە

**النجح:** سەرکەوتن و زەفەرپێبردن، گەیشتنە ئەنجام

**النهایات:** کۆتاییەکان

**الرجوع إلى الله:** گەڕانەوە بۆ لای خودا

**البدایات:** سەرەتاکان

**واتا ((لە نیشانەکانی گەیشتن بە ئەنجام و زەفەرپێبردن لە کۆتاییەکاندا گەڕانەوەیە بۆ لای خودا لە سەرەتاکاندا))**

## شرۆڤە:

❁ عاریفانی ڕێگەی خودا دەڵێن: ((**من حسنت بدایته حسنت نهایته**)) هەرکەس سەرەتاکانی بەرەو خوداچوونی باش بێت کۆتاییەکانیشی باش ئەبێت، سەرەتای دەستپێکردنی گەشت بەرەو خودا مەزنترین هەنگاوە، ئەو سەرەتایە دەبێتە بناغە بۆ کۆشکی باوەڕی ڕێبواری ڕێگەی خودا، ئەو دەبێت بزانێت:

**أ-** ئەم گەشتە بۆ دەکات و بۆ کێی دەکات، دەیەوێت هێزێکی مەعنەوی بەدەست بهێنێ و پێی ناودار ببێت؟ دەیەوێت بە زاهید و دونیانەویست ناوبانگ دەربکات؟ دەیەوێت نهێنییەکانی ناخی خۆی کەشف بکات؟ یان دەیەوێت ڕێگەی خوداناسی و بەندایەتی بۆ خودا بگرێتەبەر و ببێت بە بەندەیەکی ملکەچ بۆ ئەو(ﷻ)؟

**ب**- لەم گەشتەدا شان لەسەر چی دادەدات، خودای موتەعال، یان توانا کەموکورتەکانی خۆی؟ ئەوانەی بە هەمیشەیی بۆ لای خودا دەگەڕێنەوە و خۆیان رادەستی ئەو دەکەن کۆتاییەکانیان گەیشتنە بە باوەڕی تێروتەواو، خواناسان دەڵێن ((**من ظن أنه يصل إلى الله بغير الله قطع به، ومن استعان على عبادة الله بنفسه وكل إلى نفسه**-هەرکەس وا گومان دەبات بەبێ کۆمەك و یارمەتی خودا دەگاتە خودا رێگەی لێدەگیرێت و توانای سەفەری نامێنێت، هەرکەس بیەوێت تەنها بە کۆمەکی نەفسی عیبادەتی خودا بکات دەدرێتە دەست نەفسی خۆی))، رێبواری رێگەی خودا پاڵپشت و کۆمەکی تەنها خودایە، ئەو شان لەسەر تواناکانی خۆی دانادات، تەنانەت شان لەسەر عیبادەت لە نوێژ و رۆژ و دانادات، کە دەڵێین شان لەسەر عیبادات دانادات مەبەستمان ئەوەیە بە عیبادەتەکانی لەسەر خودا پێویستی ناکات کە دەبێت لە خۆتم نزیك بکەیەوە، خودا خودایە و هیچی لەسەر پێویست ناکرێت، شان دادان لەسەر عیبادەت شێوەیەکی ترە لە شاندادان لەسەر تواناکانی خۆت، ئێمە دەبێت بەندایەتی خودا بکەین بە خۆشەویستییەوە، چونکە شایستەی بەندایەتی بۆ کردنە، گەر پاداشت و سزاش بوونی نەبووایە خودا هەر شایستەی پەرستنە، لە رۆیشتنمان بەرەو خودا تەنها کۆمەکیمان بریتییە لە خودا، عیبادەت جێبەجێکردنی فەرمانی خودایە، بۆیە عیبادەتێك دەکرێتە وەسیلەی داوا و دوعا کە تەنها و تەنها بۆ خودا ئەنجامدرابێت و بەشی کەسی تێدا نەبێت، تەنانەت بەشی خودی بەندەکەش، وەك لە چیرۆکی سێ پیاوەکەدا هاتووەو پێغەمبەر(ﷺ) بە زمانی شیرینی بۆمان دەگێڕێتەوە: **فقد روى البُخاريّ ومسلم من حديث عبدالله بن عُمر بن الخطّاب – رضِي الله عنْهُما – قال: سمعتُ رسولَ الله – صلّى الله عليْه وسلّم – يقول:** ((**انطلق ثلاثةُ رهْطٍ ممّن كان قبلكم، حتَّى أوَوا المبيتَ إلى غارٍ فدخلوه، فانحدرتْ صخرةٌ من الجبل فسدَّت عليهم الغار، فقالوا: إنَّه لا يُنجيكم من هذه الصَّخرة إلاَّ أن تدعوا الله بصالِح أعمالكم، إلى آخر الحديث**...))، بۆچی ئەو سێ پیاوە لەناو هەموو کردارەکانیاندا هەریەکەیان یەك کرداری هەڵبژارد، ئایا کرداری چاکەی تریان نەبوو؟ ئەوان کرداری چاکەی تریان هەبوو بەڵام هەریەکە و یەك

کرداری خۆی هەڵبژارد و ناوی نا(**صالِح الأعمال**) کە بریتییە لە کردارێك تەنها بۆ خودا بێت و بەشی هیچ کەسێکی تێدا نەبێت، تەنانەت خاڵیبێت لە حەزی شاراوەی ناخی کەسەکە، کردارێك لەسەر ناخ و دەروونی مرۆڤ گران بێت و لەگەڵ ئەوەشدا بۆ خودا ئەنجام درابێت، ئەو عیبادەتانەی عوجب و خۆ بە مەزنزانین لای خاوەنەکەی دروست دەکات مرۆڤ لە خودا نزیك ناکاتەوە، بەپێچەوانەوە دووری دەخاتەوە، چونکە حەزی خۆی تێکەڵ بە بەندایەتی خودا کردووە.

**ت**- یادی خودا مەزنترین وەسیلەی رۆیشتن و گەیشتنە بە خودا، بۆیە لە قورئاندا بە گەورەترین و مەزنترین ناوبراوە﴿وَلَذِكۡرُ ٱللَّهِ أَكۡبَرُ﴾ العنكبوت: ٤٥، یادی خودا لە هەموو عیبادەتێك گەورەترە، بەڵام دەبێ ئاگاداربین یادی خودا تەنها لە خودا بناسین، ئەو(ﷻ) رێزی لێناویت کە تۆی بۆ یادکردنی خۆی هەڵبژاردووە، زۆرن ئەوانەی لە بێئاگاییدا دەژین و ئەو شەرەفەیان پێنەبڕاوە، بۆیە منەتی یادکردن بەسەر خودادا مەکە و سوپاسگوزار بە بەوەی لە یادکەرانی خودای موتەعالی، لەبیرمان نەچێت عیبادەتە فەرزکراوەکان لە نوێژ و رۆژ و حەج و زەکات، هەر هەموو یادی خودان.

# حیکمەتی بیست و حەوت

((مَنْ أَشْرَقَتْ بِدَايَتُهُ أَشْرَقَتْ نِهَايَتُهُ))

**راڤەی وشەكان:**

**أشرقت بدايته:** سەرەتاكەی رووناك بوویەوە

**أشرقت نهايته:** كۆتابییەكەی رووناك بووەتەوە

**واتا ((هەر كەس سەرەتاكەی رووناك بوویەوە كۆتاییەكەی رووناك بووەتەوە))**

**شرۆڤە:**

❁ خودا بە باوەڕداران نوور دەبەخشێت، ئەم نوورە لە دونیا و دوارۆژدا بوونی هەیە ﴿أَوَمَن كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَاهُ وَجَعَلْنَا لَهُ نُورًا يَمْشِي بِهِ فِي النَّاسِ كَمَن مَّثَلُهُ فِي الظُّلُمَاتِ لَيْسَ بِخَارِجٍ مِّنْهَا﴾ **الأنعام: ١٢٢**، ئایا ئەو كەسەی كە مردووبێ و زیندوومان كردبێتەوە و نورێكمان پێ بەخشیبێت بەناو خەڵكیدا هاتوچۆی پێبكات(پەخشی بكاتەوە) وەك ئەو كەسە وایە لە تاریكستاندا بێت و نەتوانێت لێی بێتە دەرەوە؟.. ئەم دوو ئایەتە پیرۆزەش باس لە نوورێك دەكەن كە لە رۆژی دوایدا بە باوەڕداران دەدرێت﴿يَوْمَ تَرَى الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ يَسْعَىٰ نُورُهُم بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَبِأَيْمَانِهِم بُشْرَاكُمُ الْيَوْمَ جَنَّاتٌ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا ذَٰلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ ﴿١٢﴾ يَوْمَ يَقُولُ الْمُنَافِقُونَ وَالْمُنَافِقَاتُ لِلَّذِينَ آمَنُوا انظُرُونَا نَقْتَبِسْ مِن نُّورِكُمْ قِيلَ ارْجِعُوا وَرَاءَكُمْ فَالْتَمِسُوا نُورًا فَضُرِبَ بَيْنَهُم بِسُورٍ لَّهُ بَابٌ بَاطِنُهُ فِيهِ الرَّحْمَةُ وَظَاهِرُهُ مِن قِبَلِهِ الْعَذَابُ ﴿١٣﴾﴾ **الحديد: ١٢**، رۆژێك دێت باوەڕدارانی ژن و پیاو دەبینیت نوورەكانیان لەبەردەمیان و لەلای راستیانەوە پێشەنگیان دەكات، -پێیان دەوترێت- لە ئەمڕۆدا مژدەتان لێبێت بە بەهەشتێك كە روبار بەژێریدا جاری دەبێت و بە نەمریی تیایدا دەمێننەوە، ئەوەش مەزنترین سەركەوتنە، رۆژێك دووڕووانی ژن و پیاو بەباوەڕداران دەڵێن: چاوەڕوانمان بن

با شتێك له نوورەكەی ئێوەمان بەربكەوێت، پەردەیەك بە نێوانیاندا دەدرێت ناوەوەی ڕەحمەتی تێدایە و ڕووی دەرەوە و لای ئەو ڕووە سزای تێدایە..

۞ هەر سالیکێك لەسەرەتاوە ئەم نوورەی بەرچنگ کەوت و خودا پێی بەخشی ئەو کەسە هەتا کۆتا بە نوورەوە دەڕوات و لەگەڵ نووردایە، بوونی نوور هەمیشە پێشەوەی ڕووناك دەکاتەوە و لە کۆسپ و لەمپەرەکان خۆی دەپارێزێ و لە چاڵ و نشێوەکان خۆی بەدوور دەگرێت.

۞ حەقیقەتی ئەم نوورە چییە؟ زانایانی تەفسیر وشەی (نور)یان لە (ئایەتی ١٢٢ سورەتی **الأنعام**)دا بە (**هدى، إيمان، قرآن**) لێکداوەتەوە، ئەو نوورەی خودا بە باوەڕداری دەبەخشێت بۆ ڕۆشنکردنەوەی ڕێگەیە، تاکو حەق لە باتڵ و ئیمان لە کوفر و خێر لە شەڕی پێ جیابکاتەوە، ئەو نوورە میزانێکە قسە و گوفتار و کار و کردەوەی پێ دەپێوێت و چاکی لە خراپ پێ جیادەکاتەوە، بۆیە خودای موتەعال لەپاڵ دابەزینی بورهاندا نووری دابەزاندووە، ئەگەر بورهان ئەو شەریعەتە پاك و بێگەردە بێت قورئان و فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) بەیانیان کردووە، ئەوا نوور بریتییە لەو ڕۆح و مانا و مەرامانەی لەناو شەریعەتدان و بەجێبەجێکردنیان شەریعەت بەدەست دێت﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدۡ جَآءَكُم بُرۡهَٰنٞ مِّن رَّبِّكُمۡ وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكُمۡ نُورٗا مُّبِينٗا ١٧٤ ﴾ **النساء: ١٧٤**، ئەی خەڵکینە لە پەروەردگارتانەوە بورهانتان بۆ هاتووە و نوورێکی بەیانکەر و ڕۆشنکەرەوەمان بۆ دابەزاندوون.. ئەگەر "بورهان" ڕووی دەرەوەی شەریعەت بێت ئەوا "نوور" ڕووی ناوەوەی شەریعەتە، ئەم دوو باڵەی شەریعەت پێکەوە مەرام و حیکمەتی ئیسلام دەگەیەنن وەك دواین ئایینی خودایی.

۞ ۞ ۞

# حیكمەتی بیست و هەشت

((مَا اسْتُوْدِعَ فِي غَيْبِ السَّرَائِرِ ظَهَرَ فِي شَهَادَةِ الظَّوَاهِرِ))

**راڤەی وشەكان:**

**استدع**: دانرابێت-خەزن كرابێت- هەڵگیرابێت

**غیب السرائر**: پەنهانی شاراوەكان

**ظهر**: دەردەكەوێت

**شهادة الظواهر**: دەركەوتەی رووالەتەكان

**واتا ((ئەوەی لە پەنهانی شاراوەكاندا هەڵگیرابێت لە دەركەوتەی رووالەتەكاندا دەردەكەوێت))**

**شرۆڤە:**

❁ یەكێك لەو نیشانانەی سالیكی رێگەی خودای پێ دەناسرێتەوە ئەو قسە و كار و كردەوانەیە لێیدەوەشێتەوە، ئەگەر دەرەوەی كەسەكە لەگەڵ میزانی شەریعەتدا پێكدەهاتەوە ئەو كەسە هەڵگری پەنهان و شاراوەی دروستە و ئیمان ناوەوەی داگیر كردووە، مەگەر كەسەكە لە ریزی دووڕووان بێت-خودا بمانپارێزێت- وتراوە ئەوەی لە ناخدا شاراوەیە دێتە سەر زمان و رووالەت، ناكرێت كەسێك ناخی بە ئیمان سارێژ بووبێت و درۆی لێبوەشێتەوە، هەڵگری ئیمانێكی راستەقینە بێت و ستەم لە مەردوومان بكات، هەرگیز ئیمانی راستەقینە لەگەڵ گوناه و تاوانی گەورە و بەردەوامدا پێكنایەتەوە، مەگەر كەسەكە بە نەزانی یان بێئاگایی كارێك لەو كارانە ئەنجام بدات، ئەویش بەپەلە دوای بەئاگاهاتنەوە بۆ لای خودای خۆی دەگەڕێتەوە و داوای لێبوردن بۆ گوناهەكەی دەكات.

❁ تەنانەت پەنهانی پڕ لە ئیمان وەك نوورێك لە روخساردا پەخش دەبێت و ئەوانەی چاوی بەصیرەتیان کراوەیە ئەو نووره دەبینن، قورئان وەصفی باوەڕدارانی شوێنکەوتەی پێغەمبەر(ﷺ) دەکات و دەفەرموێت: ﴿سِيمَاهُمۡ فِي وُجُوهِهِم مِّنۡ أَثَرِ ٱلسُّجُودِ﴾الفتح: ٢٩، لەناوچاوانیاندا سیمای کاریگەری سوژدە بردن دەردەکەوێت.

❁ ❁ ❁

# حیکمەتی بیست و نۆ

((شَتَّانَ بَيْنَ مَنْ يَسْتَدِلُّ بِهِ أَوْ يَسْتَدِلُّ عَلَيْهِ، الْمُسْتَدِلُّ بِهِ عَرَفَ الْحَقَّ لأَهْلِهِ فَأَثْبَتَ الأَمْرَ مِنْ وُجُودِ أَصْلِهِ، وَالاسْتِدْلاَلُ عَلَيْهِ مِنْ عَدَمِ الْوُصُولِ إِلَيْهِ، وَإِلاَّ فَمَتَى غَابَ حَتَّى يُسْتَدَلَّ عَلَيْهِ؟ وَمَتَى بَعُدَ حَتَّى تَكُونَ الآثَارُ هِيَ الَّتِي تُوَصِّلُ إِلَيْهِ؟))

## ڕاڤەی وشەکان:

**شتان:** دووره

**يستدل به:** ئەو(خودا) دەکات بەبەڵگە

**يستدل عليه:** شت دەکات بە بەڵگە لەسەری(لەسەر بوونی خودا)

**فأثبت الأمر:** ئەمرەکە(لقەکە)ی لە بوونی بنچینەکە(ئەصڵەکە)وە جێگیرکردووە

**الإستدلال عليه:** بەڵگە هێنانەوە لەسەری

**عدم الوصول إليه:** نەگەیشتنە پێی

**الآثار:** دروستکراوەکان

**واتا ((جیاوازی زۆرە لە نێوان کەسێکدا کە خودا دەکات بە بەڵگە بۆ بوونی شتەکانی تر لەگەڵ کەسێکدا شتەکان دەکات بە بەڵگە بۆ بوونی خودا، ئەو کەسەی خودا دەکات بە بەڵگە شایستەیی حەقی ناسیوە و بە بوونی بنچینەکە (ئەسڵەکە) ئەمرەکە(لقەکە)ی جێگیرکردووە، ئەو کەسەش کە شتەکان دەکات بە بەڵگە لەسەر بوونی خودا(واتە بەڵگە هێنانەوە لەسەری) بەهۆی ئەوەوەیە کە نەگەیشتووەتە خودا، ئەگینا کەی خودا شاراوەیە تا بەڵگە بۆ بوونی بهێنرێتەوە؟ کەی دوورە تا بە دروستکراوەکان شوێنپێی هەڵبگیرێت و بیگەنێ؟))**

## شرۆڤە:

**لەم حیکمەتەدا ئیبن عەتا باس لە دوو قۆناغی سەیر و سلوك دەکات، قۆناغی سەرەتا و قۆناغی بالاّ:**

**لە قۆناغی سەرەتادا:** رێبوارانی رێگەی خودا بۆ گەیشتنە یەقین ژیان و گەردوون دەکەن بە بەڵگە لەسەر بوونی خوایەکی بەدەسەلاّتی زانا و دانا و بەئاگا لە دروستکراوەکانی، قورئان کە بۆ هەموو مرۆڤەکانە بە جیاوازی ئاستی زانست و بیرکردنەوەیان هانی مرۆڤ دەدات بۆ بیرکردنەوە و تێڕامان لە دروستکراوەکان تاکو لەوێوە نهێنی خەلق تێبگات و زانست فێرببیّ و خالقی دروستکراوەکان بناسێت و بۆی ملکەچ ببێت﴿ قُلْ سِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانظُرُوا كَيْفَ بَدَأَ الْخَلْقَ ۚ ثُمَّ اللَّهُ يُنشِئُ النَّشْأَةَ الْآخِرَةَ ۚ إِنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٠﴾ ﴾ العنكبوت: ٢٠، هەروەها ئایەتی﴿ أَوَلَمْ يَتَفَكَّرُوا فِي أَنفُسِهِم ۗ مَّا خَلَقَ اللَّهُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا إِلَّا بِالْحَقِّ وَأَجَلٍ مُّسَمًّى ۗ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ النَّاسِ بِلِقَاءِ رَبِّهِمْ لَكَافِرُونَ ﴿٨﴾ ﴾، ئەمانە و زۆرێك لە ئایەتی تر کە هانمان دەدەن بیر بکەینەوە لە ئاسمان و زەوی و ئەوەی تێیاندایە لە بەڵگە و نیشانە لەسەر مەزنی و شکۆمەندی خودای موتەعال.

**لە قۆناغی بالاّدا:** رێبواری رێگەی خودا لە خوداوە شتەکان دەبینێت، واتە بوونی خودا دەکات بە بەڵگەی بوونی شتەکانی تر، ئەو کە دەگاتە پلەیەکی بالاّ لە خوداناسی لەوە تێدەگات کە تەنها حەقیقەتێك بوونی هەبێت بریتییە لە بوونی خودا، بوونی خودا تەنها حەقیقەتێکە کە بە هەمیشەیی دەدرەوشێتەوە، هەر لێرەوە بوونەکانی تری لادەبێت بە خەیاڵ، ئەو پرسیارەی لا دروست دەبێت: **ئایا جگە لە خودا لە وجوددا بوونێکی تر بوونی هەیە؟**

بۆ وەلاّمی ئەم پرسیارە چەند ئاراستەیەك دروست بووە:

**ئاراستەی یەکەم** ئەوانەن کە دەڵێن ئەم گەردوونە بەشێك لە بوونی خودایە و لە خودا جیانابێتەوە، ئەمانە سەر بە قوتابخانەی یەکێتی بوون(**وحدة الوجود**)ن کە

ئاراستەیەکی صۆفیگەری فەلسەفی بوو، وەك شێخی ئیبن عەرەبی و عومەری کوڕی **فارض** و عبدالکریمی جیلی.

**ئاراستەی دووەم** بریتییە لە ئاراستەی فەیلەسوفەکانی چاخی نوێ کە پێیان وایە گەردوون خودایە و شتێك نییە لەو دیوی گەردوونەوە جگە لە گەردوون.

**ئاراستەی سێیەم** بریتییە لە ئاراستەی ئەو صۆفییە فەیلەسوفانەی کە بە بەڵگەی قورئانی تێگەیشتنەکانی خۆیان مەحکەم و ریشەدار کردووە، حەقیقەتی بوون و حەقیقەتی فاعیلییەت تەنها بۆ خودایە، هیچ کارێك بۆ خودا نامومکین نییە.

**ئەو رایەش کە دەڵێت** خودا ئەزەلییە و ئەم گەردوونە نائەزەلی، کەوابوو ئەگەر خودا گەردوونی دروست کردبێت دەبوا گەردوونیش ئەزەلی بێت، چونکە گەر ملیارەها ساڵیش تەمەنی گەردوون بێت لەچاو ئەزەلییەتی خودا هیچ مانایەکی نییە، هەڵگرانی ئەم رایە لەو جێگەوە ئیشکالیان بۆ دروست بووە کە خودایان هێناوەتە ناو کاتەوە (زەمەنەوە)، یان کات بەسەر خودادا تێدەپەڕێنن، ئەو (ﷻ)خودایە و کات بەسەریدا گوزەر ناکات، کات مەخلوقە و لەو دەمەوە بوون پەیدا دەکات کە گەردوون سەری هەڵداوە، تەمەنی کات نزیکەی ١٣.٧ ملیار ساڵە کە بریتییە لە تەمەنی گەردوون و تەقینەوە مەزنەکە، گەردوون هەڵقولاوی هێز و نووری ئەسمائو صیفاتی خودای موتەعالە﴿ وَٱلسَّمَآءَ بَنَيۡنَٰهَا بِأَيۡيْدٖ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ ﴿٤٧﴾ ﴾ الذاريات: ٤٧﴿ قُلۡ أَئِنَّكُمۡ لَتَكۡفُرُونَ بِٱلَّذِي خَلَقَ ٱلۡأَرۡضَ فِي يَوۡمَيۡنِ وَتَجۡعَلُونَ لَهُۥٓ أَندَادٗاۚ ذَٰلِكَ رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٩﴾ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَٰسِيَ مِن فَوۡقِهَا وَبَٰرَكَ فِيهَا وَقَدَّرَ فِيهَآ أَقۡوَٰتَهَا فِيٓ أَرۡبَعَةِ أَيَّامٖ سَوَآءٗ لِّلسَّآئِلِينَ ﴿١٠﴾ ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ وَهِيَ دُخَانٞ فَقَالَ لَهَا وَلِلۡأَرۡضِ ٱئۡتِيَا طَوۡعًا أَوۡ كَرۡهٗا قَالَتَآ أَتَيۡنَا طَآئِعِينَ ﴿١١﴾ فَقَضَىٰهُنَّ سَبۡعَ سَمَٰوَاتٖ فِي يَوۡمَيۡنِ وَأَوۡحَىٰ فِي كُلِّ سَمَآءٍ أَمۡرَهَاۚ وَزَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنۡيَا بِمَصَٰبِيحَ وَحِفۡظٗاۚ ذَٰلِكَ تَقۡدِيرُ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡعَلِيمِ ﴿١٢﴾ ﴾ فصلت: ٩-١٢.

❁ ❁ ❁

# حیکمەتی سییەم

**((﴿لِيُنْفِقْ ذُو سَعَةٍ مِّنْ سَعَتِهِ﴾**(سورة الطلاق، آية ٧)، **الْوَاصِلُونَ إِلَيْهِ**
**﴿وَمَنْ قُدِرَ عَلَيْهِ رِزْقُهُ﴾** (سورة الطلاق، آية ٧)، **السَّائِرُونَ إِلَيْهِ))**

## ڕاڤەی وشەکان:

**لینفق:** با خەرجی بکات

**ذو سعة:** خاوەن ماڵ و دارایی

**قدر علیه رزقه:** رزقی سوار و بەرتەسك بێت، هەژار بێت

**واتا ((با ئەو کەسەی خاوەن ماڵ و داراییە لە داراییەکەی خەرج بکات و بەخشێت" ئەمە ئەوانەن بە خودا گەیشتوون" هەرکەس رزقی سوار و بەرتەسك بوو" ئەمەش ئەوانەن لەسەرەتای ڕێگەی بەرەو خوداچووندان))**

## شرۆڤە:

❁ لە حیکمەتی بیست و نۆدا باسی دوو قۆناغ لە سەیر و سلوکی بۆ کردین لێرەش بە ئاماژەیەکی قورئانی باس لە ئەرك و ئادابی ئەو دوو جۆرە سالیکەمان بۆ دەکات: ﴿ لِيُنفِقْ ذُو سَعَةٍ مِّن سَعَتِهِۦ ۖ وَمَن قُدِرَ عَلَيْهِ رِزْقُهُۥ فَلْيُنفِقْ مِمَّآ ءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ ۚ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا مَآ ءَاتَىٰهَا ۚ سَيَجْعَلُ ٱللَّهُ بَعْدَ عُسْرٍ يُسْرًا ﴿٧﴾ ﴾ الطلاق: ٧، با ئەو کەسەی خاوەن ماڵ و داراییە لە ماڵ و داراییەکەی(یان لەو ماڵ و داراییەی خودا پێیداوە) ببەخشێت، هەرکەسێکیش رۆزی کەم و بەرتەسك بوو با لەوەی خودا پێیداوە ببەخشێت، خودا بە ئەندازەی ئەوەی دەیدا تەکلیف لە بەندەکانی دەکات، خودا لەدوای تەنگانە فەرحانە دێنێت.. ئەوانەی بەخودا گەیشتوون وەك ئەوانە وان کە خاوەنی ماڵ و دارایین، چۆن لەسەر دەوڵەمەندان پێویستە ببەخشن و زەکاتی ماڵییان بدەن و خێر و صەدەقە بکەن ئاواش پێویستە ئەوانەی بە خودا گەیشتوون لەوەی خودا پێیداون -لە عیلم و لە ئیمان- بەناو

مەردوومانداا پەخشی بکەنەوە، ئەوانەش کە لەسەر ڕێگەی بەرەو خوداچوونن پێویستە بە ئەندازەی عیلم و ئیمانی خۆیان بەخشینیان هەبێت هەروەك چۆن پێویستە مرۆڤ بە ئەندازەی گیرفان و ڕۆزی خۆی ببەخشێت.

۞ کۆتایی ئایەتەکە دوو مژدە و ئاسانکاری بۆ مرۆڤی باوەڕدار تێدایە(لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفۡسًا إِلَّا مَآ ءَاتَىٰهَاۚ سَيَجۡعَلُ ٱللَّهُ بَعۡدَ عُسۡرٖ يُسۡرٗا)، **یەکەمیان** ئەوەیە کە خودا داوایەك لە بەندەکانی ناکات نەتوانن جێبەجێی بکەن، هەر بەو جۆرە خودا بەپێی توانای سالیك داوای بەخشینی زانست و ئیمان دەکات، **دووەمیان** کە لەدوای هەر دەست تەنگی و ڕزقسوارییەك خودا دەرگای خەزێنەی نەبڕاوەی خۆی دەکاتەوە و ڕۆزی بەسەر هەژاران و نەداراندا دادەبارێنێت، هەر بەو جۆرە با سالیکی ڕێگەی خودا بە بینینی گەیشتووان دڵی بۆ خۆی دانەمێنێت، چونکە خودای بەخشندە لە خەزێنەی ئەسراری خۆی بەشی دەدات و ئەویش دەگەیەنێتە مەنزڵی تایبەت بە خۆی.

۞ وەك "**إبن كثير**"دەفەرموێت:: ئەوانەی پێیان وایە هەتا کامڵ نەبن قسەی خێر بۆ کەس ناکەن و زانست و ئیمان بە کەس نابەخشن ئەوانە هەتا مردن قسە بۆ کەس ناکەن، چونکە قۆناغێك نییە مرۆڤ تیایدا خۆی بە کامڵ تەماشا بکات، بەڵکو هەتا مرۆڤ زیاتر خودا بناسێت و لێی نزیك ببێتەوە زۆرتر خۆی بە ناتەواو و لاواز لەبەردەم خودادا دێتە پێش چاو، بۆیە هەر کەس بە ئەندازەی پڕیی هەبگەکەی دەبێت ببەخشێت، خودا نێتی بەخشینەکەی گەرەکە نەك بڕ و جۆری بەخشینەکە﴿ لَن يَنَالَ ٱللَّهَ لُحُومُهَا وَلَا دِمَآؤُهَا وَلَٰكِن يَنَالُهُ ٱلتَّقۡوَىٰ مِنكُمۡ ﴾الحج: ٣٧، گۆشتەکەی و خوێنەکەی بەخودا ناگات، ئەوەی بە خودا دەگات ئەو تەقوایە لە ئێوەوەیە (ئەو نێت و ئیخلاصەی پاڵتان دەنێت بۆ سەربڕینی ئاژەڵەکە).

۞ نابێت ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپە تێکەڵ بە مەقامی ئیمامەت بکرێت، فەرمان بە چاکە و ڕێگری لە خراپە ئەرکی سەرشانی هەموو موسڵمانێکە بە هەر سێ شێوەکەی(بە دەستی، بە زمانی، بە دڵی)، بەڵام ئیمامەت کردنی مەردوومان مەقامێکی باڵایە و مەرجی تایبەت بەخۆی هەیە و هەموو کەس ناتوانێت خۆی لەو مەقامەدا دابنێت و بانگەشەی بکات، قورئان ئەو مەقامەی بە مەزن باس کردووە و

دانه دانه لە باوەڕداران دەیگەنێ ﴿وَجَعَلۡنَٰهُمۡ أَئِمَّةٗ يَهۡدُونَ بِأَمۡرِنَا وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡهِمۡ فِعۡلَ ٱلۡخَيۡرَٰتِ وَإِقَامَ ٱلصَّلَوٰةِ وَإِيتَآءَ ٱلزَّكَوٰةِۖ وَكَانُواْ لَنَا عَٰبِدِينَ ﴿٧٣﴾﴾ الأنبياء: ٧٣، هەروەها ﴿وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى ٱلَّذِينَ ٱسۡتُضۡعِفُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَنَجۡعَلَهُمۡ أَئِمَّةٗ وَنَجۡعَلَهُمُ ٱلۡوَٰرِثِينَ ﴿٥﴾﴾ القصص: ٥، هەروەها ﴿وَجَعَلۡنَا مِنۡهُمۡ أَئِمَّةٗ يَهۡدُونَ بِأَمۡرِنَا لَمَّا صَبَرُواْۖ وَكَانُواْ بِـَٔايَٰتِنَا يُوقِنُونَ ﴿٢٤﴾﴾ السجدة: ٢٤، هەروەها ﴿وَإِذِ ٱبۡتَلَىٰٓ إِبۡرَٰهِـۧمَ رَبُّهُۥ بِكَلِمَٰتٖ فَأَتَمَّهُنَّۖ قَالَ إِنِّي جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامٗاۖ قَالَ وَمِن ذُرِّيَّتِيۖ قَالَ لَا يَنَالُ عَهۡدِي ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٢٤﴾﴾ البقرة: ١٢٤،هەروەها ﴿وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبۡ لَنَا مِنۡ أَزۡوَٰجِنَا وَذُرِّيَّٰتِنَا قُرَّةَ أَعۡيُنٖ وَٱجۡعَلۡنَا لِلۡمُتَّقِينَ إِمَامًا ﴿٧٤﴾﴾ الفرقان: ٧٤،

**لەم پێنج ئایەتە پیرۆزەوە مەرجەکانی بە ئیمام بوونمان بۆ رۆشن دەبێتەوە:**

**أ-** هەڵبژاردنی خودا بۆیان(جعل) کە لە زۆر شوێنی تری قورئاندا بە (**إصطفاء و إجتباء**) ناوبراوە ﴿قُلِ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ وَسَلَٰمٌ عَلَىٰ عِبَادِهِ ٱلَّذِينَ ٱصۡطَفَىٰٓۗ ءَآللَّهُ خَيۡرٌ أَمَّا يُشۡرِكُونَ ﴿٥٩﴾﴾ النمل: ٥٩﴿شَاكِرٗا لِّأَنۡعُمِهِۚ ٱجۡتَبَىٰهُ وَهَدَىٰهُ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴿١٢١﴾﴾ **النحل: ١٢١**

**ب-** پابەندبوون بە ئەمر و نەهی خوداوە(يَهۡدُونَ بِأَمۡرِنَا )

**ت-** ئەنجامدانی کاری چاکە(فِعۡلَ ٱلۡخَيۡرَٰتِ )

**ث-** نوێژکردن(وَإِقَامَ ٱلصَّلَوٰةِ )

**ج-** زەکاتدان(وَإِيتَآءَ ٱلزَّكَوٰةِ )

**ح-** ملکەچی بەردەوام بۆ خودا(وَكَانُواْ لَنَا عَٰبِدِينَ )

**خ-** ئارامگرتن(لَمَّا صَبَرُواْ )

**د-** یەقین بە ئایاتی خودا(وَكَانُواْ بِـَٔايَٰتِنَا يُوقِنُونَ )

**ذ-** دەرچوون لە تاقیکردنەوەی خودا(وَإِذِ ٱبۡتَلَىٰٓ إِبۡرَٰهِـۧمَ رَبُّهُۥ بِكَلِمَٰتٖ فَأَتَمَّهُنَّۖ تَبِعَ

**ر-** خۆپارێزی، بەڵکو بوون بە ئیمامی خۆپارێزان(وَٱجۡعَلۡنَا لِلۡمُتَّقِينَ إِمَامًا ).

## حیكمەتی سی و یەك

((اهْتَدَى الرَّاحِلُونَ إِلَيْهِ بِأَنْوَارِ التَّوَجُّهِ، وَالْوَاصِلُونَ لَهُمْ أَنْوَارُ الْمُوَاجَهَةِ، فَالأَوَّلُونَ لِلأَنْوَارِ، وَهَؤُلاَءِ الأَنْوَارُ لَهُمْ لأَنَّهُمْ للهِ لاَ لِشَيْءٍ دُونَهُ ﴿قُلِ ٱللَّهُ ثُمَّ ذَرْهُمْ فِى خَوْضِهِمْ يَلْعَبُونَ ﴿٩١﴾﴾الأنعام:٩١))

**راڤەی وشەكان:**

**الراحلون:** ڕێبواران

**أنوار التوجه:** نوری بەرەوڕوو(ئاراستە)

**الواصلون:** گەیشتووان

**أنوار المواجهة:** نوری رووبەڕوو

**فالأولون للأنوار:** ئەوانەی سەرەتا بۆ نوورن

**وهؤلاء الأنوار لهم:** ئەوانەی تریش(گەیشتووان) نوور بۆ ئەوانە.

**لاشيء دونه:** هیچ شتێك لەخوار ئەو(خودا)وە نییە.

**ذرهم:** لێیان بگەڕێ

**خوضهم:** گومڕایی و سەرگەردانییان

**يلعبون:** یاری دەكەن

**واتا ((ڕێبواران بەنووری بەرەوڕوو ڕێنموونی(هدایەت) وەردەگرن، گەیشتووان نووری رووبەڕوویان بۆ هەیە، ئەوانەی یەكەم بۆ نوورن، ئەوانی تر نوور بۆ ئەوانە، چونكە ئەوان تەنها بۆ خودان، هیچ شتێك لەخوار ئەوەوە بوونی نییە، بڵێ "ألله" و پاشان لێیانگەڕێ بە لە گومڕایی و بێباوەڕی خۆیاندا بتلێنەوە و یاری بكەن))**

## شرۆڤە:

۞ لەم حیکمەتەشدا ئیبن عەتا لە گۆشەیەکی ترەوە باس لەو دوو قۆناغەی سەیر و سلوك دەکات، قۆناغی سەرەتا ئەو قۆناغەیە ڕێبواران بەرەو نوورێك هەنگاو هەڵدەگرن، لێرەدا وشەی "**التوجه**" کە مانای "بەرەوڕوو و ئاراستەوەرگرتن"ی هەیە بریتییە لە دیاریکردنی ئامانجێك و پاشان هەنگاو هەڵگرتن بەرەو ئامانجەکە، ڕێبوارانی قۆناغی یەکەم نوورەکە دەکەنە ئامانج و سەفەر دەکەن بەرەوڕووی، قۆناغی دووەم بریتییە لە گەیشتن بە مەنزڵ، گەیشتوانی ئەم قۆناغە لە نوور نزیکبوونەتەوە، بەئەندازەیەك دووری نێوانیان پێچراوەتەوە کە لەگەڵ یەکتر ڕووبەڕوو بوونەتەوە، لێرەدا ئیبن عەتا وشەی"**المواجهة**"ی بەکارهێناوە کە مانای "ڕووبەڕووبوونەوە"ی هەیە، واتە بەرانبەر یەك دەوەستن، تەنانەت گەر نەیانەوێت تەماشای نوورەکە بکەن ئەوا نوورەکە ئەوان دادەپۆشێت و دەیانخاتە ژێر لێزمەی دڵۆپی نوورەوە، ئەمانە بریتیین لە گەیشتووان بە خودا، ئەوانەن کە میعراجی ڕۆحییان کردووە، حەزرەتی محەمەد ئیمام و پێشەوای ئەم دەستەیەیە و هیچ کەسێك بەئەندازەی ئەو لە خودا نزیك نەبووەتەوە و نابێتەوە، ئەو بەئەندازەیەك لە خودا نزیك بوویەوە کە بە(**قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَىٰ**) وەصف دەکرێت، (**قَابَ قَوْسَيْنِ**) ئەندازەی دوو کەوان، یان دوو برۆ، کە لەم جێگەدا شوێن و دووری تەنها بۆ تێگەیشتنە، ئەگینا خودای موتەعال پاکتر و بالاترە لەوەی شوێن لەئامێزی بگرێت﴿ **فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَىٰ** ﴾ النجم: ٩، نزیکبوونەوەکە- بە ئەندازەی دوو کەوان، دوو برۆ یان نزمتر یان کەمتر بوو.

۞ حەقیقەتی ئەو نوورە خوداییە لە حیکمەتی بیست و حەوتدا قسەمان لەبارەوە کردووە، ماوە بڵێین ئەوەی درکی ئەو نوورە دەکات و دەیبینێت ئەم دوو چاوەی سەرمان نییە، چاوی سەرمان تەنها بۆ بینینی شتە مادییەکان ئامادەکراوە و پێمان بەخشراوە، ئەوەی نووری خودایی دەبینێت بریتییە لە چاوی بەصیرەت، نەك بەصەر، ئەم چاوە پەنهانە بەخششێکی خوداییە و تەنها بەوانەی دەبەخشێت کە لە حەزەکان خاڵی دەبنەوە و پەروەرشێکی دروستی دەروونی خۆیان دەکەن و بە سەرچاوەی ڕۆحی خۆیانەوە وابەستە دەبن.

۞ گەیشتووان بە خودا تەنانەت نوور رایانگرێت، (بۆ خودا نموونەی بەرز و بڵند بوونی هەیە)، نووری بارەگا و کۆشك و تەلاری مەلیك عاشقانی مەلیك سەرسام ناکات، ئەوان تەنها لیقای مەلیکیان دەوێت، نەهاتوون تا لە جوانییەکانی بارەگای مەلیك رابمێنن، ئەوا جوانی و شکۆمەندی مەلیك پەلکێشی کردوون، هەر ئەوەندە سەرنجی بارەگای مەلیك دەدەن کە شکۆمەندی و مەزنی مالیك(خاوەن ماڵ)یان بیربخاتەوە، ئەوان میوانی خودان نەك میوانی نوور، چۆن دەبێت بە خزمەتی خاوەن ماڵ نەگەی و بانگهێش کرابیت، چۆن لەو خانە و بارەگادا میوان دەحەوێتەوە گەر خاوەن ماڵ بە زمانی شیرینی خۆی گفتوگۆیان لەگەڵ نەکات؟!

۞ بینینی زات(**ذات**)ی خودای موتەعال لەم ژیانە نزمەدا و بەم توانا مرۆییە کەموکورتە لە توانای مرۆڤ بەدەرە، بۆیە کاتێك حەزرەتی موسا(عليه السلام) داوای بینینی خودا دەکات خودا پێی دەفەرموێت: ناتوانی ببینی﴿ **وَلَمَّا جَآءَ مُوسَىٰ لِمِيقَٰتِنَا وَكَلَّمَهُۥ رَبُّهُۥ قَالَ رَبِّ أَرِنِىٓ أَنظُرْ إِلَيْكَ ۚ قَالَ لَن تَرَىٰنِى وَلَٰكِنِ ٱنظُرْ إِلَى ٱلْجَبَلِ فَإِنِ ٱسْتَقَرَّ مَكَانَهُۥ فَسَوْفَ تَرَىٰنِى ۚ فَلَمَّا تَجَلَّىٰ رَبُّهُۥ لِلْجَبَلِ جَعَلَهُۥ دَكًّا وَخَرَّ مُوسَىٰ صَعِقًا ۚ فَلَمَّآ أَفَاقَ قَالَ سُبْحَٰنَكَ تُبْتُ إِلَيْكَ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٤٣﴾** ﴾ الأعراف: ١٤٣، کاتێك موسا(عليه السلام) هات بۆ ئەو لیقایەی بۆمان دیاری کردبوو، خودا لەگەڵی کەوتە گفتوگۆ، وتی خودایە نیشانم بدە بتبینم، خودا فەرمووی نامبینیت، تەماشای ئەو چیایە بکە گەر لە شوێنی خۆی مایەوە ئەوا دواتر دەمبینیت، کاتێك پەروەردگاری جیلوەی بۆ چیایەکە کرد تەختی زەوی کرد و موسا بێهۆش بوو، کاتێك بەئاگا هاتەوە وتی: پاکێتی و شکۆمەندی هەر بۆ تۆیە، هەر ئێستا لەو داوایەم تۆبە دەکەم و من یەکەمین باوەڕدارێکم —تێدەگەم ناتوانین تۆ ببینین- بەلاّم کاتێك مرۆڤ لە بەهەشتدا دەگاتە کەماڵێکی تایبەت بە خۆی دەتوانێت خودا ببینێت وەك قورئان ئاماژەی پێدەکات﴿ **وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ ﴿٢٢﴾** ﴾ **القيامة: ٢٢**، روخسارگەلێك لە رۆژی دوایدا سوور و سپی هەڵدەگەڕێن، تەماشای خوای خۆیان دەکەن، هەروەها لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە:

أ-قال النبي صلى الله عليه وسلم ((إِذَا دَخَلَ أَهْلُ الْجَنَّةِ الْجَنَّةَ قَالَ يَقُولُ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى تُرِيدُونَ شَيْئًا أَزِيدُكُمْ فَيَقُولُونَ أَلَمْ تُبَيِّضْ وُجُوهَنَا أَلَمْ تُدْخِلْنَا الْجَنَّةَ وَتُنَجِّنَا مِنْ النَّارِ قَالَ فَيَكْشِفُ الْحِجَابَ فَمَا أُعْطُوا شَيْئًا أَحَبَّ إِلَيْهِمْ مِنْ النَّظَرِ إِلَى رَبِّهِمْ عَزَّ وَجَلَّ." ثُمّ تلا هَذِهِ الآية: لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا الْحُسْنَى وَزِيَادَةٌ))[6]

ب- وقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ((إِنَّكُمْ سَتَرَوْنَ رَبَّكُمْ عِيَانًا))[7]

ت- وعن جرير قال: خَرَجَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَيْلَةَ الْبَدْرِ فَقَالَ: ((إِنَّكُمْ سَتَرَوْنَ رَبَّكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ كَمَا تَرَوْنَ هَذَا لا تُضَامُونَ فِي رُؤْيَتِهِ))[8]

**قسەکردنی خودا لەگەڵ بەندەکانیدا لە یەکێك لەم ڕێگانەوەیە:**

١. وەحی بۆ کردن.

٢. لە پشتی پەردەوە.

٣. ناردنی نێردراوێك(فریشتەیەك) بۆ لای تاکو بە فەرمانی خودا وەحی بۆ بکات.

﴿وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ ٱللَّهُ إِلَّا وَحْيًا أَوْ مِن وَرَآيِٕ حِجَابٍ أَوْ يُرْسِلَ رَسُولًا فَيُوحِيَ بِإِذْنِهِۦ مَا يَشَآءُ ۚ إِنَّهُۥ عَلِىٌّ حَكِيمٌ ﴿٥١﴾﴾ الشورى: ٥١،"إبن كثير" لە تەفسیری ئەم ئایەتە پیرۆزەدا دەفەرموێت: ((ئەمە مەقاماتی وەحیە بە نیسبەت خوداوە (**جل وعلا**) هەندێ جار نیگایەکی بۆ دڵی پێغەمبەر(ﷺ) دەکرد کە هیچ گومانی نەبوو ئەو وەحیە لە خوداوە بووە، وەك چۆن لە سەحیحی ئیبن حەبباندا هاتووە((لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) ریوایەت کراوە کە فەرموویەتی: ڕۆحی قودس فوی بە دڵمدا کرد: هیچ کەسێك نامرێت تا ڕۆزییەکەی و ئەجەلەکەی تەواو نەکات، لەخودا بترسن و بەجوانی دەست بۆ ڕۆزی ببەن و داوای بکەن)).

"**أَوْ مِن وَرَآيِٕ حِجَابٍ** "وەك چۆن موسا(عليه السلام) قسەی لەگەڵ خودا کرد، ئەو دوای گفتوگۆ داوای بینینی کرد، بەڵام نەیبینی و پەردە درابوو بەنێوان ئەو و خودادا، لە

---

٦ صحيح مسلم .

٧ صحيح البخاري.

٨ صحيح البخاري.

فەرموودەی سەحیحدا هاتووە ((پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی بە جابری کوڕی عەبدوڵا- خوایان لێ ڕازی بێت- خودا قسەی لەگەڵ کەس نەکردووە لە پشتی پەردەوە نەبێت، بەڵام لەگەڵ بابت ڕووبەڕوو قسەی لەگەڵ کرد))، بەم جۆرە لە فەرموودەکەدا هاتووە، ئەو(عەبدوڵا) لە جەنگی ئوحددا شەهید بوو، بەڵام ئەو بینینە لە جیهانی بەرزەخدا بووە، ئایەتەکە باس لە ئەم خانەی دونیایە دەکات.

**"أَوْ يُرْسِلَ رَسُولًا فَيُوحِيَ بِإِذْنِهِ مَا يَشَآءُ"** وەك چۆن جبریل و فریشتەکانی تر بۆ سەر پێغەمبەران دابەزیون، **"إِنَّهُۥ عَلِيٌّ حَكِيمٌ"** خودا بەرز و شکۆمەند و زانا و بەئاگا و دانایە))، ئیمام **"جلال الدين المحلّي"** لە بەشە تەفسیرەکەی خۆیدا **(تفسير الجلالين)** شتێك دەخاتە سەر ئەوەی کە "**إبن كثير**" ئاماژەی پێ دەکات و دەفەرموێت: (**وما كان لبشر أن يكلمه الله** إلا)وەحی بۆ بکرێت (وحیا) لە خەودا یان بە ئیلهام.

# حیکمەتی سی و دوو

((تَشَوُّفُكَ إِلَى مَا بَطَنَ فِيكَ مِنَ الْعُيُوبِ خَيْرٌ مِنْ تَشَوُّفِكَ إِلَى مَا حُجِبَ عَنْكَ مِنَ الْغُيُوبِ))

## راڤەی وشەكان:

**تشوفك:** حەز و ویستی پەردە لەسەر لادانت

**بطن فيك:** لە تۆدا شاراوەتەوە

**العيوب:** نەنگی و ناتەواوی

**ما حجب عنك:** ئەوەی لێت شاراوەتەوە

**الغيوب:** پەنهان

**واتا ((حەزی پەردە لەسەر لادانت بۆ ئەو نەگی و ناتەواویانەی لە تۆدا شاراوەتەوە باشترە لە حەزت بۆ ئەوەی لێت نادیارە لە پەنهان))**

## شرۆڤە:

❁ گەشتی بەرەو خوداچوون رۆچوونە بەناخی خۆدا، نەك كرانەوە بەرووی دەرەوەدا، مرۆڤ لە هەڵكۆڵینی خۆیەوە بە خودا دەگات، چەندە بە خۆماندا رۆبچین ئەوەندە خۆناسیمان زیاد دەكات، خۆناسی سەردەكێشێت بۆ خوداناسی، بۆیە وتراوە "هەركەس خۆی ناسی خودا دەناسێت"، تۆ دەبێت بۆ گەڕان بەدوای خودادا لە خۆتەوە دەست پێبكەیت، ئێمەی مرۆڤ لێوانلێوین بە ناتەواوی، ئەو ناتەواویانە بۆ بەردەوام بوونی گەشتی بەرەو خوداچوونە، هەر ناتەواوییەك وێستگەیەكە تیایدا نووری ئەسمائو صیفاتی خودای موتەعال وەردەگیرێت، ئەم حیكمەتە خودایییە لە مرۆڤدا نیشانەی كەماڵی خودایە، نەك كارەكانی خودا ناتەواو بن، ئەم مەخلوقە ناتەواوە لەڕووی كردار(**فعل**)ەوە و كامڵ لەرووی ئامادەیی(**إستعداد**)ەوە، روەك دەنكە تۆوێك لە

زەمینەی ژیان و بووندا دەنێژرێت و دەکەوێتە گەردەش و گەڕان و جیلوەپێکردنی ئەو کۆما لە ئامادەیی کە لە ناخیدا حەشاردراوە، باسکردنی ئەم حەقیقەتە لە حیکمەتی یازدەهەمدا ئیبن عەتا ئاماژەی پێداوە بە تەعبیری (**ادفن وجودك في أرض الخمول، فما نبت مما لم يدفن لا يتم نتاجه**) گۆڕینی ئامادەییەکان بۆ کردار تەکانی رۆحی و مەعریفی مەزن بە مرۆڤ دەبەخشێت و کۆی ئەو تەکانانەش ناسینی خودای لێوە بەرهەم دێت.

۞ هەندێك لە رێبوارانی رێگەی خودا حەز و تامەزرۆیی "پەردەلادان لەسەر پەنهان"یان بۆ دروست دەبێت، وادەزانن بینینی ئایات هەمیشە یەقین بە بینەر دەبەخشن، بێئاگا لەوەی کە موشاهەدەی ئایات زۆرجار بۆ بینەرەکەی فیتنەیەکی گەورەیە، ئەگەر بڕیاربێت بینینی ئایات ئیمانێکی یەقینی بۆ بینەرەکەی بەرهەم بهێنێت نەدەبوا بێباوەڕی بە پێغەمبەران روویبدابایە، چونکە مەزنترین ئایاتی خودا لەسەر دەستیان-بە فەرمانی خودا- روویداوە، لە زیندووکردنەوەی مردوو، هاتنە دەرەوەی وشتر لە بەرد و گۆڕینی عەسا بۆ ئەژدیها، تۆفان و هتد.. لەگەڵ بینینی هەموو ئەو ئایەتانەشدا کوفریان بە خودا و پێغەمبەرەکەی کردووە.

۞ بۆئەوەی گەشتی بەرەو خوداچوون -کە تیایدا خودا ئامانجە- نەگۆڕێت بۆ حەزی بینینی ئایات پێویستە سالیکی رێگەی خودا ئەو حەزە لە خۆیدا ریشەکەن بکات، چونکە لەگەڵ سەرهەڵدانی ئەو حەزەدا لادان لە ئاراستەی بەرەو خوداچووندا روودەدات، ئیتر کاری ئەو کەسە لە "یۆگا"کردنەوە نزیکترە تا لە گەشتی بەرەو خوداچوون، چونکە ئەو دەیەوێت ئایات ببینێت و هێزی رۆحی بەدەست بهێنێت، نەك بە پڕکردنەوەی ناتەواوییەکانی گەشتی بەرەو خودای بەردەوام بێت.

۞ ۞ ۞

# حیکمەتی سی و سێ

((الْحَقُّ لَيْسَ بِمَحْجُوبٍ وَإِنَّمَا الْمَحْجُوبُ أَنْتَ عَنِ النَّظَرِ إِلَيْهِ إِذْ لَوْ حَجَبَهُ شَيْءٌ لَسَتَرَهُ مَا حَجَبَهُ وَلَوْ كَانَ لَهُ سَاتِرٌ لَكَانَ لِوُجُودِهِ حَاصِرٌ وَكُلُّ حَاصِرٍ لِشَيْءٍ فَهُوَ لَهُ قَاهِرٌ ﴿وَهُوَ ٱلْقَاهِرُ فَوْقَ عِبَادِهِۦ﴾ الأنعام:١٨))

## ڕاڤەی وشەکان:

**الحق**: حەق(خودا)

**ليس بمحجوب**: دانەپۆشراوە

**النظر إليه**: تەماشاکردنی

**لو حجبه شيء**: گەر شتێك داپپۆشێت

**ساتر**: داپۆشەر

**حاصر**: سنووردانەر

**قاهر**: زاڵ

**واتا ((حەق(ﷻ) داپۆشراو نییە، ئەوەی داپۆشراوە لە سەیرکردنی حەق(ﷻ) تۆیت، گەر شتێك بەسەریدا بدرابایە ئەوەی دەدرا بەسەریدا دایدەپۆشی، گەر داپۆشەری هەبێت دەبێت بوونەکەی بوونێکی سنووردار بێت، هەر شتێك شتێك سنووردار بکات بۆی دەبێت بە زاڵ بەڵام(تەنها خودا بەسەر بەندەکانیدا زاڵە))**

## شرۆڤە:

❁ لەم حیکمەتەدا ئیبن عەتا دەڵێت: خودا ڕوون و ئاشکرایە، گەر کەسێك حەق نەبینێت چاوی ئەو داپۆشراوە یان لەکارکەوتووە، نەك نووری حەق، نەبینینی خۆر لە ڕۆژێکی ساماڵدا نیشانەی کوێری تەماشاکەرە نەك نەبوونی خۆر.

❁ لەوانەیە وەهمێك لای مرۆڤ دروست ببێت و پێیوابێت خودا پەردەی بەسەر خۆیدا هێناوە، بۆ رەواندنەوەی ئەم وەهمە ئیبن عەتا رێگەیەك دەگرێتەبەر و دەڵێت: ئەگەر خودا پەردەی بەسەر خۆیدا دابێت کەوابوو پەردەکە داپیپۆشیوە، ئەگەر بە پەردە داپۆشرابێت کەوابوو داپۆشەری هەیە، هەموو داپۆشەرێك داپۆشراوەکە سنوور دەکات، کەوابوو دەبێ بوترێت بوونی خودا سنووردارە، کەوابوو ئەو شتە زاڵ دەبێت بەسەر خودادا، ئەمەش پێچەوانە لەگەڵ ئەو ئایەتە پیرۆزەدا دەوەستێتەوە کە دەفەرموێت: ﴿وَهُوَ ٱلْقَاهِرُ فَوْقَ عِبَادِهِۦ﴾، ئەو بەسەر بەندەکانیدا زاڵە، نەك بەندەکانی بەسەر ئەودا زاڵ بن.

❁ گەر خودا روون و ئاشکرایە بۆچی ئێمەی مرۆڤ نایبینین؟ نەبینینی خودا بۆ کوێری چاوی دڵی ئێمە دەگەڕێتەوە ﴿فَإِنَّهَا لَا تَعْمَى ٱلْأَبْصَٰرُ وَلَٰكِن تَعْمَى ٱلْقُلُوبُ ٱلَّتِى فِى ٱلصُّدُورِ ﴿٤٦﴾﴾ الحج: ٤٦، ئایا کوێر خۆر دەبینێت؟ بێگومان نەخێر.

❁ مەبەست لە بینینی خودا ئامادەبوونی ئەسمائو صیفاتییەتی لەبەر دڵی باوەڕداردا، بەجۆرێك ئەم ئامادەبوونە ناوەوەی رێبواری رێگەی خودا داگیردەکات کە بوونی خۆی و دەوروبەری لەبیر دەکات، ئەمەش ئەو ئەزموونە رۆحییەیە هەندێك لە عاریفان تیایدا ژیاون و حاڵەتی مەستبوون رووی تێکردوون و هەندێ قسەی وڕێنەئامێز (**شطحات**)یان لێوەشاوەتەوە، لەوانە ئەبو یەزیدی بوستامی و حەللاج و شیبلی.

**❁ ئەو پەردەیە چییە بەسەر ئێمەی مرۆڤدا دراوە و بەهۆیەوە هەست بە بوون و ئامادەبوونی خودا ناکەین؟**

## پەردەکان ئەمانەن:

**أ**- بێباوەڕی (**الكفر**)

**ب**- هاوەڵدانان (**الشرك**)

**ت**- گوناه (**الذنوب**)

**پ**- بێئاگایی و سەرقاڵی بە دونیاوە (**الغفلة**)

هەتا مرۆڤ ئەم چوار وێستگە تاریکە نەبڕێت ناکەوێتە سەر ڕێگەی نوور و دڵی ڕێگەی زیندەگی ناگرێتە بەر، هەتا دڵ تەڕی و زیندەگی رووی تێنەکات بە صیفاتە بەرز و بڵندەکان (خۆشەویستی، رازیبوون، ئیخلاص، ئارامگری) نارازێتەوە، هەتا ئەو مانا بەرز و بڵندانەش لەدڵدا بنج دانەکوتن نووری ئاسمائو صیفات روو لەدڵ ناکات و دڵ ئامادەیی شکاندنەوەی نووری ئەسمائو صیفاتی نابێت، خودا بۆ خۆی نوورە و کەلامی خودا(قورئان) نوورە و خودا بە نوور وەصفی کردووە﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدۡ جَآءَكُم بُرۡهَٰنٞ مِّن رَّبِّكُمۡ وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكُمۡ نُورٗا مُّبِينٗا ﴿١٧٤﴾ ﴾ النساء: ١٧٤، ئەی خەڵکینە لە پەروەردگارتانەوە بورهانتان بۆ هاتووە و نوورێکی روون و ئاشکرامان بۆ دابەزاندوون، هەرکات دڵ نەیتوانی درکی ئەو نوورە خوداییە بکات و ئامۆژگاری لە قورئانەوە وەربگرێت با کەسەکە بزانێت خاوەنی دڵ نییە و لەریزی مردووان سەرژمێر دەکرێت﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَذِكۡرَىٰ لِمَن كَانَ لَهُۥ قَلۡبٌ أَوۡ أَلۡقَى ٱلسَّمۡعَ وَهُوَ شَهِيدٞ ﴿٣٧﴾ ﴾ ق: ٣٧، لەم قورئانەدا یادخستنەوە بۆ کەسانێك هەیە کە خاوەنی دڵ بن، یان گوێهەڵبدەن (گوێبگرن) و بەدڵ ئامادەبن. ئەم ئایەتە پیرۆزە مانایەکی تر بەدڵ دەدات، دڵ ئەو پارچە گۆشتە سنەوبەرییە نییە لەلای چەپی مرۆڤ دانراوە، چونکە گەر ئەوە بووایە قورئان نەیدەفەرموو "یادخستنەوەیە بۆ کەسێك دڵی هەبێت" چونکە هەموو مرۆڤێك دڵی هەیە، بەڵکو دڵ ئەو جەوهەر و کرۆك و رۆحەیە دەڕوانێت بەڕووی جیهانی مەلەکووتدا (جیهانی پەنهان)﴿ وَكَذَٰلِكَ نُرِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ مَلَكُوتَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَلِيَكُونَ مِنَ ٱلۡمُوقِنِينَ ﴿٧٥﴾ ﴾ الأنعام: ٧٥، بەو جۆرە مەلەکووتی ئاسمان و زەویمان نیشانی ئیبراهیم دا تاکو ببێت بە یەکێك لە یەقینداره‌کان﴿ أَوَلَمۡ يَنظُرُواْ فِي مَلَكُوتِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ﴿١٨٥﴾ ﴾ الأعراف: ١٨٥، ئایا تەماشای مەلەکووتی ئاسمان و زەوی ناکەن.

# حیکمەتی سی و چوار

((اخْرُجْ مِنْ أَوْصَافِ بَشَرِيَّتِكَ عَنْ كُلِّ وَصْفٍ مُنَاقِضٍ لِعُبُودِيَّتِكَ لِتَكُونَ لِنِدَاءِ الْحَقِّ مُجِيبًا وَمِنْ حَضْرَتِهِ قَرِيبًا))

## راڤەی وشەكان:

**أخرج**: بچۆ دەرەوە، وەرە دەرەوە، دەربچۆ

**أوصاف**: كۆی "**وصف**"ە واتە سیفەت و ئاكار و كردار

**بشريتك**: مرۆییت

**مناف**: پێچەوانە، دژ، نەرێكەر

**لعبوديتك**: بەندایەتیت

**نداء الحق**: بانگی حەق

**مجيبا**: وەڵامدەرەوە

**قريبا**: نزیك

**واتا ((وەرە دەرەوە لە هەرچی سیفەت و خووخدە و ئاكاری مرۆیی خۆتە كە پێچەوانە لەگەڵ بەندایەتیدا بۆ خودا دەوەستێتەوە بۆئەوەی وەڵامدەرەوەی بانگی حەق بیت و لە ئەو زاتە شكۆمەندەوە نزیك بیت))**

## شرۆڤە:

❁ خودا مرۆڤی بە ئاتاج و لاواز دروست كردووە﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ أَنتُمُ ٱلۡفُقَرَآءُ إِلَى ٱللَّهِۖ وَٱللَّهُ هُوَ ٱلۡغَنِيُّ ٱلۡحَمِيدُ ﴿١٥﴾﴾ فاطر: ١٥، ئەی خەڵكینە ئێوە ئاتاجن بۆ لای خودا، خودا بێنیاز و حەمدكراوە. لە ئاتاج و لاوازییەكانی مرۆڤ ئەوەیە كە پێویستی بە: خەو،

خواردن، خواردنەوە، هەناسە، حەزی ژن و مێردی هەیە، هەروەها نەخۆش دەکەوێت و پیردەبێت و دەمرێت، هەموو ئەمانە ئاتاجی و لاوازی مرۆڤ نیشان دەدەن.

❁ ئیبن عەتا کە فەقیهێکی مەزن و عاریفێکی گەورەیە داوا ناکات مرۆڤ لە مرۆڤبوون بکەوێت و خۆی بکات بە فریشتە، چونکە هەرچەند مرۆڤ لە ئیماندا بالاَ بێت هێشتا هەر مرۆڤە و ناتوانێت لە ئەوصافی مرۆیی خۆی بچێتە دەرەوە، چ مرۆڤێك بەئەندازەی حەزرەتی عیسا(عليه السلام) رۆحی بالاَ دەبێت لەگەڵ ئەوەشدا خودای دەربارەی دەفەرموێت:: مەسیح خۆی و دایکی خواردنیان دەخوارد و وەك مرۆڤێك ئاتاج بە خواردن بوون﴿ مَّا ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ مَرْيَمَ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ وَأُمُّهُۥ صِدِّيقَةٌ ۖ كَانَا يَأْكُلَانِ ٱلطَّعَامَ ﴾ المائدة: ٧٥، ئەوەی ئیبن عەتا ئاماژەی پێدەدات بریتییە لە سیفەتگەلێك کە نەرێکەری بەندایەتییەکی راستەقینە بێت بۆ خودا(**مناف لعبوديتك**)، ئەو ئەوصافانە چین پێچەوانە لەگەڵ بەندایەتی و ملکەچی بۆ خودا دەوەستنەوە؟ **لێرەدا بە کورتی ئاماژە بەو ئەوصافانە دەکەین:**

١. **دان نەنان بە حەقدا(الجحود):**

هەموو ئینکارکردنێکی حەق دەچێتە خانەی کوفرەوە، بەلاَم بە پلەی جۆراوجۆر ﴿ وَتِلْكَ عَادٌ ۖ جَحَدُوا۟ بِـَٔايَـٰتِ رَبِّهِمْ وَعَصَوْا۟ رُسُلَهُۥ وَٱتَّبَعُوٓا۟ أَمْرَ كُلِّ جَبَّارٍ عَنِيدٍ ﴿٥٩﴾ وَأُتْبِعُوا۟ فِى هَـٰذِهِ ٱلدُّنْيَا لَعْنَةً وَيَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ۗ أَلَآ إِنَّ عَادًا كَفَرُوا۟ رَبَّهُمْ ۗ أَلَا بُعْدًا لِّعَادٍ قَوْمِ هُودٍ ﴿٦٠﴾ ﴾ هود: ٥٩—٦٠، سەرنج بدە چۆن بە جحود (جَحَدُوا۟ بِـَٔايَـٰتِ رَبِّهِمْ ۖ) دەستیان پێکرد و سەریان لە کوفرەوە دەرچوو(أَلَآ إِنَّ عَادًا كَفَرُوا۟ رَبَّهُمْ ۗ).

٢. **لوتبەرزی (التكبر):**

لوتبەرزی بریتییە لە خۆ بەگەورەزانین و بەرانبەر بە بچووك و کەم ئەرزش تەماشاکردن، لەوێوە خۆسەپاندن و خەڵك چەوساندنەوە﴿ وَلَا تُصَعِّرْ خَدَّكَ لِلنَّاسِ وَلَا تَمْشِ فِى ٱلْأَرْضِ مَرَحًا ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ ﴿١٨﴾ ﴾لقمان: ١٨، رووت لە خەڵکی وەرمەچەرخێنە، کەشوفش مەکە لە رۆیشتنت بەسەر زەویدا، خودا خۆبەزلزانی فەخرکەری خۆشناوێت.

### ٣. خۆپەسەندی (العجب):

خۆپەسەندی عاشقبوون و عەودالبوونی خۆ و ڕا و بۆچوونی خۆیە، لێرەوە خۆپەرستی لە ناخی مرۆڤدا ریشك دەدەكوتێ و تا ئەو جێگەیە كە فیرعەونی تێكەوت شۆڕدەبێتەوە، ئەو دەیوت﴿ فَقَالَ أَنَا۠ رَبُّكُمُ ٱلۡأَعۡلَىٰ ﴿٢٤﴾ ﴾ النازعات: ٢٤، وتی: من بالاترین و بەرزترین دەسەلات و پەروەردگاری ئێوەم﴿ وَقَالَ فِرۡعَوۡنُ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمَلَأُ مَا عَلِمۡتُ لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرِي ﴾ القصص: ٣٨، فیرعەون وتی: ئەی دەستەی فیرعەونییەكان من جگە لە خۆم خودایەكی پەرستراوی تر بۆ ئێوە شك نابەم.

### ٤. ریاكاری (الرياء):

ریاكردن وتن و ئەنجامدانی كار و كردەوەیەكە رووالەتەكەی بۆ خودا بێت و لەناخەوە مەبەستت پیاهەلدان و مەدحكردنی خەلكی بێت بۆت، ریا خۆپەرستی و خەلك پەرستییە، خۆپەرستییە چونكە دەتەوێت بەشان و بالتدا هەلبدەن و مەدحت بكەن و لەناو چاكاندا ناوت بهێنن، خەلكپەرستییە، چونكە كارەكەت بۆ ئەوانە نەك بۆ خودا (**عَنْ مَحْمُودِ بْنِ لَبِيدٍ أَنّ رَسُولَ اللهِ صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ قَالَ: "إِنّ أَخْوَفَ مَا أَخَافُ عَلَيْكُمْ الشّرْكُ الْأَصْغَرُ" قَالُوا: وَمَا الشّرْكُ الْأَصْغَرُ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: "الرّيَاءُ، يَقُولُ اللّهُ عَزّ وَجَلّ لَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِذَا جُزِيَ النّاسُ بِأَعْمَالِهِمْ اذْهَبُوا إِلَى الّذِينَ كُنْتُمْ تُرَاءُونَ فِي الدُّنْيَا فَانْظُرُوا هَلْ تَجِدُونَ عِنْدَهُمْ جَزَاءً**)[9]، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: ئەوەی زۆر لێی دەترسم بۆ ئێوە بریتییە لە هاوەلدانانی بچووك، فەرموویان: هاوەلدانانی بچووك چییە ئەی پێغەمبەری خودا؟ فەرمووی: ریاكردن، خودای (**عزوجل**) لە رۆژی قیامەتدا (كاتێك خەلكی بە كردەوەكانیان پاداشت درانەوە) پێیان دەفەرموێت:: بچن بۆ لای ئەوانە كە لە دونیادا ریاتان بۆ دەكردن، تەماشا بكەن بزانن هیچ پاداشتێكتان لەلای ئەوان دەست دەكەوێت.

**پێچەوانەی ئەم ئەوصافانە كە نەرێكەری بەندایەتی راستەقینەن كۆمەلێك ئەوصافی تر بوونی هەیە پێویستە باوەڕداری راستەقینە خۆی پێ بڕازێنێتەوە، لەوانە:**

---

٩ ". أخرجه أحمد (٤٢٨/٥، رقم ٢٣٦٨٠). وصححه الألباني (صحيح الجامع، رقم ١٥٥٥.

### ١. خۆبەکەم زانین لەبەردەم خودادا و بۆ خودا ( التواضع ):

وشەی (التواضع) لە زمانی عەرەبیدا مانای (التذلل)ی هەیە کە ملکەچی و شۆڕبوونەوە دەگەیەنێت، بەرزترین ڕەوشتێك گەورەکان دەیگەنێ بریتییە لەو ملکەچی و شۆڕبوونەوە، ئەگەر عیززەتی نەفس جوانترین ئاکاری هەژارەکان بێت ئەوا تەوازوع بەرزترین ڕەوشتی زانایان و دەسەڵاتداران و دەوڵەمەندانە﴿ وَعِبَادُ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى ٱلْأَرْضِ هَوْنًا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلْجَٰهِلُونَ قَالُوا۟ سَلَٰمًا ﴿٦٣﴾ ﴾ الفرقان: ٦٣، بەندەکانی ڕەحمان ئەوانەن بە ئارامی پێ لە زەوی دەنێن و کاتێك نەفامان گفتوگۆیان لەگەڵ بکەن هێمنی و ئارامی و ئاشتییان بەسەردا دادەبارێنن.

### ٢. حیلم ( الحلم ):

حیلم جیاوازی هەیە لە ئارامگرتن(صبر)، صەبر خۆگرتن و ئارامگرتنە تاکو قسە و کردار و ڕەفتارێکت لێ نەوەشێتەوە پێچەوانەی ئادابی ئیسلام بێت، بەڵام لە ناخەوە هەست بە پەستان و دڵگرانییەك دەکەیت، حیلم بریتییە لە صەبرێك کە ناخی کەسەکە زۆر ئارامە و بە قسە و کرداری کەسی بەرانبەر نەهەژاوە و وەك دەریایەك پیسییەکانی دەرەوە دەشارێتەوە و خۆیشی بەپاکی دەمێنێتەوە، کەسی حەلیم زۆر بالایە و دانابەزێت بۆ ئاستێك کە خەڵکی نەزان تیایدا دەخولێنەوە.

### ٣. ڕازیبوون( الرضا ):

ڕازیبوون لە خودا و لە بەشی خودا مەقامێکی بەرزی باوەڕە، هەتا مرۆڤ خۆی و خودا بە باشی نەناسێت پێ لەم مەقامە بەرزەی ئیمان نانێت، خۆت بناسی و تێبگەیت کە تۆ نازانیت کامە بۆت چاکە و کامە بۆت خراپە، خواش بناسی و تێبگەیت ئەو(ﷻ) هەموو خێر و چاکەیەکی بۆ بەندەکانی دەوێت، لێرەوە خۆت ڕادەستی خودا دەکەی و ئەوەی ئەو بۆت دیاری دەکات بە خۆش و ناخۆشەوە پێی ڕازی دەبیت، لەسەر خۆشەکان لەپاڵ ڕازیبووندا شوکر دەکەی و لەسەر ناخۆشەکان لەپاڵ ڕازیبووندا ئارام دەگریت. خودا وەصفی یارانی حەزرەت دەکات و دەفەرموێت:﴿وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلْأَوَّلُونَ مِنَ ٱلْمُهَٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحْسَٰنٍ رَّضِىَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا۟ عَنْهُ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى تَحْتَهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿١٠٠﴾ ﴾ التوبة: ١٠٠

**٤ . ئیخلاص( الإخلاص ):**

دڵسۆزی و بۆخودایی و لەبەرخودایی و نیازپاکی لە تەواوی نیێت و قسە و کار و کردەوەدا نیشانەی یەکلابوونەوەی بەندەی خودایە بۆ خودا، ئەو لە نەفسی خۆی هاتۆتە دەرەوە و بەشی خۆی لە کار و کردەوەکانیدا بوونی نییە، کە مرۆڤ لەخۆی هاتە دەرەوە لە خەڵکیش رزگاری دەبێت، دەگۆڕێت بۆ بەندەیەکی ملکەچ و فەرمانبەر بۆ پەروەردگاری، ئیخلاص پاڵفتەبوونی نیێت و قسە و کردارە لە خەوش و خاڵی خودی خۆ و خەڵکی، تەنها یەك پاڵفتە دەمێنێتەوە کە بریتییە لە پاڵفتەبوونی دینی کەسەکە ئەویش تەنها بۆ خودا﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُوا۟ وَأَصْلَحُوا۟ وَٱعْتَصَمُوا۟ بِٱللَّهِ وَأَخْلَصُوا۟ دِينَهُمْ لِلَّهِ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ مَعَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۖ وَسَوْفَ يُؤْتِ ٱللَّهُ ٱلْمُؤْمِنِينَ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿١٤٦﴾ ﴾ النساء: ١٤٦، هەروەها﴿ قُلْ إِنَّ صَلَاتِى وَنُسُكِى وَمَحْيَاىَ وَمَمَاتِى لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿١٦٢﴾ ﴾ الأنعام: ١٦٢

۞ بانگی حەق(**نداء الحق**) بریتییە لە بانگی پێغەمبەران بۆ تەوحید و دوورکەوتنەوە لە هاوەڵدانان و زەلکاوی بتپەرستی (**الشرك و الأوثان**)، بانگی حەق وەڵامدانەوەی ئەو بانگەیە کە خودا دەفەرموێت:﴿ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ ۖ قَالُوا۟ بَلَىٰ ۛ شَهِدْنَآ ﴾الأعراف: ١٧٢، خودا پەیمانی لە هەرچی نەوەی ئادەمە وەرگرتووە و فەرموویەتی: من پەروەردگاری ئێوە نیم؟ ئەوانیش بە یەك دەنگ وتوویانە: بەڵێ، تۆ پەروەردگاری ئێمەی و شاهیدی دەدەین. پێویستە ئەم "بەڵێ و شاهیدییە" لێرە بەڕاست دەربکەین و بچین بەدەم بانگی پێغەمبەرانەوە و ملکەچی و بەندایەتیمان بۆ ئەو پەروەردگارە دەربڕین.

۞ ۞ ۞

# حیكمەتی سی و پێنج

((أَصْلُ كُلِّ مَعْصِيَةٍ وَغَفْلَةٍ وَشَهْوَةٍ الرِّضَا عَنِ النَّفْسِ وَأَصْلُ كُلِّ طَاعَةٍ وَيَقَظَةٍ وَعِفَّةٍ عَدَمُ الرِّضَا مِنْكَ عَنْهَاوَلأَنْ تَصْحَبَ جَاهِلاً لاَ يَرْضَى عَنْ نَفْسِهِ خَيرٌ لَكَ مِنْ أَنْ تَصْحَبَ عَالِمًا يَرْضَى عَنْ نَفْسِهِ فَأَيُّ عِلْمٍ لِعَالِمٍ يَرْضَى عَنْ نَفْسِهِ وَأَيُّ جَهْلٍ لِجَاهِلٍ لاَ يَرْضَى عَنْ نَفْسِهِ))

## راڤەی وشەكان:

**أصل:** بنچینە

**معصية:** سەرپێچی و یاخیبوون

**غفلة:** بێئاگایی

**شهوة:** حەز و ئارەزوو

**الرضا عن النفس:** لەخۆ رازیبوون

**طاعة:** گوێڕایەڵی

**يقظة:** ئاگاهی

**عفة:** پاكداوێنی

**تصحب جاهلا:** هاوەڵی نەفامێك بكەیت

**واتا ((بنچینەی هەرچی یاخیبوون و بێئاگایی و ئارەزوویەك بریتییە لە خۆڕازیبوون، بنچینەی هەرچی گوێڕایەڵی و بەئاگاهاتن و پاكزمانی و پاكڕەفتاری و پاكداوێنییەك بریتییە لە ناڕازیبوون لە خۆ، گەر هاودەمی نەفامێك بكەیت لەخۆی ناڕازیبێت چاكترە بۆت لە هاوەڵی كردنی زانایەك لەخۆی رازییێت، چ زانستێك لای زانایەكە لەخۆی رازی بێت؟! چ نەزانییەك لای نەزانێكە لەخۆی ناڕازی بێت؟!))**

**شرۆڤە:**

۞ لای ئیبن عەتا سەرچاوەی هەرچی نەزانییە بریتییە لە رازیبوون لەخۆ، چاوگەی هەرچی زانستیشە لە "نارازیبوون لە خۆ"وە هەڵدەقوڵێت.

۞ خودای موتەعال مرۆڤی بە ئاتاج دروست کردووە، ئەم ئاتاجی و هەژارییە بەردەوام بەرەو کەماڵ هەڵیدەنێت، کاتێك مرۆڤ جۆرێك لە رازیبوون لەخۆ لای دروست دەبێت وای لێدەکات نەنگی و ناتەواوییەکانی خۆی نەبینێت، ئەمەش لە جووڵە و گەردەشی دەخات و تەکانی بەرەو کەماڵی رادەوەستێنێت، هەموو وەستانێکیش بۆگەنبوون رووی تێدەکات و لەوێوە لەخۆرازیبوون دەبێت بە زەلکاوێك هەرچی دەرد و ئافاتی دەروونییە تیایدا سەرهەڵدەدات، لەدەستەکەی ترەوە نارازیبوون لەخۆ وا لە مرۆڤ دەکات نەنگی و ناتەواوییەکانی خۆی ببینێت، ئەمەش کەسەکە هەڵدەنێت بۆ پڕکردنەوەی ناتەواوییەکان، لێرەوە دەکەوێتە ناو حەرەکەتی چوون بەرەو کەماڵ، ئەم جووڵە و گەردەشە بەردەوامەش وزەیەکی مەعنەوی ئەرێیی بە خاوەنەکەی دەبەخشێت و زۆرێك لە ئەوصافی چاك و پاکی تیادا دەروێنێت.

۞ خودای موتەعال حەرەکەتی ناوەوە و دەرەوە لە مرۆڤ داوا دەکات، ئەم حەرەکەتە باوەڕدار لە بێباوەڕ جیادەکاتەوە، لە**"لسان العرب"**دا لەمەڕ وشەی **"کفر"** هاتووە(و**"الكفر" بالفتح: التغطية**... لە کتێبی"**الصحاح**"هاتووە، **الكفر: الليل المظلم**)، بەشێوەیەکی گشتی وشەی "کفر" مانای "داپۆشین" دەگەیەنێت و وشەی "کافر"یش مانی "ساتر"واتە "داپۆشەر" دەگەیەنێت، دەبێ کەسی بێباوەڕ چی داپۆشێت؟ کەسی بێباوەڕ ئەو ئامادەییەی تیایدا دانراوە -کە کلیلی کردنەوەی دەرگاکەی بریتییە لە ئیمان- پەردەپۆش دەکات و ناهێڵێت ئامادەییە رۆحییەکانی بۆ کردار بگۆڕێت، واتە ناکەوێتە ناو حەرەکەت و گەردەشی چوون بەرەو کەماڵ، لێرەوە ئامادەییە رۆحییەکانی دەپوکێنەوە و وای لێ دێت وەك ئەوەی هیچ جۆرە ئامادەییەکی رۆحی تیا دانەنرابێت، ئەمە ئەو ئاستە نزمەیە مرۆڤ بۆی شۆڕدەبێتەوە و خودای موتەعال نموونەی ئەو جۆرە مرۆڤانە بە ئاژەڵان بەڵکو پەستتر لە ئاژەڵان باس لێوە دەکات﴿**وَلَقَدۡ ذَرَأۡنَا لِجَهَنَّمَ**

كَثِيرًا مِّنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ ۖ لَهُمْ قُلُوبٌ لَّا يَفْقَهُونَ بِهَا وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لَّا يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ ءَاذَانٌ لَّا يَسْمَعُونَ بِهَآ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ كَٱلْأَنْعَٰمِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْغَٰفِلُونَ ﴿١٧٩﴾ ﴾ الأعراف: ١٧٩

# حیكمەتی سی و شەش

**((شُعَاعُ الْبَصِيرَةِ يُشْهِدُكَ قُرْبَهُ مِنْكَ، وَعَيْنُ الْبَصِيرَةِ يُشْهِدُكَ عَدَمَكَ لِوُجُودِهِ، وَحَقُّ الْبَصِيرَةِ يُشْهِدُكَ وُجُودَهُ، لاَ عَدَمَكَ وَلاَ وُجُودَكَ))**

## راڤەی وشەكان:

**شعاع البصيرة:** تیشكی بەصیرەت

**يشهدك قربه منك:** نزیكی ئەو لە تۆ نیشان دەدات

**عين البصيرة:** چاوی بەصیرەت

**تشهدك عدمك لوجوده:** نەبوونی تۆ بەهۆی بوونی ئەوەوە نیشان دەدات

**حق البصيرة:** حەقی بەصیرەت

**يشهدك وجوده، لا عدمك ولا وجودك:** بوونی ئەوت نیشان دەدات، نە نەبوونی تۆ نە بوونی تۆ

**واتا ((تیشكی بەصیرەت نزیكی ئەو لە تۆ بەتۆ نیشان دەدات، چاوی بەصیرەت نەبوونی تۆ نیشان دەدات بەهۆی بوونی ئەوەوە، حەقی بەصیرەت بوونی ئەو بە تۆ نیشان دەدات، نە نەبوونی تۆ و نە بوونی تۆ))**

## شرۆڤە:

❁ دوای بڕینی ئەو قۆناغانە لە ئیمان كە لە حیكمەتی یەكەمەوە تا ئەم حیكمەتە ئیبن عەتا باسی لەبارەوە كرد، سالیكی ڕێگەی خودا گەیشتۆتە ئاستێك چاوی بەصیرەتی بكرێتەوە، بۆیە لەم حیكمەتەدا ئیبن عەتا باس لە سێ جۆر بەصیرەت دەكات، تیشكی بەصیرەت و چاوی بەصیرەت و حەقی بەصیرەت﴿قَدْ جَآءَكُم بَصَآئِرُ مِن رَّبِّكُمْۖ فَمَنْ أَبْصَرَ فَلِنَفْسِهِۦۖ وَمَنْ عَمِيَ فَعَلَيْهَاۚ وَمَآ أَنَا۠ عَلَيْكُم بِحَفِيظٍ ﴿١٠٤﴾﴾ الأنعام: ١٠٤

❁ ئایا لە سەرەتاوە تا ئەم جێگە ئێمە وەك توێژەرێك خەریكی ئەم حیكمەتانە بووین یان وەك سالیكێك رێگەی خودامان گرتۆتە بەر؟ هەندێك لە عاریفان ئامۆژگاری شاگرد و رۆڵەكانی خۆیان كردووە بە وتنی(رۆڵەكەم ببە بە چاوگەی مانا، ئەگینا ماناكەت لەدەست دەچێت)

❁ كوێربوون كوێربوونی چاوی دڵە نەك چاوی سەر، زۆرن ئەوانەی چاوی سەریان نییە لە ئاستێكی بەرزی باوەڕدا دەژین، زۆرن ئەوانەی چاوی سەریان هەیە و پەردەیان بەسەر چاوی دڵدا هێناوە﴿ أَفَلَمْ يَسِيرُواْ فِي ٱلْأَرْضِ فَتَكُونَ لَهُمْ قُلُوبٌ يَعْقِلُونَ بِهَآ أَوْ ءَاذَانٌ يَسْمَعُونَ بِهَاۖ فَإِنَّهَا لَا تَعْمَى ٱلْأَبْصَٰرُ وَلَٰكِن تَعْمَى ٱلْقُلُوبُ ٱلَّتِي فِي ٱلصُّدُورِ ﴿٤٦﴾ ﴾ **الحج: ٤٦**

❁ پێغەمبەر(ﷺ) لەخودا دەپاڕایەوە و داوای نووری دەكرد(( **عن عبدالله بن عباس أنه رقد عند رسول الله صلى الله عليه وسلم فاستيقظ فتسوك وتوضأ وهو يقول:** ﴿ إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَأٓيَٰتٍ لِّأُوْلِي ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩٠﴾ ﴾ آل عمران: ١٩٠ **فقرأ هؤلاء الآيات حتى ختم السورة، ثم قام فصلى ركعتين فأطال فيهما القيام والركوع والسجود ثم انصرف فنام حتى نفخ، ثم فعل ذلك ثلاث مرات ست ركعات، كل ذلك يستاك ويتوضأ ويقرأ هؤلاء الآيات، ثم أوتر بثلاث، فأذن المؤذن فخرج إلى الصلاة، وهو يقول"اللهم اجعل في قلبي نورا، وفي لساني نورا، واجعل في سمعي نورا، واجعل في بصري نورا، واجعل من خلفي نورا، ومن أمامي نورا، واجعل من فوقي نورا، ومن تحتي نورا، اللهم أعطني نورا)[١٠].**

❁ **بەصیرەت چییە؟**

بەصیرەت لە فەرهەنگی زمانی عەرەبیدا مانای(**الإدراك، الفطنة، الدليل، الشاهد**)ی هەیە، واتە(درككردن، زیرەكی بیۆێنە، بەڵگە و بورهان و بینین و گەواهی)، لەڕووی زاراوەییشەوە مانای(كرانەوەی چاوی دڵ و فراوانی پەیپێبردن و وەرگرتنی سەرئەنجامەكان لەسەرەتاكانەوە و هێنانە پێشەوەی داهاتوو بۆ ناو ئێستا، بەصیرەت

---

١٠ رواه مسلم.

تەنها چاوگەیەکی عیرفانە دەلیلی ئیلهامی بەدەستەوە دەدات، یەکەمین ئاستە تیایدا رۆح لە نهێنی شتەکان تێدەگات، هەستێکی ویژدانی قووڵە ئەوەی ئەقڵ پەی پێ نابات بەهۆی وابەستەبوونی بە رەنگ و قەبارە و رووالەتەوە ئەو تێیدەپەڕێنێت و لێی حاڵی دەبێت)

۞ تیشکی بەصیرەت سەرەتای سەرهەڵدانی بەصیرەتە، لەم قۆناغەدا سالیك هێشتا لە "خۆی" نەهاتۆتە دەرەوە، کە دەڵێین لە "خۆی" مەبەستمان پێی ئەو "من"ەیە کە هەڵیگرتووە، هەتا مرۆڤ لەناو "من"دا بژی هەنگاو بەرەو خودا هەڵناگرێت، کاتێك هێواش هێواش لە "من" دێتە دەرەوە تیشکی بەصیرەتی بۆ پەیدا دەبێت، هەتا دوورکەوتنەوەکەی لە "من" زۆرتربێت تیشکەکە بەهێزتر دەبێت و زیاتر لە خودا نزیك بووەتەوە، وەك عاریفان دەڵێن(تەنها پەردەیەك لە نێوان تۆ و خودادا بریتییە لە خودی خۆت)، ئەم دوورکەوتنەوە لە "من" لای ئەهلی ڕێگەی خودا بە "فەنا" ناوبراوە، فەنا بریتی نییە لە سڕانەوە و نەمانی ڕەسمی مرۆڤ بەڵکو هاتنە دەرەوەیە لە دۆخی "من"، بەجۆرێك ئەنانییەت لە مرۆڤدا کۆتایی پێ بێت.

۞ **چاوی بەصیرەت:** ئاستی دووەمە لە دوورکەوتنەوە لە "من"، بەجۆرێك لە خودی خۆت دووردەکەویەوە کە هەست بە نەمانی دەکەیت، ئەم هەستەش کاتێك سەرهەڵدەدا لەبەردەم دەرگای چوونە ژوورەوەدای بۆ ناو رۆحی خۆت، بەهۆی نزیکیتەوە لە خودا لێزمەی نوور هەموو بوونی داگیرکردووی، لەگەڵ ئەوەشدا هەست دەکەیت بوونێك لە تۆدا گۆڕا بۆ نەبوون، واتە دەزانیت ئەو"من"ەی لەسەرەتاوە لەگەڵت بوو سڕایەوە و وەکو سەراب وێنەکەی بزر بوو.

۞ **حەقی بەصیرەت:** لەم ئاستەی بەصیرەتدا تۆ گۆڕاویت بۆ نوور، هەست ناکەیت تۆ بوونێك بیت و نوورەکەش بوونێکی تر، بەڵکو هەموو بوونەکان بوونەوەتەوە بە یەك بوون کە تۆی، بۆیە بوون و نەبوونی "من"ەکەی سەرەتا مانای بۆ نامێنێتەوە (**لا عدمك، ولا وجودك**)، ئەگەر درەختێك لە دۆخی درەختبوون بێتە دەرەوە و بگۆڕێت بۆ مرۆڤ، ئایا درەختبوون بۆ ئەو مانایەکی بۆ دەمێنێتەوە، ئەو ئێستا بوونێکی بالایە، ئێستا هۆشیارە، بیردەکاتەوە، قسە دەکات، لەوانەیە لەبیری بچێت رۆژێك درەخت

بووە، عاریفێك دەڵێت: (جارێك لە خەونمدا بووبووم بە پەپوولە، ئێستا نازانم مرۆڤم و خەونم بە پەپوولەبوونەوە بینیوە، یان پەپوولەم و خەون بە مرۆڤبوونەوە دەبینم)

❁ ئەم گەشتە رۆحییە لە کوێوە و چۆن دەستپێبکەین؟ چۆن لە "من" بێینە دەرەوە و بگەینەوە بە سەرچاوەی رۆحی خۆمان؟ پرسیارێکە و دەمانەوێت بەزمانێکی هەندێ زانستی قسەی لەبارەوە بکەین.

❁ مرۆڤ نغرۆی بیر و بیرکردنەوە بووە، تەئویل کردنی هەموو شتێك، حوکم دەرکردن بەسەر هەموو شتێکدا، ناونیشان دانان بۆ هەموو شتێك، تێپەڕاندنی هەموو شتێك بە شاشەی زەیندا، ئەمە رێگە باوەکەی ژیانی هەموو کەسێکە، زۆربەی هەرە زۆری خەڵکی نازانن کە بەو جۆرە دەژین، چونکە هەموو خەڵکی وادەژین، سیاسییەکان، دەوڵەمەندەکان، بەناوبانگەکانی جیهان، سەرکەوتووەکانی جیهان، هەموو بە هەمان شێوە ژیان بەڕێدەکەن، بەڵام بەو توانا سەرسوڕهێنەرەی مرۆڤ هەیەتی (ئەگەر ساتێکی کەمیش بێت) دەتوانێت لە جووڵەی هزر و بیر بچێتە دەرەوە، لەگەڵ هاتنە دەرەوە لە بیرکردنەوە تێڕوانینەکانی مرۆڤ بۆ خۆی و دەوروبەری دەگۆڕێ، هەموو شتێك لەلای تازەیە، بۆ؟ چونکە ئەو شێوە کۆنانەی ژیان لە لای تێکوپێك دراوە و ئێستا فۆرمگەلێکی نوێ دەبینێ کە پێشتر ئەزموونی نەکردووە، بەکام رێگە لە ئەفکارەکانم بچمە دەرەوە؟ تەنها وەڵامێك بریتییە لە "ئامادەبوون" و "تێڕامان".

❁ **ئامادەبوون:** بریتییە لە ئارامی و خامۆشی پلە بە پلەی ئەقڵ (یان بیرکردنەوە)، تا شەپۆلەکانی بیر دادەمرکێنەوە و مرۆڤ دەگاتە سەرچاوەی هزر و هۆشیاری خاوێن کە بریتییە لە رۆح، واتە تا وابەستەی جەوهەر و رۆحی خۆی دەبێت، کە مرۆڤ گەیشتە رۆحی خۆی دەگاتە خودا، چونکە رۆحی مرۆڤ لە خوداوەیە﴿وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِي﴾ الحجر: ٢٩، گەر دەتەوێ لە "ئامادەبوون" تێبگەی لەو پشیلەیە وانە وەربگرە کە لە دەرگای کونی مشکێکدا خۆی داگرتووە و دەیەوێ مشکەکە سەر دەربهێنێ و ئەمیش هەڵمەتی بۆ ببات و بیکات بە نێچیری خۆی، ئەو پشیلەیە تەنها چاوی بڕیوەتە کونی مشکەکە و تەواوی کار و حەز و ئارەزووی بریتییە لە گرتنی مشکەکە، بۆ ئەو کارەش لەئەوپەڕی ئامادەباشیدایە، هەموو خەریکبوون و بیرکردنەوەیەکی پشیلەکە هەنگاوێك

له ئامانجەکەی دووری دەخاتەوە، تەنانەت ئەگەر بیرکردنەوەش بێت لە مشکەکە، بۆ نموونە لە بیری خۆیدا بڵێت: "دەیگرم و هەندێ یاری پێدەکەم ئەوجا دەیبەم بۆ بەردەمی بەچکەکانم"، بیرکردنەوە -هەر بیرکردنەوەیەك- پشیلەکە لە ئامانج دووردەخاتەوە، جا بیرکردنەوەکە لە پارچە دوگێك بێت، یان لە مشکێکی قەڵەو، عاریفێك دەڵێ مامۆستاکەی من پشیلە بوو، من لەوەوە فێری "ئادەبوون" بووم..

۞ **دەپرسی چۆن بگەمە ئەو ئاستە باڵا لە ئامادەبوون و گەیشتن بە رۆحی خۆم؟** تەوژمی بیرکردنەوە تەوژمێکی بەردەوام نییە، بەڵکو لەیەکتر دابڕاو و پچڕ پچڕە، تۆ دەتوانی لەو بۆشاییانەوە بچییە ژوورەوە، لەو کەلەبەرانەوە دەتوانی هەنگاو بۆ ناو پانتایی رۆحی خۆت هەڵبگریت، بۆشایی نێوان ئەفکارەکانمان هەمان ئەو بۆشاییانەن کە لە نێوان ترپەکان(**ذبذبات**)ی گەردووندا بوونیان هەیە، چونکە لە نێوان هەر دوو ترپەیەکدا پانتاییەکی بچووك لە بۆشایی بوونی هەیە، "فیزیای چەندێتی" دەڵێ: گەردوون لە شێوەی تۆپەڵێك لە وزەدایە، ئەم وزە زەبەلاحە لە کەمتر لە هەزار بەشی چرکەیەك خامۆش دەبێتو دواتر دادەگیرسێتەوە،واتە گەردوون سروشتێکی ترپەئامێزی هەیە، بیرکردنەوەکانی تۆش هەمان سروشتی وزەی گەردوونی هەیە، دەکوژێتەوە و دادەگیرسێتەوە، خاڵی کوژانەوە بۆشاییە و دەتوانی لە نێوان دوو خاڵی داگیرساندا -کە بۆشاییەك(کوژانەوەیەك) لە نێوانیاندا هەیە- بچییە ژوورەوە و لە تەوژمی بیرکردنەوە رزگارت ببێت..

۞ بۆئەوەی رزگارت ببێت لە بۆماوەکانی هەزاران ساڵ پێویستت بە کات نییە، پێویستت بە داهاتوو نییە، ئەقڵ پێی خۆشە کارەکە بۆ داهاتوو بگوێزێتەوە، لەم چرکەوە دەتوانی لە تەوژمی بیر رزگارت ببێت و بەرۆحی خۆت ئاشنابییەوە..

۞ لێرەدا ئەقڵت پێت دەڵێت جا ئەگەر ئەقڵ بەجێبهێڵیت کەوابوو تۆ ئەقڵت لەدەستداوە، واتە تۆ شێت بووی، ئەم قسەی ئەقڵت هیچی تر نییە جگە لە ترساندنی تۆ و فێڵ لێکردنت، تۆ کاتێك ئامادە دەبیت ئاگاهیت لەدەست نەداوە، تۆ نەسڕاویتەوە و تیانەچوویت، ئەوە فێڵی ئەقڵە کە خۆی کردووە بە تۆ و پێت دەڵێ "گەر لە من دابڕێیت تیاچوون دەبێتە چارەنووست، چونکە من حەقیقەتی تۆم، من

تۆم، من ڕۆحی تۆم"، لە ڕاستیدا بەو جۆرە نییە و ئەقڵ نابێتە حەقیقەتی مرۆڤ، ئەو کاتانەش کە تۆ ئامادەی ئاگاهییەك یاخود هۆشیارییەك بوونی هەیە کە چاودێری بیرکردنەوە و بیرنەکردنەوە دەکات، لە کاتی خەودا بیرکردنەوە ڕادەوەستێ و لەگەڵ ئەوەشدا تۆ زیندەگی لە دەست نادەیت، لەگەڵ وەستانی بیردا خەوت لێدەکەوێ، بۆیە لە کاتی ئاگاهیدا کە هەوڵی هاتنە دەرەوە لە فیکر دەدەی خەو داگیرت دەکات..

۞ **دوو ئاست لە ئاگاهی بوونی هەیە: ئاستێکی سەرخان،** واتە "سەرخانی ئاگاهی" کە بریتییە لە بیرکردنەوە، یاخود هزر و سۆز و کارلێکە ئەقڵییەکان، **لەگەڵ ئاستێکی ژێرخان،** واتە "ژێرخانی ئاگاهی" کە بریتییە لە هۆشیاری خاوێن (یان ڕۆح)، ئاستی یەکەم دەربڕی ئاستی دووەمە و تەعبیری لێدەکات، واتە ئاستی یەکەم لە ئاستی دووەمەوە هەڵقوڵاوە، شێوە و بەرجەستەی ناکۆتا لەم "ڕۆح"ەوە سەریهەڵداوە، گوڵێك بریتییە لە شێوە و بەرجەستەی ئەو ڕۆحە، ئەستێرەیەك، درەختێك، زیندەوەرێك هەموو ئەمانە جیلوەی ئەو ڕۆحە باڵان، ڕۆح لەناو شتەکاندا یاخود لەناو شێوەکاندا بوونی هەیە، بەڵام هەموو ڕۆح ناگۆڕێ بۆ شێوە و بەرجەستە، ڕەهەندێك لە ڕۆح بوونی هەیە کە بێشێوەیە و هەرچی شێوە هەیە لەو ڕەهەندەوە شێوەیان وەرگرتووە، واتە ڕۆح مەزنترە لە دەرکەوتەکانی ڕۆح ڕۆح جەوهەری سەرجەم بوونەکانە.

۞ دوای ئەوەی بیر ڕادەوەستێت دڵ ئامادە دەبێت، ئامادەبوون لەبەردەم سەرچاوەی بوونی خۆتدا (ڕۆحی خۆت)، لەوێشەوە ئامادەبوون لە خزمەتی خودادا﴾.(بۆ ئاگاداری خوێنەر ئەو نوسینانەی کەوتۆتە نێوان ئەم دوو جۆرە کەوانەوە﴿ ﴾ لە کتێبێکی چاپنەکراوی خۆم وەرمگرتووە، ئەویش لە چەندین سەرچاوەوە وەرگیراوە)

۞ ۞ ۞

# حیکمەتی سی و حەوت

((كَانَ اللهُ وَلاَ شَيْءَ مَعَهُ وَهُوَ الآنَ عَلَى مَا عَلَيْهِ كَانَ))

## ڕاڤەی وشەکان:

**ولا شيء معه:** هیچی لەگەڵ نەبوو

**على ما عليه كان:** لەسەر ئەوەیە کە لەسەری بوو

**واتا ((خودا هەبوو هیچ شتێکی لەگەڵ نەبوو، ئێستا خودا هەر ئەو خودایە و لەسەر ئەوەیە کە لەسەری بوو))**

## شرۆڤە:

❁ لەخوار خوداوە لە لەوح و قەڵەم و عەرش و کورسی فریشتەکان و زەمان و مەکان، حەوت ئاسمانەکان، مرۆڤ و جینن و ئەوەی لە بووندایە هەر هەموو دروستکراون، هەڵقوڵاون و هاتوونەتە بوونەوە، ئەم بوونانە لە نووری ئەسمائو صیفاتی خوداوە هەڵقوڵاون، بۆیە هیچ یەکێك لەم بوونانە بوونەکەی بەخۆیەوە نەبەستراوەتەوە و لەسەر لاقی خۆی ڕانەوەستاوە، ئەوە ناوی **"القيوم"**ە بە بەردەوامی ئەوانی ڕاگیر کردووە و بوونیان پارێزگاری لێدەکات، تەنها خودایە بوونی خۆی بەخۆیەوەیە و شانی لەسەر هیچ بوونێکی تر دانەداوە.

❁ بە دروستکردنی ئەم دروستکراوانە مەزنی و شکۆمەندی خودا گۆڕانی بەسەردا نەهاتووە و زیاد و کەمی ڕووی تێنەکردووە، ئەو بەر لەوەی خەلق بکات **"الخالق"** بوو، بەرلەوەی بمرێنێ و زیندوو بکاتەوە **"المميت و المحيي"**بوو، ئەو خودایەکی مەزن و شکۆمەند و کامڵ بوو بە هەموو ئەسمائو صیفاتییەوە بەر لەوەی دروستکراوەکانی بخولقێنێت، بەڵکو وشەی "مەزن و شکۆمەند و کامڵ" زۆر بچووکترن لەوەی

شکۆمەندی خودایەکی مەزنی وەك ئەو خودا کاملە تەعبیر لێبدەن، چونکە ئەم وشانە مەخلوقن و مەخلوقیش ناتوانێت وەصفی تەواوی خالیقەکەی بکات.

❁ هەرچی مەخلوقاتە ئاتاجی ئەو خودا مەزنەیە، و هەموو چرکەساتێکیان تەسبیحات و نزا و پاڕانەوەیە تاکو بوونی خۆیان لەدەست نەدەن: ﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴿١﴾﴾ الصف: ١ ﴿يَسْأَلُهُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ كُلَّ يَوْمٍ هُوَ فِي شَأْنٍ ﴿٢٩﴾﴾ الرحمن: ٢٩ ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ يَسْجُدُ لَهُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَمَن فِي الْأَرْضِ وَالشَّمْسُ وَالْقَمَرُ وَالنُّجُومُ وَالْجِبَالُ وَالشَّجَرُ وَالدَّوَابُّ وَكَثِيرٌ مِّنَ النَّاسِ وَكَثِيرٌ حَقَّ عَلَيْهِ الْعَذَابُ وَمَن يُهِنِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِن مُّكْرِمٍ إِنَّ اللَّهَ يَفْعَلُ مَا يَشَاءُ ﴿١٨﴾﴾ الحج: ١٨

❁ جیاوازی نێوان خالیق و مەخلوق: ﴿لە نێوان خوای موتەعال و دروستکراوەکانیدا جیاوازیگەلێك بوونیان هەیە، شاراوە نییە لە هەرکەسێك کەمترین بەصیرەتی هەبێت، لەوانە:

**أ**- پەروەردگار لە هەرچی دروستکراوی هەیە بێنیازە، لە هیچ ڕێگەیەکەوە خودا ئاتاجی غەیری خۆی نییە، مەلیك و دەسەڵاتداران پێویستیان بە دەستوپێوەندەکانییان هەیە، بەڵام خودا لەسەرو ئاتاجییەوەیە.

**ب**- پەروەردگار هەرچەند کرداری چاکەی خۆشدەوێ و وپێی ڕازییە و دڵخۆشە بە تۆبە و گەڕانەوەی بەندەکەی بۆ لای هەر ئەوە ئەو کردارانە دەخولقێنێ و ئاسانییان دەکات، ئەوەی خۆشی دەوێ و پێی ڕازییە بە قودرەت و ویستی خۆی خولقاندوونی، ئەمەش لە مەزهەبی ئەهلی سوننە و جەماعەدا بەڕوونی دەرکەوتووەو دانیان بەوەدا ناوە کە خودا نیعمەت بەخشی ئیمانە بە بەندەکانی بەپێچەوانەی "قەدەرییەکان"ەوە، مەخلوق هەندێ جار شتێکی بە کرداری کەسێکی ترەوە بەرچنگ دەکەوێت.

**ت**- پەروەردگار فرمانی بە شتێك کردووە بەندەکانی پێ ئیصلاح بکات و نەهی لێکردوون لە شتێك فەساد و ئاشووبیان تێ بخات، وەك قەتادە دەڵێت: خودا فەرمانی نەکردووە بە بەندەکانی لەبەر ئاتاجی خۆی بەوان، نەهی لێنەکردوون بەهۆی دەستتەنگی و چاوچنۆکییەوە، فەرمانی پێکردوون بەشتێك کەڵکی بۆ ئەوان هەبێت

و نەهی لێکردوون لە شتێك زیانیان پێدەگەیەنێت، بەپێچەوانەی مەخلوقەوە فرمان دەدات بەشتێك ئاتاجیی پێی هەبێت و نەهی دەکات لە شتێك بەهۆی چاوچنۆکییەوە، ئەمەش دیسان لە مەزهەبی سەلەف و ئەهلی سونتەتدا روون و ئاشکرایە کە حیکمەت و رەحمەتی خودا جێگیر دەکەن و دەڵێن: فرمانی بەبەندەکانی کردووە بەشتێك سوودیان پێبگەیەنێت و نەهی لێکردوون لە شتێك زیانیان پێدەگەیەنێت، بەپێچەوانەی "جەبرییەکان"ەوە کە دەڵێن: هەندێ جار خودا فرمان بەبەندەکانی دەکات بەشتێك زیانیان پێبگەیەنێت و نەهییان لێدەکان لە شتێك سوویيان پێبگەیەنێت.

**پ-** پەروەردگار بەناردنی پێغەمبەران و دابەزاندنی کتێبەکان نیعمەتبەخش (**المنعم**)ە، ئەو بە پێدانی قودرەت و هەستەکان و جگە لەمانەش نیعمەتبەخشە کە بەهۆیانەوە زانست و کرداری چاکە بەدەستدێن، ئەو رێنموونیکەری بەندەکانییەتی هەوڵ و هێز (**الحول و القوة**) تەنها بەهۆی خوداوەیە، بۆیە ئەهلی بەهەشت دەڵێن: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى هَدَىٰنَا لِهَٰذَا وَمَا كُنَّا لِنَهْتَدِىَ لَوْلَآ أَنْ هَدَىٰنَا ٱللَّهُ ۖ لَقَدْ جَآءَتْ رُسُلُ رَبِّنَا بِٱلْحَقِّ ﴿٤٣﴾﴾ الأعراف: ٤٣، مەخلوق توانای بەسەر هیچ کام لەوانەدا ناشکێت، ئەگەر خودا کارەکەی بۆ ئاسان نەکات.

**ج-** نیعمەتەکانی خودا لەسەر بەندەکانی زۆرتر و زیاترە لەوەی سەرژمێر بکرێن، گەر عیبادەت پاداشتی نیعمەت بێت، ئەوا خودی عیبادەتەکە شوکری شتێکی کەم لەو نیعمەتە دەکات، دەی چۆن شوکرانەبژێریمان پێدەکرێت گەر عیبادەت دیسان لە نیعمەتەکانی خودا بێت؟!.

**ح-** بەندەکانی هەردەم گەردنکەچ و ئاتاجی عەفو و لێبوردنی ئەون، کەس کردارەکانی نایباتە بەهەشتەوە، هیچ کەس نییە کۆمەڵێك گوناهی نەبێت و پێویستی بە لێبوردنی خودایی نەبێت﴿وَلَوْ يُؤَاخِذُ ٱللَّهُ ٱلنَّاسَ بِمَا كَسَبُوا۟ مَا تَرَكَ عَلَىٰ ظَهْرِهَا مِن دَآبَّةٍ ﴿٤٥﴾﴾ فاطر: ٤٥، ئەو فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) "لن

**يدخل أحد الجنة بعمله"**[11] دژایەتی نییە لەگەڵ ئایەتی﴿ جَزَآءَۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾ **الواقعة: ٢٤**، نەفییەکە لە فەرمودەکەدا نەفی **"المقابلة و المعاوضة"**یە، وەك دەوترێت ئەمەم بەوە فرۆشت، ئەوەی جێگیر بووە بە **"باء السبب"** جێگیر بووە، کردار هاوتای پاداشت نییە با هۆی پاداشتەکەش بێت، بۆیە هەرکەس وا گومان ببات ئەوەی لەسەرشانی بووە ئەنجامی داوە و پێویستی بە لێبوردن و عەفوی پەروەردگار نییە گومڕایە، وەك چۆن لە فەرمودەی سەحیحدا لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) ریواتکراوە **"إن الله لو عذب أهل سماواته وأهل أرضه لعذبهم وهو غير ظالم لهم، ولو رحمهم لكانت رحمته لهم خيراً من أعمالهم"** [12]

۞ ۞ ۞

---

١١ رواه البخاري و مسلم.

١٢ رواه أبو داود وابن ماجه وابن حبان في صحيحه وصححه الألباني) ( مجموع فتاوى شيخ الإسلام ابن تيمية ٢١٦/١، ٢١٧).

# حیکمەتی سی هەشت

((لاَ تَتَعَدَّ نِيَّةُ هِمَّتِكَ إِلَى غَيْرِهِ فَالْكَرِيمُ لاَ تَتَخَطَّاهُ الآمَالُ))

**راڤەی وشەکان:**

**لا تتعد:** هەنگاوهەڵمەگرە بەسەریدا، لە سنوور دەرمەچۆ، بازمەدە بەسەریدا

**نية همتك:** نیێتی هەوڵ و لێبڕان

**لا تتخطاه الآمال:** هیچ هیوا و ئاواتێك هەنگاو بەسەریدا نانێت

**واتا ((با نێتی هەوڵ و لێبڕانت بۆ لای غەیری خودا نەڕوات، چونکە بەخشندە هیچ هیوا و ئاواتێك بەسەریدا هەنگاو هەڵناگرێت))**

**شرۆڤە:**

❁ خودا هیوای هیواکانە، سەرچاوەی هەموو ئاواتەکانە، ئیتر هیوا و ئاواتی خۆت بۆ لای کێ دەبەی و بۆ چ شتێك تەرخانیان دەکەی؟

❁ خودا بەخشندەیە شەرم دەکات داوای بەندەکانی رەدبکاتەوە(عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهعَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِنَّ اللَّهَ حَيِيٌّ كَرِيمٌ ، يَسْتَحْيِي إِذَا رَفَعَ الرَّجُلُ إِلَيْهِ يَدَيْهِ أَنْ يَرُدَّهُمَا صِفْرًا خَائِبَتَيْنِ) [١٣]

❁ خودای موتەعال بەخشندەیی بە بەخشندەکان بەخشیوە و لە صیفەتی "الكريم"ی خۆی بەشیداون، بۆیە داواکان هەرچەند گەورە بن لەچاو کەرەمی ئەو هەر بچووکن.

❁ خودا خەزێنەیەکی مەزنە و هەرکەس خودای دۆزییەوە خەزائینی ئاسمان و زەوی لەچاو دۆزراوەکەی ئەو هێشتا بچووکە﴿وَلِلَّهِ خَزَآئِنُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ المنافقون: ٧

١٣ سنن الترمذي – كِتَاب الدَّعَوَاتِ، قَالَ أَبُو عِيسَى هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

# حیکمەتی سی و نۆ

**((لاَ تَرْفَعَنَّ إِلَى غَيْرِهِ حَاجَةً هُوَ مُورِدُهَا عَلَيْكَ فَكَيْفَ يَرْفَعُ غَيْرُهُ مَا كَانَ هُوَ لَهُ وَاضِعًا، مَنْ لاَ يَسْتَطِيعُ أَنْ يَرْفَعَ حَاجَةً عَنْ نَفْسِهِ فَكَيْفَ يَسْتَطِيعُ أَنْ يَكُونَ لَهَا عَنْ غَيْرِهِ رَافِعًا))**

## راڤەی وشەکان:

**لاترفعن:** بەرزی مەکەوە

**حاجة:** پێویستی

**هو موردها عليك:** ئەو بۆتی راوانەکردووە

**واضعا:** دایبەزاندووە

**رافعا:** بەرزی بکاتەوە، هەڵیبگرێت

**واتا ((پێویستییەك خودا بۆتی رەوانە کردووە بۆ لای غەیری خودا بەرزی مەکەوە، هەرکەس نەتوانێت پێویستی خۆی دەستەبەر بکات چۆن دەتوانێت پێویستی غەیری خۆی هەڵبگرێت؟!))**

## شرۆڤە:

❁ سروشتی مرۆڤ بە جۆرێکە دڵی بە "هۆکارەکان"ەوە وابەستەیە، بەلاّم کە دەگاتە پلەیەکی بالاّ لە باوەڕ تێدەگات پێویستییەکان و هۆکارەکان لەدەست خودادان و ئەوە پێویستییەکانی بۆ مرۆڤ خولقاندووە و هەر ئەویش دەتوانێت دەستەبەریان بکات.

❁ دابەزاندنی پێویستییەکان بەسەر مرۆی باوەڕداردا بۆئەوەیە بەبەرداوامی دڵی وابەستەی خودا بێت و بە زمانی دڵ لەبەر پەروەردگاری بپاڕێتەوە و ملکەچی خۆی بۆ بنوێنێت.

❁ ئەم مەقامە پلەیەکی بەرزە لە باوەڕ کە هەموو شتەکان لە خوداوە دەبینێت، ئەم پلە بالآیە پێچەوانە نییە لەگەڵ بەکارهێنانی ئەسبابە شەرعییەکاندا بە مەرجێك دڵی کەسەکە وابەستەی هۆکارەکان نەبێت و وەك فەرمانێکی شەرعی و رێزنان لە سونەنە خواییەکان دەستیان بۆ ببات، جیاوازی زۆرە لە نێو کەسێکی تینوو ئاو دەخواتەوە و باوەڕداری راستەقینە کاتێك خواردن و خواردنەوە دەخوات و دەخواتەوە لە یەك کاتدا خواردن و خواردنەوەکە لە خودا دەناسێت و تێربوون و پاراوبوونیش هەر لە ئەو(ﷺ) بۆیە دەڵێت: (**الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَطْعَمَنَا فَأَشْبَعَنَا، وَسَقَانَا فَأَرْوَانَا**)[١٤]، سوپاس بۆ ئەو خودایەی خواردنی پێداین و تێریکردین، ئاوی پێبەخشین و پاراوی کردین. سەرنج بدە کە دەفەرموێت: "خواردنی پێداین و تێری کردین، ئاوی پێداین و پاراوی کردین" ئەگەر هەرچی خواردنی دونیایە بیخۆیت خودا تێرت نەکات تێرنابیت، ئەگەر هەرچی ئاوی شیرینی دونیایە بیخۆیتەوە خودا پاراوت نەکات تینوێتیت ناشکێت.

❁ پێویستی و ئاتاجییەك خودا بەسەر مرۆڤدا بیسەپێنێت بە هەموو دونیا هەڵناگیرێت، تەنانەت ئەگەر پێویستییەکە لەڕواڵەتدا دەستەبەر بکرێت هەمان ئەو پێویستییە بەدەستهاتووە دەبێت بە سەرچاوەی چەندەها پێویستی گەورەتر و گەورەتر.

❁ ❁ ❁

١٤ **كتاب الأربعين في شعب الدين**–رقم الحديث: ١٦.

# حیكمەتی چل

((إِنْ لَمْ تُحْسِنْ ظَنَّكَ بِهِ لأَجْلِ حُسْنِ وَصْفِهِ فَحَسِّنْ ظَنَّكَ بِهِ لِوُجُودِ مُعَامَلَتِهِ مَعَكَ فَهَلْ عَوَّدَكَ إِلاَّ حَسَنًا وَهَلْ أَسْدَى إِلَيْكَ إِلاَّ مِنَنًا؟!))

**ڕاڤەی وشەكان:**

**لم تحسن ظنك به:** گومانت باش نەبوو بە خودا

**حسن وصفه:** وەصفی چاك و جوانی

**معاملته معك:** مامەڵەكردنی لەگەڵت

**عودك حسنا:** چاكەی لەگەڵ كردووی

**أسدى إليك مننا:** بەچاكەكانی منەتی لەسەركردووی

**واتا ((ئەگەر گومانت باش نەبوو بەخودا لەپێناو ئەوصافی چاك و جوانیدا، ئەوا گومانت پێی باش بێت لە پێناو مامەڵەی باشی لەگەڵت، جگە لە چاكە چی لەگەڵ كردووی؟ بەچاكەكانی منەتباری كردووی ؟!))**

**شرۆڤە:**

۞ مرۆڤ ناتوانێت بگاتە مەقامی تەسلیمبوون بە خودا هەتا نەگاتە مەقامی یەقین، مەقامی یەقین وەهم و شك و گومانی تیا دەڕەوێتەوە، دڵ یەكلادەبێتەوە و پاڵ بەخوداوە دەدات، ئیتر خۆی رادەستی مەلیك دەكات و هەڵبژاردنێك ناكات بە پرسی مەلیك نەبێت، بەڵكو هەڵبژاردنەكانی بریتین لە هەڵبژاردنی مەلیك.

۞ ئەم حیكمەتە تەواوكەری حیكمەتی سی و نۆیە كە فەرمووی: پێویستییەكانت تەنها بۆ لای خودا بەرزبكەرەوە، لێرەشدا دەفەرموێت: بۆئەوەی دڵت یەكلاببێتەوە و بتوانیت تەنها لە خودا داوا بكەیت پێویستت بە یەكێك لەم دووانەیە:

**یەکەمیان،** تێگەیشتنە لە ئەسمائو صیفاتی خودای موتەعال، خودا موصوفە بە ئەوصافی بەرز و بڵند، لەوانە: ڕۆزیدەر **"الرزاق"**، بەخشەر **"الوهاب"**، ڕەحمان **"الرحمن"**، والاکەر **"الفتاح"**، دەوڵەمەند و بێنیاز لە هەرکەسێك **"الغني"**، کە باوەڕدار لە مانای ئەم ناوە جوانانە گەیشت ئیتر دڵی بەخودا دەدات و بۆ دەستەبەرکردنی پێویستییەکانی ڕوو لەو دەکات.

**دووەمیان،** گەر لەم ئەوصافە بەرز و بڵندانەی خودای موتەعال بەهرەمەند نەبووی ئەوا سەرنجی ئەو گشتە بەهرە و فەزڵانەی خودای موتەعال بدە کە بەتۆی بەخشیوە، تۆ نەبووی بوونی پێبەخشیت، بە مرۆڤ دروستی کردی، دەیتوانی بە گیاندارێکی تر تۆ بخولقێنێت، ئیمانی پێبەخشیت، لەناو ئیماندا تۆی کرد بە کەسێك بۆ بەدەستهێنانی پلە بەرزەکانی باوەڕ بکۆشیت، نیعمەتی زۆری لە جەستە و لە ڕۆزی بۆ فەراهەم کردووی، ئایا کەسێکی ئاوا بەخشندە شایستەی ئەوە نییە متمانەی پێ ببەخشی و خۆتی ڕادەست بکەیت؟! بەدڵنیایەوە بەڵێ.

۞ تۆ داواکانت بۆ لای کەسانێ دەبەیت کە ئەوانیش هەژاری بەردەم قاپی خودان ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ أَنتُمُ ٱلْفُقَرَآءُ إِلَى ٱللَّهِ ۖ وَٱللَّهُ هُوَ ٱلْغَنِىُّ ٱلْحَمِيدُ ﴿١٥﴾﴾ فاطر: ١٥، ئەمانەی خودا بانگیان لێدەکات و بە هەژار ناویان دەبات هەموو خەڵکییە بەهەژار و دەوڵەمەندەوە، بە سەدار و ژێردەستەوە هەموو ئاتاجی دەرگای خودان، جا گەر هەمووان داواکانیان دەبەنەوە بۆ لای خودا ئەی تۆ بۆ داواکەت بۆ لای ئەو بەرزناکەیەوە؟!

۞ ۞ ۞

# حیکمەتی چل و یەك

((الْعَجَبُ كُلُّ الْعَجَبِ مِمَّنْ يَهْرَبُ مِمَّنْ لاَ انْفِكَاكَ لَهُ عَنْهُ وَيَطْلُبُ مَا لاَ بَقَاءَ لَهُ مَعَهُ ﴿فَإِنَّهَا لَا تَعْمَى ٱلْأَبْصَٰرُ وَلَٰكِن تَعْمَى ٱلْقُلُوبُ ٱلَّتِي فِي ٱلصُّدُورِ ﴿٤٦﴾﴾ الحج: ٤٦))

## راڤەی وشەكان:

**العجب:** سەرسوڕمان

**يهرب:** هەڵدێت

**لا إنفكاك له:** ناتوانێت لێی جیاببێتەوە، ناتوانێت لێی بێنیاز بێت

**ما لا بقاء معه:** مانەوەی لەگەڵ نییە

**تعمى:** كوێردەبێت

**الأبصار:** كۆی "بصر"ە واتە چاوی بینین

**الصدور:** كۆی "صدر" واتە سینە

**واتا ((هەرچی سەرسوڕمانە لە كەسێكە كە هەڵدێت لەوەی ناتوانێت لێی بێنیاز بێت و داوای شتێك دەكات كە مانەوەی بۆ نییە "چاو كوێر نابێت، ئەوە دڵەكانە كوێردەبنەوە كە لە سینەدا قەراری گرتووە"))**

## شرۆڤە:

❁ مرۆڤ ناتوانێت لە خودا بێنیاز بێت، هەموو چركەساتێكی ژیانی ئاتاجی خودای موتەعالە، ئاتاجە بەو تاكو بوونی رابگرێت، بوونی مرۆڤ و بوونەكانی تر لەسەر لاقی خۆیان رانەوەستاون، بەڵكو بوونیان وابەستەی بوونی خودایە، ئەو بە ناوی جوانی "القيم" راگیری كردوون، مرۆڤ ئاتاجە بە خودا تاكو هۆكارەكانی ژیانی بۆ فەراهەم بكات: ئاو، خۆراك، هەوا، وەستان لەسەر پشتی زەوی، خۆر، مانگ كە تیاچوونی هەر

یەکێك لەمانە تیاچوونی ژیانی مرۆڤە، مرۆڤ ئاتاجە بە خودا تاکو پەیامی ئاسمانی بۆ بنێرێ و لەسەر ئەو پەیامە هیدایەت وەربگرێت، کەوابوو راکردن لە خودایەك کە ئەوەندە مرۆڤ پێی ئاتاج بێت و رووکردنە شتگەلێك کە فانی و کاتین جێگەی پرسیار و سەرسوڕمانە.

❁ جگە لە خودا هەموو شتەکانی تر کە مرۆڤ وابەستەیان دەبێت فانین و تیادەچن، تەنها خودا مانەوەی بۆ هەیە، هەرکەسێك رووی خۆی کردە رووی خودا ئەوا لە مانەوەی خۆی بەشی دەدات﴿ كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ ﴿٢٦﴾ وَيَبْقَىٰ وَجْهُ رَبِّكَ ذُو الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ ﴿٢٧﴾ ﴾ الرحمن: ٢٦-٢٧.

❁ ❁ ❁

# حیكمەتی چل و دوو

**((لاَ تَرْحَلْ مِنْ كَوْنٍ إِلَى كَوْنٍ فَتَكُونَ كَحِمَارِ الرَّحَى يَسِيرُ وَالْمَكَانُ الَّذِي ارْتَحَلَ إِلَيْهِ هُوَ الَّذِي ارْتَحَلَ مِنْهُ وَلَكِنِ ارْحَلْ مِنَ الأَكْوَانِ إِلَى الْمُكَوِّنِ ﴿ وَأَنَّ إِلَىٰ رَبِّكَ ٱلْمُنتَهَىٰ ﴾** النجم: ٤٢**، وَانْظُرْ إِلَى قَوْلِهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:** ((**فَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ إِلَى اللهِ وَرَسُولِهِ فَهِجْرَتُهُ إِلَى اللهِ وَرَسُولِهِ وَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ إِلَى دُنْيَا يُصِيبُهَا أَوِ امْرَأَةٍ يَتَزَوَّجُهَا فَهِجْرَتُهُ إِلَى مَا هَاجَرَ إِلَيْهِ))، فَافْهَمْ قَوْلَهُ عَلَيْهِ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَمُ، وَتَأَمَّلْ هَذَا الأَمْرَ إِنْ كُنْتَ ذَا فَهْمٍ والسلام))**

**ڕاڤەی وشەكان:**

**لا ترحل:** گەشت مەكە

**من كون إلى كون:** لە گەردوونێكەوە بۆ گەردوونێكی تر، لە جیهانێكەوە بۆ جیهانێكی تر

**حمار الرحى:** گودرێژی دەستهاڕ(دەساڕ)

**يسير:** ڕێگە دەبڕێت

**من الأكوان:** لە گەردوونوكاوە:

**المكون:** ئەفرێنەری گەردوون

**المنتهى:** كۆتایی

**يصيبها:** بەدەستی دەهێنێ

**واتا ((گەشت دەست پێ مەکە لە جیهانێکـەوە بـۆ جیهـانێکی تـر، چـونکە وەك گودرێژی دەستهاڕت لێ دێت، ڕێگەدەبڕێت، بەڵام ئەو شوێنەی گەشتی بۆ دەکات ئـەو شـوێنەیە گەشـی لێـوە کردووە(لێـوەی دەسـتی پێکـردووە)، بـەڵکو لـە جیهانەکانەوە بەرەو ئەفرێنەری جیهانەکان گەشتەکەت دەست پێ بکە (کۆتایی هەر بۆ لای خودایە)، سەرنجی ئەم فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ)بدە: هەر کەس کۆچەکەی بۆ لای خودا و پێغەمبەر بێت(ﷺ)، ئەوا کۆچەکەی بۆ لای خودا و پێغەمبەرە، هەر کەس کۆچەکەی بۆ دونیا بێت دەستی دەکەوێت، بۆ ئافرەتێك بێت مارەی دەکات، کۆچەکەی بۆ لای ئەو شتەیە کۆچی بۆ کردووە، لە فەرموودەکەی (علیه الصلاة والسلام) تێبگە، لەم بارە رابمێنە گەر دارای تێگەیشتنی، والسلام))**

## شرۆڤە:

❁ ئیبن عەتا داوای گەشتێکی شاوڵی(ستوونی) نەك ئاسۆیی لە ئێمە دەکات، گەشتی ستوونی رۆیشتنە لە گەردوونەوە بۆ لای ئەفرێنەری گەردوون، گەشتی ئاسۆیی گەشتکردنە لە گەردوونێکەوە بۆ گەردوونێکی تر، نموونەیەك بۆ گەشتی ئاسۆیی دەهێنێتەوە: ئەویش نموونەی ئەو گوێدرێژەیە(گودرێژی دەستهاڕ)کە هەڵگۆزینی ئاو لە رووبارەکان بە رێگەی ناعوورە(ئامێرێکی کۆن بووە ئاویان لە روبارەوە پێ هەڵگۆزیوە) چاوی دەبەستن و لە بازنەیەکی داخراودا لە بەیانییەوە بۆ ئێوارە رێگە دەبڕێت، بەڵام ئەو شوێنەی گەشتی بۆ دەکات هەمان ئەو شوێنەیە گەشتەکەی لێوە دەست پێکردووە، چونکە لە بازنەیەکی داخراودا دەخولێتەوە نەك لە حەقیقەتدا رێگە ببڕێت.

❁ ئەو کەسانەی لە گەردوونەوە دەچن بۆ ئەفرێنەری گەردوون کەسە سەرەتاکانن، ئەگینا -وەك لە حیکمەتەکانی پێشتردا ئاماژەی پێدا- کەسی باڵا لە ئیماندا لە خوداوە دەگەڕێتەوە بۆ گەردوون و خودا دەکاتە بەڵگەی بوونی دروستکراوەکان.

❁ ئەوەی جێگەی سەرنجە ئیبن عەتا وشەی "کون" بە کۆ بەکاری هێناوە "الأکوان" لێرەدا بەکارهێنانی وشەی "الأکوان" یەکێك لەم دوو مەبەستەی لە پشتەوەیە:

**یەکەمیان،** مەبەستی یە "کون" گەردوون نەبێت، بەڵکو دیاردە و ئاسۆ جۆراوجۆرەکانی گەردوون و ژیان بێت، گەردوونی رووەك و گەردوونی ئاژەڵان و گەردوونی باڵندەکان و گەردوونی ئەستێرەکان و هتد..

**دووەمیان** ئەوەیە وشەی"کون"ی بە مانای خودی گەردوون بەکارهێنابێت، لێرەوە بەکارهێنانی وشەی گەردوون بە کۆ **"الأکوان"**جێگەی تێڕامانە، لە گەشتی باوەڕدا مرۆڤ بەرزدەبێتەوە و ئاسۆی بینینی فراوان دەبێت، لە خۆیەوە بۆ هەموو زەوی، لە زەوییەوە بۆ ئاسمان، لە بڕینی ئاسمانەکانەوە بۆ عەوالیمە رۆحانییەکان، یەکێك لە عاریفان باس لەو گەشتە دەکات و دەڵێت: گەشتی بەرەو خوداچوون و میعراجی رۆح بیست بازنەیە، بڕینی هەموو ئاسمانەکان تەنها نیو بازنەیە لەو بیست بازنەیە، هەریەك لەو بازنانە چەندین گەردوونی پێدایە، بۆیە ئیبن عەتا بە کۆ ناویان دەهێنێت و دەفەرموێت: لە **"الأکوان"** وەرە دەرەوە و ئیش و کارت با تێڕامان و سەرنجدان نەبێت لە گەردوونەکان، بەڵکو تەنها پیایاندا گوزەر بکە و خۆت بەخودا بگەیەنە، "ئەکوان" وێستگەی وەستان نین، بەڵکو وێستگەی گوزەر کردنن، وەستانی تۆ لە وێستگەی شەمەندەفەردا بۆ ئەوە نییە لەو جێگەدا بچەقی و تەنها بیر لە سەیر و سەمەرەکانی شەمەندەفەر بکەیەوە، بەڵکو بۆ ئەوەیە بە شەمەندەفەر گەشت بەرە ئامانجەکەت بکەیت، شەمەندەفەر بکەیت بە وەسیلە بۆ گەیشتن بە جێگەی مەبەست.

۞ هەر سالیکێك نێت و مەرامی گەشتەکەی گەیشتن بێت بەخودا ئەوا بۆ لای خودا کۆچ دەکات و دەکەوێتە ناو گەشتێکی رۆحییەوە، گەر نێتی گەشتەکەی بینینی نهێنی و سەیر و سەمەرەکانی گەردوون بێت ئەوە دەستی دەکەوێت، بەلاّم بەخودا نەگەیشتووە، بینینی ئەسرار و ئایاتی جۆراوجۆر ناکرێنە بەڵگەی گەیشتن بە خودا، دەگونجێ ئەو کەسە گەشتەکەی بۆ ئەوانە بووبێت، نەك گەیشتن بە خودا، بۆیە لە هەوڵەکەی بێبەش نابێت و بەدەستی دەهێنێت(**فهجرته إلى ما هاجر إليه**)، گەر لەو گەشتەیدا مەبەستی بێت هێزێکی رۆحی دەستەبەر بکات و لەوێشەوە سامان و دەسەلاّتی دونیا بەدەست بهێنێت، یان چێژە جەستەییەکان بۆ خۆی فەراهەم بکات، ئەوا دەستی دەکەوێت، بەلاّم با بزانێت کۆچەکەی بۆ لای خودا و پێغەمبەر(ﷺ)

نەبووە، بۆیە گەر کەسانێکتان بینی ئایات و خەواریقی گەورە گەورەیان لێدەوەشایەوە تا ئەم لایەنانەیان نەپشکنن و پابەندبوونیان بە بنەما نەگۆڕەکانی ئیسلامەوە سەرنج نەدەن شوێنیان مەکەون و لە ریزی صاڵحان سەرژمێری مەکەن.

# حیکمەتی چل و سیٚ

((لاَ تَصْحَبْ مَنْ لاَ يُنْهِضُكَ حَالُهُ وَلاَ يَدُلُّكَ عَلَى اللهِ مَقَالُهُ))

## راڤەی وشەکان:

**لا تصحب:** هاوەڵی مەکە

**لا ينهضك حاله:** حاڵی بەئاگات ناهێنێت و بەرزت ناکاتەوە

**لا يدلك:** رێنموونیت ناکات، نیشانت نادات

**مقاله:** قسەکانی

**واتا ((هاوەڵیی کەسێك مەکە کە حاڵی بەئاگات نەهێنیٚ و تەکانت پـیٚ نـەدات و بەرزت نەکاتەوە، وتەکانی رێنیشاندەر و رێنموونیکەرت نەبن بۆ لای خودا))**

## شرۆڤە:

۞ هاوەڵیکردن بەشێکە لە ئادابی بەرەو خوداچوون، ژیان لەگەڵ صالحان و خواناساندا فەرمانی پێدراوە و قورئان دەفەرمویٚت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَكُونُوا۟ مَعَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿١١٩﴾﴾ التوبة: ١١٩، مرۆڤ تێکەڵ بە هەر کەسێك بوو صیفات و خووخدەی ئەو کەسەی بۆ دەگوێزرێتەوە، تێکەڵ بوون بەکەسی "صادق" صدق بەمرۆڤ دەبەخشێت، کە مرۆڤ صدقی بەدەست هێنا هەرچی صیفاتی باشی باوەڕدارە تیایدا دەڕوێت و دەرگای خێر بەڕوویدا دەکرێتەوە، چونکە "صدق" وەك لە فەرموودەی پێغەمبەردا(ﷺ) هاتووە "**يهدي إلى البر**" سەردەکێشێت بۆ چاکە، بەپێچەوانەوە تێکەڵ بوون بە مرۆڤی درۆزن"**كاذب**" مرۆڤ فێری درۆ دەکات و ئەمەش دەرگای هەرچی سیفاتی خراپ و ناباشە بەڕووی مرۆڤدا والاٚ دەکات، وەك لە هەمان فەرموودەدا هاتووە کە درۆ سەردەکێشێت بۆ خراپەکاری"**يهدي إلى الفجور**"، خۆ گەر نزیکبوونەوەکە تێکەڵ بوون بێت بەدەستەی "صادقين" ئەوا گەورەترین کاریگەری لەسەر ناخ و ژیانی مرۆڤ بەجێدەهێڵێت،و تۆش دەبیت بەپارچەیەك لە جەستەی کۆمەڵی راستڕەوان و راستگۆیان.

❁ قسەی صاڵحان و خواناسان لێوانلێوە بە نوور و رێگە بۆ وێڵبووان رۆشن دەکەنەوە، بۆیە نابێت رێبوارانی رێگەی خودا قسە و ئامۆژگارییەکانی کەسە رەبانییەکان فەرامۆش بکەن، ئەوان بە رێگەکەدا گوزەریان کردووە و دەزانن چی دەڵێن و چ رێگەیەك دەخەنە بەردەم سالیکان.

❁ دانیشتن لەگەڵ کەسی بێئاگا لە خودا بێئاگایی بە مرۆڤ دەبەخشێت و دوای دانیشتنەکەش بە گران دەتوانیت بگەڕێیەوە بۆ ناو یادی خودا، بۆیە دەبێت لە پەیوەندییەکانت بەئاگا بیت.

"**ذو النون**"ی میصری دەڵێت: "هاوەڵی خودا بکە بە رازیبوون بەوەی بۆتی دیاری دەکات، لەگەڵ خەڵکدا بە ئامۆژگاری کردن، لەگەڵ نەفسدا بە گوێڕایەڵی نەکردنی، لەگەڵ شەیتاندا بە دوژمنایەتی کردنی".

**❁ مەرجەکانی ئەو کەسەی هاوەڵی دەکەیت:**

**أ-** خاوەنی حاڵ بێت، بە بینین و دانیشتن لەگەڵی مرۆڤ خودای بیربکەوێتەوە، حاڵی کەسی عاریف وەك کایەی موگناتیس وایە و هەرکەس کەوتە مەوداکەی بۆ لای خۆی رادەکێشێت.

**ب-** قسە و گوفتاری نوورانی بن و بە قسەکانی دڵ زیندوو ببێتەوە، حەکیمان کە قسە دەکەن دڵ لە حیکمەتیاندا دەتوێتەوە و لە ناخەوە گۆڕان سەرهەڵدەدات.

**ت-** مرۆڤێکی دونیانەویست بێت و بە دین دونیا پەیدا نەکات.

**پ-** کار و کردەوە و قسەکانی لەگەڵ شەریعەتی خودادا تەبابن، بەڵام ئاگاداربە، روواڵەتکاری تۆ لەناو توێکڵی شەریعەتدا حوکمی خێرات پێ دەرنەکات، وانەی گەورە لە چیرۆکی حەزرەتی موسا و پیاوچاکەکە وەربگرە کە لە کۆتایی سورەتی "الکهف"دا چیرۆکەکەی بەیان کراوە.

**ج-** دەمارگیر نەبێت بۆ مەزهەب و مەشرەب و رێگەیەکی تایبەت، خۆی و دەستەکەی بە تاقانە دەستەی خودا بزانێت و ئەوانەی لەگەڵ ئەو نین بە گومڕا، یان دەرچوو لە ئیسلام، یان نەزان تەماشایان بکات.

ح- خەڵكی بۆ لای خودا ڕێنموونی بكات، نەك بۆ خۆی و زۆربوونی دەستە و كۆمەڵەكەی.

خ- پەیوەست بێت بە پێغەمبەری خوداوەو سوننەتەكانی(ﷺ) لە ڕەفتار و گوفتاریدا ڕەنگیان دابێتەوە.

**هەندێك لەو ئادابانەی كە پێویستە ڕێبوارانی ڕێگەی خودا بیزانن:**

١. پارێزگاری لەو بەڵێن و پەیمانانەی بە خودای دەدات، كارێك لەسەر خۆی پێویست نەكات نەتوانێت ئەنجامی بدات، چونكە شكاندنی بەڵێن لەگەڵ خودا ئافاتی گەورەی سەر ڕێگەی بەرەو خودا چوونە﴿ ثُمَّ قَفَّيْنَا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم بِرُسُلِنَا وَقَفَّيْنَا بِعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ وَءَاتَيْنَٰهُ ٱلْإِنجِيلَ وَجَعَلْنَا فِى قُلُوبِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ رَأْفَةً وَرَحْمَةً وَرَهْبَانِيَّةً ٱبْتَدَعُوهَا مَا كَتَبْنَٰهَا عَلَيْهِمْ إِلَّا ٱبْتِغَآءَ رِضْوَٰنِ ٱللَّهِ فَمَا رَعَوْهَا حَقَّ رِعَايَتِهَا ۖ فَـَٔاتَيْنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنْهُمْ أَجْرَهُمْ ۖ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَٰسِقُونَ ﴿٢٧﴾ ﴾ الحديد: ٢٧، ئەم ئایەتە پیرۆزە دەفەرموێت:: ئێمە ڕەهبانییەتمان لەسەر نەصارا پێویست نەكردبوو، ئەوان خۆیان بۆ ڕازیكردنی خودا دایان هێنابوو، لەگەڵ ئەوەشدا نەیانتوانی بەدروستی و بەڕەوایی ریعایەتی بكەن و كاری پێبكەن، كەوابوو شتێك لەسەر خۆت پێویست مەكە نەتوانی پارێزگاری لێ بكەیت، چونكە بەر لۆمەی ئەم ئایەتە پیرۆزە دەكەویت.

٢. پارێزگاری كردن لە ئادابی شەریعەت لە عیبادات و حەلاڵ و حەرامدا، ڕۆنەچوون لە مەباحاتدا، صدق لە نیێت و قسە و كرداردا..

٣. خۆ بەدوورگرتن لە حەسوودی بەو دۆست و برایانەی لەگەڵ تۆ ڕێگەی بەرەو خوداچوونیان گرتۆتەبەر، بەڵكو بە سەركەوتنەكانیان لە مەیدانی جەنگی نەفس و شەیتاندا دڵخۆش بە، بە كردنەوەی دەرگای ڕەحمەتی خودایی بەروویاندا مەسروور بە و دوعای خێری زیاتریان لەخودا بۆ بكە، ئەم دەروونە خاوێنە خێری گەورە بۆ خاوەنەكەی رادەكێشێت و لە تەواوی ئەو خێرانەی بەسەر دەوروبەریدا دابەزیوە بێبەش نابێت.

٤. هاوەڵی و تێكەڵی زۆری منداڵ و تازەپێگەیشتوو یەكێكە لەو ئافەتانەی ڕێبواری ڕێگەی خودا ڕووبەڕووی ئافاتی گەورە دەكاتەوە، پێویستە ئەو منداڵ و تازە

پێگەیشتووانە پاکترین و دامەزراوترین کەس پەروەردەیان بکات تاکو رووبەڕووی پەروەردەی ناتەواو نەبنەوە.

٥. مانەوەی حەزی دونیایی لە ناخی رێبواری رێگەی خودادا ئافەتی گەورەی بۆ دەخولقێنێت، ئەو حەزانە لە ناخدا وەك دەنکە تۆو وان، لە هەر وەرز بۆ رەخسانێکدا چەکەرە دەکەن و سەردەردەهێنن.

# حیكمەتی چل و چوار

((رُبَّمَا كُنْتَ مُسِيئًا فَأَرَاكَ الإِحْسَانَ مِنْكَ صُحْبَتُكَ مَنْ هُوَ أَسْوَأُ حَالاً مِنْكَ))

**راڤەی وشەكان:**

**مسيئا:** خراپەكار

**فأراك:** نیشانت بدات

**الإحسان منك:** چاكە لە تۆوە

**أسوأ:** خراپتر

**واتا ((لەوانەیە كەسێكی خراپ و گوناهكار بیت، بەڵام هاوەڵیت لەگەڵ كەسانێكدا كە لە تۆ خراپترن چاكەكانی خۆت پێنیشان بدات))**

**شرۆڤە:**

❁ ئەم حیكمەتە تەواوكاری حیكمەتی چل و سێیە، لەم حیكمەتەدا ئیبن عەتا باس لە خراپەكانی هاوەڵێكردنی كەسی بێئاگا دەكات، ئەو دەڵێت: هاوەڵی كردنی كەسانێك كە حاڵیان لە حاڵی تۆ خراپترە وەهمێك لەلای تۆ دەخولقێنێت گوایە كە تۆ كەسێكی باشی، چونكە خراپتر لە تۆ بوونی هەیە، لە بەراورددا بەرز و نزم، باش و خراپ دەردەكەون.

❁ تەنها كەسە ڕەبانییەكان دەتوانن هاوەڵی كەسانی بێئاگا بكەن، لە جێگەی ئەوەی لێیانەوە زەرەرمەند بن بە دڵی زیندووی خۆیان كەسانی بێئاگا دەهەژێنن و خودایان بەبیر دەهێننەوە، بۆیە حیكمەتەكەی ئیبن عەتا بۆ كەسانی سەرەتایە، ئەوانەی تازە كەوتوونەتە سەر ڕێگەی بەرەو خوداچوون، ئەگینا ئەركی سەر شانی ڕەبانییەكانە بچنە ناو مەردوومان و لە خەوی غەفڵەت بەئاگایان بهێنن و بۆ لای خودا بانگیان بكەن.

# حیکمەتی چل و پێنج

((مَا قَلَّ عَمَلٌ بَرَزَ مِنْ قَلْبٍ زَاهِدٍ، وَلاَ كَثُرَ عَمَلٌ بَرَزَ مِنْ قَلْبٍ رَاغِبٍ))

**ڕاڤەی وشەکان:**

**ما قل:** کەم نییە

**برز:** دەرکەوێت، سەرهەڵبدات

**قلب زاهد:** دڵێکی دونیانەویست

**لا کثر:** زۆر نییە

**قلب راغب:** دڵێکی دونیاویست

**واتا ((کردارێك بەکەم تەماشا ناکرێت لە دڵێکی دونیانەویستەوە هەڵقوڵابێت، بەزۆریش سەرنج نادرێت گەر لە دڵێکی دونیاویست و هەڵپەکەرەوە سەرچاوەی گرتبێت))**

**شرۆڤە:**

❁ موخلیص لە نێت و کردار و زاهید لە دونیا و لە خەڵکی ڕەوشتی ڕەبانییەکان و سالیکانی ڕێگەی خودایە، ئەمانە بە کرداری زۆر و بۆر نەگەیشتوونەتە ئەو ئاستە باڵا لە ئیمان، بەڵکو بە یەکلابوونەوەیان بۆ خودا و وەلانانی حەزە دونیاییەکان و بێنیازبوون لە خەڵکی.

❁ ڕەبانییەکان بە پاڵفتەکردنی کردارەکانیان لە خەوش و خاڵی حەزی نەفس لە خودا نزیك بوونەتەوە، بۆیە بە کەمێك کرداری چاك و پاك تەکانی گەورە بەخۆیان دەدەن، ئەوان هەموو ساتەکانیان ئاگاهییە و ژیانە لەگەڵ خودادا، وابەستەبوونی دڵیان بەخوداوە وایکردووە خەرمانی کرداری چاکەیان بەرەکەتدار بێت و لە یەك بە "دە"وە تا یەك بە

حەوسەد پاداشتیان بدرێتەوە﴿مَّثَلُ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمۡوَٰلَهُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنۢبَتَتۡ سَبۡعَ سَنَابِلَ فِي كُلِّ سُنۢبُلَةٖ مِّاْئَةُ حَبَّةٖۗ وَٱللَّهُ يُضَٰعِفُ لِمَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ٢٦١﴾ البقرة: ٢٦١

۞ دڵی زاهید دڵێکە لە هەڵپە کەوتووە، لەگەڵ خودای خۆی ئارام بۆتەوە، دڵی راغیبیش دڵێکە پڕبووە لە حەز، حەزی ماڵ و دارایی، حەزی ناو و ناوبانگ، حەزی پلە و پایە، حەزی ئافرەت، هتد...ئەو دڵەی لێوانلێو بووە بە حەز گەر کردارێکی چاکەشی لێ بوەشێتەوە حەزە جۆراوجۆرەکان نیێتەکەی خەوشدار دەکەن و کردارەکەی کەم نرخ یان بەتاڵ دەکەنەوە.

۞ ۞ ۞

# حیكمەتی چل و شەش

((حُسْنُ الأَعْمَالِ نَتَائِجُ حُسْنِ الأَحْوَالِ، وَحُسْنُ الأَحْوَالِ مِنَ التَّحَقُّقِ فِي مَقَامَاتِ الإِنْزَالِ))

**راڤەی وشەكان:**

**حسن الأعمال:** چاكی كردار

**نتائج:** بەرهەم

**حسن الأحوال:** چاكی حاڵ

**التحقق:** دەستەبەركردن

**مقامات الإنزال:** مەقاماتێك پێت لێ نابێت

**واتا ((چاكی كار و كردەوەكان لە چاكی حاڵەكانەوەن، چاكی حاڵەكانیش لە دەستەبەركردنی مەقاماتی پێ لێنراوەوەن))**

**شرۆڤە:**

۞ "حاڵ" لای عاریفان بریتییە لە بەخششێكی خودایی كە بۆ سەر دڵی سالیكانی رێگەی خودا دادەبەزێت، لە ترس و ڕجا و كرژبوون و كرانەوە و شەوق و خۆشەویستی و حەیا لە خودا، ئەم حاڵانە ماوەیەك لە ناخی سالیكدا دەمێننەوە و دواتر بزر دەبن، جونەیدی بەغدادی دەفەرموێت: "حاڵ میوانێكی دڵە و بەردەوام نامێنێتەوە"، "مەقام"یش مانەوە و بەردەوامبوونی حاڵە لە دڵی سالیكدا، مەقام ئەو پلەی باوەڕە كە بووەتە مەنزڵگەی رێبواری رێگەی خودا و بەهۆیەوە عیبادات و موجاهەدات دەكات و خۆی بۆ خودا یەكلا دەكاتەوە، رێبواری رێگەی خودا وەك رەوەند وایە مەنزڵ بە مەنزڵ بەرەو كوێستان هەنگاو هەڵدەگرێت، تا دەگاتە دامێنی چیای بەفرین،

سالیك لە مەنزڵێكدا گیرناخوات و بەردەوامە لە نزیكبوونەوە لە مەنزڵی كۆتایی خۆی ﴿وَمَا مِنَّآ إِلَّا لَهُۥ مَقَامٌ مَّعۡلُومٌ ١٦٤﴾ الصافات: ١٦٤.

۞ ئەو مەنزڵانەی باوەڕ كە سالیك پێی تێدەنێت و تیایدا قووڵ دەبێتەوە حاڵی قەلبی و دەروونی كەسەكە ساز دەكەن، ئەم سازییە لە حاڵدا ناوەوە و دەرەوەی كەسەكە دەگۆڕێت، نێت و مەرام و قسە و گوفتار و كار و رەفتاری بەو سازییەی دڵ و دەروون رەنگ دەگرن.

۞ **گواستنەوە لە مەنزڵێكەوە بۆ مەنزڵێكی تر دوو رووی هەیە:**

**روویەك** كە بەڕووی بەندەی خودادا دەڕوانێت: شان لەسەر كاروكردەوە و لێبڕانی كەسەكە دادەدات، **روویەكی تر** كە ئەوە خودایە دەیەوێت كەسەكە لە مەنزڵێكەوە بۆ مەنزڵێكی تری باوەڕ بگوێزێتەوە، بۆیە توانای كۆمەڵێك كاروكردەوەی باشی پێدەبەخشێت تا بەهۆیەوە تەكان بەخۆی بدات و پێ لە مەنزڵێكی نوێ بنێت.

۞ ۞ ۞

# حیکمەتی چل و حەوت

((لَا تَتْرُكِ الذِّكْرَ لِعَدَمِ حُضُورِكَ مَعَ اللهِ فِيهِ لِأَنَّ غَفْلَتَكَ عَنْ وُجُودِ ذِكْرِهِ أَشَدُّ مِنْ غَفْلَتِكَ فِي وُجُودِ ذِكْرِهِ، فَعَسَى أَنْ يَرْفَعَكَ مِنْ ذِكْرٍ مَعَ وُجُودِ غَفْلَةٍ إِلَى ذِكْرٍ مَعَ وُجُودِ يَقَظَةٍ، وَمِنْ ذِكْرٍ مَعَ وُجُودِ يَقَظَةٍ إِلَى ذِكْرٍ مَعَ وُجُودِ حُضُورٍ وَمِنْ ذِكْرٍ مَعَ وُجُودِ حُضُورٍ إِلَى ذِكْرٍ مَعَ وُجُودِ غَيْبَةٍ عَمَّا سِوَى الْمَذْكُورِ ﴿ وَمَا ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ بِعَزِيزٍ ﴿٢٠﴾ ﴾ إبراهيم: ٢٠؟))

**واتا ((یادی خودا واز لێ مەهێنە بەهۆی ئامادەنەبوونی دڵت لەگەڵ خودا لەناو زیکردا، چونکە بێئاگایت لە بوونی یادی خودا گەورەترە لە بێئاگایت لەناو بوونی زیکردا، بەڵکو خودا بەرزت بکاتەوە لە یادی خوداوە لەگەڵ بوونی بێئاگاییدا بۆ یادی خودا لەگەڵ بوونی بەئاگاییدا، لە یادی خوداوە لەگەڵ بوونی بەئاگاییدا بۆ یادی خودا لەگەڵ ئامادەبوونی دڵدا، لە یادی خوداوە لەگەڵ ئامادەبوونی دڵدا بۆ یادی خودا لەگەڵ بێئاگابوون لە غەیری خودا "ئەوە بۆ خودا کارێکی گران و دەگمەن و ئەستەم نییە"))**

## راڤەی وشەکان:

**لا تترك الذكر**: زیکر واز لێ مەهێنە

**لعدم حضورك**: ئامادە نەبوونی دڵت

**غفلتك عن وجود ذكره**: غەفڵەتت لە بوونی زیکری خودا

**غفلتك في وجود ذكره**: غەفڵەتت لەناو بوونی زیکریدا

**يرفعك**: بەرزت بکاتەوە

**ذكر مع وجود غفلة:** یادی خودا لەگەڵ بوونی بێئاگایی
**ذكر مع وجود حضور:** یاد لەگەڵ ئامادەبوونی دڵ
**ذكر مع وجود غیبة:** یاد لەگەڵ بوونی بزربوونی هەموو شتێك جگە لە خودا.

---

## شرۆڤە:

۞ لە سەرەتای یادی خوداوە خەریك بوونی هەستەكان و بیری سالیك پەرت و ئاڵۆزە و ناهێڵن دڵ لەناو یادی خودادا ئامادە ببێت، واتە یادی خودا تەنها بە زمان دەبێت و دڵ لەگەڵی بەشداری ناكات، ئەمەش كەسی یادكەر بێزار دەكات، چونكە چێژ لە یادەكەی وەرناگرێت و هەست بە هیچ گۆڕانێك ناكات بەهۆی یادەكەیەوە، بۆیە دەیەوێت ئەو جۆرە یادكردنە كە تەنها زمان تیایدا بەشدارە واز لێ بهێنێت، ئیبن عەتا هۆشداریمان پێدەدات و پێمان دەفەرموێ: وازهێنان لە یادێك -با تەنها بە زمانیش بێت- گەورەترین غەفڵەتە، واتە ئیبن عەتا یادی خودا لەگەڵ بوونی غەفڵەت بە باشتر دەزانێ لە بێئاگابوون لە زیكر و یادی خودا، ئەو داوا دەكات ئێمە بەردەوام بین لەسەر یادی خودا بە زمان، چونكە بە ڕەحمی خودا لەو قۆناغەی یادەوە بەرەو قۆناغە بالاكانی یاد بەرز دەبینەوە.

۞ **قۆناغەكانی یادی خودا لای ئیبن عەتا بەم جۆرەیە:**

١. یادكردنی خودا تەنها بە زمان بەبێ ئامادەبوونی دڵ.
٢. یادكردنی خودا لەگەڵ بەئاگاهاتنی دڵ یان بێداربوونەوەی دڵ.
٣. یادی خودا لەگەڵ ئامادەبوونی دڵ.
٤. یادی خودا لەگەڵ بزربوونی هەرچی شتە جگە لە خودا.

۞ **پایەكانی یاد لای ئیمامی غەزالی سیانن:**

١.یادكەر
٢.یاد

۳.یادکراو، مرۆی باوەڕدار یادکەرە، ئەو زیکر و یاد و ئەورادانەی لە قورئان و فەرمووده‌دا هاتووه بریتیین له کەلیماتی یاد، یادکراویش بریتییه له خودای موتەعال.

۞ لەسەرەتاوە یادکەر تەنها خۆی دەبینێ (واتە دەنگی خۆی دەبیستێ بەبێ هۆش و ژنەوتن)، دواتر یادکەر دڵی بەئاگا دێت و لە یادەکەی نزیك دەبێتەوە و لە ماناکان تێدەگات، لە قۆناغێکی تردا لە ماناکاندا قووڵ دەبێتەوە و دڵی لە خزمەتی خودادا ئامادەبوون پەیدا دەکات، لەم قۆناغەدا یادکەر و یاد زۆر لە یادکراو نزیکبوونەتەوە، لەگەڵ ئامادەبوونی زۆرتر و زیاتردا یادکراو(خودا) بەسەر هۆش و هەست و نەستی یادکەردا زاڵ دەبێت و خۆی و غەیری خۆی لەبیردەباتەوە و تەنها یادکراو ئامادەبوونی دەبێت، ئەمە ئەو قۆناغەیە عاریفان بە فەنا ناوی دەبەن.

۞ ۞ ۞

# حیكمەتی چل و هەشت

((مِنْ عَلاَمَاتِ مَوْتِ الْقَلْبِ: عَدَمُ الْحُزْنِ عَلَى مَا فَاتَكَ مِنَ الْمُوَافَقَاتِ، وَتَرْكُ النَّدَمِ عَلَى مَا فَعَلْتَهُ مِنْ وُجُودِ الزَّلاَتِ))

## راڤەی وشەكان:

**علامات:** نیشانە

**موت القلب:** مردنی دڵ

**عدم الحزن:** دڵتەنگ نەبوون، خەم نەخواردن، نیگەران نەبوون

**علی ما فاتك:** لەسەر ئەوەی لەدەستت چووە

**الموافقات:** رەزامەندییەكان(ئەو كارانەی خودا فەرمانی پێداون)

**ترك الندم:** وازهێنان لە پەشیمانی

**وجود الزلات:** بوونی هەڵە و لادان و خلیسكان

**واتا ((لە نیشانەكانی مردنی دڵ ئەوەیە كە نیگەران و دڵتەنگ نەبێت بۆ لەدەستچوونی ئەو كارانەی رەزامەندی خودای تێدایە، هەروەها پەشیمان نەبێتەوە لە ئەنجامدانی هەڵە و لادان))**

## شرۆڤە:

❁ دڵی زیندوو ترس و خەشیەی خودای موتەعالی تێدایە، ئەم ترسە لە پشتهەڵكردن لە مەعبود لەدوو حاڵەتدا دەكەوێتە دادگایی كردنی خۆ، یەكەمیان كە نەفس دەداتە باری تەمبەڵی و نایەوێت بەكاری چاكە هەڵبسێت، بۆیە زۆرێك لە چاكەی مەزن لەدەستی خۆی دەدات، دوومیان، كاتێك گوناه و خراپەیەك ئەنجام دەدات، لەم دوو حاڵەتەدا دڵی زیندوو دەكەوێتە دادگایی كردنی دەروونی خۆی، دادگایی كردنی خۆ

نیشانەی دڵی زیندووە، بەپێچەوانەوە گەر لەدەستچوونی کارە چاکەکان و تێوەگلان لە خراپە و گوناهـ دڵ دانەچڵەکێنیٚ و نەکەوێتە موحاسەبە کردنی خۆ ئەوا ئەو دڵە زیندەگی تیادا نەماوە و بەرەو مردن هەنگاو هەڵدەگرێت.

۞ موحاسەبە کردنی خۆ فەرمانێکی قورئانییە و گەرەکە کەسی ژیر و لەخوداترس رۆژانە بکەوێتە سەرنجدانی کردارەکانی، لە گوناهەکانی تەوبە بکات و لە تەمبەڵی و لەدەستچوونی کاری چاکە پەشیمان ببێتەوە و پەیمان لەگەڵ خودای خۆیدا تازە بکاتەوە بۆ دوورکەوتنەوە لە گوناهـ و ملکەچی و فەرمانبەرداری لە ئەمرەکانی خودا﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَلْتَنظُرْ نَفْسٌ مَّا قَدَّمَتْ لِغَدٍ ۖ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿١٨﴾ وَلَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ نَسُوا۟ ٱللَّهَ فَأَنسَىٰهُمْ أَنفُسَهُمْ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿١٩﴾ ﴾ الحشر: ١٨– ١٩، ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، لەخودا بترسن و هەر کەسێك با سەرنج بدات چی بۆ سبەینیٚ(دوارۆژ) ئامادە کردووە، لە خودا بترسن، خودا بەئاگایە لەوەی ئەنجامی دەدەن، وەك ئەوانە مەبن خودایان لەیاد کرد، خوداش خۆیانی لەبیر بردنەوە، ئەوانە دەرچووان و ملپێچیکەرانن لە فەرمانی خودا.

۞ باشترین کات بۆ موحاسەبەکردنی خۆ شەوان و کاتی چوونە ناو جێگەی نوستنە، لە بەیانییەوە هەتا ئەو کاتەی لەسەر جێگەی نوستن راکشاوی هەموو کار و قسە و رەفتارەکانت بێنە پێش چاوت، بۆ چاکەکان شوکری خودا بکە و بۆ هەڵە و گوناهەکانیش تەوبە و پەشیمانی دەربڕە و بڕیار بدە دووبارەیان نەکەیەوە.

۞ ۞ ۞

# حیکمەتی چل و نۆ

> (( يَعْظُمُ الذَّنْبُ عِنْدَكَ عَظَمَةً تَصُدُّكَ عَنْ حُسْنِ الظَّنِّ بِاللهِ تَعَالَى فَإِنَّ مَنْ عَرَفَ رَبَّهُ اسْتَصْغَرَ فِي جَنْبِ كَرَمِهِ ذَنْبَهُ))

**راڤەی وشەکان:**

**لا يعظم عندك:** لات گەورە نەبێت

**تصدك:** ڕێگەت لێ بگرێت

**إستصغر:** لای بچووك دەبێتەوە

**في جنب كرمه:** لەپاڵ بەخشندەیی ئەودا (ﷻ).

> **واتا ((با گوناهت ئەوەندە لا گەورە نەبێت ڕێگەت لێ بگرێت لە گومانی باش بردن بە خودای موتەعاڵ، هەر کەس پەروەردگاری بناسێت لەپاڵ بەخشندەیی ئەودا گوناهەکانی لەلا بچووك دەبێتەوە))**

**شرۆڤە:**

❁ لە حیکمەتی پێشوودا باسی ئەوەی کرد کە لە نیشانەکانی دڵی مردوو ئەوەیە پەشیمانی بۆ ئەنجامدانی گوناه دەرنەبڕیت، لەم حیکمەتەشدا هاوسەنگیمان بۆ دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت:: با پەشیمانی لە گوناهان ئەوەندە گوناهەکەت لا گەورە نەکات هیوات بە لێبوردنی خودا نەمێنێت، ئەم هیوابڕانە گومانی خراپ بردنە بە خودا، چونکە خودا خاوەنی صیفات و ئەسمائی بەرز و بڵندی **"الرحمن، الرحيم، الغفور، الغفار، التواب، الودود، الكريم، غافر الذنب، قابل التوب، أرحم الراحمين"**ە، گوناه هەرچەندە گەورە بێت بە مەرجی پەشیمانی و گەڕانەوە خودا لێی دەبوورێت و خراپەکانی بە چاکە بۆ دەگۆڕێت: ﴿ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَٰلِحًا فَأُوْلَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمْ حَسَنَٰتٍ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٧٠﴾ ﴾ الفرقان: ٧٠

❁ کردنی گوناه له بێئاگاییەوەیە، تەوبە و گەڕانەوەش ئاگاداربوونەوەیە، وەلێ بێهیوابوون له رەحم و لێبوردەیی خودا له نەناسینی خوداوەیە، بۆیە ئەو بێهیوابوونە بەئەندازەی گوناه ئاساری خراپ لەسەر باوەڕی رێبواری رێگەی خودا بەجێدەهێڵێت: ﴿قُلْ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٣﴾﴾ الزمر: ٥٣، بڵێ: خودا دەفەرموێت: ئەی ئەو بەندانەی که زیادەڕەویتان لەسەر نەفسی خۆتان کردووە بێهیوا مەبن له رەحمی خودا، خودا له هەموو گوناهان دەبورێت، خودا لێبوردە و بەبەزەییە.

❁ بەگەورە تەماشا کردنی گوناه ئەگەر شەرم کردن بێت له خودا ئەوە له ناسینی خوداوەیە و هەر ئەویش (ﷻ) دڵنەوایی بەندەکەی دەکات و ئارامیی بەسەر دڵیدا دادەبارێنێت، بەڵام گەر بەگەورەزانینی گوناه ئەو باوەڕەی لا دروست بکات که خودا لەو نابورێت ئەمەیان بێهیوابوونە و له نەناسینی خوداوە سەرچاوەی وەرگرتووە.

❁ ❁ ❁

# حیکمەتی پەنجا

**((لاَ صَغِيرَةَ إِذَا قَابَلَكَ عَدْلُهُ، وَلاَ كَبِيرَةَ إِذَا وَاجَهَكَ فَضْلُهُ))**

## راڤەی وشەکان:

**لا صغيرة:** هیچ گوناهێك بچووك نییە

**قابلك عدله:** دادپەروەری ئەو رووبەڕووت ببێتەوە

**لا كبيرة:** هیچ گوناهێك گەورە نییە

**واجهك فضله:** فەزڵی ئەو رووت تێبکات

واتا **((هیچ گوناهێك بچووك نییە گەر دادپەروەری خودا رووبەڕووت ببێتەوە، هیچ گوناهێکیش گەورە نییە گەر فەزڵی خودا رووت تێبکات))**

## شرۆڤە:

❁ خودای موتەعال بە یەکێك لەم دوو میزانە مامەڵەی گوناهانی بەندەکانی خۆی دەکات: **میزانی عەدل** و **میزانی فەزڵ، گەر مرۆی گوناهکار رووبەڕووی عەدلی خودا ببێتەوە**، ئەوا هەرچی گوناهە بچووك و گەورە هەر گەورەیە، عەدلی خودا لێی دەپرسێت: تۆ بەندەی خودا نەبووی؟ تۆ لە مەملەکەتی ئەودا نەبووی؟ تۆ رۆزی ئەوت نەدەخوارد؟ تۆ نەکەوتبوویە ژێر لێشاوی نیعمەتەکانی خودا؟ تۆ دەزانی لەچی دروستکرای و دواتر بووی بەچی؟ بۆ هەموو ئەم پرسیارانە بەندەی گوناهکار لەبەردەم عەدلی خودادا "بەڵێ" دەکات و دان بە گوناهەکانیدا دەنێت، عەدلی خوداش پێی دەڵێت: ئەی چۆن سەرپێچی خودای خۆتت کرد؟ پادشا دونیاییەکان سەرپێچیکارانیان سزا دەدا و پێیان دەوتن ئێوە لە مەملەکەتی ئێمەدا دەژین، چۆن دەبێت یاساکانی ولآت جێبەجێ نەکەن؟! ئەی چۆن خودا لە تۆ ناپێچێتەوە؟!، **بەلآم گەر بەندەی گوناهکار بەر لێبوردن و رەحمەتی خودا بکەوێت ئەوا بە فەزڵ و ئیحسان مامەڵەی لەگەڵ دەکات،**

بۆیە هەرچەند گوناهان گەورە و مەزن بن لەپاڵ لوتف و کەرەمی خودادا بچووکن و لێیان دەبورێت.

❁ ئەوانەی پەشیمانبوونەوە دەیانگەیەنێتە رادەی بێهیوابوون لە رەحمی خودا ئەوانە رووبەڕووی عەدلی خودا دەبنەوە، ئەوانەش وا لە شەرمکردن لە خوداوە گوناهەکانیان لا گەورە بوو بوو فەزڵی خودا دایان دەپۆشێت و گوناهەکانیان بە چاکە بۆ دەگۆڕێتەوە، ئیمامی شازلی لە پاڕانەوەیەکیدا دەفەرموێ: "خودایە، با خراپەکانمان خراپەی ئەوانە بن کە خۆشتدەوێن، خودایە، با چاکەکانمان چاکەی ئەو کەسانە نەبن کە رقت لێیانە"

❁ پرسیار دەکرێت و دەوترێت: بۆچی بەندەیەکی خودا بە عەدل مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت و بەندەیەکی تر فەزڵی خودا رووی تێدەکات؟

روو تێکردنی عەدل یان فەزڵی خودا بۆ بەندەکانی بەپێی میزانی عەدل و حیکمەتی خودا خۆیەتی، ناعەدلی و نەزانی و نادانایی لە هیچ کارێکی خودادا نییە، ئەو خودایە و ئەگەر هەموو ئەهلی سەر زەوی بە چاکان و خراپانەوە سزا بدات بۆ ئەو عەدلە و هیچ کەس بۆی نییە پرسیاری لێبکات﴿ لَا يُسْأَلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْأَلُونَ ﴿٢٣﴾ ﴾ الأنبیاء: ٢٣، خودا پرسیاری لیٚ ناکرێت و ناخرێتە ژێر پرسیارەوە، ئەوە مرۆڤە پرسیاری لێدەکریٚ و دادگایی بۆ دادەنرێت، هەر بەندەیەك بە نهێنییەك بەخوداوە گرێدراوە، ئەو نهێنیانە تەنها لە نێوان خودا و بەندەکانیدایە و تەنانەت جن و فریشتەکانیش پێی نازانن، ئەو نهێنیانەن خودا سەرنجیان دەدات و عەدل و فەزڵیان بۆ دیاری دەکات.

❁ ❁ ❁

# حیکمەتی پەنجا و یەك

((لاَ عَمَلَ أَرْجَى لِلْقَبُولِ مِنْ عَمَلٍ يَغِيبُ عَنْكَ شُهُودُهُ، وَيُحْتَقَرُ عِنْدَكَ وُجُودُهُ))

**راڤەی وشەکان:**

**أرجى للقبول:** هیوابەخشترین بۆ قبولّ بوون

**يغيب عنك شهوده:** بینینیت لەبەر چاو ون بێت

**يحتقر عندك وجوده:** بوونیت لەبەر چاو کەم بێت

**واتا ((هیچ کردارێك نییە بە قەدەر ئەو کردارە هیوابەخش بێت بۆ قبوڵبوون لەلای خودا لە کردارێك بینینیت لەبەر چاوان ون بێت و بوونیت لەبەر چاوان کەم**

**شرۆڤە:**

❁ لە قورئان و فەرمووددا فەرمان بە کرداری چاکە کراوە و هانی باوەڕدار دراوە بۆ ئەنجامدانی﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ لَهُمۡ أَجۡرُهُمۡ عِندَ رَبِّهِمۡ وَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ ﴿٢٧٧﴾ ﴾البقرة: ٢٧، بەڵکو بانگ لە ئەهلی بەهەشت دەکرێت و پێیان دەوترێت ئەوە ئەو بەهەشتەیە بە میراتتان گرتووە بەهۆی ئەو کردارە باشانەی ئەنجامتان دەدان: ﴿وَنُودُوٓاْ أَن تِلۡكُمُ ٱلۡجَنَّةُ أُورِثۡتُمُوهَا بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿٤٣﴾ ﴾ **الأعراف: ٤٣**

❁ لەم حیکمەتەدا ئیبن عەتا نایەوێت کرداری چاکە لەبەرچاو بخات و وامان لێبکات بە کەم بایەخ سەرنجی بدەین، بەڵکو دەیەوێت فێرمان بکات چۆن دەڕوانینە کردارەکانمان: مرۆڤی باوەڕدار کرداری چاکە ئەنجام دەدات، چونکە خودا فەرمانی پێکردووە و پێغەمبەرمان(ﷺ) بە قسە و کردار بۆی بەیان کردووین، ئەنجامدانی کردارەکان ئەرکی سەر شانی مرۆی باوەڕدارە، بەڵام گەر پێمان وابێت کردارەکانی ئێمە

نرخی بەهەشتە و پێویستە خودا بەم کردارانە بەهەشت بە ئێمە ببەخشێت ئەم تێڕوانینە هەڵەیە و لە نەناسینی خۆت و خوداوە سەرچاوەی گرتووە، ئێمە بەندەی خوداین، ئەو بوونی پێبەخشیوین، نیعمەتە ناوەکی و دەرەکییەکانی بەسەردا داباراندووین، بە مرۆڤ دروستی کردووین و هیدایەتی داوین بۆیە هەرچەندە لە کڕنووش و بەندایەتیدا بین هێشتا بەرانبەر لوتف و فەزڵی خودا هیچمان نەکردووە، بەهەشتی خودا نەبڕاوەیە و نیعمەتەکانی لە هەژماردن نایەن، بۆیە ئەگەر هەزاران ساڵ تەمەنت بێت و ئەو تەمەن لە سوژدەدا بیت هێشتا نرخی ساتێکی ناو بەهەشتت بە خودا نەبەخشیوە، ئیتر چۆن دەبێت بەندەی خودا وابیربکاتەوە کە بەو کەمە لە کرداری چاکە و بەو چەند ڕۆژەی تەمەن بەهەشتی لە خودا کڕیوە؟! چوونە بەهەشت بە لوتف و کەرەم و فەزڵی خودایە، بەلاّم ئەم خودا بەخشندە لە گەورەیی خۆیەوە فەرموویەتی گەر باوەڕ بهێنن و ئەو کەمە لە کرداری چاکە ئەنجام بدەن ئەوا بەهەشتتان پێ دەبەخشم، ئەوانەی کە دەچنە بەهەشتەوە لەم حەقیقەتە تێدەگەن، حاڵی دەبن چوونە بەهەشتی ئەوان بەهۆی بەخشندەیی خوداوە بووە، بۆیە حەمد و سوپاسی دەکەن و دەڵێن ﴿وَقَالُواْ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي صَدَقَنَا وَعۡدَهُۥ وَأَوۡرَثَنَا ٱلۡأَرۡضَ نَتَبَوَّأُ مِنَ ٱلۡجَنَّةِ حَيۡثُ نَشَآءُۖ فَنِعۡمَ أَجۡرُ ٱلۡعَٰمِلِينَ ﴿٧٤﴾﴾ الزمر: ٧٤، ئێمە بۆ چوونە بەهەشت دڵمان بە بەڵێنی خودا خۆشە کە فەرموویەتی باوەڕ بهێنن و کرداری چاکە ئەنجام بدەن بەهەشتتان پێ دەبەخشم، ئەم بەڵێنەیە ئێمەی دڵخۆش کردووە ئەگینا خودا خودایە و هیچ کەسێك ناتوانێت هیچ شتێك لەسەر خودا پێویست بکات، لە کوێ بەندە توانیویەتی شت لەسەر گەورەکەی خۆی پێویست بکات؟ سەرنج بدە ئەهلی بەهەشت حەمدی خودا دەکەن بۆ ئەوەی بەڵێنەکەی لەگەڵیان جێبەجێ کرد و کردنی بە میراتگری بەهەشت (وَقَالُواْ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي صَدَقَنَا وَعۡدَهُۥ).

۞ خواناسان دەڵێن: کردنی گوناهێك کە شەرمەزاری و زەلیلی بۆ بەندەی خودا — لەبەردەم خودادا- دروست بکات باشترە لە بەندایەتی کردنێك خۆ بە زل زانین و کردار بە گەورە زانین بۆ مرۆڤ بەرپا بکات، خودا ملکەچی و زەلیلی لە بەندەکەی دەوێت نەك لوتبەرزی و خۆ بەگەورەزانین، بۆیە وتراوە: هەر کردارێك ئەنجامی دەدەی گەر بە گەورە

سەرنجت دا ئەوە لای خودا قبولّ نەبووە، چونکە ئەگەر کردارێك لای خودا وەرگیراوبێت بۆ لای خۆی بەرزی دەکاتەوە و لەسەر زەوی نامێنێت تا خاوەنەکەی تەماشای بکات و خۆی لێ بگۆڕێت.

❁ رێبواری رێگەی خودا لە یەکەم هەنگاوەوە بڕیاری داوە لا بەلای هیچ شتێکدا نەکاتەوە، ئەو خودای کردووە بە ئامانجی خۆی و هەرچی شتی ترە لەیادی کردووە، تەنانەت لا بەلای کرداری چاکەشدا ناکاتەوە، واتە کرداری چاکە ئەنجام دەدات بەبێ ئەوەی لایان بەلادا بکاتەوە و سەرنجیان بدات و بە زۆریان بزانێت، ئیمام ئەحمەد لە مەسنەدەکەیدا لە ئەبو هورەیرەوە ریواتی کردووە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (هیچ کەس لە ئێوە بە کردارەکەی ناچێتە بەهەشت، وتیان: تۆش ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)؟ فەرمووی: منیش، مەگەر خودابمخاتە ناو رەحمەت و فەزڵی خۆیەوە، دەستی لەسەر سەری خۆی دانا) (!!!! !! !!!! !!!!É! !! !Ê!! !! !! !!! !!!!! !!!•!!! !! !!! !!!! ! !!!! !!! !!!!! !!!!!!!! !!!! !!! !!! !!!!! !!!Ê!!! !!!!•!!!!!!!! !!!!!!! ! ! !!!! !!!!É!!!!! !! !!!! !! !!! !!!•!!! ! !!!! !! !!!! !!! !! !!") [15]

❁ ❁ ❁

---

15 !!!!! !!! !!! !!! !!.

# حیكمەتی پەنجا و دوو

((إِنَّمَا أَوْرَدَ عَلَيْكَ الْوَارِدَ لِتَكُونَ بِهِ عَلَيْهِ وَارِدًا))

**راڤەی وشەكان:**

**أورد عليك:** بۆت دادەبەزێنێت، بۆت رەوانە دەكات

**الوارد:** مەعاریفی رەبانی و لەتائیفی رەحمانی

**واتا ((بۆیە خودا مەعاریفی رەبانی و لەتائیفی رەحمانیت بۆ رەوانە دەكات تاكو بەهۆیەوە دڵت ئامادە ببێت و بە خزمەتی خودا بگات))**

**شرۆڤە:**

❁ واردات ئەو لەتائیف و مەعریفە رەحمانیانەیە دادەبارێنە سەر دڵ، ئەوانە كۆمەڵێك مەنای قووڵی پێشتر نەزانراون، لە ساتێك لە ساتەكاندا دڵ وەریان دەگرێت و تێیان دەگات بەبێ كەسب كردن و خۆماندوو كردن، هەندێك لەو مەعاریفانە فەرمانی بكە و مەكە(**الأمر و النهي**)یان تێدایە بەبێ ئەوەی سەرئەنجامی ئەنجامدان یان ئەنجام نەدانی ئەو كارە بزانیت.

❁ واردات هەموو كاتێك پاك و بێگەرد نییە و ناتوانین بڵێین هەمووی لە خواوەیە، بەڵكو شەیتان دەستی تێدەخات و ئاماژەی خۆی تێكەڵ دەكات، بۆیە پێویستە سەرچاوەی واردات بپشكنین تاكو دڵنیابین لەوەی لە خوداوەیە یان لە شەیتانەوەیە، باشترین میزان بۆ پشكنین شەریعەتی خودایە كە لە قورئان و فەرموودەی دروستی پێغەمبەردا (ﷺ) رۆشن بۆتەوە، ئەبو سولەیمانی دارانی دەفەرموێت:: "هەندێ جار قسەیە لە قسەی ئەهلی دڵ دەكەوێتە دڵمەوە، بەڵام قبووڵی ناكەم تا دوو شاهیدی عەدلم بۆ نەهێنن: قورئان و فەرموودە" ئەبو لحوسەینی نووری دەفەرموێ: "هەر كەس بانگەشەی حاڵێك دەكات لەگەڵ خودا كە لە سنووری زانستی شەریعەت دەری

دەکات ئەوا نزیکی مەکەوە" سرِی سەقەتیش دەفەرمویّ: "هەر کەس بانگی باتنی زانستێك دەکات کە زاهیری زانست دژی دەوەستێتەوە ئەوە لە هەڵەدا دەژی" هەرگیز دڵ لە خوداوە زانستێك وەرناگرێت پێچەوانەی شەریعەت بێت، ئەگەر وابوو پێویستە پیاچوونەوە بکات، چونکە یان بەهۆی کەمی زانستی ئەوەیە لە شەریعەت یان لە شەیتانەوەیە.

۞ هەندێك جار واردات قسەی دەروونی مرۆڤە و لێی دەگۆڕێت بە ئیلهام وارداتی راستەقینە، بەتایبەت بۆ ئەوانەی لە سەرەتاکانی رێگای بەرەو خوداچووندان، ئەم تێکەڵییەش بەهۆی پاڵفتە نەبوونەوەیە، بەڵاّم بە پلەکانی تەزکییەدا بەرز دەبێتەوە تا وردە وردە قسەی دەروونی نامێنێت و بێدەنگ دەبێت.

۞ هەندیّ واردات و ئیلهاماتی خودایی لەلای رێبواری رێگەی خوداوە گومانیان دەکەوێتە سەر و ناتوانێت قبوڵیان بکات، بەتایبەت ئەگەر ئەو وارداتانە بەڵگەی لەناو شەریعەتدا بۆ نەدۆزێتەوە، یان —بە ئەقڵی- ئەو پێچەوانەی شەریعەت بێت، لەم بارەدا پێویستە کەسەکە خۆی بە وردەکارییەکانی زانستی شەریعەتەوە خەریك بکات و تەنها لە رووالّەت و توێکڵی شەریعەتدا گیر نەخوات، بۆئەوەی بتوانێت بە میزانی شەریعەت وارداتی خودایی لە وارداتی شەیتانی جیابکاتەوە.

۞ لە بنچینەدا ناردنی واردات لە خوداوە بۆ سەر دڵی بەندەکەی بۆ ئەوەیە بەهۆیانەوە دڵی بەرەو خودا تەکان بدات و ئامادە ببێت، واردات وەك پەیامهێنێکی مەلیك وایە بۆ لای یەکێك لە رەعییەتەکانی تاکو بانگی بکات بۆ بارەگای مەلیك و رێزی لیّ بگریّ و خەڵاّتی بکات.

۞ ۞ ۞

# حیکمەتی پەنجا و سێ

((أَوْرَدَ عَلَيْكَ الْوَارِدَ لِيَتَسَلَّمَكَ مِنْ يَدِ الأَغْيَارِ، وَلِيُحَرِّرَكَ مِنْ رِقِّ الآثَارِ))

**ڕاڤەی وشەکان:**

**ليتسلمك:** بۆ ئەوەی بتگرێتە دەست

**يد الأغيار: أغيار** کۆی "غير"ە، واتە دەستی نەیاران یان ناحەزان

**يحرك:** ئازادت بکات

**رق الآثار:** بەندایەتی و کۆیلەیی دروستکراوەکانی خودا

**واتا ((بۆیە خودا مەعاریفی ڕەبانی و لەتائیفی ڕەحمانیت بۆ ڕەوانە دەکات تاکو لە دەستی ناحەزان ڕزگارت بکات و بتهێنێتەوە ژێر دەستی خۆی و ئازادت بکات لە کۆیلەیی و بەندایەتی دروستکراوەکان))**

**شرۆڤە:**

۞ لە فەرهەنگی تەصەوفدا هەر شتێك مرۆڤ لەسەر ڕێگەی خودا لابدات یان لە خودا بێئاگای بکات، یاخود باوەڕدار لە جووڵەی بەرەو خوداچوون ڕابگرێت و بیوەستێنێت بە "ئەغیار" ناو دەبرێت، جگە لە خودا و ئەوانەی بە خوداوە وابەستەن لەلای ئەهلی دڵ بە "غیر" تەماشا دەکرێت.

۞ **"الآثار" ئاسار** بریتییە لە هەموو ئەو دروستکراوانەی کە دەبنە بەڵگە لەسەر بوون و گەورەیی خودای موتەعال، پێویستە لە ڕێگەی دروستکراوەکانەوە مرۆڤ خودا بناسێت، نەك ببێت بە کۆیلەی دروستکراوەکان.

۞ هاتنی واردات بۆ ئەوەیە تۆ لە بەندایەتی بەندەکانی خۆی ئازاد بکات و بتکات بە بەندەی ڕاستەقینەی خۆی، خودا مرۆڤی بۆ بەندایەتی خۆی دروست کردووە و نایەوێت لەم گەردوونەدا وێڵی بکات و ببێت بە بەندەی شتەکانی تر، بۆیە لە ڕێگەی

هاتنی پێغەمبەرانەوە ئاشنای دەكات بە ئیمان و لە ڕێگەی ئیمانیشەوە دڵی زیندوو دەبێتەوە و دڵی زیندووش ورداتی لەلای خوداوە بەسەردا دادەبارێت.

# حیکمەتی پەنجا و چوار

((أَوْرَدَ عَلَيْكَ الْوَارِدَ لِيُخْرِجَكَ مِنْ سِجْنِ وُجُودِكَ إِلَى فَضَاءِ شُهُودِكَ))

**راڤەی وشەکان:**

**ليخرجك:** دەرتبهێنێت

**سجن وجودك:** بەندیخانەی بوونت

**فضاء شهودك:** فەزای بینینت

**واتا (( بۆیە خودا مەعاریفی رەبانی و لەتائیفی رەحمانیت بۆ رەوانە دەکات تاکو لە بەندیخانەی بوونت دەرتبهێنێت بۆ فەزای بینینت))**

**شرۆڤە:**

❁ بوونی خودی مرۆڤ زۆرجار بۆ رێبواری رێگەی خودا دەبێتە بەندیخانە و ناهێڵێت بەرەو خودا هەنگاو هەڵبگرێت، حەزەکانی مرۆڤ، کەڵکەڵە و بیرکردنەوەکانی مرۆڤ زۆرجار بەربەستن لەسەر رێگەی بەرەو خوداچوون، بۆیە برینی بیابانی خۆ"خود" گەورەترین ماندووبوونی دەوێت، کاری مەزنی سالیکی رێگەی خودا فەنابوونە لە نەفس"خود"، هەتا ئەم خودە خاوەن شوناس بێت و پەیکەری مەزن بۆ خۆی دروست بکات، مرۆڤ هەنگاوی بەرەو خودا پێ هەڵناگیرێت.

❁ **عاریفان دەڵێن:** تەنها یەك هەنگاو لە خۆت بەدووربە ئەوەی بەدوایدا عەودالی بەدەستی دەهێنیت، تەنها حیجابێك لە نێوان تۆ و خودادا بریتییە لە خۆت، خۆتی ناهێڵی دڵ و دەروونت بە نووری ئەسمائو صیفات نوورانی بن، هەتا "من، من" لە ناخی مرۆڤدا بوونی هەبێت ئەو کەسە سەرقاڵی پەرستنی ئەو "من"ەیە و هێشتا بەرەو خودا هەنگاوی هەڵنەگرتووە.

۞ هاتنی واردات پێت دەڵێت: لە بەندیخانەی بوونی خۆت وەرە دەرەوە و روو لە فەزای بەرینی رۆحت بکە، تۆ لە چواچێوەی بوونی خۆتدا دیلکراوی و نازانیت چ جیهانێکی بەرین لە دەرەوەی ئەو چوارچێوە چاوەڕوانت دەکات، تۆ وەك کۆرپەیەك رەحمی دایکت لێبووە بە گەورەترین جیهان و بێئاگای لەوەی جیهانێکی بەرین لەودیو تۆ و رەحمی دایکەوە بوونی هەیە.

۞ ۞ ۞

# حیکمەتی پەنجا و پێنج

((الأَنْوَارُ مَطَايَا الْقُلُوبِ وَالأَسْرَارِ))

**ڕاڤەی وشەکان:**

**مطایا:** کۆی "مطیة- بکسر المیم"یە واتە وڵاخی سواری

**الأسرار:** کۆی "سر" واتە پەنهان

**واتا ((نوور وڵاخی سواری دڵ و پەنهانە)))**

**شرۆڤە:**

❁ بوونی نوور بۆ کەسی باوەڕدار لە دونیادا بەپێی دەقی قورئانی پیرۆز جێگیر بووە﴿ أَوَمَن كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَاهُ وَجَعَلْنَا لَهُ نُورًا يَمْشِي بِهِ فِي النَّاسِ كَمَن مَّثَلُهُ فِي الظُّلُمَاتِ لَيْسَ بِخَارِجٍ مِّنْهَا كَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِلْكَافِرِينَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿١٢٢﴾ ﴾ الأنعام: ١٢٢، زانایانی تەفسیری قورئان هاوڕان لەسەر ئەوەی بوونی ئەم نوورە کە قورئان ئاماژەی پێ دەکات لە دونیادایە، بەڵام حەقیقەتی ئەو نوورە چییە و چۆنە لێکدانەوەی جیاوازی بۆ کراوە، لەم ئایەتە پیرۆزەدا هاتنی وشەی نوور جیاوازە لەو نوورەی خودا لە دوارۆژدا بە کەسی باوەڕداری دەبەخشێت﴿ يَوْمَ تَرَى الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ يَسْعَىٰ نُورُهُم بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَبِأَيْمَانِهِم بُشْرَاكُمُ الْيَوْمَ جَنَّاتٌ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا ذَٰلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ ﴿١٢﴾ ﴾ الحدید: ١٢.

❁ یەکێك لە تەفسیرەکان بۆ ئایەتی نوور کە لە سوورەتی نووردا هاتووە بە نووری خودا لە دڵی باوەڕداردا لێکدانەوەی بۆ کراوە﴿ اللَّهُ نُورُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ مَثَلُ نُورِهِ كَمِشْكَاةٍ فِيهَا مِصْبَاحٌ الْمِصْبَاحُ فِي زُجَاجَةٍ الزُّجَاجَةُ كَأَنَّهَا كَوْكَبٌ دُرِّيٌّ يُوقَدُ مِن شَجَرَةٍ مُّبَارَكَةٍ زَيْتُونَةٍ لَّا شَرْقِيَّةٍ وَلَا غَرْبِيَّةٍ يَكَادُ زَيْتُهَا يُضِيءُ وَلَوْ لَمْ تَمْسَسْهُ نَارٌ نُّورٌ عَلَىٰ نُورٍ يَهْدِي اللَّهُ لِنُورِهِ مَن يَشَاءُ وَيَضْرِبُ اللَّهُ الْأَمْثَالَ لِلنَّاسِ وَاللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴿٣٥﴾ ﴾ النور: ٣٥

۞ بوونی نوور بۆ دڵ و پەنهانی باوەڕداران ڕێگەیان بۆ ڕۆشن دەکاتەوە و ئەوانیش بەو ڕێگە نوورانییەدا هەنگاو بەرەو خودا هەڵدەگرن، هەتا نوور زیاتر بێت ڕێگە نوورانی تر و تەکانی بەرەو خودا زۆرتر و بەهێزترە.

۞ ناخی مرۆڤ ئەشکەوتێکی تاریك و نوتەکە، مرۆڤ لەم تاریکستانی وجوودەدا حەیران و سەرگەردانە، نوور پەنهان ڕۆشن دەکاتەوە و ئەشکەوتی تاریکمان بۆ نوورانی دەکات و هێزی بینین دەکەوێتەگەڕ و دەرگای چوونەدەرەوە لەو ئەشکەوتە دەبینێتەوە و لە خودەوە بۆ گەردوون و لە سنووردارییەوە بۆ بێسنووری هەنگاو هەڵدەگرێت، مەحوی دەفەرموێ:

تا زوڵمەتی وجوودە تەریکی لە نووری عیشق
زوڵمەت نەما هەتاوە کە مەحوی نەما خودا.

۞ ۞ ۞

# حیکمەتی پەنجا و شەش

((النُّورُ جُنْدُ الْقَلْبِ كَمَا أَنَّ الظُّلْمَةَ جُنْدُ النَّفْسِ، فَإِذَا أَرَادَ اللهُ أَنْ يَنْصُرَ عَبْدَهُ أَمَدَّهُ بِجُنُودِ الأَنْوَارِ، وَقَطَعَ عَنْهُ مَدَدَ الظُّلَمِ وَالأَغْيَارِ))

**راڤەی وشەكان:**

**جندالقلب:** سەربازی دڵ

**الظلمة:** تاریكی

**أمده بجنود الأنوار:** كۆمەكی دەكات بە سەربازی نوور

**قطع عنه:** لێیدەبڕێت

**مدد الظلم و الأغيار:** پشتیوانی تاریكی و نەیاران

**واتا ((نوور سەربازی دڵە، وەك چۆن تاریكی سەربازی نەفسە، كاتێك خودا بیەوێت بەندەكەی خۆی سەربخات كۆمەكی دەكات بە سەربازی نوور و هاتنی تاریكی و نەیارانی لێ دەبڕێت(لێ دەگرێتەوە))**

**شرۆڤە:**

❁ خودای موتەعال ئامادەیی ئەنجامدانی خێر و شەڕی لە مرۆڤدا داناوە ﴿وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّىٰهَا ۝٧ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَىٰهَا ۝٨ قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ۝٩ وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا ۝١٠﴾ الشمس:٧-١٠، سوێند بەو دەروونە و بەوەی پێكی هێناوە و ڕێكیخستووە و هێزی خراپە و چاكەی بۆ ئیلهام كردووە، سەرفەراز بوون ئەوانەی نەفسیان خاوێن كردەوە، زیانۆمەند بوون ئەوانەی پشتگوێیان خست.. ئەم دوو سوپایە(سوپای فجور و سوپای تەقوا) لە شەڕێكی دەستەویەخەدا لەگەڵ یەكتر دەجەنگن، تاوێك هێزی فجوور سەركەوتن بەدەست دەهێنێت و ناخ و دەرەوەی مرۆڤ وێران دەكات، تاوێكیش هێزی تەقوا زاڵ دەبێت و وێرانەكانی دەستی سوپای فجوور لە مرۆڤدا بینا دەكاتەوە.

❁ هەریەك لەم دوو سوپایە کۆمەکی و پشتیوانی لە لایەکەوە وەردەگرێت، سوپای فجوور لە شەیتان و دارودەستەکەیەوە هێزی تاریکی رەوانە دەکات و پشتیوانی سوپای فجووری پێدەکات، خودای موتەعالیش هێزی نوور و رۆشنایی بۆ کۆمەکی سوپای تەقوا رەوانە دەکات، مرۆڤ بە بەردەوامی لە ناوەندی جەنگی ئەم دوو سوپادایە، بەلاّم خودای موتەعال دەست لە بەندە راستگۆکانی خۆی بەرنادا و بە هەمیشەی پشتیوانیان دەکات ﴿ وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ فِينَا لَنَهۡدِيَنَّهُمۡ سُبُلَنَاۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٦٩﴾ ﴾ العنكبوت: ٦٩، ئەوانەی لە پێناوی ئێمەدا موجاهەدەیان کرد و لەگەڵ نەفسی خۆیان کۆشان بۆ سەر رێگاکانی خێر و چاکە هیدایەتیان دەدەین، خودا لەگەڵ موحسینانداپە.

❁ خودای موتەعال جگە لە کۆمەکی کردنی سوپای تەقوا بە نوور و رۆشنایی، پاڵپشتی سوپای فجووریش بە تاریکی و نەیاران دەبڕێت و هێزی شەڕ لە مرۆڤدا کەم دەکاتەوە.

❁ مرۆڤ لە جەنگی لەگەڵ هێزی شەڕدا تەنها نییە، خودا و فریشتەکان و پێغەمبەران و باوەڕداران لە ئینس و جین یەك بەرەن و رووبەڕووی شەیتان و دارودەستەکەی وەستاون، ئەوان دەیانەوێت گەردوون داگیر بکەن و هێزی تاریکی بەسەر نووردا سەربخەن و حکومەت و دەوڵەتی خۆیان حوکمڕانی بکات، خودای موتەعال و باوەڕدارانیش لە ئینس و جین و فریشتەکان دەیانەوێت بە هێزی نوور لە گەردووندا تاریکی بڕەوێنن.

❁ ئیمامی ترمزی و ئیبن حەببان و نەسائی و غەیری ئەوانیش ریوایەتیان کردووە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ((شەیتان هەوڵ و هێرش و گرتن و پەلاماری خۆی هەیە کە فەرماندانە بە شەڕ و حەق بەدرۆزانینە، فریشتەش هەوڵ و کۆمەك و گرتنی خۆی هەیە کە بریتییە لە فەرماندان بە خێر و چاکە و حەق بەڕاستزانین، هەر کەس ئەمەی —دووەمی- بینییەوە با حەمدی خودا بکات، هەر کەس شتێکی تری بینییەوە با پەنابگرێت بە خودا لە شەیتانی نەفرەت لێکراو. (**إن للشيطان لمة بابن آدم وللملك لمة: فأما لمة الشيطان فإيعاد بالشر وتكذيب بالحق، وأما لمة الملك فإيعاد بالخير وتصديق بالحق، فمن وجد ذلك فليعلم أنه من الله فليحمد الله، ومن وجد الأخرى فليتعوذ بالله**

من الشيطان الرجيم ثم قرأ {الشَّيْطَانُ يَعِدُكُمُ الْفَقْرَ وَيَأْمُرُكُم بِالْفَحْشَاء وَاللّهُ يَعِدُكُم مَّغْفِرَةً مِّنْهُ وَفَضْلاً وَاللّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ}

# حیكمەتی پەنجا و حەوت

((النُّورُ لَهُ الْكَشْفُ، وَالْبَصِيرَةُ لَهَا الْحُكْمُ، وَالْقَلْبُ لَهُ الإِقْبَالُ وَالإِدْبَارُ))

**راڤەی وشەكان:**

**الكشف:** دەرخستن و پەردە لەسەر لادان

**الحكم:** بڕیار

**الإقبال و الإدبار:** روو تێكردن و پشت تێكردن

**واتا ((نوور دەرخستن و پەردە لەسەرلادانی بۆ هەیە، بەصیرەتیش بڕیاردان و دڵیش رووتێكردن و پشت تێكردن))**

**شرۆڤە:**

**ئیبن عەتا لەم حیكمەتەدا باس لە سێ دەزگای گرنگی مەعنەوی لە مرۆڤدا دەكات:**

١. **نوور:** نووری بەدەستهاتوو لە بڕینی مەقامات رێگە رۆشن دەكاتەوە و حەقیقەتی شتەكانمان بۆ دەخاتە روو، واتە كاری دەرخستن و ناساندنی هەموو ئەو حاڵەتانەیە دێنە بەردەم رێبواری رێگەی خودا، هەروەك چۆن رۆشنایی خۆر لە رۆژدا بوونەكان رۆشن دەكاتەوە و حەقیقەتی ئەو بوونانەمان نیشانمان دەدات.

٢. **بەصیرەت:** بە تەنها بوونی خۆر بەس نییە بۆ دەركەوتنی شتەكان، بەڵكو بوونی دەزگایەكی وەك چاو پێویستە كە دەتوانێت رۆشنایی شكاوەی سەر شتەكان وەربگرێت و لەوێشەوە حەقیقەتی شتەكان ببینێت، چونكە زۆرن ئەوانەی بەهۆی لەدەستدانی چاویانەوە بە رۆژیشدا هیچ نابینن، هەر بەو جۆرە ئەگەر بۆ رۆشنایی خۆر **"بصر"** پێویست بێت ئەوا بۆ رۆشنایی نوور **"بصیرة"**ی پێویستە تاكو بتوانێت بەهۆی نوورەوە حەقیقەتی حاڵەتەكان ببینێت و لێیان تێبگات، بەصیرەت چاوی دڵە وەك چۆن دوو چاوی بینینمان چاوی سەرە، هەندێك لە عاریفان ناویان ناوە چاوی سێیەم كە پێیان وایە پەیوەستە بە ناوچاوانی مرۆڤەوە و شەشەمین لەتیفە **"لطائف"**ی مرۆڤە.

**٣. دڵ:** وێستگەی بڕیارە بە رووتێکردن و پشت تێکردن، دوای ئەوەی نوور رۆشنایی دەخاتە سەر حەقیقەتی شتەکان و بەصیرەت حوکمی خۆی لەمەڕ ئەو حەقیقەتانە دەردەکات (بە شیاوو نەشیاو) دڵ  روو لە شیاوەکان بەخۆی دەکات و پشت لە نەشیاوەکان دەکات، شیاو هەموو ئەو دۆخ و بارانەن مەعبوود پێی رازییە و نەشیاویش هەموو ئەوانەن نەهی لێکراوە، بۆیە نابێت بەصیرەت شتێك بە پەسەند ببینێت کە شەرع لەلای پەسەند نییە، یاخود بەپێچەوانەوە، ئەوانەی حاڵێکیان بۆ کەشف دەبێت پێچەوانەی دەقی بڕاوەی شەریعەت بێت با بزانن وەحیان لە شەیتانەوە بۆ هاتووە و ئەو کەشفکراوە لە خوداوە نییە، چونکە خودا بەندە صاڵحەکانی خۆی لە شتێك ئاگادار ناکات پێچەوانەی شەریعەتە گەردوونییەکەی بێت.

❁ دەبێت لێرەدا قسەیەك لە پێوەرەکانی کەشف بکەین، کەشف پێوەری تایبەت بە خۆی هەیە، لەوانە:

١.کەسەکە بەدڵ و بەجەستە پابەندە بە شەریعەتەوەو لادان لەو شەریعەتە بە بێباوەڕی و گومڕایی تەماشا دەکات.

٢.کەشفەکە رەگ و ریشە و بنچینەی لە شەریعەتدا هەیە.

٣.کەشفەکە لێڵی و تەمومژێك (کە لای کەسەکە دروست بووە) دەڕەوێنێتەوە، نەك شەرعێکی تازە بهێنێت و نەسخی شەریعەتی پێ بکات.

٤.کەشف لە سنوورێکی بەرتەسکدایە و گشتگیر ناکرێت بۆ هەموو سەردەم و شوێن و کەسێك.

٥.کەشف ناکرێتە بەڵگەی راستگۆیی و راستڕەویی کەسی خاوەن کەشف، بەڵکو پابەندبوونی بە شەریعەوە پێوەری حەق و باتڵە.

٦.باس کردنی کەشف و بلاَوە پێکردنی مەکروهە و شاردنەوەی باشترە لە ئاشکرا کردنی.

❁ ❁ ❁

# حیکمەتی پەنجاو هەشت

((لاَ تُفْرِحْكَ الطَّاعَةُ لِأَنَّهَا بَرَزَتْ مِنْكَ، وَافْرَحْ بِهَا لِأَنَّهَا بَرَزَتْ مِنَ اللهِ إِلَيْكَ
﴿ قُلْ بِفَضْلِ ٱللَّهِ وَبِرَحْمَتِهِۦ فَبِذَٰلِكَ فَلْيَفْرَحُواْ هُوَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ ﴿٥٨﴾ ﴾ یونس: ٥٨))

**راڤەی وشەکان:**

**لا تفرحك:** دڵخۆشت نەکات

**الطاعة:** گوێڕایەڵی، هەموو ئەوەی شەرع فەرمانی پێکردووە و بەباشی زانیوە

**برزت منك:** لە تۆوە دەرکەوتووە، تۆ ئەنجامت داوە

**برزت من الله إليك:** لە خوداوە بۆ تۆ دەرکەوتووە

**واتا ((گوێڕایەڵی دڵخۆشت نەکات گوایە لە تۆوە دەرکەوتووە و ئەنجامت داوە، بەڵکو پێی دڵخۆش بە لەبەر ئەوەی لە خوداوە بۆ تۆ دەرکەوتووە و نێرراوە))**

**شرۆڤە:**

❁ لە بنچینەدا مرۆڤی باوەڕدار دەبێ بەئەنجامدانی کردارە باشەکان و دوورکەوتنەوە لە کردارە خراپەکان دڵخۆش بێت، چونکە لەو رێگەیەوە مرۆڤ بە خودا دەگات و بەهەشت و رەزامەندی خودا بەدەست دەهێنێت، ئەی لێرەدا مەبەست چییە لە دڵخۆش نەبوون بە کرداری چاکە؟ ئیبن عەتا دەیەوێت ئێمە لە ئافەتێکی گەورەی نەفس ئاگادار بکاتەوە، ئەویش خۆ بەخاوەن زانینی کردارە باشەکانە، کاتێك مرۆڤ کردارەکان لە خۆیەوە دەبینێت جۆرێك لە غروورو خۆبەگەورەزانین رووی تێدەکات، ئەمەش سەرچاوەی زۆرێك لە نەخۆشییەکانی دڵ و دەروونە، بۆیە گوناه بکەی و پەشیمان بیت و لە بەردەم خودادا هەست بە رووزەردی بکەیت چاکترە لەوەی عیبادەت بکەی و لوتبەرزی و غروورت بۆ دروست ببێت، کاتێك چاکەکانت بۆ خودا دەگێڕییەوە و لەوەوە چاکەکان دەبینیت، ئەوا:

١. خۆت لە نەخۆشی غروور و لوتبەرزی پاراستووە.

٢. ئەدەبی خواناسیت لەگەڵ خودادا پاراستووە، چونکە هیچ کار و کردەوەیەك بەبێ ویستی ئەو ئەنجام نادرێت.

٣. دڵخۆش دەبیت بەوەی خودا یادی تۆی کردووە و هەدیەی بۆ ڕەوانە کردووی کە ئەنجامدانی کرداری چاکەیە، واتە بەخودا دڵخۆش دەبیت کە سەرچاوەی هەموو خێر و چاکەیەکە نەك بە خودی خۆت کە چاکە و خراپە تێکەڵ بە یەکتر دەکەیت، ئەم دڵخۆش بوونەش بە خودا کردارە چاکەکانت بەرەکەتدار دەکات و تا یەك بە حەوسەد و زیاتریش پاداشتی لەسەر وەردەگریت، جگە لەوەی ئەو کردارە چاکەیە کە لە خوداوە دەبینرێت دەبێتە دایك و سەرچاوە بۆ کۆمەڵێك کرداری چاکەی تر، لەوانەیە وتنی کەلیمەیەك کە لە خوداوە ببینرێت ببێتە هۆی هیدایەتی هەزاران مرۆڤ، ئەمەش بەرەکەتی ئیخلاص و لە خوداوە سەرنجدانی کردارە باشەکانە. هەنگاوێك خوارتر لەم حاڵەتە باڵا ئەوەیە کەسەکە دڵی بە کردارەکەی خۆی خۆش بێت لەبەر ئەوەی خودا بەو کردارە ڕازییە، لێرەشدا دڵخۆش بوونەکە پەسەندە، چونکە لە بنچینەدا بە ڕەزامەندی خودا دڵخۆشە نەك بە خودی کردارەکەی.

❁ ئیبن عەتا ئاماژە بە یەکێك لە ئایەتە پیرۆزەکان دەکات کە دەفەرموێت:: بڵێ بە فەزڵ و ڕەحمەتی خودا بابە ئەوە دڵخۆش بن، ئەوە باشتر و چاکترە لەوەی کۆی دەکەنەوە، پێش ئەم ئایەتە پیرۆزە ئایەتی ٥٧ی هەمان سورەتە کە دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدۡ جَآءَتۡكُم مَّوۡعِظَةٞ مِّن رَّبِّكُمۡ وَشِفَآءٞ لِّمَا فِي ٱلصُّدُورِ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٞ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ ٥٧﴾ یونس: ٥٧، ئەی خەڵکینە ئامۆژگاری لە پەروەردگارتانەوە بۆ ئێوە هاتووە کە شیفایە بۆ ئەوەی لەدڵ و دەرووندایە و هیدایەت و ڕەحمەتە بۆ باوەڕداران.. گەورەترین نیعمەتی خودا بۆ سەر زەوی ناردنی قورئانە بۆ مرۆڤایەتی، قورئانێك کە ئامۆژگاری و شیفا و هیدایەت و ڕەحمەتە، خودای موتەعال دەفەرموێت:: بەو فەزڵ و ڕەحمەتەی خوا دڵخۆش بن کە بە هۆیەوە قورئانی بۆ ڕەوانە کردن و بوو بە ئامۆژگاری و شیفا و هیدایەت و ڕەحمەت بۆ ئێوە، نموونەی بەرز و بڵند بۆ خودایە، وەك ئەوەی مەلیکێك هەدیەیەك بۆ کەسێك بنێرێت و کەسەکە بەهۆی مەزنی هەدیەکەوە

مەلیکی لەبیر بچێت و تەنها بیر لە هەدیەکە بکاتەوە، خودای موتەعال ئاگادارمان دەکاتەوە کە بە فەزڵ و رەحمەتە خوداییەکە دڵخۆش بین کە بەسەر ئێمەدا دایباراند و قورئانی بۆ رەوانە کردین، ئەو فەزڵ و رەحمەتە زۆر مەزنترە لەوەی ئێمە لە خۆمانی کۆدەکەینەوە شتومەکی دونیایی بێت یان زانست و زانیاری.

# حیکمەتی پەنجا و نۆ

((قَطَعَ السَّائِرِينَ لَهُ وَالْوَاصِلِينَ إِلَيْهِ عَنْ رُؤْيَةِ أَعْمَالِهِمْ وَشُهُودِ أَحْوَالِهِمْ،
أَمَّا السَّائِرُونَ فَلأَنَّهُمْ لَمْ يَتَحَقَّقُوا الصِّدْقَ مَعَ اللهِ فِيهَا،
وَأَمَّا الْوَاصِلُونَ فَلأَنَّهُ غَيَّبَهُمْ بِشُهُودِهِ عَنْهَا))

## راڤەی وشەکان:

**السائرين له:** ڕێبواران بۆ لای خودا

**الواصلين إليه:** ئەوەی بە خودا گەیشتوون

**رؤية أعمالهم:** بینینی کارەکانیان

**شهود أحوالهم:** سەیرکردنی حاڵیان

**غيبهم بشهوده عنها:** بە بینینی خۆی لە بینینی کارەکان نادیاری کردوون

**واتا ((خودا بینینی کارەکانیان و سەیرکردنی حاڵەکانیانی لە ڕێبواران بۆ لای خودا و گەیشتووان بە خودا بڕیوەتەوە، چونکە ڕێبواران بۆ لای خودا بە بینینی ئەو کارانە دەستەبەری صدق ناکەن لەگەڵ خودادا، گەیشتووانیش بە خودا بە بینینی خۆی(ﷻ) لە بینینی کارەکان نادیاری کردوون))**

## شرۆڤە:

❁ ئیبن عەتا باسی دوو جۆر لە ڕێبواری ڕێگە دەکات: ڕێبواران بۆ لای خودا (**السائرون**) و گەیشتووان بە خودا (**الواصلون**)، ڕێبواران هێشتا لەسەر ڕێگەی بەرەو خوداچوونن، خەریکی تەکان و گەڕان و گەردەشی ڕۆحین، گەیشتووان دڵیان لە ڕۆخی دەریای خواناسیدا لەنگەری گرتووە.

۞ خودای موتەعال لە "رێبواران" و "گەیشتووان" بینینی کارەکانی ون کردووە، هەریەکەیان بە جۆرێك: رێبواران بە بینینی ئەو کارانە دەستەبەر کردنی صدق لەدەست دەدەن، بۆیە خودا لەوان دەگەیەنێت کە تەماشای کارەکان نەکەن، چونکە صدقیان لەگەڵ خودا تێکەڵی بۆ دروست دەبێت، ئەمەش پێچەوانەیە لەگەڵ ئەو بڕیارەی کە لەسەرەتای گەشتەکەیانەوە بڕیاریان لەسەر دابوو، ئەوەش گەشتکردنە بۆ لای خودا، بۆ خودا و لەگەڵ خودا، گەیشتووانیش ئامادەیی دڵیان لە خزمەت خودادا هەموو شتێکی لەبیر بردوونەتەوە، بۆیە کردارەکانی خۆیان نابینن.

۞ رێبواران بە زاڵبوونی صیفەتی صدق بەسەریاندا کردارەکانیان لیّ ون دەبێت و سەرنجیان نادەن، گەیشتوانیش بە زاڵبوونی نووری ئەسمائوصیفات بەسەریاندا کارەکانی خۆیان لا بزر دەبێت.

۞ ونبوون و بزربوونی کار مانای ئەنجام نەدانی کار نییە، رێبواران و گەیشتووان سەرقاڵی بەندایەتی و کڕنووش بردنن بۆ خودا هەتا مردن، بەڵام کۆی ئەو ملکەچی و بەندایەتییە وایان لیّ ناکات بەگەورە تەماشای بکەن و وابزانن کارێکی مەزنیان بۆ خودا ئەنجام داوە، چونکە ئەو بینینە لە رۆیشتن بەرەو خودا رایان دەگرێت و لە گەڕان و گەردەش دەوەستن.

## حیكمەتی شەست - یەك - دوو

٦٠ ((مَا بَسَقَتْ أَغْصَانُ ذُلّ إِلاَّ عَلَى بَذْرِ طَمَعٍ))

.....

٦١ ((مَا قَادَكَ شَيْءٌ مِثْلُ الْوَهْمِ))

.....

٦٢ ((أَنْتَ حُرٌّ مِمَّا أَنْتَ عَنْهُ آيِسٌ وَعَبْدٌ لِمَا أَنْتَ لَهُ طَامِعٌ))

### راڤەكردنی وشەكان:

**بسقت:** پەلوپۆ لێدەدات

**أغصان ذل:** لقوپەلی زەلیلی

**بذر الطمع:** تۆوی چاوچنۆكی

**قادك:** پێشوایەتیت دەكات، رێنموونیت دەكات

**الوهم:** ئەندێشە

**آیس:** بێهیوا

**طامع:** تەماعدار

**٦٠ ((لقوپۆی زەلیلی لەسەر تۆوی تەماع و چاوچنۆكی گەبەڵ دەبێت و پەلوپۆ لێدەدات))**

.....

**٦١ ((هیچ شتێك وەك وەهم بەرەو هەڵدێرت نابات))**

.....

**٦٢ ((تۆ ئازادی لە شتێك كە لێی بێهیوا دەبیت، دەبیت بە كۆیلەی شتێك كە تەماعكارانە دەستی بۆ دەبەی))**

### شرۆڤە:

❁ لای ئیبن عەتا کۆتوبەندی زەلیلی مرۆڤ وەك درەختێکی گەبەڵ وایە، ئەم درەختە گەبەڵە لە تۆوێکەوە سەر دەردەهێنێت کە تۆوی تەماع و چاوچنۆکییە، گەر بتوانیت ئەو تۆوە بنبڕ بکەیت ئەوا درەختی زەلیلی لە مرۆڤدا گەشە ناکات و پەلوپۆ لێ نادات، بنبڕکردنی دەنکە تۆوێك ئاسانترە لە بڕینەوەی درەختێکی گەبەڵ کە پاش ماوەیەك دیسان سەوز دەبێتەوە و لقوپۆپ دەردەکات، حەقیقەتی مرۆڤ و مانای مرۆڤ بە ئازادییەکەیەوەیە، گەر ئازادی لەدەست دا مانای مرۆڤبوونی دەکەوێتە بەردەم هەڕەشەی بوون و نەبوونەوە، ئازادی مرۆڤ لە ناخەوە دەست پێدەکات، گەر لە ناوەوە ڕەها نەبێت و کۆتوبەندی حەزەکان تێکوپێك نەشکێنێت هەرگیز ناتوانێت لە دەرەوە ئازاد بێت و مانای ئازادی بزانێ و ببەخشێت.

❁ **تەماع چییە؟** تەماع ویستنی شتگەلێکە کە لە هەموو کەس زۆرترت لەلا بێت، ماڵ، دارایی، نەوە، ناوبانگ، هێز، کورسی،هتد...چاوچنۆکی (جشع)یش بریتییە لە لوتکەی تەماع، بەجۆرێك لە داگیرکردن و خواردنی ماڵ و سامانی خەڵکیدا هیچ جۆرە بەزەییەکت لە لا نەبێت، گەر تەماع بریتی بێت لە داواکردنی قاپێکی تر لە خواردن بەر لە تەواوبوونی قاپی یەکەم، ئەوا چاوچنۆکی بریتییە لە داواکردنی هەموو ئەو قاپانەی لەبەردەم کەسانی تردا دانراوە تا بە تەنها خۆی بیخوات و خەڵکی سەیری دەمی ئەو بکەن.

❁ تەماع تەنها لە شتە مادیەکاندا نییە، بەڵکو شتە مەعنەویەکانیش جێگەی تەماعن، هەندێ کەس وادەزانێ بەهەشت زۆر بەرتەسکە و جێگەی کەم کەسی تیادەبێتەوە، بۆیە حەز بەوە ناکات ئەهلی خێر و چاکە زۆر بن، نەبادا بەشەکەی ئەو لە بەهەشتدا داگیر بکەن، گەر چەند کەسێك بن و شەوێك لە جێگەیەکدا بمێننەوە، شەو بۆ خۆی بۆ شەونوێژ هەڵدەستێت و حەز ناکات هیچ کەس بەئاگا بێت، نەك لەبەر ئەوەی نێت و ئیخلاصی ئەو رووبەڕووی ڕیا نەبێتەوە، بەڵکو حاڵەتەکەی ئەو لە چاوچنۆکیەوەیە و تەنانەت دوای ئەوەی خۆی نوێژی بەیانی دەکات هیچ کەس بەئاگا ناهێنێت، ئەمانە پێیان دەوترێت موسڵمانی چاوچنۆك.

❁ تەماعی پلە و پایەی بەرز لە باوەڕدا زۆرجار زەبری کوشندە لە کەسەکە دەدات، ئەو وەهمی پلەیەکی زۆر بەرز لە باوەڕ دەخاتە سەریەوە، ئەم وەهمە زۆرجار حەقیقەتی خۆی لەبیردەباتەوە و لای وایە ئەو کەسە مەزنەیە کە هەڵگری پلە و پایەیەکی زۆر مەزنە، وەهمی پلەی بەرز لە باوەڕ بە هەمیشەیی وای لێ دەکات "ئێستا" بەجێبهێڵێت و لە داهاتوودا بژی، لێرەوە ژیانی دەبێت بە زنجیرەیەك لە بۆشایی بێ مانا و بێ کار، بۆیە ئیبن عەتا لەدوای باس کردنی تەماع لە حیکمەتی شەست و یەکدا باس لە وەهم دەکات، هەر ساتێك پێت وابوو کەماڵی تۆ لە داهاتوودایە، نەك لە ئێستادا ئەوە تۆ لە وەهمدا دەژی و هەرگیز ناگەیە ئەو کەماڵە وەهمییە، کە باوەڕت بەوە هێنا پێویستە چرکە بە چرکەی ژیانم لە "ئێستا"دا بگەیەنمە کەماڵ و هیچ پەیوەندییەکی بە داهاتووەوە نییە، ئیتر تەمومژی وەهم دەڕەوێتەوە و لە "ئێستا"دا دەست دەبەی بۆ کار و خۆت لە "خۆفریودان" دوور دەخەیەوە.

❁ دەروونی مرۆڤ هەمیشە حەز دەکات خۆی بداتە دەم وەهم، نەك ژیان لەگەڵ حەقیقەتدا، کاتێك مرۆڤ وەهمی ئەوەی بۆ دروست دەبێت کە "قازانج و زەرەر" لەدەستی مەخلوقاتدایە، لە راستیدا ئەمە هیچی تر نییە جگە لە وەهم، چونکە قازانج و زەرەر لەدەستی هێزێکی بالاٌتر لە مەخلوقاتدایە کە ئەویش خودای موتەعالە، وەهم سەردەکێشێ بۆ گومان، گومانیش تۆوی تەماع لەوەی لەدەستی مەخلوقاتدایە دروست دەکات، تۆوی تەماعیش درەختی گەبەڵی زەلیلی و سەرشۆڕی لە مرۆڤدا دەخولقێنێت، بۆیە باوەڕداری راستەقینە هەمیشە رووی دڵی لە خودایە و شان بەلای ئەودا دادەدات و دڵی خۆی وابەستەی ئەو دەکات، نەك مەخلوقات.

❁ هەر شتێك لە دڵ دەرتکرد تۆ بەشێك لە ئازادی بەدەست دەهێنیت، بەپێچەوانەوە هەر شتێکت لەدڵ دانا بەشێك لە ئازادی لەدەست دەدەی و خۆت کۆتوپێوەند دەکەی، هەر شتێك لە دڵ دانرا مرۆڤ دەبێتە کۆیلە بۆی، بڕیارە مرۆڤ تەنها خودا لە دڵ دابنێت و بەندایەتی هەر بۆ ئەو بێت، بۆیە خۆت و خۆشەویستی خۆشت لە دڵ دامەنێ، بۆ ئەوەی نەبیتە مرۆڤێکی خۆپەرست، تۆ بڕیارە بەندەی خودا بیت، نەك بەندەی حەزەکانی خۆت و غەیری خۆت.

# حیکمەتی شەست و سێ- چوار- پێنج- شەش

٦٣ ((مَنْ لَمْ يُقْبِلْ عَلَى اللهِ بِمُلاَطَفَاتِ الإِحْسَانِ قِيدَ إِلَيْهِ بِسَلاَسِلِ الامْتِحَانِ))

.....

٦٤ ((مَنْ لَمْ يَشْكُرِ النِّعَمَ فَقَدْ تَعَرَّضَ لِزَوَالِهَا وَمَنْ شَكَرَهَا فَقَدْ قَيَّدَهَا بِعِقَالِهَا))

.....

٦٥ ((خَفْ مِنْ وُجُودِ إِحْسَانِهِ إِلَيْكَ وَدَوَامِ إِسَاءَتِكَ مَعَهُ أَنْ يَكُونَ ذَلِكَ اسْتِدْرَاجًا لَكَ {سَنَسْتَدْرِجُهُم مِّنْ حَيْثُ لاَ يَعْلَمُونَ} لقلم: ٤٤))

.....

٦٦ ((مِنْ جَهْلِ الْمُرِيدِ أَنْ يُسِيءَ الأَدَبَ فَتُؤَخَّرُ الْعُقُوبَةُ عَنْهُ، فَيَقُولُ: لَوْ كَانَ هَذَا سُوءَ أَدَبٍ لَقَطَعَ الإِمْدَادَ وَأَوْجَبَ الإِبْعَادَ، فَقَدْ يَقْطَعُ الْمَدَدَ عَنْهُ مِنْ حَيْثُ لاَ يَشْعُرُ، وَلَوْ لَمْ يَكُنْ إِلاَّ مَنْعَ الْمَزِيدِ، وَقَدْ يُقَامُ مَقَامَ الْبُعْدِ وَهُوَ لاَ يَدْرِى، وَلَوْ لَمْ يَكُنْ إِلاَّ أَنْ يُخَلِّيكَ وَمَا تُرِيدُ))

## ڕاڤەی وشەکان:

**لم يقبل على الله:** روو نەکاتە خودا

**ملاطفات الإحسان:** لوتف و دواندن بە چاکە لەگەڵ کردن

**قيد إليه:** کۆت و زنجیر دەکرێت بۆ لای خودا

**سلاسل الإمتحان:** زنجیر و کۆت و بەندی تاقیکردنەوە

**فقد تعرض لزوالها:** تووشی تیاچوونی دەبێت

**فقد قیدها بعقالها:** بە پەتی (شوکر) دەیبەستێتەوە

**دوام إساءتك معه:** بەردەوامی خراپەی تۆ لەگەڵ خودا

**إستدراجا لك:** هەڵنانت بێت

**أن یسيء الأدب:** بێ ئەدەبی بکات

**فتؤخر العقوبة عنه:** سزا بۆ سەری دوابکەوێت

**لقطع الإمداد:** کۆمەکی خوایی دەبڕا

**أوجب الإبعاد:** دوورخستنەوەی لێ دەکەوتەوە

**منع المزید:** رێگری لە زیادکردنی کۆمەك بۆی

**یقام مقام البعد:** لە مەقامی دوورخستنەوە دەمێنێتەوە

**أن یخلیك وما ترید:** وێڵت بکات لەگەڵ ئەوەی کە تۆ دەتەوێت

**٦٣ ((هەرکەس بە دواندنی چاکەی خودایی روو لە خودا نەکات بە کۆت و بەندی تاقیکردنەوە بەرەو لای خودا زنجیر دەکرێت))**

.....

**٦٤ ((هەر کەس شوکری نیعمەت نەکات خۆی رووبەڕووی تیاچوونی نیعمەتەکە کردۆتەوە، هەر کەس شوکری بکات بە پەتی شوکر نیعمەتەکەی بەستۆتەوە))**

.....

**٦٥ ((بترسە لەوەی بوونی چاکەی خودا لەسەر تۆ و بەردەوامی خراپەی تۆ لەگەڵ خودا ئەوە بریتی بێت لەهەڵنانت** ﴿سَنَسْتَدْرِجُهُم مِّنْ حَيْثُ لَا يَعْلَمُونَ﴾ القلم: ٤٤، **هەڵیان دەنێین بەجۆرێك ئەوان پێی نەزانن))**

.....

**٦٦ ((لە نەفامی مورید ئەوەیە بێئەدەبی بکات و سزادانی دوابکەوێت، دواتر بڵێت: ئەگەر ئەمە بێئەدەبی بێت کۆمەکیم لێ دەبڕا و شایستەی دوورخستنەوە دەبووم، هەندێ جار کۆمەکی خودایی لێ دەبڕێت بەبێ ئەوەی پێی بزانێت، گەر تەنها بڕینی زیادکردنی کۆمەکی بێت، هەندێ جار لە شوێنی دوورخستنەوەدا وەستاوە و بەخۆی نازانێت، گەر تەنها وێڵکردنیشت بێت لەگەڵ ئەوەی تۆ بەدوایدا عەودالی))**

## شرۆڤە :

❁ کاتێك خودای موتەعال دەیەوێت بەندەیەك بخاتە سەر ڕێگەی هیدایەت و بەرەو خودا هەنگاوی پێهەڵبگرێت ئەوا بە یەکێك لەم دوو یاسایە مامەڵەی لەگەڵ دەکات:

أ. چاکە لەگەڵ کردن و ڕژاندنی نیعمەتەکانی خۆی بەسەریدا، تاکو خاوەن نیعمەتەکەی بیر بکەوێتەوە و بە خۆشەویستی ئەوەوە بەرەو خودا بکەوێتە گەڕ.

ب. گەر بە نیعمەتەکان بەرەو خودا هەنگاوی هەڵنەگرت ئەوا دەرگای بەلا و ناڕەحەتییەکانی لێ دەکاتەوە، تاکو ملکەچی خودا ببێت و بۆ لادانی ئەو بەلا و گرفتاریانە لە خودا بپاڕێتەوە و ڕووی تێبکات.

**❁ گەر بەندەی خودا شوکری نیعمەتەکانی کرد ئەوە دوو ئاما نجی گەورەی بەدەست هێناوە :**

١. حیکمەتی خودا لەودا هاتۆتە دی و بە ڕژانی نیعمەتەکانی خۆی بەسەریدا ڕووی لە خودا کردووە.

**٢**. بە شوکرکردن نیعمەتەکەی لە تیاچوون پاراستووە و دەرگای زۆربوونی نیعمەتی بەڕووی خۆیدا کردۆتەوە، هاتنی نیعمەتی زۆریش واتە زیاتر ناسینی خودا و شوکری زیاتری نیعمەتەکانی.

❁ شوکر نەکردن واتە نەناسینی خودا و سەرئەنجام کۆتاهاتنی نیعمەت و کرانەوەی دەرگای بەلا و میحنەت کە ئەمەش دیسان حیکمەتێکی خوداییە و دەیەوێت بە بەلا و ناخۆشییەکان بەندە سەرکەشەکەی ملکەچ بکات.

❁ ئەگەر ئەو بەندەیە بە یەکێك لەم دوو ڕێگەیە خودای نەناسی و ڕووی لە خودا نەکرد ئیتر ئەو بەندەیە ڕووبەڕووی هەڵنان (**إستدراج**) دەبێتەوە، هەڵنان زۆرکردن و زیادکردنی نیعمەتەکانی خودایە بۆ ئەو کەسە، لە کاتێکدا ئەو لە غەفڵەت و بێئەدەبیدا لەگەڵ خودا نغرۆ بووە، نەك هەر ئەمە بێئەدەبییەکانی بەرانبەر بە خودا بە بێئەدەبی نازانێت و دەڵێت: گەر ئەم کار و ئاکار و قسە و بیرکردنەوانەی من بێئەدەبی بوونایە ئەوا خودا کۆمەکی و یارمەتی خۆی لە من دەگرتەوە، بەردەوامبوونی کۆمەکی خودایی نیشانەی حەقڕەوی و چاك و پاکی منە، دواکەوتنی سزای خودایی

لەو بەندەیە نیشانەی بەردەوام بوونی ڕەحمەتی خودا نییە بۆ ئەو، ئەو كۆمەكی خوایی لێ دەگیرێتەوە بەبێ ئەوەی هەستی پێ بكات، یەكێك لە شێوازی گرتنەوەی نیعمەت زیادنەبوونی نیعمەتە، واتە نیعمەتەكە زیاد نەكات، هەر نیعمەتێك لە شوێنی خۆیدا وەستا و زیادی نەكرد هێواش هێواش دەگۆڕێت بۆ نەقمەت، وەك چۆن ئاوی وەستاو بۆگەن دەكات و دەبێتە سەرچاوەی دەرد و نەخۆشی، جاری وایە كەسەكە لە خودا دوورخراوەتەوە و بەخۆی نازانێت، وێڵكراوە و بێئاگایە لەوەی لەگەڵ خودا پەیوەندی پچڕاوە، ئەو عەودالی چی بێت خودا بەدوای ئەو شتەدا وێڵی دەكات، هەموو ئەمانەش سزای خوداین بۆ ئەو بەندەیە.

❁ ❁ ❁

# حیكمەتی شەست و حەوت

**((إِذَا رَأَيْتَ عَبْدًا أَقَامَهُ اللهُ تَعَالَى بِوُجُودِ الأَوْرَادِ، وَأَدَامَهُ عَلَيْهَا مَعَ طُولِ الإِمْدَادِ فَلاَتَسْتَحْقِرَنَّ مَا مَنَحَهُ مَوْلاَهُ لأَنَّكَ لَمْ تَرَ عَلَيْهِ سِيمَا الْعَارِفِينَ، وَلاَ بَهْجَةَ الْمُحِبِّينَ، فَلَوْلاَ وَارِدٌ مَا كَانَ وِرْدٌ))**

## راڤەی وشەكان:

**أقامه الله:** خودا راوەستاوی بكات

**بوجود الأوراد:** بە بوونی ئەوراد (ئەزكار و تەسبیحات)

**أدامه عليها:** بەردەوامی كرد لەسەری

**طول الإمداد:** بەدرێژایی(بە بەردەوامی) كۆمەك

**فلا تستحقرن:** بەكەم تەماشای مەكە

**ما منحه مولاه:** بەوەی خودا پێی بەخشیوە

**سيما العارفين:** سیمای خوداناسان

**بهجة المحبين:** روخساری پڕ لە شەوقی خوداخۆشویستان

**واتا ((گەر بەندەیەكت بینی خودا لەناو یاد و ملكەچی و بەندایەتیدا راوەستاوی كردبوو، لەسەر ئەو رێگەیە -بەهۆی كۆمەكی خوداییەوە- بەردەوامی كردبوو، ئەوا ئەوەی خودا پێی بەخشیوە بەكەم تەماشای مەكە گوایە سیمای خوداناسان و روخساری خواخۆشویستانی لێ بەدی ناكەیت، چونكە گەر عینایەت و چاودێری خودا بۆ ئەو بەندەیە بوونی نەبێت لەناو ملكەچی و بەندایەتیدا بەردەوام نەدەبوو))**

## شرۆڤە:

❁ قۆناغەکانی بەرەو خوداچوون ڕێبواران دەکات بە دوو دەستەوە: دەستەی زاهیدان و بەندە صالّحەکان کە لەسەرەتای بەرەو خوداچووندان و سەرقالّی یادکردنەوەی خودا و ملکەچی و گوێڕایەلّین و لەناو بەندایەتی خودادا سەرقالّن، دەستەی دووەم بریتین لە عاریفان و خواخۆشویستان کە لە سەروبەندی گەیشتن بە خودان، هەندێك جار ئەوانەی لە قۆناغی بالاّدان بە چاوی کەم سەرنجی کار و کردەوەی سەرەتاکان دەکەن، وتراوە "چاکەی چاکان خراپەی نزیکانە لە خوداوە(**حسنات الابرار سيئات المقربين**)"، لێرەدا ئیبن عەتا هۆشداری دەدا و دەفەرمویّ: ئەوانەی سەرقالّی یاد و بەندایەتی خودان لەژێر ڕەحمەت و چاودێری خودادان-با سیمای عاریفان و شەوقی موحیبانیشیان لەگەلّ نەبێت- چونکە گەر چاودێری و ریعاتی خودا بۆ ئەوان بوونی نەبوایە لەسەر ملکەچی و بەندایەتی بۆ خودا بەردەوام نەدەبوون، هەر بەوەندەی لەناو یاد و بەندایەتیدان ئەوان لەناو ڕەحم و چاودێری خودادان و نابێت کارەکانیان بە چاوی کەم تەماشا بکرێت.

❁ هەموو کەم تەماشاکردنێکی بەرانبەر خۆبەزلزانینێکی تێدایە و بەرزبوونەوەیەکی وەهمی لەلای مرۆڤ دەخولقێنێت، ئەمەش بۆخۆی ئافەتێکی گەورەیە بۆ دلّ و دەروون و دەبێتە سەرەتایەك بۆ دابەزین لە ئاستە بەرزەکانی باوەڕ.

❁ گومانی باش بردن بە دەوروبەر و پرسیار دروستکردن لەسەر نەفسی خۆ نیشانەی باوەڕێکی دامەزراوە، بۆیە هەمووان بە چاوی باش و چاك سەرنج بدە تا هەلّە و لاری و تێکەوتن دەبینی، گەر جێگەی پاساو هێنانەوە بوو ئەوا بیانوو پاساو بۆ کەسەکە بهێنەوە، ئەگەر نە، هەولّبدە بە کردار و گوفتاری جوان لە هەلّە و تێکەوتنەکان ڕاستی بکەرەوە، یان هیچ نەبێت دوعای خێری بۆ بکە تاکو خودا بیخاتە سەر ڕێگەی خواناسان و صالّحان.

❁ ❁ ❁

# حیکمەتی شەست و هەشت

((قَوْمٌ أَقَامَهُمُ الْحَقُّ لِخِدْمَتِهِ، وَقَوْمٌ اخْتَصَّهُمْ بِمَحَبَّتِهِ، {كُلاًّ نُمِدُّ هَؤُلاَءِ وَهَؤُلاَءِ مِنْ عَطَاءِ رَبِّكَ وَمَا كَانَ عَطَاءُ رَبِّكَ مَحْظُورًا} الإسراء: ٢٠))

**راڤەی وشەکان:**

**أقامهم الحق لخدمته:** خودا لەناو خزمەتدا راگیری کردوون

**أختصهم بمحبته:** بەخۆشەویستی خۆی تایبەتی کردوون

**واتا ((دەستەیەك خودا لـەناو ملکەچـی و بەندایەتیـدا راوەسـتاو و راگـیری کردوون، دەستەیەکی تـری بـە خۆشەویسـتی خـۆی تایبـەت کـردووە (بـە بەخششی پەروەردگار کۆمەکی هەموو لایەك ئەوانـە و ئەوانـەش دەکرێـت، بەخششی پەروەردگارت بەری لێ ناگیرێت)** الإسراء-٢٠))

**شرۆڤە:**

❁ لە حیکمەتی شەست و حەوتدا باسی لە دەستەی عابیدان و دەستەی خواناسان کرد، عابیدان سەرقاڵی بەندایەتین لە نوێژ و رۆژ و حەج و زەکات و تەواوی دروشمەکانی پەرسش، بەڵام هێشتا شۆڕنەبوونەتەوە بۆ ناو کاری دڵ (**عمل القلب**)، لە صدق و ئیخلاص و شوکر و **رضا** و مەحەبەت و هتد.. ئەمانە عابیدانن، دەستەی دووەم لەپاڵ بەئەنجام گەیاندنی دروشمەکانی پەرسشدا بە قووڵی بۆ ناو کارەکانی دڵ شۆڕبوونەتەوە، ئەمانەش خوداناسان یان عاریفانن، لەو حیکمەتە ئاماژە بۆکراوەدا(حیکمەتی ٦٧) ئیبن عەتا ئاماژەی بە ئافەتێك کرد کە روو لە خوداناسان دەکات، ئەوەش بەکەم تەماشاکردنی خوار خۆ لەسەر رێگەی بەرەو خوداچوون، لەم حیکمەتەشدا(حیکمەتی ٦٨) زیاتر رۆشنایی دەخاتە سەر ئەو بابەتە و دەفەرموێ: دەستەی عابیدان ئەوانەن کە خودا تایبەتی کردوون بە ملکەچی و عیبادەت، دەستەی خوداناسانیش ئەوانەن خودا

بەمەحەبەتی خۆی تایبەتی کردوون، هەردوولا -هەرکەس بە ئەندازەی خۆی- لە فەزڵ و بەخشینی خودا بەهرەمەند بوون.

۞ ئەگەر بڕیاربێت بەهەشت بۆ عابیدان بێت وەك قورئان دەفەرموێت:﴿لِمِثۡلِ هَٰذَا فَلۡيَعۡمَلِ ٱلۡعَٰمِلُونَ ۝٦١﴾ الصافات: ٦١، ئەوا پێگەی صدق بۆ خوداناسانە ﴿فِي مَقۡعَدِ صِدۡقٍ عِندَ مَلِيكٖ مُّقۡتَدِرِۭ ۝٥٥﴾ القمر: ٥٥،

۞ ئەم حیکمەتە ئاماژەیە بەو فەرموودە شیرینەی حەزرەت کە دەفەرموێ(**عن أبي هريرة رضي الله عنه، قال: قال رسول الله صلي الله عليه وسلم: {إن الله تعالى قال: من عادى لي وليّاً فقد آذنته بالحرب، وما تقرب إليّ عبدي بشيء أحب إليّ مما افترضته عليه، ولا يزال عبدي يتقرب إليّ بالنوافل حتى أحبه، فإذا أحببته كنت سمعه الذي يسمع به، وبصره الذي يبصر فيه، ويده التي يبطش بها، و رجله التي يمشي بها، ولئن سألني لأعـطينه، ولئن استعاذني لأعيذنه}** [١٦]، **ئەم فەرموودەیە باس لە چوار قۆناغ لە بەرەو خوداچوون دەکات، کە ئەمانەن:**

١.جێبەجێ کردنی ئەرکە ئیسلامی و ئیمانییەکان (**الفرائض**)

٢. جێبەجێ کردنی سونەن و نەوافلە ئیسلامییەکان (**النوافل**)

٣.گەیشتن بە ئەعمالی قەلب، لەوانە خۆشەویستی خودا (**المحبة**)

٤. تەسلیمبوون و ملکەچبوونی تەواو بە خودا و بۆ خودا (**التسليم**) بەجۆرێك پەردە لەسەر چاوی دڵ لابدرێ و بە ویست و مۆڵەتی خودا ئەندام و هەست و نەستەکانی مرۆڤ بکەونە ژێر دەسەلاتی ئەوەوە —**سبحانه**-

۞ ۞ ۞

١٦ رواه البخاري: ٦٥٠٢.

# حیكمەتی شەست و نۆ

((قَلَّمَا تَكُونُ الْوَارِدَاتُ الإِلَهِيَّةُ إِلاَّ بَغْتَةً، لِئَلاَّ يَدَّعِيَهَا الْعِبَادُ بِوُجُودِ الاسْتِعْدَادِ))

## راڤەی وشەكان:

**قلما:** كەم جار

**الواردات الإلهية:** هاتووە خواییەكان

**بغتة:** ناكاو-كوتوپڕ

**لئلا يدعيها العباد:** **العباد**-بضم العين- كە كۆی "عابد"ە، تاكو عابیدان بانگەشەی نەكەن

**بوجود الإستعداد:** بە بوونی ئامادەیی

**واتا ((داباریی رەحمەت و "فیض"ی خودایی"الواردات" لەناكاو و كوتوپڕە، بۆئەوەی عابیدان بانگەشەی نەكەن و نەیبەستنەوە بە بوونی ئامادەییەك كە لەواندا بوونی هەیە ))**

## شرۆڤە:

❁ لە كتێبی"**المصطلحات الصوفية**"ی عبدالرزاق كاشانیدا لەسەر زاراوەی "وارد" دەڵێت: ((وارد بریتییە لە هەر شتێك لە "مانا" كە روو لە دڵ دەكات بەبێ ئەوەی كاری مرۆڤی تێدا بێت)).

❁ لەم حیكمەتەدا ئیبن عەتا عابیدان -كە لە سەرەتای بەرەو خوداچووندان- ئاگادار دەكاتەوە و پێیان دەفەرموێ: هاتنی رەحمەت و ئەسراری خودایی لە ناكاو و چاوەڕوان نەكراوە، پەیوەندی بە ئامادەیی بەندەكانەوە نییە و تەنها لوتف و فەزڵی خودایە بۆ بەندە گوێڕایەڵەكانی، بۆیە پێویستە بوونی واریدات بەندەكان تووشی ئافەتی غرور نەكات و لایان وانەبێت كە بەهۆی ئامادەیی و كەماڵی ئەوانەوە بەسەریاندا باریوە.

# حیکمەتی حەفتا

((مَنْ رَأَيْتَهُ مُجِيبًا عَنْ كُلِّ مَا سُئِلَ، وَمُعَبِّرًا عَنْ كُلِّ مَا شَهِدَ، وَذَاكِرًا كُلَّ مَا عَلِمَ، فَاسْتَدِلَّ بِذَلِكَ عَلَى وُجُودِ جَهْلِهِ))

**مجيبا عن كل ما سئل:** وەڵامدەری هەموو ئەو پرسیارانە بێت لێی دەكرێت

**معبرا عن كل ما شهد:** دەربڕی هەموو ئەوانە بێت بە چاوی دڵ دەیبینێت

**ذاكرا كل ما علم:** باسكەری هەموو ئەوە بێت كە فێردەكرێت

**فاستدل بذالك:** ئەوە بكە بە بەڵگە

**علی وجود جهله:** لەسەر بوونی نەزانی ئەو

**واتا ((هەركەسێكت بینی وەڵامی هەموو ئەو پرسیارانە دەداتەوە كە لێی دەكرێت، هەموو ئەوەی بە چاوی دڵ دەیبینێت دەریدەبڕێت، باسی هەموو ئەو زانستە دەكات كە فێر دەكرێت، ئەوە بكە بە بەڵگە لەسەر بوونی نەزانی لە ئەودا))**

## شرۆڤە:

❁ لێرەشدا ئیبن عەتا ئاماژە بە ئافەتێكی تری ڕێگەی عابیدان و خواناسان دەكات ئەویش بریتییە لە باس كردنی ئەو نهێنیانەی لەسەر ڕێگەی بەرەو خوداچوون دەیانبینێ و دەیانبیستێ و دەیانژنەوێت، ئیبن عەتا ئاماژە بە سێ جۆر لە نەزانی دەكات:

**أ.** نەزانینێك كە مرۆڤ هەڵدەنێت بۆ وەڵامدانەوەی هەموو پرسیارێك، زانایان دەڵێن: هەر زانایەك "نازانم" لەسەر زمانی نەبێت كەسێكی نەزانە و متمانەت بە زانستەكەی نەبێت.

**ب.** نەزانینێك هەموو ئەوەی دەیبینێت لە مەشاهیدی جۆراوجۆر -لە خەوندا یان لە ئاگاییدا- لای خەڵکی دەریدەبڕێ و لای خۆی رایناگرێت.

**ج.** نەزانینێك کە پەردە لادەدات لەسەر  هەرچی زانستی فێرکراوە، ئەم سێ جۆرە نەزانینە لە هەر مرۆڤێکدا بوونی هەبوو خۆتی لێ بەدوور بگرە، چونکە جگە لە نەزانی شتێکی تر بە تۆ نابەخشێت.

۞ رێگەی خوداناسی پڕە لە ئەسرار، خودا بەندەکانی بە دانانی نهێنی لەلایان تاقیدەکاتەوە، گەر توانییان پارێزگاری لە ئەمانەتە خوداییەکە بکەن ئەوا بۆیان زیاد دەکات و بەردەوامی دەکات، لەگەڵ کەشف کردنی نهێنییەکاندا مۆری نەزانی لەو بەندەیە دەنرێت و کۆتایی بە هاتنی واریداتی پڕ لە ئەسرار دێت، بۆیە ئەم رێگەیە رێگەی کەسانێکە بێدەنگیان لە قسە لا خۆشترە، تەنهاییان لە تێکەڵی پێ باشترە، قسەیان بۆ خودایە و تێکەڵییان بۆ ئیصلاح کردنی بەندەکانی خودایە.

۞ بۆچی نابێت وەڵامی هەموو پرسیارێك بدەینەوە؟ وەڵام دانەوەی هەموو پرسیارێك زەریایەك لە زانستی پێویستە، ئەمەش بۆ بەندەکانی خودا محاڵە، بۆیە-بە زانستی دروست- وەڵامی هەموو پرسیارێکی پێ نادرێتەوە و سەرئەنجام نەزانی بەسەر دەوروبەردا پەخش دەکاتەوە، بۆچی پەردە لەسەر هەموو مەشهەدەکان هەڵنەدرێتەوە؟ چونکە کاتێك بە زمان تەعبیر لەو مەشهەدانە دەکرێت زۆرێك لە حەقیقەتی خۆیان لەدەست دەدەن و بەو شێوە دروستە مەعنەوییەی خۆیان ناگەن بە کەسی بەرانبەر، جگە لەوەی لەوانەیە کەسەکە هیچی لێ تێنەگات و رووبەڕووی فیتنە ببێتەوە، بۆچی هەموو زانستە نهێنییە فێرکراوەکان دەرنەبڕین و باسیان لە بارەوە نەکەین؟ لەوانەیە ئەو زانستە تایبەت بێت بە تۆ و خودا وەك ئەمانەتێك لەلای تۆ دایناببێت، باس لێوە کردنی تەنها فیتنە و ئاشووبی لێوە بەرهەم بێت.

۞ بۆچی خودای موتەعال ئەم ئەسرارانە لای بەندەکانی دادەنێت؟ بۆ کردنەوەی دەرگای یەقین بە روویاندا، هەروەها بۆ خۆپاراستن لە فیتنەی دونیا و پیلانەکانی شەیتان، هەندێ جاریش بۆ ئیصلاحی بەندەکانی خودا.

# حیکمەتی حەفتا و یەك

((مَا جَعَلَ الدَّارَ الآَخِرَةَ مَحَلاًّ لِجَزَاءِ عِبَادِهِ الْمُؤْمِنِينَ لأَنَّ هَذِهِ الدَّارَ لاَ تَسَعُ مَا يُرِيدُ أَنْ يُعْطِيَهُمْ، وَلأَنَّهُ أَجَلَّ أَقْدَارَهُمْ عَنْ أَنْ يُجَازِيَهُمْ فِي دَارٍ لاَ بَقَاءَ لَهَا))

**راڤەی وشەكان:**

**لا تسع ما يريد أن يعطيهم:** ناگرێتە خۆ هەموو ئەوەی دەیەوێت پێیان ببەخشێت

**أجل أقدارهم:** قەدری بەرز راگرتوون

**لا بقاء لها:** مانەوەی نییە

**واتا ((خودا ماڵی دوایی (واتە: بەهەشت) كردووە بە جێگەی پاداشتی بەندە باوەڕدارەكانی، چونكە ئەم خانەی دونیایە جێگەی ئەو پاداشتەی تیادا نابێتەوە كە دەیەوێت پێیان ببەخشێت، هەروەها بەرزتر و بەڕێزتر تەماشای بەندە باوەڕدارەكانی دەكات وەك لەوەی لە خانەیەكدا پاداشتیان بداتەوە كە مانەوەی بۆ نییە))**

**شرۆڤە:**

❁ گەر لەم خانەی دونیادا هەژاری بوو بەبەشت وامەزانە خودا ستەمی لێ كردووی، یاخود گوێ بە داوا و پاڕانەوەكانت نادات، یان خەزێنەی خودا بەشی تۆی تێدا نییە، هەموو ئەم جۆرە وەسوەسانە لە شەیتانەوەیە و دەبێت بەخێرایی بەرپەرچیان بدەیەوە.

❁ **خودا خانەی دونیای نەكردووە بە خانەی پاداشت لەبەر دوو هۆ:**

١. پاداشتەكانی خودا بۆ بەندە صاڵحەكانی زۆر گەورەیە و لە دونیادا جێگەیان نابێتەوە، ئەو پاداشتانە بەم دونیایە ناخۆن، دەبێ لە جیهانێكی تێر و تەواودا كە بەهەشتە پاداشتی بەندەكانی بداتەوە.

**٢**. ئەم خانەی دونیایە ماوەکەی کەم و کورتە، پەنجا ساڵ، سەد ساڵ، هەزار ساڵ تەمەن ماوەیەکی زۆر کەمە بۆ پاداشت وەرگرتن، ئەوان دەبێت بەهەتاهەتایی پاداشت وەرگرن﴿ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ وَنِعۡمَ أَجۡرُ ٱلۡعَٰمِلِينَ ﴿١٣٦﴾ ﴾ آل عمران: ١٣٦، بۆیە بۆ ڕێزگرتنی بەندە صاڵحەکانە لەم دونیا کەم و کورتەدا پاداشتیان ناداتەوە، گەر هەموو دونیاش بە یەك بەندەی باوەڕدار ببەخشێت هێشتا کەمە و هیچ نییە، چونکە کۆتایی پێ دێت، پاداشتێك پاداشتە بەهەمیشەیی بمێنێتەوە﴿ إِنَّ هَٰذَا لَرِزۡقُنَا مَا لَهُۥ مِن نَّفَادٍ ﴿٥٤﴾ ﴾ ص: ٥٤

۞ نیعمەتەکانی ئەم دونیایە پاش ماوەیەك مرۆڤ لێیان بێزار دەبێت و تام و چێژیان کۆتایی پێ دێت، بەڵام نیعمەتەکانی بەهەشت سات لە دوای سات خۆشتر و بەتامتر دەبن بۆیە ئەهلی بەهەشت جگە لە بەهەشت شتێکی تریان ناوێت﴿ خَٰلِدِينَ فِيهَا لَا يَبۡغُونَ عَنۡهَا حِوَلٗا ﴿١٠٨﴾ ﴾ الكهف: ١٠٨

۞ مردن لە دونیادا هەرچی خۆشیی دونیایە کەم ئەرزشی دەکات، هەر ساتێك لەناو خۆشییەکدا نوقم دەبیت تەنها یادێکی مردن بکەرەوە راستەوخۆ تام و چێژی خۆشییەکان نامێنن، بەڵکو خۆشییەکان تاڵ دەبن، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی داوە بە یادی مردن و بە روخێنەر و تیابەری خۆشییەکان باسی کردووە.(**أذكروا هادم اللذات: الموت**) [١٧]

۞ ۞ ۞

١٧ رواه الترمذي والنسائي و صحححه ابن حبان.

# حیكمەتی حەفتا و دوو

**((مَنْ وَجَدَ ثَمَرَةَ عَمَلِهِ عَاجِلاً فَهُوَ دَلِيلٌ عَلَى وُجُودِ الْقَبُولِ آجِلاً))**

## راڤەی وشەكان:

**ثمرة عمله:** بەری كردارەكانی

**عاجلا:** لەم دونیایەدا، یان لە سەرەتای هەنگاونانی بەرەو خودا، یان لە سەرەتای كارەكەیەوە

**آجلا:** دوارۆژ

**واتا ((هەركەس لەم دونیایەدا و لە سەرەتای كارەكەیەوە بەری كارەكەی خۆی بینییەوە، ئەوە بەڵگەیە كە لە پاشەرۆژدا كارەكەی لەلای خودا**

## شرۆڤە:

❁ كرداری چاكە لە یادی خودا و نوێژ و رۆژ و حەج و زەكات و بەخشین و كۆشان جگە لە پاداشتی دوارۆژ بەری شیرینی تایبەت بە خۆیان هەیە و مرۆڤی باوەڕدار لەم دونیایەدا دەیبینێتەوە و هەستی پێ دەكات.

❁ لە فەرموودەی پێغەمبەردا(ﷺ) بەری كرداری چاكە یاخود بەری درەختی باوەڕ بە شیرینی باوەڕ(**حلاوة الإيمان**) ناوبراوە، كە لە سێ رێگەوە بەدەست دێت، خودا و پێغەمبەری(ﷺ) لە هەرچی شتە خۆشتر بوێت، كەسێكی تەنها لەبەر خودا خۆشوێت، و پێیناخۆش بێت بەرێتەوە بۆ سەر بێباوەڕی وەك چۆن پێیناخۆشە هەڵبدرێتە ناو ئاگرەوە (**عن أنس بن مالك رضي الله عنه عن النبي صلى الله عليه وسلم قال ثلاث من كن فيه وجد حلاوة الإيمان أن يكون الله ورسوله أحب إليه مما سواهما وأن يحب المرء لا يحبه إلا لله وأن يكره أن يعود في الكفر كما يكره أن يقذف في النار**)[18]، هەروەها

---

١٨ **رواه البخاري.**

پێغەمبەر(ﷺ) دەربارەی نوێژ و خۆشەویستی و شیرینی نوێژ فەرموویەتی: بینایی چاوم لە نوێژدایە. (**عن أنس رضي الله عنه قال قال رسول الله صلى الله عليه وسلم حبب إلي النساء والطيب وجعلت قرة عيني في الصلاة**) [١٩]

۞ لادانی پەردە لەسەر هەندێك لە پەنهان و بینینی خەونی چاك و پاك و ڕوودانی هەندێك لە ئایات و کەرامات لەسەر دەستی چاکان لەبەری درەختی باوەڕ و کرداری چاکەن، پێویستە لەسەر مرۆی باوەڕدار کە موشاهەدەی ئەو کارە نهێنییانە دەکات شوکری خودایان لەسەر بکات و یەقین و باوەڕی بەخودا و دوارۆژ زیاد بکات، لەپاڵ ئەوەشدا بۆ گەیاندنی پەیامی خودا نابێت باسیان لەبارەوە بکات، گەرەکە وەك نهێنی لای خۆی پارێزگارییان لێ بکات، چونکە باس لێوەکردنیان فیتنەی تایبەت بەخۆی هەیە.

۞ وەك چۆن هەڵکردنی نەسیمی با مژدەی هاتنی باران دەدات هەر بەو جۆرە هاتنی بەری درەختی باوەڕ مژدەی ڕژانی لێزمەی ڕەحمەتی خودایە بۆ ئەو بەندە باوەڕدارە و لەدوارۆژیشدا قبوولکردن و پاداشتی نەبڕاوەی بەدوادا دێت.

۞ گەر تەمەنێکی دوورودرێژ ڕێگەیەکت گرتەبەرو بەبەری درەختی باوەڕ نەگەیشتی ئەوا پشکنین لە چەند جێگەیەك بکە:

**أ**- نیەت و مەرامت لە گرتنەبەری ئەو ڕێگەیە، لەوانەیە لە سەرەتاوە کە ئەو پرسیارە دەکەیت خۆت بەخۆت بڵێیت من تەنها مەبەستم ڕەزامەندی خودایە، بەڵام گەر زۆرتر لە خۆت وردببیەوە بۆت دەردەکەوێت شتی ترت تێکەڵ بە نیەت و مەرامت کردووە.

**ب**- پشکنین لەو ڕێگەیە بکە کە تۆ لەسەری هەنگاو هەڵدەگریت، لەوانەیە نیەت و مەرامت ڕازیکردنی خودا بێت، بەڵام ڕێگەکە ئەو ڕێگەیە نەبێت تۆ بەخودا بگەیەنێت.

**ت**- پشکنین بۆ ئەو مەنهەج و بەرنامە بکە کە ڕۆژانە بەسەر خۆتدا جێبەجێی دەکەیت، بزانە لە کوێدا هەڵە و تێکەوتنی تێدایە.

---

١٩ رواه النسائي.

**پ-** پشکنین بۆ گوناهێك بکە پێیەوە ئالوودە بووبیت، چونکە هەندێك گوناه مرۆڤ کۆت و زنجیر دەکەن و ناهێڵن لە خودا نزیك ببێتەوە.

گەر لەم چوار شوێنە دڵنیابوویت و بۆت دەرکەوت هیچ کام لەوانە نییە ئەوا دان بە خۆتدا بگرە و ئارام بە چونکە تۆ لەژێر تاقیکردنەوەی خودادای.

۞ ۞ ۞

# حیکمەتی حەفتا و سێ

((إِذَا أَرَدْتَ أَنْ تَعْرِفَ قَدْرَكَ عِنْدَهُ فَانْظُرْ فِي مَاذَا يُقِيمُكَ))

## راڤەی وشەکان:

**قدرك**: رێز و حورمەت و پلە و پایەت

**فانظر**: سەرنج بدە، تەماشا بکە

**فيما يقيمك**: لە چ کار و حاڵ و بارێکدا تۆی داناوە

**واتا ((گەر دەتەوێت رێـز و گـەورەیی و پلەوپایـەی خـۆت لـەلای خـودا بزانیت، ئەوا سەرنج بدە و بزانە خودا لـە چ کاروبارو حاڵێکدا تۆی داناوە))**

## شرۆڤە:

❁ هەر یەکێك لەلای خوا پلە و شوێن و جێگەی تایبەت بە خۆی هەیە﴿ هُمْ دَرَجَٰتٌ عِندَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ بَصِيرٌۢ بِمَا يَعۡمَلُونَ ﴿١٦٣﴾ ﴾ آل عمران: ١٦٣

❁ هەرکەس دەیەوێت بزانێت چ پلە و پایەیەکی لەلای خودا هەیە با سەرنجی دوو خاڵی زۆر گرنگ بدات:

١. سەرنجی گەورەیی و خۆشەویستی خودا بدات لە دڵی خۆیدا، گەر خودا لە ناختدا گەورە و گران بوو، خۆشەویستێك بوو کە ئامادەی لە پێناویدا گیان و ماڵ و ژیانت ببەخشیت ئەوا تۆ لەلای خودا بە قەدر و حورمەتی و دڵنیابە پلەیەکی مەزنت لەلای ئەو (ﷻ) بۆ دیاریکراوە.

٢. سەرنجی ئەو حاڵ و بار و کردارانە بدە کە تۆ لەناویدای، گەر بە دونیاوە خۆت سەرقاڵ کردبوو، بەجۆرێك خوات لەیاد چووبوو، یان گەر خەریکی کاری چاکەی بچووك بوویت و بەرەو کارە چاکە مەزنەکان هەنگاوت هەڵنەگرت، ئەوە پێویستت بە پێداچوونەوە هەیە، چونکە مردن لەسەر ئەو بارە گەورەترین زیانۆمەندییە.

❁ خودا له بەندەکانی رازی دەبێت و ئەو رازی بوونە بەندەکان بەرەو رەزامەندی خودا هەڵدەنێت و سەرئەنجام ملکەچی خودا دەبن و له هەموو بڕیار و قەدەرەکانی رازی دەبن﴿رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُ﴾التوبة: ١٠٠، سەرنج بدە سەرەتا دەفەرموێت: "خودا لەوان رازی دەبێت" ئەوجا"ئەوانیش له خودا رازی دەبن"، بۆیە هەمیشە سەرنجی دڵی خۆت بدە و بزانە چەندە له خودا رازیت، رەزامەندی تۆ له خودا نیشانەی رەزامەندی خودایە له تۆ، گەر خودا له تۆ رازی نەبوایە ئەوا ئەو مەقامە گەورەی باوەڕت -کە رازیبوونە له خودا- بەدەست نەدەهێنا.

❁ کاتێك خودا پشت له بەندەیەکی هەڵبکات دەیداتە دەست حەزەکانی خۆی و بە راکردن و هەڵپە بەدوای دونیاوە سەرقاڵی دەکات، ئەوەش نیشانەیەکی ترسناکە بۆ سەرئەنجامی ئەو بەندەیە، خودا هەموومان لەسەر باوەڕ و کرداری چاکە پارێزگاری لێبکات و نەمانداتە دەست دەروونی بەدکار و دونیای فریودەر و شەیتانی دوژمن.

❁ گەر کەسێکت بینی سەرقاڵی دونیابوو راستەوخۆ گومانی خراپت بەو کەسە لەلا دروست نەبێت، چونکە لەوانەیە ئەو کەسە لەگەڵ ئەو گشتە هەوڵ و کۆششە دونیای لەناو دڵ دانەنابێت، یاخود کارەکەی بۆ مەبەستی دونیا نەبێت، یان بەو کار و کەسابەتەی سەدان مرۆڤی هەژار و نەدار یارمەتی بدات، بۆیە نووری بەصیرەتت خامۆش مەکەو گومانی خراپ تەنها بە نەفسی خۆت ببە، نەك خەڵکانی دەوروبەرت.

❁ ❁ ❁

# حیکمەتی حەفتا و چوار

((مَتَى رَزَقَكَ الطَّاعَةَ وَالْغِنَى بِهِ عَنْهَا فَاعْلَمْ أَنَّهُ قَدْ أَسْبَغَ عَلَيْكَ نِعَمَهُ ظَاهِرَةً وَبَاطِنَةً))

## راڤەی وشەکان:

**رزقك الطاعة:** خودا گوێڕایەڵی کردە رۆزیت، گوێڕایەڵی پێ بەخشیت

**الغنی به عنها:** بە وابەستەبوون بە خوداوە دڵت وابەستەی ئەو کردارانە نەبوو

**أسبغ عليك:** بەسەرتدا رشتوویەتی، بەهرەمەندی کردووی، کردوویە بە پۆشاکت

**ظاهرة و باطنة:** نیعمەتی دەرەوە و ناوەوە

**واتا ((هەرکات خودا گوێڕایەڵی فەرمانەکانی پێبەخشیت، لەگەڵ ئەوەشدا کە کارە چاکەکانت ئەنجام دەدا دڵت بەو کارانەوە نەدەبەست و تەنها وابەستەی خودا بوو، ئەوە بزانە کە بەهرە و نیعمەتەکانی دەرەوە بە تۆ بەخشیوە و کردوویە بە کاڵای باڵات))**

## شرۆڤە:

❁ کەوتنە ناو بازنەی گوێڕایەڵی خوداوە یەکێکە لە نیعمەتە مەزنەکانی خودا لە دوای باوەڕ کەلەلایەن خوداوە بەمرۆی باوەڕدار دەبەخشرێت، بۆیە ئەوکەسەی کە بەئەنجامدانی دروشمەکانی پەرستن و یادی خودا و بەخشین و کۆشانەوە خەریکە پێویستە لەپاڵ ئەنجامدانی ئەو کارە مەزنانەدا کارێکی زۆر مەزنی تریش بەئەنجام بگەیەنێت، ئەوەش شوکری خودایە لەسەر گوێڕایەڵی، چونکە بەخشینی گوێڕایەڵی بە مرۆی باوەڕدار نیشانەی رەزامەندی خودایە لەو بەندەیە، بۆیە توانای ئەنجامدانی کاری چاکەی پێداوە.

❁ ئەنجامدانی کاری چاکە شوکری پێویستە نەك لەخۆدەرچوون، ئەوە خودایە ویستی کاری چاکەی بە تۆ بەخشیوە، ئەگینا نەتدەتوانی لە چاکە نزیك ببیتەوە، کەوابوو با دڵت تەنها وابەستەی خودا بێت نەك وابەستەی خودی کردارە چاکەکان.

۞ کرداری چاکە چەند جۆرێکە: جۆرێك لە ناخی مرۆڤدایە و مرۆی باوەڕدار خۆی پێ دەڕازێنێتەوە، لە خۆشەویستی و ڕازیبوون و شوکر و دڵسۆزی و هتد.. جۆرێکی تر بریتییە لە ئەنجامدانی دروشمەکانی پەرستن لە نوێژ و ڕۆژ و حەج و زەکات و یادی خودا، جۆری سێیەم بریتییە لەو ئاکارورەفتارانەی کە مرۆڤ لەگەڵ مرۆڤ و گیانداران و زیندەوەران و ژیان و گەردووندا ئەنجامی دەدات کە دەچنە خانەی ئەدەب و ئەخلاقەوە.

۞ هەر بەندەیەك بارانی لێزمەی ئەم سێ بەهرەیەی خودای بەسەردا داباری، ئەوا کاڵای باڵای هەرچی نیعمەتەکانە بە بەری بڕاوە و دەبێت شوکری ئەو نیعمەتە مەزنە بکات و دواتر شوکری ئەو نیعمەتی شوکرەیش بکات کە کرداری چاکەی دڵی مرۆڤە و بەخششی خودایە بە ئەو.

۞ ۞ ۞

# حیکمەتی حەفتا و پێنج

((خَيْرُ مَا تَطْلُبُهُ مِنْهُ مَا هُوَ طَالِبُهُ مِنْكَ))

## راڤەی وشەکان:

**تطلبه منه:** لێی داوا دەکەیت

**طالبه منك:** لێت داوا دەکات

**((باشترین شتێك لـە خودا داوا بکەیت ئەو شتەیە کە ئەو(ﷻ) داوای لـە تۆ کردووە))**

## شرۆڤە:

مرۆی باوەڕدار پێویستە هەمیشە لە داوا و نزادا بێت، داوا و نزا بە مەبەستی دەربڕینی ملکەچی و بەندایەتی، زۆرجار داواکار نازانێت باشترین داوا کامەیە و چی لە خودای خۆی داوا بکات، بۆیە لەم حیکمەتەدا ئیبن عەتا باشترین داوامان بۆ دیاری دەکات و دەفەرموێ: باشترین داوا لە خودا ئەو داوایە کە ئەو لە بەندەکەی داوا کردووە، خودا داوای باوەڕ و گوێڕایەڵی و کرداری چاکە و بەردەوام بوون لەسەر ئەوانە لە بەندەکەی دەکات، بۆیە بەندەی خودا دەبێت لە خودای خۆی بپاڕێتەوە تاکو باوەڕی پێتەو و کرداری چاکە و گوێڕایەڵی و راوەستاوی پێ ببەخشێت، ئەوەی خودا بۆ بەندەکەی دیاری کردووە و داوای لێکردووە باشترین و مەزنترین کارێکە، چونکە ئەو دەزانێت خێری دونیا و دینی بەندەکانی لە چیدایە، لێرەوە بەندەی هۆشمەند تێدەگات ئەو شتانەی خودا دیاری کردوون باشترین و بەنرخترین شتێکن بە بەندەکانی ببەخشێت، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) داوای لە خودای موتەعال دەکرد و دەیفەرموو "خودایە، لەسەر یادی خۆت و شوکری تۆ و بەندایەتی تۆ یارمەتیمان بدە" (**اللهم اعنا على ذكرك و شكرك وحسن عبادتك**). جونەیدی بەغدادی دەیفەرموو (**اللهم اجعل غاية قصدي إليك ما هو لك ولا تجعل قصدي إليك ما أطلبه منك**)، خودایە، لوتکەی هەوڵ و مەرامم بۆ لای تۆ ئەوە بێت تۆ دەتەوێ و داوات کردووە، خودایە مەرام و هەوڵم ئەوە نەبێت کە خۆم دەمەوێت.

# حیكمەتی حەفتا و شەش

((الْحُزْنُ عَلَى فُقْدَانِ الطَّاعَةِ- مَعَ عَدَمِ النُّهُوضِ إِلَيْهَا- مِنْ عَلاَمَاتِ الاغْتِرَارِ))

**راڤەی وشەكان:**

**فقدان الطاعة:** لەدەستچوونی گوێڕایەڵی

**عدم النهوض إليها:** هەڵنەستان بۆ كاری گوێڕایەڵی

**علامات الإغترار:** نیشانەی سەرلێشێوان و خۆفریودانە

**واتا ((دڵتەنگی بۆ لەدەستچوونی گوێڕایەڵی و كاری چاكە -لەگەڵ هەڵنەستان بۆ ئەنجامدانی ئەو كارە چاكانە لە داهاتوودا- لە نیشانەكانی سەرلێتێكچوون و خۆفریودانە))**

**شرۆڤە:**

❁ لەدەست چوونی كرداری چاكە لە كات و شوێنی خۆیدا دڵتەنگی و ئازار لە دڵی كەسی باوەڕداردا دروست دەكات، بەشێكی بۆ لەدەستچوونی ئەو پاداشتە گەورەیە و بەشێكی بۆ لەدەستچوونی كۆمەك و یارمەتیی خودایی، عاریفانیش خەمی گەورەیان ئەوەیە شایستەنەبوون بە كاری چاكە بۆیە خودا لە ئەنجامدانیدا كۆمەكی نەكردوون، ئەو كە دەبینێت كاری چاكەی لە شوێن و كاتی خۆی لەدەست چووە پرسیار لە خۆی دەكات: بۆ خودا كۆمەكی و یارمەتی نەكردم ئەو كارە چاكە ئەنجام بدەم؟ دیارە شایستەی ئەو پاداشتە مەزنە نەبووم، ئەمەش بەهۆی گوناه و ناتەواوییەكەوەیە لە خودی مندایە.

❁ دڵتەنگی و ئازاری شایستەنەبوون بۆ ئەنجامدانی كاری مەزن لە دڵتەنگی و ئازاری لەدەستچوونی پاداشتی خودی كارە چاكەكە گەورەترە، باوەڕداری ژیر بۆ نموونە، كە نوێژێكی بەیانی دەچێت، بیر لەوە دەكاتەوە ئەو بەیانییە خودا حەزی بە لیقای ئەو

نەبووە ئەگینا بەئاگای دەهێنا﴿ كَرِهَ ٱللَّهُ ٱنۢبِعَاثَهُمۡ فَثَبَّطَهُمۡ وَقِيلَ ٱقۡعُدُواْ مَعَ ٱلۡقَٰعِدِينَ ﴿٤٦﴾ ﴾ التوبة: ٤٦، سەرنجی ئایەتە پیرۆزەکە بدە، دەربارەی دووڕووان دەفەرمویٚ: خودا هاتنی ئەوانەی بۆ جیهاد و تێکۆشان لە پێناوی خۆیدا پێناخۆش بوو، بۆیە ویست و توانای هەستان بەو کارەی لێوەرگرتنەوە، لە ئایەتێکی پیرۆزی تردا دەفەرموێت:: گەر بمانویستبایە بەو ئایەتانە پلە و پایەمان بەرز دەکردەوە، بەلاّم ئەو بە زەوییەوە لکا و شوێنی ئارەزووەکانی خۆی کەوت﴿ وَلَوۡ شِئۡنَا لَرَفَعۡنَٰهُ بِهَا وَلَٰكِنَّهُۥٓ أَخۡلَدَ إِلَى ٱلۡأَرۡضِ وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُۚ ﴿١٧٦﴾ ﴾ الأعراف: ١٧٦

۞ ئەو پرسیارە مەکە: گوناهی ئەوانە چی بوو کە خودا نەیویستووە ڕێگەی باوەڕ و کاری چاکە بگرنەبەر؟! کە ئەم پرسیارەت کرد، نووری بەصیرەتت کپ دەبێتەوەو بەرەو بە حاکم کردنی زەین و بیرت هەنگاو هەڵدەگری و ئەو کات ئەم باسەی ئێمەش بە تۆ ناخوات..

۞ ۞ ۞

# حیکمەتی حەفتا و حەوت

((مَا الْعَارِفُ مَنْ إِذَا أَشَارَ وَجَدَ الْحَقَّ أَقْرَبَ إِلَيْهِ مِنْ إِشَارَتِهِ، بِلِ الْعَارِفُ مَنْ لاَ إِشَارَةَ لَهُ لِفَنَائِهِ فِي وُجُودِهِ، وَانْطِوَائِهِ فِي شُهُودِهِ))

**راڤەی وشەکان:**

**العارف:** خوداناس

**أشار:** ئاماژەی کرد

**لفنائه في وجوده:** فەنابوون لە بوونی ئەودا

**إنطوائه:** ڕۆچوون

**واتا ((خوداناس ئەو کەسە نییە کە ئاماژە دەکات خودا لە ئاماژەکەی نزیکتر ببینێت، بەڵکو خوداناس ئەو کەسەیە کە ئاماژەی نەماوە بە هۆی فەنابوون لە بوونی ئەودا و ڕۆچوون و پڕبوون بە ئامادەبوونی ئەو (ﷻ) ))**

**شرۆڤە:**

۞ ترسناکترین بابەت لە بابەتەکانی عیرفان ئەم حیکمەتی حەفتا و حەوتەیە کە ئیبن عەتا بە کورترین وشە دەریبڕیوە، لەراستیدا لە شرۆڤە کردنی ئەم حیکمەتەدا هەست بە ترس و شڵەژانێك دەکەم، بەڵام دڵم بە بەزەیی و کۆمەکی خودا خۆشە و بەو هیوایەوە دەست دەدەمە نووسینی شرۆڤە کردنەکە.

۞ لەم حیکمەتەدا باس لە دوو مەقامی مەزنی باوەڕ دەکات، ئەوانەش: "فەنا و شهود"ن، **فەنا** بریتی نییە لە توانەوە و تیاچوونی جەستە و ڕۆحی مرۆڤ، مرۆڤ هەر مرۆڤە و خوداش هەر خودایە، نە مرۆڤ دەبێت بە خودا و نە خوداش پۆشاکی مرۆیی لەبەر دەکات، ئەی دەبێ فەنا چی بێت؟ **فەنا لە چەند ڕەهەندێکی مرۆڤدا ڕوودەدات:**

**١. فەنا لە بیر و زەینی مرۆڤدا** بریتییە لە خامۆشبوونی بیر و زەین و وردە وردە نزیکبوونەوە لەو جیهانە رەهای کە رۆح تیایدا تەنها بوونێکە.

**٢. فەنا لە ئەخلاقدا** بریتییە لە ریشەکەند کردن و سڕینەوەی سیفەتە دزێو و ناباشەکان لە دەرەوە و ناوەوەی مرۆڤدا، لە ناوەوە: رق و لوتبەرزی و حەسوودی و خۆشەویستی دونیا و پلە و پایە و دەسەلآت و هتد...، تەواوی ئەو رەفتارو کردارانەی شەرع بە نادروست و ناپەسەندی داناون﴿وَذَرُواْ ظَٰهِرَ ٱلۡإِثۡمِ وَبَاطِنَهُۥٓ ﴾الأنعام: ١٢٠

**٣. فەنا لە ویست و هەوڵدا** بەجۆرێك هەموو ویستێکی مرۆڤ بۆ خودا بێت لە سەیرکردن و بیستن و بینین و رۆیشتن و تەوای ویستەکانی تری، کەسی فانی لە ویستی خۆی بەر ئەو فەرموودە قودسییە دەکەوێت کە دەفەرموێت: (دەبم بەو چاوەی پێی دەبینێت، دەبم بەو گوێیەی پێی دەبیستێت، دەبم بەو دەستەی دەیوەشێنێت، ئەو شەقاوەی دەیهاوێت)، ئەو ویستێکی نییە جگە لەویستی خودا، بۆیە هەموو کات لە گوێڕایەڵی و بەندایەتیدایە، کاتێك مرۆی باوەڕدار لەم سێ زەمینەدا فەنا دەکات و بە سیفاتی رەببانی لە عیلم و حیلم و رەحمەت و عەدل و هتد.. خۆی دەڕازێنێتەوە ئەوا لە خودا نزیك دەبێتەوەو نزیکبوونەوەش چەندین ئاست و پلەی هەیە، پلە بالآکانی نزیکبوونەوە لەخودا دەبێت **بەشهود**، نزیکبوونەوەی پێغەمبەر(ﷺ) لە خودای موتەعال لە شەوی میعراجدا کە قورئان ئەو نزیکبوونەوە بە﴿فَكَانَ قَابَ قَوۡسَيۡنِ أَوۡ أَدۡنَىٰ ٩﴾ النجم: ٩، وەسف دەکات، هەموو باوەڕدارێك میعراجی تایبەت بە خۆی هەیە و لەم نهێنییە تێبگە و مەڵێ ئەو پێغەمبەر(ﷺ) بووە و ئایەتەکە باسی رووداوێکی تایبەت دەکات، کاتێك خودا لە دڵی مرۆی باوەڕداردا ئامادە دەبێت و ناخی داگیر دەکات لە سیفەتە مرۆییە نزمەکان دوور دەکەوێتەوە و بەو ئامادەبوونە پڕ دەبێت.

۞ لەم حیکمەتەدا ئیبن عەتا لە پاڵ ئاماژە بەو دوو مەقامە بەرزەی باوەڕ پێناسەی "خوداناس"مان بۆ دەکات، **لێرەدا چەند ئاستێك لەو خوداناسییە ئاماژە پێدەدەین:**

**ئاستی یەکەم** بریتییە لە ئیمانێکی زەینی و ئەقڵی بە خودای موتەعال.

**ئاستی دووەم** بریتییە لەو باوەڕەی کە گەردوون و ژیان دەکاتە بەڵگە بۆ سەر بوونی

خودا و وادەبینێت لە پشتی هەموو دیاردەکانی گەردوون و ژیانەوە خودا و هێز و حیکمەت و زانستی خودا بوونی هەیە.

**ئاستی سێیەم** بریتییە لە ئاماژە بە بوونی خودا لە پاڵ بوونی شتەکاندا.

**ئاستی چوارەم** ئاماژەیە بە بوونی خودا بە تەنها بەبێ سەرنجدان و هەستکردن بە بوونی شتەکانی تر.

**ئاستی پێنجەم** ئەوەیە کە بەر لە ئاماژەکە هەست بکات خودا نزیك و ئامادەیە، واتە بوونی ئەو دەکەوێتە پێش ئاماژەکردنەکەوە.

**ئاستی شەشەم** کە ئیبن عەتا دەیکاتە پێناسەی عاریف ئەو دۆخەیە تیایدا عاریف ئاماژەی نامێنێت، چونکە تا ئاماژە بوونی هەبێت تۆ بوونت هەیە، تا تۆ بوونت هەبێت فەنات لە بوونی خۆت نەکردووە، تا فەنا نەکەیت لە خودا نزیك نابیتەوە، تا نزیك نەبیتەوە پێ نانێیتە مەقامی شهود، تا نەگەی بە مەقامی شهود لەلای ئیبن عەتا بە عاریف سەرژمێر ناکرێیت.

۞ ۞ ۞

# حیکمەتی حەفتا و هەشت

((الرَّجَاءُ مَا قَارَنَهُ عَمَلٌ، وَإِلاَّ فَهُوَ أُمْنِيَةٌ))

**راڤەی وشەکان:**

**الرجاء:** هیوا

**قارنه عمل:** کرداری لەگەڵ بێت

**أمنیة:** خۆزگە

**واتا ((ئاوات و هیوا بە بەزەیی و لێبووردنی خودا کاتێك ئاوات و هیوایە کرداری لەگەڵ بێت، ئەگەر نە، تەنها خۆزگەیەکە و هیچی تر))**

**شرۆڤە:**

❁ لەم حیکمەتەدا ئیبن عەتا مانای رجامان بۆ دەکات، بوونی ڕجا بە لێبووردنی خودا و لێخۆشبوونی هەموو گوناهان مەقامێکە لە مەقامەکانی باوەڕ، ئەم پلەیە لە باوەڕ لە ناسینی خوداوە سەر هەڵدەدات، ناسینێکی قووڵی ریشەدار، گەر ترس سیمای عابیدین بێت، ئەوا رجا سیمای زانایان و عاریفانە، چونکە زیاتر لەوانی تر خودا دەناسن.

❁ ڕجا بە رەحمەتی خودا ویستی باوەڕدار بۆ ئەنجامدانی کرداری چاکە دەخاتە گەڕ، بۆیە نیشانەی بوونی ڕجای دروست کار و کردەوەی دروستە، نەك وازهێنان لە کاری چاکە، ئەوانەی پێیان وایە خودا خاوەن بەزەییە و لە هەموو گوناهان دەبوورێ و پێویست بەئەنجامدانی کرداری چاکە ناکات ئەوانە خودایان نەناسیوە، گەر بیاناسیبایە بەخۆشەویستییەوە بۆی ملکەچ دەبوون و کارە چاکەکانیان دەکردە وەسیلە بۆ لێخۆشبوونی گوناهان و بەدەستهێنانی رەزامەندی ئەو (سبحانه وتعالى).

# حیكمەتی حەفتا و نۆ

((مَطْلَبُ الْعَارِفِينَ مِنَ اللهِ تَعَالَى الصِّدْقُ فِي الْعُبُودِيَّةِ وَالْقِيَامُ بِحُقُوقِ الرُّبُوبِيَّةِ))

**راڤەی وشەكان:**

**مطلب العارفين:** داوای خوداناسان

**الصدق في العبودية:** راستیی لە بەندایەتییدا

**القيام:** هەستان

**حقوق الربوبية:** مافی پەروەردگار

**واتا ((داوا و هەوڵی خوداناسان لە خودا بریتییە لە گەیشتن بە راستیی لە بەندایەتیدا و هەستان بە مافی پەروەردگار))**

**شرۆڤە:**

❁ ئەم حیكمەتە تەواوكەری حیكمەتی پێشووە، كەسی خوداناس لە بەندایەتییەكەیدا بۆ خودا دوو مەرامی زۆر مەزنی هەیە: **یەكەم** صدق لە ملكەچی و بەندایەتیدا، **دووەم** جێبەجێ كردنی حەقی پەروەردگار لەسەر خۆی.

❁ مەزنترین مەقامێك مرۆی باوەڕدار بیگاتێ بریتییە لە مەقامی بەندایەتی، لە قورئاندا وەسفی مەزنترین پێغەمبەر كە حەزرەتی **محمد**(ﷺ) بە "بەندە" كراوە ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ عَلَىٰ عَبۡدِهِ ٱلۡكِتَٰبَ وَلَمۡ يَجۡعَل لَّهُۥ عِوَجَا ۜ ۝١﴾ الكهف: ١، ﴿تَبَارَكَ ٱلَّذِي نَزَّلَ ٱلۡفُرۡقَانَ عَلَىٰ عَبۡدِهِۦ لِيَكُونَ لِلۡعَٰلَمِينَ نَذِيرًا ۝١﴾ الفرقان: ١، ﴿أَلَيۡسَ ٱللَّهُ بِكَافٍ عَبۡدَهُۥۖ وَيُخَوِّفُونَكَ بِٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦۚ وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنۡ هَادٖ ۝٣٦﴾ الزمر: ٣٦، ﴿فَأَوۡحَىٰٓ إِلَىٰ عَبۡدِهِۦ مَآ أَوۡحَىٰ ۝١٠﴾ النجم: ١٠، ﴿هُوَ ٱلَّذِي يُنَزِّلُ عَلَىٰ عَبۡدِهِۦٓ ءَايَٰتِۭ بَيِّنَٰتٖ لِّيُخۡرِجَكُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ بِكُمۡ لَرَءُوفٞ رَّحِيمٞ ۝٩﴾ الحديد: ٩، ﴿وَأَنَّهُۥ لَمَّا قَامَ عَبۡدُ ٱللَّهِ يَدۡعُوهُ كَادُواْ يَكُونُونَ عَلَيۡهِ لِبَدٗا ۝١٩﴾ الجن: ١٩، ﴿عَبۡدًا إِذَا صَلَّىٰٓ ۝١٠﴾ العلق: ١٠

❁ صدق له بەندایەتیدا خۆ یەکلاکردنەوەیە بۆ ملکەچی و بەندایەتی خودا، بە جۆرێك بەشی هیچ کەسێکی تر لەو بەندایەتییەدا بوونی نەبێت، واتە نێت و ئیخلاصی کەسی باوەڕدار تەنها بۆ خودا بێت و کەسی تر و شتی تر لەبەرچاو نەگرێت، تەنانەت لە بەندایەتی و ملکەچی بۆ خودا تەنها مەبەستی ڕەزامەندی خودایە و هیچ حەز و قازانجێکی خۆی لە بەهەشت و حۆری و ناز و نیعمەتەکانی بەهەشت لەبەرچاو ناگرێت، ئەو تەنها خودای دەوێت.

❁ جێبەجێ کردنی مافی پەروەردگار لەسەر خۆی مەرامی دووەمی عاریفانە، وشەیەکی تر نییە بۆ دەربڕینی ئەو ڕاستییە بەکار بێت، ئەگینا هیچ کەس ناتوانێت مافی پەروەردگار لەسەر خۆی بەجێبگەیەنێت، ئەو پەروەردگارە مەزنە بوونی پێبەخشین، بە مرۆڤ —کە مەزنترین دروستکراوی خودایە- دروستی کردین، نیعمەتە هەژمارنەکراوەکانی خۆی بەسەردا ڕژاندین، بە مەبەستی هیدایەتمان پێغەمبەران و کتێبەکانی بۆ ڕەوانە کردین، بەهەشتی هەتاهەتایی بۆ باوەڕداران ئامادە کردووە، بە گەورەیی و بەخشندەیی خۆی ژیانی نەمری(خلود) بۆ مرۆڤ ڕەخساندووە، ئێمە چۆن بتوانین مافی خودا لەسەر خۆمان بەجێبگەیەنین؟ بەڵام ئەو خودایە بەبەزەیی و بەخشندەیی خۆی کەمێکی زۆر کەم ئەرك و فەرمانی بە ئێمە ڕاسپاردووە تاکو ئەنجامیان بگەیەنین، بازنەیەکی زۆر بچووکی لە حەرام و قەدەغەکراو بۆ دیاری کردووین تاکو خۆمانی لێ بپارێزین، ئەو خودایە نە پێویستی بە بەندایەتی ئێمەیە، نە یاخیبوون و سەرپێچییەکانی ئێمە زیان بە خودا دەگەیەنێت.

❁ ❁ ❁

# حیکمەتی هەشتا

((بَسَطَكَ كَيْ لاَ يُبْقِيكَ مَعَ الْقَبْضِ، وَقَبَضَكَ كَيْ لاَ يَتْرُكَكَ مَعَ الْبَسْطِ، وَأَخْرَجَكَ عَنْهُمَا كَيْ لاَ تَكُونَ لِشَيْءٍ دُونَهُ))

**راڤەی وشەکان:**

**بسطك:** دەتکاتەوە

**يبقيك:** بتهێڵێتەوە

**القبض:** گرژبوون

**قبضك:** گرژت دەکات

**البسط:** کرانەوە

**واتا ((خودا رووبەڕووی کرانەوەت دەکاتەوە تاکو لەناو گرژبووندا نەتهێڵێتەوە، رووبەڕووی گرژبوونت دەکاتەوە تاکو لەگەڵ کرانەوەدا بەجێتنەهێڵێت، لە هەردووکیان(کرانەوە و گرژبوون) دەتهێنێتە دەرەوە بۆئەوەی نەبیت بە بەشی هیچ شتێك لە خوار خوداوە))**

**شرۆڤە:**

۞ لەم حیکمەتەدا ئیبن عەتا باسی دوو دۆخمان بۆ دەکات کە رێبواری رێگەی خودا تێیدەکەوێت، ئەو دوانەش بریتین لە "کرانەوە(**البسط**) و گرژبوون(**القبض**)".

۞ **کرانەوە:** حاڵەتێکی خۆشی و سروورە کە هەموو بوونی مرۆی باوەڕدار داگیر دەکات، زۆرجار سەرچاوەی ئەم خۆشی و سروورە نادیارە و هەندێ جاریش دڵخۆشبوون بە بەزەیی و لێبوردەیی و میهرەبانی خودا و شەوقی گەیشتن بە بەهەشت و ناز و نیعمەتەکان هۆکارەکەیەتی.

۞ **گرژبوونیش:** دۆخێکی توندبوون و گرژبوونی ناخی مرۆی باوەڕداره کە هەموو گەردوونی لێ بەرتەسك دەبێتەوه و تەنانەت لەگەڵ خودی خۆی نامۆ دەبێت، ئەم حاڵەتەش -هەر وەك کرانەوه- زۆر جار سەرچاوەکەی نادیاره و هەندێ جاریش ترسان لە خودا و ئەدانەکردنی مافی بەندایەتی و بیرکردنەوه لە سزای دوارۆژ ئەم دۆخە دەخولقێنێت.

۞ خودای موتەعال خاوەنی دوو ناوی جوانە، ئەوانەش **"الباسط و القابض"**ن، ئەم دوو ناوه لە ئاسۆی گەردوون و ژیاندا پەخش بوونەتەوه، تەواوی گەردوون و دروستکراوەنی بەم دوو ناوه کاریگەرن، زانایانی فیزیای چەندێتی دەڵێن "بنچینەی گەردوون بریتییە لە وزه، ئەم تۆپەڵە وزه گەردوونییە لە شێوەی ترپەدایه، واته دەگوژێتەوەو دادەگیرسێتەوه، بە مانایەکی تر گرژدەبێت و دواتر دەکرێتەوه" مرۆڤیش وەك بەشێکی گرنگی گەردوون هەمان سونەتی گرژبوون و کرانەوەی بەسەردا جێبەجێ دەبێت، بەلاّم قسەی ئێمە لە ئاقارەکانی ئەو گرژبوون و کرانەوەیە، نەك بنچینە و هۆی ئەو دوو دۆخە.

۞ گەر مرۆی باوەڕدار بە هەمیشەیی لە کرانەوەدا بمێنێتەوه بەرەو بێئاگایی و خەمساردی بەرانبەر بە ئەرك و ئادابە ئاینییەکان هەنگاو هەڵدەگرێت، هەر بەو جۆره مانەوەی بەردەوامی لە گرژبووندا رووبەڕووی پەستی و شەکەتی دەکاتەوه و لەوانەیە پاش ماوەیەك توانای لەبەر ببڕێت و کۆتایی بە کاروانی بەرەو خوداچوونی بهێنێت.

۞ ئیبن عەتا ئاماژه بەوه دەدات کە مانەوەی ناو ئەو دوو دۆخە (کرانەوه و گرژبوون) بەشێك نییە لە کەماڵ، بەڵکو کەماڵ ئەوەیە لەو دوو دۆخە بێیە دەرەوه، ئەو دەفەرموێت:: خودا نایەوێت لەو دوو بارەدا بەندەکەی خۆی بهێڵێتەوه بۆ ئەوەی بەندەکەی تەنها بۆ خودا بێت، نەك بۆ کرانەوه و گرژبوون، تەنها بۆ خودا بێت، واته هەموو ئەو ئاقارانەی بەهۆی کرانەوه و گرژبوونەوه سەرهەڵدەدەن لە خۆشی و ناخۆشی، سروور و بێزاری نابێت هۆیەکەی ئەو دوو دۆخە بێت، بەڵکو دەبێت نواندنی هەموو ئەو خۆشی و ناخۆشییانە تەنها بۆ خودا بێت، خۆشییەکانی بۆ خودا بێت و ناخۆشییەکانی بۆ خودا بێت، نەك سروشت و میزاجێك کە بەهۆی کرانەوەو گرژبوونەوه

سەرهەڵدەدەن، بەم جۆرە بەندەی خودا بەشی خۆی لە خۆیدا نامێنێت، ئەو کە پێدەکەنێت بۆ چێژی دەروونی خۆی نییە، بەڵکو بۆ خودای موتەعالە، کە بێزار دەبێت سروشت و میزاجی ناخی نییە، بەڵکو بێزارییەکەی بۆ خودایە، لێرەوە ئەو بەندەیە دەستەبەری مەقامی **"إياك نعبد و إياك نستعين"** دەکات، خودا دەیەوێت تەنها بەشی ئەو بیت، نە بەشی خۆت و نە بەشی جگە لە خۆت.

۞ دەوترێت: مرۆڤ پێویستی بە خواردن و خواردنەوە و هامسەرینی و پێکەنین و گریان و هتد.. هەیە، هەموو ئەوانەش چێژی تایبەت بە خۆیان هەیە، ئیتر چۆن دەتوانین بڵێین ئەوانە بۆ خودان؟!

ئەم پرسیارە بۆ ئەوانە دروست دەبێت کە پێیان نەناوەتە ناو مەقامی ئیخلاص لە بەندایەتیدا، یاخود نەچوونەتە ناو دۆخی "گرژبوون و کرانەوە"، بەڵام باشە بزانین ئەوانەی ناخ و دەرەوەیان رادەستی خودا دەکەن و لە خودپەرستی و خەڵکپەرستی و شتپەرستی هاتوونەتە دەرەوە ئەنجامدانی هەموو کاروبارانە بۆ خودا لەلایان کارێکی ئاسانە، پێکەنینێك کە بۆ خودا بێت زۆر بەتامترو ناسکترو خەمڕەوێنترە لە پێکەنینێك کە بۆ چێژی دەروون بێت، یان بۆ رازیکردنی کەسێك بێت، پارووبەك کە بۆ خودا بخورێت تامەکەی تامی خواردنەکانی بەهەشتە و لە جەستەی مرۆڤدا دەبێت بە تەندروستی و وزەی پڕ لە خێر و فەڕ.

۞ ۞ ۞

# حیکمەتی هەشتا و یەك

((الْعَارِفُونَ إِذَا بُسِطُوا أَخْوَفُ مِنْهُمْ إِذَا قُبِضُوا، وَلاَ يَقِفُ عَلَى حُدُودِ الأَدَبِ فِي الْبَسْطِ إِلاَّ قَلِيلٌ))

**راڤەی وشەكان:**

**بسطوا:** كرانەوە

**قبضوا:** گرژبوون

**واتا ((خوداناسان كاتێك دەكرێنەوە زیاتر لە مەترسیدان وەك لەوەی گرژبن، زۆر كەم لەوانەی دەكرێنەوە لە سنووری ئەدەبدا خۆیان رادەگرن))**

**شرۆڤە:**

۞ باسمان لە كرانەوەو گرژبوون كرد، پێویستە ئەم دوو دۆخەی دڵ لەسەر میزان بێت، هاوسەنگی گرنگترین سیمای رێبوارانە لەهەردوو دۆخەكەدا، نەبەرتەسكبوونەوەی دڵ و ناخ، بەجۆرێك بێزار و وەڕسی بكات پۆشاكی بێهیوایی لەبەر بكات و بەزەییە بەرینەكەی خودای موتەعالی لەبیربچێتەوە، نە كرانەوە و سەرڵدانی خۆشی و سروور لە ناخیدا و هیوازۆریی بە بەزەیی خودا ئادابی بەندایەتی پێ تێدەپەڕێنێ و رووبەڕووی سنووربەزێنیی بكاتەوە.

۞ گەر بەندە لە هەردوو بارەكەدا لەبەردەم مەترسیدا بێت، ئەوا لەباری كرانەوەدا مەترسییەكە گەورەترە، چونكە بەو خۆشی و سرووورەی لە دڵ و دەروونیدا سەرهەڵدەدات شلگیرییەكی بۆ دروست دەبێت و لەوانەیە رووبەڕووی بەزاندنی سنووری ئادابی عاریفی ببێتەوە كە شكۆ و رێز و سەنگینی باوەڕ و ئارامیی قووڵە.

۞ ئەوانەی لەباری كرانەوەدا لە سنووری ئادابدا خۆیان رادەگرن ئەو عاریفە مەزنانەن زانستی تەواویان بە مەنزیلەكانی بەرەو خوداچوون و حاڵ و مەقام و كرانەوە

و گرژبوون و تەواوی ئافەتەکانی ڕێگەی بەرەو خوداچوون هەیە، ئەو عاریفانە پێیان لە مەنزیلەیەك ناوە کە بریتییە لە مەنزیلەی دامەزران و دەستبەسەرداگرتن و ریشەداکوتین (**التمکین**) لەناو مەقامەکانی باوەڕدا.

۞ ۞ ۞

# حیکمەتی هەشتا و دوو

((الْبَسْطُ تَأْخُذُ النَّفْسُ مِنْهُ حَظَّهَا بِوُجُودِ الْفَرَحِ، وَالْقَبْضُ لاَ حَظٌّ لِلنَّفْسِ فِيهِ))

## راڤەی وشەکان

**حظها:** بەشی نەفس

**بوجود الفرح:** بەبوونی دڵخۆشی و ئاسوودەیی

**واتا ((لەباری "کرانەوە"دا نەفس بەشی خۆی لێ دەبات کە بریتییە لە خۆشی و ئاسوودەیی، بەڵام لەباری "گرژبوون"دا نەفس هیچ جۆرە بەشێکی تێدا نییە))**

## شرۆڤە:

❁ ئەم حیکمەتە تەواوکەری حیکمەتەکەی پێشووە، ئیبن عەتا هۆ بۆ حیکمەتەکەی پێشوو دەخاتە ڕوو، دەفەرموێت: بۆیە عاریف لەباری کرانەوەدا لەبەردەم مەترسیدایە، چونکە نەفس لەم بارەدا بەشی هەیە، بەشەکەشی بریتییە لەو خۆشی و ئاسوودەییەی دەستی دەکەوێت، بەڵام لەباری گرژبووندا هیچ جۆرە دڵخۆشی و ئاسوودەییەکی تێدا نییە، بەڵکو هاتنەوەیەك و گرژبوون و بێزارییەکی ئازاربەخش بۆ ئەو گوناه و خراپانەی دەرحەق بەخودا کردوویەتی، بەرانبەر ئەو گشتە چاکە و میهرەبانییەی لەلای خوداوە بۆی رەوانەکراوە.

❁ کاتێك نەفس بەشی خۆی لەم دۆخی کرانەوە دەست دەکەوێت عاریف بەدوای خۆیدا کێش دەکات و لەوانەیە سنووری ئادابی مەزننانی پێ ببەزێنێت، ئەمەش شایستە نییە بە مەقامی عاریفان.

❁ بەزاندنی سنوورەکان بۆ ئەوانەی خوار ئەوان ئاسان دەکەوێتەوە، بەڵکو سروشتی دەگوزەرێت، بەڵام بۆ عاریفی راوەستا و هاوسەنگ لە سەیر و سلکویدا دەبێتە

نەنگی، ئەو بۆیە ناو و ناوەڕۆکی عاریفی پێبەخشراوە زانستی تەواوی بە ڕێگەکە هەیە، ترازان لە باری کرانەوەدا جۆرێك لە بێئاگایی عاریف بە ئافەتی ڕێگای لێ دەخوێنرێتەوە، بۆیە ئیبن عەتا عاریفان لەو ترازان و ئاداب بەزێنییە ئاگادار دەکاتەوە.

❁ ❁ ❁

# حیكمەتی هەشتاوسێ[٧]

((رُبَّمَا أَعْطَاكَ فَمَنَعَكَ، وَرُبَّمَا مَنَعَكَ فَأَعْطَاكَ))

## ڕاڤەكردنی وشەكان:

**أعطاك**: پێت بدات

**منعك**: لێت قەدەغە بكات

**واتا ((لەوانەیە پێت بدات و لێت قەدەغە بكات، لەوانەیە لێت قەدەغە بكات و پێت بدات))**

## شرۆڤە:

❁ خودای موتەعال دەرگای حەزەكانی دەروون بەڕووی كەسێكدا دەكاتەوە، بەڵام دەرگای بڕینی مەقاماتی بەرزی ئیمانی بەڕوودا دادەخات، یان لەوانەیە دەرگای بڕینی مەقاماتی باوەڕ و كۆمەك و یارمەتی بەڕووی كەسێكدا بكاتەوە و دەرگای حەزە دونیاییەكانی بەڕوودا دابخات.

❁ ئەو كەسەی خودا دەرگای كۆمەك و یارمەتی بۆ بڕینی مەقاماتی باوەڕ بەڕوویدا دەكاتەوە كەسێكە موڕادی خودایە و بۆ خۆی هەڵیبژاردووە و دەیەوێت بیگەیەنێت بەو ئاستە باڵای بۆی دیاریكراوە.

❁ كەمن ئەو كەسانەی خودا بەشێك لە حەزەكانی دونیای پێبەخشیون و لەگەڵ ئەوەشدا لە مەقاماتی بەرزی باوەڕدا ژیابن، ئەوانەی ئەم دوانەیان پێبەخشراوە كەسانێكن حەزی دونیاییان بۆ خودی خۆیان نەماوە، بەڵكو ئەو حەزانەش بۆ خودا بەكاردەهێنن و بەشی نەفسیان تێدا سڕاوەتەوە، ئەمانەش بە زۆری هەندێكن لە پێغەمبەران(علیهم السلام) كە لەپاڵ پێغەمبەرایەتیدا خودا موڵكی پێبەخشیون، لەوانە یوسف و داوود و سلیمان(علیهم السلام) ئەوان خاوەنی موڵك و دەسەڵات بوون لەگەڵ

ئەوەشدا پێغەمبەربوون و چرکە بە چرکەی تەمەنیان لەگەڵ خودا و بۆ خودا بوو.
قورئان دەربارەی سلیمان(عليه السلام) دەفەرموێت:﴿ قَالَ رَبِّ ٱغۡفِرۡ لِي وَهَبۡ لِي مُلۡكٗا لَّا يَنۢبَغِي لِأَحَدٖ مِّنۢ بَعۡدِيٓۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡوَهَّابُ ﴿٣٥﴾ ﴾ ص: ٣٥

# حیکمەتی هەشتاو چوار

((مَتَى فَتَحَ لَكَ بَابَ الْفَهْمِ فِي الْمَنْعِ عَادَ الْمَنْعُ عَيْنَ الْعَطَاءِ))

## راڤەی وشەکان:

**الفهم**: تێگەیشتن

**عين العطاء**: خودی بەخشین (سەرچاوەی بەخشین)

**واتا ((هەرکات بە قەدەغەکردن لە تۆ دەرگای تێگەیشتنت لێکرایەوە ئەوا قەدەغەکردنەکە دەبێت بە خودی(سەرچاوەی) بەخشین))**

## شرۆڤە:

❁ خودای موتەعال بە یاسای "قەدەغەکردن" و "بەخشین" مامەڵەی بەندەکانی دەکات، ئەو (ﷻ) خاوەنی دوو ناوی "**المانع**" و "**المعطي**"ە.

❁ گەر لە حیکمەتی قەدەغەکردن گەیشتیت و بەو قەدەغەکردنە دەسەڵات و زاڵیی خودای موتەعالت بۆ دەرکەوت و لەوە گەیشتیت کە قەدەغەکردن تەنها ویستێکی بێ حیکمەت نییە، بەڵکو دانایی و بەزەیی و دادپەروەری خودای تیا دەردەکەوێت، کاتێك ئەم تێگەیشتنە وردە بە هۆی قەدەغەکردنەوە لە لات دروست بوو ئەوە لەخۆیدا بەخشینێکی مەزنە، نەك قەدەغەکردن، لەڕووی دەرەوە وادەردەکەوێت کەسەکە لێی قەدەغە کرابێت، بەڵام لەڕووی ناوەوە قەدەغەکردن نییە، بەڵکو بەخشینە.

❁ خودا بە داخستنی دەرگایەك دەیەوێت چەندین دەرگا بەڕووی بەندەکەیدا واڵا بکات، باشە ڕووداوێك وەك نموونە بۆ تێگەیشتن لەم حیکمەتە خوداییە بخەمە ڕوو: باڵندەیەك دێتە ژوورەوە و بۆ ڕزگاربوون لە ژوورەکە دەکەوێتە فڕین و باڵەتەپێ، ژوورەکە دەرگای چەند ژوورێکی تری لەسەرە، هەموو جارێ لە دەرگای ئەو ژوورەوە بە مەبەستی فڕین و ڕزگاربوون دەچێت بۆ ژوورەکانی تر، بەڵام لەوێش دیسان دەرگاو

پەنجەرەكان داخراون و رزگاری نابێت، تۆ بۆ ئەوەی باڵندەكە رزگار بكەیت دەرگاكە دادەخەیت بۆ ئەوەی لێیەوە نەچێت بۆ ژوورەكانی تر، لەپاڵ داخستنی دەرگاكەدا پەنجەرەیەك لە پەنجەرەی ژوورەكە والا دەكەیت تاكو باڵندەكە لێیەوە بفڕێت، دەبێ چۆلەكەكە چۆن لە داخستنی دەرگای ژوورەكە بڕوانیت، لەوانەیە بڵێت خاوەن ماڵ دەیەوێت بمگرێت و زیندانم بكات، ئەو نازانێت خاوەن ماڵ بە داخستنی دەرگاكە دەیەوێت ناچاری بكات بە پەنجەرەكەدا بچێتە دەرەوە و بۆ هەتاهەتایە رزگاری ببێت، هەر كات چۆلەكەكە لە حیكمەتی داخستنی دەرگاكە گەیشت، ئەوا رێلێگرتن و قەدەغەكردن بۆ ئەو دەبێت بە بەخشینێكی گەورە، چونكە دەرگای تێگەیشتنی بەڕوودا كرایە و بەو تێگەیشتنەش پەنجەرەكەی دۆزییەوە و دای لە شەقەی باڵ.

❁ ❁ ❁

# حیکمەتی هەشتا و پێنج

((الأَكْوَانُ ظَاهِرُهَا غِرَّةٌ، وَبَاطِنُهَا عِبْرَةٌ، فَالنَّفْسُ تَنْظُرُ إِلَى ظَاهِرِ غِرَّتِهَا وَالْقَلْبُ يَنْظُرُ إِلَى بَاطِنِ عِبْرَتِهَا))

## راڤەی وشەکان:

**الأكوان:** ئەو شتانەی بەشی نەفسی تێدایە

**غرة:** لەخۆدەرچوون

**عبرة:** پەند و ئامۆژگاری

**واتا ((گەردوونەکان رواڵەتی دەرەوەیان لەخۆ دەرچوونە و ناوەوەیان پەند و ئامۆژگاری، نەفس سەیری رووالەتی لەخۆدەرچوون دەکات، دڵیش سەیری ناوەی پەند و ئامۆژگاری))**

## شرۆڤە:

❁ لەم حیکمەتەدا ئیبن عەتا دەیەوێت پێمان بڵێت: کە دونیا و پێکهاتەکانی بۆ نەفسی مرۆڤ جێگەی سەرنجن، نەفس بە سروشت حەزەکان دەیبزوێنن و روو لەو شتانە دەکات کە حەزەکانی تێر دەکەن، ئەو ئارەزوومەندی شتە کاتی و کەموکورتەکانە و ناتوانێت بگاتە دیوی ناوەوەی شتەکان، بۆیە جوانی و زرقوبرقەکانی دونیا فریوی دەدات و بۆ لای خۆی کێشی دەکات.

❁ خودا ئامێرێ تری لە مرۆڤدا داناوە بۆ ئەوەی بەهۆیەوە پەی بە حەقیقەتی شتەکان ببات، گەر بوونی ئەو ئامێرە نەبووایە ئەوا مرۆڤ لە رووالەتگەرایی و تەنکاوی ژیاندا دەخولایەوەو پەیی بەمانا بەرزو بڵندەکان نەدەبرد، ئەو ئامێرەش بریتییە لە دڵ، ئەم ئامێرە کە روویەکی بەسەر جیهانی مەلەکوتدا دەڕوانێت و روویەکی بەسەر جیهانی بینراو و بەرچاودا گرنگترین رۆڵ لە ژیانی مرۆڤدا دەگێڕێت،

دوو هێزی تر دەکەونە پێش دڵەوە، ئەو دوانەش: **بینین (بصر)** و **"فوئاد"ن**، هێزی "بصر" پەردە لەسەر یاساورێسا گەردوونییەکان لادەدات و دڵ ئەو زانیارییە بەدەستهاتووانە دەکاتە بەڵگە بۆ سەر جیهانێکی تر و بەدەستهێنانی جۆرێکی تر لە زانیاری، زانیاری گڕگرتوو و جۆشخواردوو پێی دەوترێت فوئاد، کەوابوو فوئاد زانیارییەکانی جیهانی بینراو(**عالم الشهادة**) کە "بصر" بەدەستی هێناون گڕ پێدەگرێت و دڵیش ئەو زانیارییە گڕپێگرتووانە وەردەگێڕێت بۆ بەڵگە و نیشانە لەسەر جیهانێکی تر و لەوێشەوە بەدەستهێنانی جۆرێکی تر لە مانای بەرزو بڵند، ئەمەش مانای "قلب"ە لە زمانی عەرەبیدا کە مانای "وەرگەڕان"ی هەیە.

۞ ۞ ۞

# حیكمەتی هەشتاو شەش

((إِنْ أَرَدْتَ أَنْ يَكُونَ لَكَ عِزٌّ لاَ يَفْنَى فَلاَ تَسْتَعِزَّنَّ بِعِزّ يَفْنَى))

**راڤەی وشەكان:**

**عز:** رووسووری و سەربەرزی

**لایفنی:** تیانەچێت

**واتا ((گەر دەتەوێ سەربەرزی و رووسوورییەك بەدەست بهێنیت كە تیانەچێت داوای سەربەرزی و رووسوورییەك مەكە كە تیادەچێت))**

**شرۆڤە:**

❁ هەرچی لە دونیا بێ و لەناو دونیا بێت تیا دەچێت و تەنها رووی پاكی خودا و ئەوەی بۆ ئەو رووە پاكە ئەنجام دراوە دەمێنێتەوە﴿ كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ ﴿٢٦﴾ وَيَبْقَىٰ وَجْهُ رَبِّكَ ذُو الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ ﴿٢٧﴾ ﴾ الرحمن: ٢٦-٢٧، ئیمان و خۆشەویستی خودا و پێغەمبەر(ﷺ) و گوێڕایەڵی و كرداری چاكە لەو شتانەیە لەسەر زەوی ئەنجام دەدرێن و دەمێننەوە﴿ الْمَالُ وَالْبَنُونَ زِينَةُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا ۖ وَالْبَاقِيَاتُ الصَّالِحَاتُ خَيْرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَابًا وَخَيْرٌ أَمَلًا ﴿٤٦﴾ ﴾ الكهف: ٤٦﴿ وَيَزِيدُ اللَّهُ الَّذِينَ اهْتَدَوْا هُدًى ۗ وَالْبَاقِيَاتُ الصَّالِحَاتُ خَيْرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَابًا وَخَيْرٌ مَّرَدًّا ﴿٧٦﴾ ﴾ مريم: ٧٦

❁ لاوازی و دەستەوسانی لەگەڵ هەویری مرۆڤدا شێلراوە، بۆیە هەوڵی پڕكردنەوەی ئەو لاوازییە دەدات و كۆشش بۆ خۆ بەهێزكردن دەكات.

❁ دانانی ئەو لاوازییە لە مرۆڤدا حیكمەتی گەورەی لە پشتەوەیە، ئەوەش بۆ ئەوەیە مرۆڤ بۆ پڕكردنەوەی لاوازییەكانی روو لە پەروەردگاری بكات﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ أَنتُمُ الْفُقَرَاءُ إِلَى اللَّهِ ۖ وَاللَّهُ هُوَ الْغَنِيُّ الْحَمِيدُ ﴿١٥﴾ ﴾ فاطر: ١٥

۞ مرۆڤ بە هۆی دووری لە باوەڕ و نەناسینی خودا و ئەوەی خودا بۆی ئامادە کردووە دەیەوێت ئەو لاوازی و بۆشاییە بە شتێکی تر جگە لە خودا پڕ بکاتەوە، لە ماڵ و دەسەڵات و منداڵ و هۆز و هێز، تا دەگاتە ئاستێك وەهمی بێنیازبوونی لە خودا بۆ دروست دەبێت و پێیوایە هێز و دەسەڵات و ماڵ و سامانەکەی دەتوانێت پارێزگاری لیّ بکات و پێویستی بە خودا نەماوە ﴿ كَلَّآ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَيَطۡغَىٰٓ ٦ أَن رَّءَاهُ ٱسۡتَغۡنَىٰٓ ٧ ﴾ العلق: ٦ – ٧، هەروەها ئایەتی ﴿ وَيۡلٞ لِّكُلِّ هُمَزَةٖ لُّمَزَةٍ ١ ٱلَّذِي جَمَعَ مَالٗا وَعَدَّدَهُۥ ٢ يَحۡسَبُ أَنَّ مَالَهُۥٓ أَخۡلَدَهُۥ ٣ كَلَّاۖ لَيُنۢبَذَنَّ فِي ٱلۡحُطَمَةِ ٤ ﴾ الهمزة:١–٤

۞ لەم حیکمەتەدا ئیبن عەتا دەفەرموێت: پشت مەبەستە بەهێز و دەسەڵاتێك کە تیادەچێت و کۆتایی پێدێت، پشت بە هێزی لەبن نەهاتووی خودا ببەستە، ئەو تەنها هێزێکە عیززەت دەبەخشێت و بیەوێت کەسێك سوك و رسوا بکات هیچ هێزێك ریز و عیززەتی پیّ نابەخشێت ﴿ وَمَن يُهِنِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن مُّكۡرِمٍۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَفۡعَلُ مَا يَشَآءُ ١٨ ﴾ الحج: ١٨، بۆیە دەبێت بە هەمیشەیی بپاڕێینەوە و بڵێین: ﴿ قُلِ ٱللَّهُمَّ مَٰلِكَ ٱلۡمُلۡكِ تُؤۡتِي ٱلۡمُلۡكَ مَن تَشَآءُ وَتَنزِعُ ٱلۡمُلۡكَ مِمَّن تَشَآءُ وَتُعِزُّ مَن تَشَآءُ وَتُذِلُّ مَن تَشَآءُۖ بِيَدِكَ ٱلۡخَيۡرُۖ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ٢٦ ﴾ آل عمران: ٢٦

۞ ۞ ۞

# حیکمەتی هەشتا و حەوت

((الطَّيُّ الْحَقِيقِيُّ أَنْ تَطْوِيَ مَسَافَةَ الدُّنْيَا عَنْكَ حَتَّى تَرَى الآَخِرَةَ أَقْرَبَ إِلَيْكَ مِنْكَ))

**راڤەی وشەکان:**

**الطي:** پێچانەوە

**تطوي مسافة الدنيا عنك:** ماوە و دووری دونیا بپێچیتەوە

**أقرب إليك منك:** دوارِۆژ لە خۆت نزیکتر بێت لە بوونی خۆت.

**واتا ((پێچانەوەی راستەقینە ئەوەیە ماوە و دووری دونیا لە خۆت بپێچیتەوە تا دوارِۆژ ببینیت نزیکتر بێت لێتەوە لە بوونی خۆت))**

**شرۆڤە:**

❁ پێچانەوەی دووری زەوی کەراماتێکە خودا بە دۆستان و بەندە صاڵحەکانی دەدات، لە دوعای سەفەری پێغەمبەری خودادا هاتووە(ﷺ) ((**واطو عنا بعده**- خودایە دووری سەفەرمان بۆ بپێچەرەوە))، بەڵام دەبێت ئەو کەسانە ئیخلاص و شوێنکەوتنی پێغەمبەریان(ﷺ) لە کەماڵدا بێت، ئەگینا نابێتە کەرامات و لەوانەیە دەستێوەردانی شەیتان بێت.

❁ ئیبن عەتا دەیەوێت بە ئێمە بڵێت کە کەراماتی راستەقینە ئەوەیە مرۆڤ هەموو دونیا لە دڵی دەربکات و بیپێچێتەوە و روو لەدوارِۆژ بکات و لێی نزیك ببێتەوە، بە نزیکبوونەوەیەك کە تێکەڵ بەو دونیایە ببێت و لەناویدا بژی و وەك جەستەی خۆی بە رووداوەکانی نزیك ببێت.

❁ کەراماتی راستەقینە خوداویستی و دوارِۆژویستییە، راوەستانە لەسەر ئەو رێگەیەی پێغەمبەر(ﷺ) لەسەری راوەستابوو، ئەگینا کەسانێك هەن لای خودا خاوەنی رێز و

پلەوپایەی گەورە نین و هەندێك ڕووداوی سەیرو سەرسوڕهێنیان لێ دەوەشێتەوە، ئەو ڕووداوانە یەکێکن لەم سێ خاڵە:

**١.** تاقیکردنەوەیەکی خودایە بۆ ئەو بەندە: ئایا لە خودای دەناسێت و شوکری خودای لەسەر دەکات، یاخود فریوی پێ دەخوات و لە خۆی دەناسێت؟.

**٢.** خودا بەزەیی بەو بەندە کردووە و دەیەوێت لەو ڕێگەیەوە یەقینی بە هێز و دەسەلاّتی خودا لە پەنهاندا دابمەزرێنێت و لە شك و گومان بێتە دەرەوە.

**٣.** دەستی شەیتانە و دەیەوێت فریوی بدات و کەسەکە بکاتە بەندەی خۆی.

۞ بۆیە عاریفان دەڵێن گەر کەسێکت بینی لەچاوتروکانێکدا لە خۆرهەلاّتەوە دەگەیشتە خۆرئاوا باوەڕی پێ مەکە تا سەرنجی کاروکردەوەکانی نەدەیت: ئەگەر بەمیزانی شەریعەت و شوێنکەوتنی پێغەمبەری خودا بوو(ﷺ)، ئەوا داوامانە لە خودا نێت و مەبەست و ئیخلاصی بۆ خودابێت و ئەو ڕووداوەش ڕێزلێنانێك بێت لە خوداوە بۆ ئەو، ئەگەر کاروکردەوەکانی بە میزانی شەریعەت نەبوو ئەوە هیچ گومانت نەبێت کە کارەکانی لە شەیتانەوەیە و بوو بە دۆستی ئەو.

۞ ۞ ۞

# حیکمەتی هەشتا و هەشت

((الْعَطَاءُ مِنَ الْخَلْقِ حِرْمَانٌ، وَالْمَنْعُ مِنَ اللهِ إِحْسَانٌ))

**راڤەی وشەکان:**

**العطاء:** بەخشین

**حرمان:** بێبەش بوون

**المنع:** لێگرتنەوە

**إحسان:** چاکە

**واتا ((بەخشین لە خەڵکەوە بێبەشبوونە، و لێگرتنەوەش لە خوداوە چاکەیە))**

**شرۆڤە:**

۞ بەخشین لە خەڵکەوە بۆ تۆ لەگەڵ بێئاگابوونت لە خودا بێبەشبوونە لەو شتە، چونکە خۆشەویستی و پەیوەستبوونت بە خەڵکەوە بۆ دروست دەکات و کاتەکانت لە ڕەزامەندی ئەواندا بەخت دەکەیت، ئەمەش ویڵبوون و سەرگەردانییەك بۆ دڵ دەخولقێنێ و بێبەش دەبێت لەو مەعریفانەی لەخوداوە بە مرۆڤ دەگات، بۆیە هەندێك لە عاریفان لە موناجاتیان لەگەڵ خودا وتوویانە: پۆشاکێك ناپۆشم جگە لە تۆ بیکات بە بەرمدا، دونیایەکم قبووڵ نییە جگە لە تۆ پێمی بەخشیبێت.

**فلا ألبس النعما وغيرك ملبسي ولا أقبل الدنيا وغيرك واهبي**

۞ کە خودا لە بەندەیەکی خۆی دەگرێتەوە و لە هەندێ نیعمەت بێبەشی دەکات ئەوە لە خۆیدا چاکەیەکی گەورەیە لە خوداوە بۆ ئەو، چونکە ئەو بێبەشبوونە زمانی هەژاری و ئاتاجی لای بەندە دروست دەکات و بە بەردەوامی لە پاڕانەوە و داوادا دەبێت، بۆیە مەحرووم بوونەکە بۆ ئەو بە خێرێکی گەورە دەشکێتەوە.

۞ سالیکی ڕێگە دەبێت پێ بەخشین و مەحرووم بوون تەنها لە خوداوە تەماشا بکات، چونکە ئەو(ﷻ) خاوەنی دوو ناوی جوانە کە "**المعطي و المانع**"ن، بێبەشبوون و مەحرووم بوون و پێبەخشین و وەرگرتن هەردوو تاقیکردنەوەن بۆ بەندە و پێویستە لە خوداوە تەماشایان بکات و ڕووبەڕوویان ببێتەوە، لە پێبەخشین و وەرگرتنی نیعمەتەکاندا شوکری خودا بکات و لە مەحروومبوون و بێبەشبووندا ئارام بگرێت، بەو شوکر و ئارامگرتنەش بەندایەتی خودا بکات و چاوی لە پاداشتی خودا بێت.

۞ ۞ ۞

# حیكمەتی هەشتا و نۆ

((جَلَّ رَبُّنَا أَنْ يُعَامِلَهُ الْعَبْدُ نَقْدًا فَيُجَازِيهِ نَسِيئَةً))

## راڤەی وشەكان:

**جل ربنا:** مەزنی و شكۆمەندی بۆ پەروەردگار

**نقدا:** بە ئامادە

**نسیئة:** دواخستن

**واتا ((پەروەردگارمان مەنتر و شكۆمەنترە لەوەی بەندەكەی بە ئامادە مامەڵەی لەگەڵ بكات و خودا بە دواخستن پاداشتی بداتەوە))**

## شرۆڤە:

❁ كرداری چاكە لە بەندەوەیە و پاداشتیش لە خوداوە، بەندە وەك چۆن پاداشت لە خوداوە دەبینێت، كردارە چاكەكانیش لە خودا دەناسێت، ئەو بە هەدیەی خودایان دەزانێت و لەسەر ئەنجامدانیان شوكری خودا دەكات، بەندە دەزانێت گەر لا بكاتەوە بەلای ئەو كاروكردەوانەدا كە ئەنجامیداون كردارەكانی بەتاڵ دەبنەوە.

❁ پاداشتی كرداری چاكە تەنها لە دوارۆژدا نییە، بەڵكو هەر كردارێكی چاكە دوو پاداشت بەدوای خۆیدا دەهێنێت، **یەكەم:** كۆمەكی و یارمەتی لە خوداوە بۆ ئەنجامدانی كاری چاكەی تر ﴿وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ فِينَا لَنَهۡدِيَنَّهُمۡ سُبُلَنَاۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ٦٩﴾ العنكبوت:٦٩، دووەم: پارێزگاری لەو بەندەیە لە ئەنجامدانی گوناهێك ﴿إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِ﴾العنكبوت: ٤٥

# حیکمەتی نەوەد

((كَفَى مِنْ جَزَائِهِ إِيَّاكَ عَلَى الطَّاعَةِ أَنْ رَضِيَكَ لَهَا أَهْلاً))

**راڤەی وشەکان:**

**كفى من جزائه:** بەسە بۆ پاداشتەکانی

**رضيك لها أهلا:** رازی بووە بتکات بە ئەهلی کرداری چاکە

**((بەسە لە پاداشتی خودا بۆ تۆ رازیبووە بەوەی بتکات بە ئەهلی کرداری چاکە))**

**شرۆڤە:**

❁ ئەم حیکمەتە تەواوکاری حیکمەتەکەی پێشووە، نموونەیەك بۆ پاداشتی ئامادەی خودا لەسەر کردەوە چاکەکانی بەندەی خۆی دەهێنێتەوە، ئەوەش رازیبوونی خودایە بەوەی کەسەکەی کردووە بە ئەهلی کرداری چاکە، واتە خودی ئەنجامدانی چاکەکە بۆ کەسەکە پاداشتە، چونکە پاداشتەکە لە خوداوەیە و رازیبووە بەوەی کەسەکە بکات بە ئەهلی ئەنجامدانی کرداری چاکە.

❁ کاتێك رازی دەبیت بەوەی خودا پەروەردگارت بێت دەبێت رازی بیت بەوەی ئیسلام ئایینت بێت، کە بڕیارت دا ئیسلام ئایینت بێت دەبێت بڕیار بدەی پێغەمبەر پێشەوا و سەرمەشقت بێت(ﷺ)، کاتێك دڵت بەلای ئەم سیانەوە پاڵیان دایە و یەقینت بەم سیانە لا دروست بوو ئیتر تۆ لەناو چاکانی خودادای، خوداش کارە چاکەکان دەکات بە بەشی ئەهلی خۆی، ئەو هیدایەتیان دەدات بۆ سەر **"لا إله إلا الله"** و رێگەی راست و دروست ﴿وَهُدُوٓاْ إِلَى ٱلطَّيِّبِ مِنَ ٱلۡقَوۡلِ وَهُدُوٓاْ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلۡحَمِيدِ ﴿٢٤﴾﴾ الحج: ٢٤

# حیکمەتی نەوەد و یەك

> ((كَفَى الْعَامِلِينَ جَزَاءً مَا هُوَ فَاتِحُهُ عَلَى قُلُوبِهِمْ فِي طَاعَتِهِ، وَمَا هُوَ مُورِدُهُ عَلَيْهِمْ مِنْ وُجُودِ مُؤَانَسَتِهِ))

**راڤەی وشەكان:**

**كفى العاملين:** بەسە بۆ كاركەران

**فاتحه:** والاكەریەتی

**مورده:** هاوەردەكەریەتی

**مؤانسته:** هۆگربوونی

**واتا ((بەسە بۆ كاركەران پاداشت بە شتێك كە خودای موتەعال والاكەریەتی بۆ سەر دڵانیان بەهۆی كاری چاكە و گوێڕایەڵییانەوە، هەروەها ئەوەی بۆیان هاوەردە دەكات لە بوونی هۆگربوونی))**

**شرۆڤە:**

❁ خودای موتەعال جگە لە پاداشتی رۆژی دوایی هەر لەم دونیایەدا بەرانبەر كرداری چاكە پاداشتی داناوە، پاداشتی چاكە بە چاكە بەشێكی هەر لەم دونیایەدایە ﴿ هَلۡ جَزَآءُ ٱلۡإِحۡسَٰنِ إِلَّا ٱلۡإِحۡسَٰنُ ۝٦٠ ﴾ الرحمن: ٦٠، هەروەك سزای كاری خراپە بەشێكی لە دونیادایە، لە رسوایی و شەرمەزاری و لەدەستچوونی بەرژەوەندی دین و دونیا.

❁ بۆ كرداری چاكەی چاكەكەران دوو پاداشت بوونی هەیە، ئەم دوو پاداشتە دەبنە بەڵگە و نیشانە بۆ دروستیی رێگەی بەرەو خوداچوون و لەوێشەوە كۆتاهاتنی شك و گومان و دڵەڕاوكێ، سەرئەنجام سەرهەڵدانی یەقین و خۆ تەسلیم كردن بە خودا، ئەو دوانەش:

**١.** داباریینی ئیلهامە بەسەر دڵدا کە ئەهلی ئەم ڕێگەیە بە تەعبیری جۆراوجۆر دەریانبڕیوە لەوانە"**حال، وجد، ذوق**"، هەموو ئەمانە شیرینییەك بەدڵ دەبەخشن.

**٢.** سەرهەڵدانی هۆگربوون بە یادی خوداوە و پەیدابوونی خۆشی و سروور لە دڵدا، ئەم هۆگربوونە لە موشاهەدەی ناو و سیفات و کردار و ئاسەواری خودای موتەعالەوە سەرهەڵدەدەن، تا کەسەکە لە ناو و سیفات و کرداری خودادا قوڵ ببێتەوە زیاتر خودای موتەعال دەناسێت و زۆرتر هۆگری دەبێت و لەوێشەوە لێشاوی زۆرتر لە ئیلهام بەسەریدا دادەبارێت، ئەم دوو خاڵە دوو پاداشتی خێران بۆ کارکەران و ڕێبوارانی ڕێگەی بەرەو خوداچوون.

# حیکمەتی نەوەد و دوو

((مَنْ عَبَدَهُ لِشَيْءٍ يَرْجُوهُ مِنْهُ، أَوْ لِيَدْفَعَ بِطَاعَتِهِ وُرُودَ الْعُقُوبَةِ عَنْهُ فَمَا قَامَ بِحَقِّ أَوْصَافِهِ))

## ڕاڤەی وشەکان:

**یرجوه:** هیوای دەکات، رجای دەکات

**لیدفع بطاعته:** بەهۆی کارە چاکەکانییەوە لەسەر خۆی لایدا

**ورود العقوبة:** هاتنی سزا

**ما قام:** هەڵنەستاوە

**حق أوصافه:** حەقی ناو و سیفاتی خودای موتەعال

**واتا ((هەر کەس خودای پەرستووە بۆ شتێك کە لە خودا رجای دەکات، یان بە چاکەکانی بیەوێت هاتنی سزا لەسەر خۆی لاببات ئەو کەسە هەڵنەستاوە بە حەقی ناو و سیفاتی خودای موتەعال))**

## شرۆڤە:

❁ بەگشتی زۆربەی هەرە زۆری ئەهلی باوەڕ بۆ بەدەستهێنانی بەهەشت و ڕزگاربوون لە سزای دۆزەخ خودا دەپەرستن و کاری چاکە ئەنجام دەدەن و خۆیان لە خراپە بەدوور دەگرن، قورئان لێوانلێوە بەو ئایەتانەی هانمان دەدەن بۆ بەدەستهێنانی بەهەشت و لە سزای دۆزەخ دەمانترسێنن.

❁ لەسەرو ئەم پلەی باوەڕەوە پلەیەکی تر هەیە کەسەکە ڕەزامەندی خودا لەبەرچاو دەگرێت، ئەو دەیەوێت خودا ڕازی بێت، لە ڕازیبوونی خوداوە بگاتە بەهەشت و بە ڕازیبوونی ئەو لە دۆزەخ قوتار ببێت، جیاوازی ئەم پلەیە لەگەڵ پلەی پێشوو ئەوەیە: کە پلەی یەکەم بەهەشت و دۆزەخی لەبەرچاوە و حەز و ترس پاڵ دەنێن بۆ کاری چاکە و دوورکەوتنەوە لە خراپە، بەڵام لە پلەی دووەمەدا ڕازیبوونی خودا و خەشم و

تووڕەبوونی لەبەرچاوگیراوە، ئەو دەزانێت گەر لێی رازی ببێت دەگاتە بەهەشت و گەر خەشم و رقی بەسەردا دابارێنێت زیانۆمەند دەبێت و سەرئەنجامی دۆزەخە.

۞ بالاّترین پلە ئەو پلەیەیە کە زاتی خودا بە شایستەی بەندایەتی دەبینێت، ئەو گەر سزا و پاداشتیشی لەلا نەبێت بۆ بەندەکانی هەر شایستەی پەرستنە، چونکە بوونی پێبەخشیوین و مانەوەمان لە هەموو چرکەیەکدا بە بوونی خودای موتەعالەوە بەستراوەتەوە، خودا بە سیفەتی "القیوم"ی خۆی هەموو دروستکراوەکانی راگرتووە، ئەمە و ئەو گشتە نیعمەتەی کە هەژمار ناکرێن و لە ئاسمان و زەویدا پەرش و بلاّوی کردووە، بۆیە ئەو کەسەی ئەمە ئەوسافی بێت گەر پاداشت و سزاشی لەلا نەبێت هەر شایستەی پەرستنە.

۞ پلەی یەکەم پلەی ئەوانەیە بە "کردارەکانی خودا" خودا دەپەرستن، پلەی دووەم پلەی ئەوانەیە کە بە "ناو و سیفەتەکانی خودا" خودا دەپەرستن، و پلەی سێیەمیش ئەوانەن کە بە "زاتی خودا" خودا دەپەرستن.

۞ کاتێك باوەڕدار بە پلەکانی باوەڕدا بەرز دەبێتەوە لەگەڵ گەیشتن بە هەر پلەیەك داوای لێبووردن و لێخۆشبوون لە خودا دەکات بۆ ئەو کەمتەرخەمی و کەموکورتییانەی لە پلەی پێشوودا بوونی هەبووە، لە هەر پلەیەکی بالاّدا نزمی و کەموکورتی پلەکەی تری لائاشکرا دەبێت، بەم جۆرە تا بۆ لای خودا بەرز ببێتەوە زۆرتر و زیاتر هەست بە ناتەواوی و کەمتەرخەمی دەکات لە جێبەجێ کردنی بەندایەتی لەناوەوە و دەرەوەیدا، لە باوەڕ و لە کرداریدا.

۞ ۞ ۞

# حیکمەتی نەوەد و سێ

((مَتَى أَعْطَاكَ أَشْهَدَكَ بِرَّهُ، وَمَتَى مَنَعَكَ أَشْهَدَكَ قَهْرَهُ، فَهُوَ فِي كُلِّ ذَلِكَ مُتَعَرِّفٌ إِلَيْكَ، وَمُقْبِلٌ بِوُجُودِ لُطْفِهِ عَلَيْكَ))

## ڕاڤەی وشەکان:

**متى أعطاك:** هەر کات پێی بەخشیت

**أشهدك بره:** چاکەی خۆیت نیشان دەدا

**متى منعك:** هەرکات لێیگرتییەوە

**أشهدك قهره:** زاڵیی خۆیت نیشان دەدات

**متعرف إليك:** خۆی پێتدەناسێنێت

**مقبل:** بەرەو ڕووت دێت

**لطفه:** فەزڵ و چاکەی

**واتا ((هەرکات پێی بەخشیت چاکەی خۆیت نیشان دەدات، هەرکات لێیگرتییەوە زاڵی خۆیت نیشان دەدات، ئەو لە هەموو ئەوانەدا خۆی بە تۆ دەناسێنێت و بە بوونی فەزڵ و چاکەی ڕووت تێدەکات))**

## شرۆڤە:

❁ خودای موتەعال خاوەنی ناو و سیفاتی بەرز و بڵندە، داوای کردووە بەندەکانی بەو ناو و سیفاتانە بیناسن و بیپەرستن﴿وَلِلَّهِ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰ فَٱدۡعُوهُ بِهَا ﴾الأعراف: ١٨٠، خودا خاوەنی کۆمەڵێك ناوی جوانە(ئەو بڕەی بۆ ئێمە دەرکەوتووە) بەو ناوانە بیناسن و بانگی بکەن و بیپەستن و داوای لێ بکەن.

❁ ئەو(ﷻ) دەیەوێت بەو ناوانە خۆی بە بەندە باوەڕدارەکانی بناسێنێت، کە پێی بەخشیت ئەوە بە ناوی (**المعطي، الكريم، الغني، الرزاق**) پێی بەخشیوی و دەیەوێت بەو

ناوانە خۆی بە تۆ بناسێنێت، کاتێك لێتدەگرێتەوە و پێتنابەخشێت دەیەوێت بە چەند ناوێکی تر خۆی بە تۆ بناسێنێت، لەوانە (**المانع، القهار**).

۞ لە بەخشیندا ناوی **"المعطي"** بەسەر تۆدا زاڵە و لە لێگرتنەوەدا ناوی **"القهار"**، هەردوو ناوەکە ناوی جوانی خودای موتەعالن و بە ناوی یەکەم چاکە و فەزڵ و بەخشینی خۆی بۆ تۆ دەردەخات و دەیەوێت شوکری نیعمەتی بکەی و بەندەیەکی شوکرکەرت لێ دەربچێت، لە ناوی دووەمدا دەیەوێت هێز و توانا و زاڵی خۆی بە بەندەکەی نیشان بدات و لەو بارەشدا دان بەخۆدا بگریت و بە ئارامگرتن(صبر) بەندایەتی خودا بکەیت، هەموو شتێك لەژێر زۆر و زاڵی خودای موتەعالدایە و هیچ شتێك بەسەر ئەودا زاڵ نییە﴿وَهُوَ ٱلۡقَاهِرُ فَوۡقَ عِبَادِهِۦۚ وَهُوَ ٱلۡحَكِيمُ ٱلۡخَبِيرُ ١٨﴾ الأنعام: ١٨

۞ کەوابوو لە پێداندا شوکر پێویستە و لە گرتنەوەدا ئارامگرتن، مرۆڤی باوەڕ بە هەمیشەیی لەنێوان یەکێك لەم دوو بارەدایە شوکر و صبر، بۆیە شوکر بە نیوەی ئایین دانراوە و نیوەکەی تری بریتییە لە ئارامگرتن(صبر).

۞ کاتێك باوەڕدار لەم دوو تاقیکردنەوە مەزنەدا(شوکر و صبر) سەرکەوتنی بەدەستهێنا دەبێت بە بەندەی ڕاستەقینەی خودا، سەرکەوتن واتە لەلای کەسەکە هاتنی نیعمەت و لێگرتنەوەی نیعمەتی یەکسان دەبێت، چونکە هەردوو بارەکە لە خودا دەناسێت، ئەو خۆی یەکلاکردۆتەوە بۆ ملکەچبوون و فەرمانبەرداری لەبەردەم خودادا، بەندە لەلای سەردارەکەی هیچ ئیختیار و هەڵبژاردەیەکی نییە، تەنها گوێڕایەڵی و ملکەچی لەسەرە.

۞ کاتێك دەرکەوت ئەو کەسە بەندەی ڕاستەقینەی خودایە ئەوجا خودا لە خۆی نزیك دەکاتەوە، خۆشەویستی و ڕازیبوونی پێدەبەخشێت، دەبێت بە ئەهلی دیوانی خودا، قسە و داوای لای مەلیکی حەق ناگەڕێتەوە، بەڵکو خودا بۆخۆی کارەکانی هەڵدەسوڕێنێت و تەگبیری ژیانی دەکات، لەپاڵ هەموو ئەمانەدا دەکەوێتە ژێر لێشاوی میهر و بەزەیی و زۆرێك لە لوتفی ڕەبانی بەسەریدا دادەبارێت، کە ئێرە جێگەی قسەکردن لەو لوتفە ڕەبانییانە نییە.

# حیكمەتی نەوەد و چوار

((إِنَّمَا يُؤْلِمُكَ الْمَنْعُ لِعَدَمِ فَهْمِكَ عَنِ اللهِ فِيهِ))

## راڤەی وشەكان:

**يؤلمك:** ئازارت دەدات

**المنع:** لێگرتنەوە

**لعدم فهمك:** بەهۆی نەبوونی تێگەشت لە تۆدا.

**واتا ((بۆیە لێگرتنەوە ئازارت دەدات، چونكە تێناگەیت ئەو كارە لە خوداوەیە))**

## شرۆڤە:

۞ خودا خاوەنی دوو ناوی جوانە "**المعطي**" و "**المانع**"، پەروەردگار بەبەندەكانی ئەبەخشێت و ئەگرێتەوە، ئەو لەو بەخشین و لێگرتنەوەدا حیكمەتی گەورەی هەیەو هەروا نابەخشێت و بگرێتەوە، بەڵكو لە هەردوو بارەكەدا بەندەكەی تاقیدەكاتەوە، لە بەخشیندا داوای شوكری لێدەكات و لە لێگرتنەوەدا داوای صەبرو ئارامگرتنی لێ دەكات.

۞ بەخشین و لێگرتنەوە رۆزی مادی و **مەعنەوی** لە ئامێز دەگرێت، كەسی سالیك بۆ لای خودا زیاتر چاوەڕوانی رۆزی مەعنەوییە و ژیانی رۆحی و دڵ و دەروونی خۆی بەو رۆزییەوە دەبینێت.

۞ رێبواری رێگەی خودا لە گەشت و سەفەرەكەی سارد نابێتەوە و بەردەوام تەكان بە خۆی دەدات و لەو گەشتەدا تەنها خودای لەبەر چاو گرتووە و هیچ مەبەست و مەرامێكی تری نییە.

۞ هەندێ جار بۆ بەندەكەی حیكمەتی خودا وا داوا دەكات رۆزی مادی و مەعنەوی لێبگرێتەوە، یان یەكێك لەو دوانەی لێ بگرێتەوە، ئەوەی رێبوار هەندێ جار شەكەت و ماندوو دەكات لێگرتنەوەی رۆزی مەعنەوییە، رێبواری رێگە بەهۆی كەمی زانستی

**بە حیکمەت و بڕیاری خودا بە لێگرتنەوە ئازار دەچێژێت و هەندێ جار ساردی رووی تێدەکات، ئەوەی دەبێتە هۆی ئازار و ساردبوونەوە چەند خاڵێکە:**

**یەکەم:** چاوبڕینە وەجد و تاموچێژی عیبادەت و بینینی ئایەتەکانی سەر رێگەی بەرەو خوداچوون، کاتێك خودا ئەمانەی لێ دەگرێتەوە رووبەڕووی وەڕسبوون و گرژبوون و توندبوونی دەروونی دەبێتەوە.

**دووەم:** نەهاتنی ئایەتەکان و کۆتاهاتنی وەجد و تاموچێژ بەوە لێکدەداتەوە کە خودا بەهۆی تاوان و گوناهی ئەمەوە پشتی تێکردووەو بەزەیی و لوتفی خۆی لێ گرتۆتەوە، خراپتر لەمە ئەوەیە شك و گومانی لە رێگەی بەرەوخوداچوون بۆ دروست ببێت و وابزانێت رێگەیەکی هەڵەی بۆ لای خودا گرتۆتەبەر، ئەم شك و گومانە سەردەکێشێت بۆ دڵکرمێنی و وازهێنان لە رێگەو گەڕانەوە بۆ ناو دۆخی نەفامی و ژیان لەگەڵ نەفاماندا.

**سێیەم:** نەبوونی زانستی دروست و بەرین و ورد لەمەڕ حیکمەتەکانی خودا بۆ ئەو بەندانەی هەڵیبژاردوون و بەرەو لای خۆی بەرزیان دەکاتەوە، خودای موتەعال لەو لێگرتنەوەدا حیکمەتی زۆری هەیە، لەوانە:

١. تاکو بەندەکەی فێری ئارامگرتن بکات و لە لاوازییەکانی نەفس و دەروون رزگاری ببێت، ئارامگرتن دەبێتە هۆی لەدایکبوونی کۆمەڵێك ئەخلاقی بەرز و بڵند و رازانەوەی دەرەوە و ناوەوەی بەندە بەو ئەخلاقانە، هەر وەك چۆن نەبوونی ئارامگرتن دەبێتە هۆی لەدایکبوونی کۆمەڵێك لاوازی و نەخۆشی ئەخلاقی کە بەندە پێیانەوە گرفتار دەبێت.

٢. لێگرتنەوە تاقیکردنەوەی خودایە بۆ بەندە تاکو بڕیار بدات ئاخۆ رێگەی خودا هەڵدەبژێرێت یاخود شوێنی حەزەکانی خۆی دەکەوێت، لێگرتنەوە رێگری دەکات لەوەی بەندە ناشایستەکان رێگەکە بگرنەبەر، بۆیە لە رێگە پاشگەز دەبنەوە و دەگەڕێنەوە بۆ ئەو شوێنەی شایستەی بوون.

**٣.** قۆناغەکانی ڕێگەی بەرەو خوداچوون پشوو درێژی و ئارامگرتن و نەفەسی قووڵی گەرەکە، ئەگەر سالیك هەر لە سەرەتاوە خۆی بە ئارامگرتن نەڕازێنێتەوە ناتوانێت مەنزیلە بالاکانی باوەڕ بەدەست بهێنێت، ئەو لەسەر ڕێگەی میحنەتە و وەك پێغەمبەران(علیهم السلام) ڕووبەڕووی ئازار و مەینەتی دەبێتەوە، بۆیە ئارامگرتن لەگەڵ نەفسی خۆ و لەگەڵ خەڵکی لە هەرە پێویستترین مەنزیلەکانی باوەڕە و پێویستە کەسەکە بەدەستی بهێنێت.

گرتنەوەی ڕۆزییە مەعنەوییەکان بە سروشتی خۆیان گرژبوون(**القبض**) بۆ سالیك دروست دەکەن و پێدان و بەخشینی ئەو ڕۆزیانەش کرانەوە(**البسط**) بۆ ڕێبواری سەر ڕێگە پەیدا دەکەن، خودای موتەعال لە پاڵ ناوی (**المعطي**) و (**المانع**)دا خاوەنی ناوی (**الباسط**) و (**القابض**)ە، بەردەوام پەروەردگار بەم چوار ناوە و ناوە جوانەکانی تر کاردەکاتە سەر گەردوون و بوون بەڕێوە دەبات، لە هەریەکێك لەو ناو و سیفەت و کارانەدا حیکمەتێکی بالاً بوونی هەیە و مرۆڤ کەمێکی زۆر کەمی دەزانێت، بۆیە گەرەکە سالیك خۆی ڕادەستی خودا و حیکمەتەکانی بکات و بە بڕیارە قەدەرییەکانی خودا لەسەر ئەو و ژیانی ڕازی بێت.

# حیکمەتی نەوەد و پێنج

> (( رُبَّمَا فَتَحَ لَكَ بَابَ الطَّاعَةِ وَمَا فَتَحَ لَكَ بَابَ الْقَبُولِ، وَرُبَّمَا قَضَى عَلَيْكَ بِالذَّنْبِ فَكَانَ سَبَبًا فِى الْوُصُولِ))

**راڤەی وشەکان:**

**باب الطاعة:** دەرگای گوێڕایەڵی

**باب القبول:** دەرگای قبووڵ

**قضى عليك بالذنب:** گوناهێکت لەسەر بڕیار بدات

**سببا في الوصول:** هۆی گەیشتن بە خودا

> **واتا ((لەوانەیە دەرگای گوێڕایەڵیت بە رووودا بکاتەوە و دەرگای قبووڵ کردنی کاروکردەوەکانت بەڕوودا نەکاتەوە، لەوانەیە گوناهێکت لەسەر بڕیار بدات هۆیەك بێت بۆ گەیشتنت بە خودا))**

**شرۆڤە:**

❁ نیوەی یەکەمی ئەم حیکمەتە رێبواری رێگەی خودا دێنێتە هەژان، پێمان دەڵێت: لەوانەیە خودا دەرگای ئەنجامدانی کار و کردەوەی چاکەت بە ڕوودا بکاتەوە، بەڵام مەرج نییە دەرگای قبووڵ کردنی ئەو کاروکردەوە چاکانەت بە رووودا بکاتەوە، بەندەکانی خودا تەنها ملکەچ بوونیان لەسەرە بۆ خودا، قبووڵ کردنی کارە چاکەکان لە رەحمی خوداوەیە، بۆیە دوای ئەنجامدانی ئەو کاروکردەوانە پێویستە لە خودا بپاڕێیەوە لێت قبووڵ بکات، قبووڵ نەکردنی کاروکردەوەکان بۆ عیللەتێك دەگەڕێتەوە لەو کار و کردەوانەدا، هەندێك لە رێبوارانی رێگە کاروکردەوەی زۆر لە نوێژ و رۆژ و حەج و سەدەقە و یادی خودا ئەنجام دەدەن، بەڵام ئەنجامدانی ئەو کارە باشانە تووشی

لوتبەرزی و خۆپەسەندی و لەخۆدەرچوونی دەکەن، ئەمەش وادەکات کارەکانی پووچ ببنەوە و لەلای خودا قبوولّ نەبن.

۞ لە نیوەی دووەمی حیکمەتەکەدا رووی دووەمی کاروکردەوەی مرۆڤ دەخاتە روو، ئەوەش رووی ئەنجامدانی کاروکردەوەی خراپە، دەفەرمویّت:: لەوانەیە ئەنجامدانی کاریّکی خراپە خاوەن خراپەکە بە خودا بگەیەنیّت، ئەو گوناهە کامەیە لە جیّگەی ئەوەی مرۆڤ لە خودا دوور بخاتەوە بە خودای دەگەیەنیّت؟ ئەو گوناهە گوناهیّکە مرۆڤ ئەنجامی دەدات و بەهۆی گوناهەکەوە رووبەڕووی زەلیلی و شەرمەزاری دەبیّتەوە لەبەردەم خودادا، گوناهیّك مرۆڤ بۆ لای خودا دەگیّڕیّتەوە و تەوبەیەکی نەصوح بەدوای خۆیدا دەهیّنیّت و بەدیّژایی تەمەنی بیر لەو گوناهە خراپەیە دەکاتەوە و بە هەمیشەیی داوای لیّبووردن و لیّخۆشبوون لە خودا دەکات بۆ گوناهەکەی، ئەم گوناهە دەبیّتە هۆیەك بۆ والاّبوونی دەرگای خودا و گەیشتن بەو(ﷻ)

۞ ئەو گوناهانەی مرۆڤ رووبەڕووی بیّهیوابوون لە بەزەیی خودا دەکەنەوە دووجار بۆ کەسەکە دەبیّتە بەلاّ، جاریّك کە کۆڵی گوناهەکەیە و جاریّك کە بیّهیوابوونە لە رەحمی خودا و تاوانەکەی لە گوناهەکە گەورەترە، بۆیە پیّویستە باوەڕدار هەمیشە لە دوعا و پاڕانەوەدا بیّت لە پەروەردگاری و داوای لیّ بکات لە گوناه بیپاریّزیّ و گەر بەهۆی لاوازی خۆیەوە رووبەڕووی گوناهیّك بوویەوە داوا لە خودا بکات لە قاپی رەحمەتی بیّهیوای نەکات، بەڵکو گوناهەکەی بۆ بکات بە زەلیلی و گەردنکەچی و دڵشکاوی لەبەردەم خودادا، تاکو وەك قەمچییەك لە نەفسی سەرکەشی بدات و بیداتە بەر بۆ گەیشتن بە پلە بالاّکانی باوەڕ.

۞ ۞ ۞

# حیكمەتی نەوەد و شەش

((مَعْصِيَةٌ أَوْرَثَتْ ذُلاًّ وَافْتِقَاراً خَيْرٌ مِنْ طَاعَةٍ أَوْرَثَتْ عِزًّا وَاسْتِكْبَارًا))

**راڤەی وشەكان:**

**أورثت ذلا وافتقارا:** ببێتە هۆی زەلیلی و هەژاری

**أورثت عزا واستكبارا:** ببێتە هۆی عیززەت و لوتبەرزی

**واتا ((یاخیبوونێك ببێتە هۆی زەلیلی و هەژاری لەبەردەم خودادا باشتر و چاكترە لە گوێڕایەڵییەك ببێتە هۆی عیززەت و لوتبەرزی))**

**شرۆڤە:**

❁ ئەم حیكمەتە تەواوكەری حیكمەتەكەی پێشووە، دەفەرموێت: گوناه و یاخیبوونێك زەلیلی و دڵشكان و هەژاری لەبەردەم خودادا دروست بكات خێرتر و چاكترە بۆ خاوەنەكەی لە گوێڕایەڵی و چاكەیەك خۆپەسەندی و لوتبەرزی بۆ خاوەنەكەی دروست بكات.

❁ ئەو دڵەی بەهۆی گوناهێكەوە رووبەرووی زەلیلی و گەردنكەچی بۆ خودا دەبێتەوە دڵێكی زیندووە و نەمردووە، بەڵام ئەو دڵەی بە كار و كردەوەی چاكە خۆپەسەندی و لوتبەرزی بۆ دروست دەبێت دڵێكی نەخۆشە، خوداش -وەك لە فەرموودەی شیریندا هاتووە- تەماشای دڵی بەندەكانی دەكات.

❁ ❁ ❁

# حیكمەتی نەوەد و حەوت

((نِعْمَتَانِ مَا خَرَجَ مَوْجُودٌ عَنْهُمَا، وَلاَ بُدَّ لِكُلِّ مُكَوَّنٍ مِنْهُمَا: نِعْمَةُ الإِيجَادِ، وَنِعْمَةُ الإِمْدَادِ))

## ڕاڤەی وشەكان:

**نعمتان:** دوو نیعمەت

**ما خرج:** لێی دەرناچن

**نعمة الإيجاد:** نیعمەتی هاتنە بوونەوە

**نعمة الإمداد:** نیعمەتی كۆمەكی و یارمەتی و پێبەخشین

**واتا ((دوو نیعمەت هەن كە هیچ بوونێك(هیچ دروستكراوێك) لێی دەرناچن: نیعمەتی بوون و نیعمەتی كۆمەكی))**

## شرۆڤە:

ئەم حیكمەتە بیری نیعمەتە مەزنەكانی خودامان دەخاتەوە تاكو بتوانین بە دڵ و زمان و كردار شوكرییان بكەین، ئەوەش:

**یەكەم:** نیعمەتی "بوون"ە، ئێمە نەبووین و خودا بوونی پێبەخشین﴿هَلْ أَتَىٰ عَلَى ٱلْإِنسَٰنِ حِينٌ مِّنَ ٱلدَّهْرِ لَمْ يَكُن شَيْـًٔا مَّذْكُورًا ﴿١﴾﴾ الإنسان: ١، زەوی و گەردوون بەر لە بوونی ئێمە بوونیان هەبوو، لەدوای مردنیشمان ئەوان بوونیان دەبێت، خودا ئەو بوونە بوو هەموو بوونەكانی تری دروست كرد، عەرش و كورسی و فریشتە و ئاسمانەكان و زەوی و بەهەشت و دۆزەخ و مرۆڤ و جین، بوونی ئێمە بە خۆمانەوە نەبەستراوەتەوە، تەنها خودا بوونی خۆی بە خۆیەوەیە، سەرجەم دروستكراوەكانی تر بوونیان بە بوونی خوداوەیە، تەنها ئەوە دروستكەر و ڕاگری هەموو بوونەكان، نیعمەتی بوون نیعمەتێكی مەزنە، لە

دروستکردنی من و تۆدا خودا هیچ زۆرێکی لەسەر نەبوو، ئەو بە عیلم و حیکمەت و رەحمەتی خۆی بوونی بە ئێمە بەخشی، گەر ئەو ویستە خوداییە نەبوایە ئێستا ئێمە نە بوونمان هەبوو و نە باس و خواس، ئەو خودایە بە لوتفی خۆی ئێمەی بە هاتنە بوون شایستەکرد، هەزاران هەزار حەمد و شوکر بۆ خودا لەسەر ئەو نیعمەتە مەزنەی، کاتێك خودا بە عیلم و حیکمەتی خۆی مرۆڤی دروست کرد بۆ مەبەست و مەرامێکی مەزن بوو، ئەوەش بریتییە لە بەندایەتی و ملکەچی و گوێڕایەڵی بۆ خودای موتەعال﴿ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴿٥٦﴾ ﴾ الذاريات: ٥٦، کەوابوو پێویستە ئەرکە مەزنەکەی خۆمان لەبیر نەچێت کە بەندایەتی کردنە بۆ خودای موتەعال.

**نیعمەتی دووەم:** بریتییە لە نیعمەتی کۆمەکی مرۆڤ بۆ ئەوەی ژیانی جەستەیی و رۆحیی بەردەوام بێت، بۆ ژیانی جەستەیی: زەوی بۆ دروستکردووە بە هەموو ئەو نیعمەتانەی کە لەسەریەتی، هەوا، ئاو، باران، خۆر، مانگ، دەریا، وشکانی، رووەك، گیانداران، هتد.. نەبوونی هەر یەکێك لەمانە مانای نەبوونی مرۆڤ لەسەر زەوی دەگەیەنێت، هەر بەو جۆرە نیعمەتی بینین و بیستن و ژنەوتن و نیعمەتی دەست و لاق و قامەت و نیعمەتی نێر و مێ و  نیعمەتی ژیری و بیرکردنەوە و هتد.. کە بەردەوامبوونی مرۆڤ لەسەر زەوی بە کۆی ئەم نیعمەتانەوەیە، پاشان بۆ ژیانی رۆحی مرۆڤ پێغەمبەرانی بە ئایاتی رۆشنەوە رەوانە کردووە و کتێبەکانی دابەزاندووە و زانایان و عاریفانی کردووە بە شوێنکەوتەی پێغەمبەران(عليهم السلام) تاکو لەدوای ئەوان پەیامی پێغەمبەران رابگەیەنن و بانگ بکەن بۆ لای.

۞ هەموو مرۆڤایەتی لەناو ئەم دوو نیعمەتەدا نغرۆبوون، ئەوانەی نیعمەتی خودایان بەسەردا داباری هەست بەو دوو نیعمەتە گەورەیە دەکەن و لەسەریان شوکری خودا دەکەن و دوو نیعمەتەکە وەکو خۆیان لە جێگەی خۆیان بەکاردەهێنن، ئەوانەش کەوتنە بەر خەشمی خودا و لە شاڕێگەی راست و دروست لایاندا و سەریان لە خۆیان شێواند ئەوانە بێئاگان لە نیعمەت و خاوەن نیعمەت، بۆیە شوێن حەز و ئارەزووەکانی خۆیان دەکەون و چەند رۆژێکی کەموکورت لەم دونیایەدا بەسەر دەبەن و دواتر دەگەڕێنەوە بۆ بەردەستی خودا و دادگای دادپەروەری.

# حیکمەتی نەوەد و هەشت

((أَنْعَمَ عَلَيْكَ أَوَّلاً بِالإِيجَادِ، وَثَانِيًا بِتَوَالِي الإِمْدَادِ))

**راڤەی وشەکان:**

**أنعم عليك:** نیعمەتی خۆیی پێبەخشیت

**أولا بالإيجاد:** یەکەمجار بە هێنانە بوون

**وثانيا بتوالي الإمداد:** بە ناردنی کۆمەکییەکان بەدوای یەکتردا

**واتا ((یەکەمجار بە هێنانە بوون نیعمەتی خۆیی پێبەخشیت و دووەم جار بە ناردنی یەك لەدوای یەکی کۆمەکییەکان بۆت))**

**شرۆڤە:**

❁ ئەم حیکمەتە تەواوکاری حیکمەتەکەی پێش خۆیەتی، دەفەرموێت: خودا یەکەمجار بوونی بە تۆ بەخشی، پاشان بە ناردنی یەك لەدوای یەکی کۆمەکییەکان کە جۆرێکی ترن لە نیعمەت و هەروەك نیعمەتی بوون پێویستیان بە شوکرە.

❁ ئەم حیکمەتە پێمان دەفەرموێ بۆ ئەوەی بوونت بەردەوام بێت چرکە بە چرکەی ژیانت پێویستی بە خودای موتەعالە، ئەوە خودایە ئاسمانەکان و زەوی ڕاگرتووە تاکو بەسەر یەکتردا بەر نەبنەوە﴿وَيُمۡسِكُ ٱلسَّمَآءَ أَن تَقَعَ عَلَى ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا بِإِذۡنِهِۦٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِٱلنَّاسِ لَرَءُوفٞ رَّحِيمٞ ﴿٦٥﴾﴾ الحج: ٦٥، خودای موتەعال یەکێك لە ناوەکانی بریتییە لە "الخلاق" کە "صغة المبالغة"ی ناوی "الخالق"ە، ئەو ناوە بەرز و بڵندە تێمان دەگەیەنێت کە خودا بەبەردەوامی خەلق دەکات، چۆن؟ پێشتر وتمان جگە لە خودا هەرچی دروستکراوی ترە بوونەکەی بە خودی خۆیەوە نییە، بەڵکو بوونی بە بوونی خودای موتەعالەوەیە، ئاسمانەکان و زەوی بە بەردەوامی دەچنە ناو جیهانی عەدەم و خودا بە بەردەوامی خەلقیان پێ دەبەخشێتەوە و ناهێڵێت ڕووبەڕووی زەوال و تیاچوون

ببنەوە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُمۡسِكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ أَن تَزُولَاۚ وَلَئِن زَالَتَآ إِنۡ أَمۡسَكَهُمَا مِنۡ أَحَدٖ مِّنۢ بَعۡدِهِۦٓۚ إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورٗا ﴿٤١﴾﴾ فاطر: ٤١، ئایەتە پیرۆزەکە ئاماژە بەوە دەدات کە ئەوە خودایە ئاسمانەکان و زەوی راگرتووە تاکو زەوال و تیاچوونیان بەسەریاندا نەیەت، ئەوە خودایە کاتێك ئاسمانەکان و زەوی بە سروشتی خۆیان دەیانەوێت بەرەو زەوال بچن، بەڵام خودا بە سیفەتی "الخلاق"ی خۆی رایاندەگرێت و ناهێڵێت روو لە جیهانی عەدەم بکەن ﴿ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُ﴾البقرة: ٢٥٥، خودای موتەعال بە سیفەتی "الخلاق"بە هەمیشەیی ئەفرێنەر و خەلقکەرو بەسیفەتی "القیوم"بە هەمیشەیی راگری ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی تێیاندایە و بوونی پێ بەخشیون.

۞ سالیکی رێگەی خودا دەبێت بەم مەعریفە مەزنەوە سەفەر بۆ لای خودا بکات، مرۆڤی نەزان ناتوانێت لە سەفەرەکەیدا بۆ لای خودا بگاتە مەنزڵ، ئەو دەبێت بوونی خۆی و نیعمەتەکانی، بەردەوامی بەخشش و ئیمان و کار و چاکە و سەفەری هەموو لە خوداوە ببینێت، نەك لە خودی خۆیەوە، ئەو بوونەکەی بە خودی خۆیەوە نییە تاکو ئەو شتانەی بە بوونی ئەوەوە وابەستەن لە خودی خۆیەوە بێت، بۆیە هەمیشە لەگەڵ خودادایە و لە نەفس و ویستی خۆی هاتۆتە دەرەوە.

۞ ۞ ۞

# حیكمەتی نەوەد و نۆ

((فَاقَتُكَ لَكَ ذَاتِيَّةٌ، وَوُرُودُ الأَسْبَابِ مُذَكِّرَاتٌ لَكَ بِمَا خَفِيَ عَلَيْكَ مِنْهَا، وَالْفَاقَةُ الذَّاتِيَّةُ لاَ تَرْفَعُهَا الْعَوَارِضُ))

**راڤەی وشەكان:**

**فاقتك:** ئاتاجی و هەژاری و پێویستیت

**ذاتية:** لە خودی خۆتدایە

**ورود الأسباب:** هاتنی هۆكارەكان

**لا ترفعها العوارض:** دیاردە لابەلاكان كۆتایی پێ نایەنن

**واتا ((بوونی هەژاری و ئاتاجی لە خودی تۆدایە، هاتنی هۆكارەكانی ئاتاجی و هەژاری بۆت یادخەرەوەی ئەو هەژاری و ئاتاجییەیە كە لە خودی خۆتدایە، هۆكارە لابەلاكانی بێنیازبوون ئەو ئاتاجی و هەژارییە كۆتا پێ ناهێنن))**

**شرۆڤە:**

❁ مرۆڤ لە خودی خۆیدا هەموو سات و دەمێك لێوانلێوە بە ئاتاجی و هەژاری، ئاتاجی مرۆڤ رووداوێك نییە و لە دەرەوە رووی تێكردبێت یاخود رووبەرووی بووبێتەوە، بەڵكو ئاتاجی و هەژاری هەڵقولاّوی ناخ و هەویری بوون و سروشتییەتی، مرۆڤ و بوون لە كەمتر لە بەشێكی هەزاران بەشی چركەیەك بوونی دەچێتە عەدەم و كۆتایی پێدێت و لە هەمان كاتدا خودا بە سیفەتی"الخلاق" و"القیوم" جارێكی تر بوونی پێ دەبەخشێتەوە، كەوابوو هەژاری و ئاتاجی مرۆڤ بۆ لای خودا لە هەویری بوونیدایە، چونكە گەر خودا ئەو دوو ناوە جوانە لە بوون بكێشێتەوە ئەوا لە چاوتروكانێكدا هەموو بوون جگە لە خودا دەچێتە جیهانی عەدەم و تەنها خودا دەمێنێتەوە، ئەمەش ئەوپەڕی ئاتاجی و

هەژاری مرۆڤ و بوونە بە پەروەردگاریان، مەلیکەکانی سەر زەوی بەر لە هەژارەکان ئاتاجی دەرگای خودا و هەژاری لوتف و ڕەحمەتی ئەون.

۞ هەندێ جار خودا لە ڕێگەی کۆمەڵێك هۆکارەوە ئاتاجی و هەژاری بیری مرۆڤ دەخاتەوە، نەخۆشی بۆ دەنێرێت، برسی و تینووی دەکات، بێ ماڵ و سامانی دەکات، ڕۆڵەی پێ نابەخشێت، تەنگەلانی و کارەسات رووی تێدەکات، هەموو ئەمانە بۆ ئەوەیە هەژاری و ئاتاجی ریشەداکوتیوی ناخی وەبیری مرۆڤ بهێنێتەوە **(و ورود الأسباب مذكرات لك بما خفي عليك منها)**.

۞ مرۆڤ بە سروشتی خۆی کە بێنیاز دەبێت بەهۆی لەشساغی و ماڵ و سامان و دەسەڵات و منداڵ و شوێنکەوتوانەوە لەخۆی دەردەچێت و توغیان دەکات ﴿ كَلَّآ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَيَطْغَىٰٓ ﴿٦﴾ أَن رَّءَاهُ ٱسْتَغْنَىٰٓ ﴿٧﴾ ﴾ العلق: ٦-٧ ، بەڵام هێز و دەسەڵات و ماڵ و سامان و شتەکانی تریش ئاتاجی و هەژاری ناخی مرۆڤ ناسڕنەوە، بەڵکو بەهۆی ئەو هەژاری و ئاتاجییەوەیە پەلاماری ئەو شتانە دەدات و پێیوایە بە هۆیانەوە بێنیاز دەبێت، بەڵام ئاتاجییەکەی تۆخ دەکاتەوە و هەژارییەکەی زۆرتر و زیاتر**(والفاقة الذاتية لا ترفعها العوارض)**

۞ کاتێك بەندە ئەمە حاڵ و شانوشکۆیەتی ئیتر لەخۆدەرچوون و پشتبەستن بە خۆ و هۆکارە مادییەکان بۆ ئەو مانایەکیان بۆ نامێنێتەوە، ئەگەر لە خوداوە تەماشایان نەکات و بەکاریان نەهێنێت، دەستبردن بۆ هۆکارەکان ڕێزلێنانە لەو داواکاری و یاسا شەرعی و گەردوونییانەی خودا خولقاندوونی و داوای لە مرۆڤ کردووە بەکاریان بهێنێت، ئەگینا لە خودی خۆیاندا کاریگەرییەکیان نییە گەر خودا هێزی کاریگەرییان پێ نەبەخشێت، ئاگر ناتوانێت بسوتێنێت گەر خودا هێزی سوتانی پێ نەبەخشێت وەك بۆ ئیبراهیم(عليه السلام) هێزەکەی لێ وەرگیرایەوە و نەیتوانی بسوتێنێت، هەر بەو جۆرە تەواوی هۆکارەکانی تر.

۞ ۞ ۞

# حیكمەتی سەدەهەم

((خَيْرُ أَوْقَاتِكَ وَقْتٌ تَشْهَدُ فِيهِ وُجُودَ فَاقَتِكَ، وَتُرَدُّ فِيهِ إِلَى وُجُودِ ذِلَّتِكَ))

**راڤەی وشەكان:**

**تشهد فيه:** تیایدا ببینیت

**وجود فاقتك:** بوونی ئاتاجی و هەژاریت

**ترد فيه:** لەوێوە بگەیە

**وجود ذلتك:** بوونی زەلیلی خۆت

**واتا ((باشترین كاتی تۆ ئەو كاتەیە تیایدا بوونی ئاتاجی و هەژاری خۆت بۆ خودا ببینیت، لەوێوە بگەیە بوونی زەلیلی و گەردكەچی خۆت بۆ خودا))**

**شرۆڤە:**

❁ هەر كەس ئاتاجی و هەژاری لە خۆیدا بەرانبەر بە خودا نەبینێت ئەو كەسە یان بێئاگایە و لە خەوی غەفڵەتدایە، یان وەك فیرعەونی لێهاتووە و داوای پەروەردگاری دەكات و دەڵێت(من باڵاترین پەروەردگار و خودای ئێوەم).

❁ باشترین كاتێك كە بەسەر مرۆڤدا گوزەر دەكات ئەو كاتەیە پەی بە هەژاری و ئاتاجی خۆی بۆ لای خودا دەبات، چونكە كاتێك مرۆڤ هەستی بە لاوازی و هەژاری و ئاتاجی خۆی كرد و زانی كەسێك هەیە دەتوانێت ئاتاجییەكانی خۆی بباتە دەرگای ئەوا بە ناچاری روو لەو كەسە دەكات و بۆی زەلیل و ملكەچ دەبێت، بەندایەتیش بریتییە لە زەلیلی و گەردنكەچی بۆ خودای موتەعال.

❁ سالیكی رێگەی خودا بە هەمیشەیی هەژاری و ئاتاجییەكانی خۆی بۆ لای خودا دەبینێت و بە هەمیشەیی كۆڵی ئاتاجییەكانی بەرەو قاپی خودا دەبات و بە ئەوپەڕی

ملکەچی و زەلیلییەوە داوا لە پەروەردگاری دەکات پێویستی و ئاتاجییەکانی بۆ جێبەجێ بکات.

۞ بردنی ئاتاجییەکان و پێویستییەکان بۆ لای غەیری خودا مرۆڤ سوك و رسوا دەکات و باجەکەی لەدەستدانی کەرامەت و لاوازی باوەڕە و ئاتاجی و هەژارییەکەشی بە هەمیشەیی دەمێنێتەوە.

۞ گرتنەبەری وەسیلە شەرعییەکان، ئەو وەسیلانەی خودا و پێغەمبەر(ﷺ) ڕێگەیان پێداون بۆ گەیشتنە ئامانجەکان و سڕینەوەی هەندێ پێویستی کەموکورتی مرۆیی کارێکی پەسەندە بە مەرجێك سەرئەنجامەکان لە خوداوە تەماشا بکات نەك لە خودی وەسیلەکانەوە.

۞ ۞ ۞

# حیكمەتی سەد و یەك

((مَتَى أَوْحَشَكَ مِنْ خَلْقِهِ فَاعْلَمْ أَنَّهُ يُرِيدُ أَنْ يَفْتَحَ لَكَ بَابَ الأُنْسِ بِهِ))

## ڕاڤەی وشەكان:

**أوحشك من خلقه:** لە دروستكراوەكانی نامۆی كردی، وەحشەتی بۆ دروست كردی

**باب الأنس:** دەرگای هۆگربوون

**واتا ((هەركات لە دروستكراوەكانی خۆی وەحشەتی بۆ دروست كـردی بزانـە خودا دەیەوێت دەرگای هۆگربوونت بەڕوودا بكاتەوە))**

## شرۆڤە:

❁ بینینەوەی خودا وەك بینینەوەی خەزنەیەكی زێڕی گەورە وایە لای مرۆڤێكی دونیاویست، چەندە ئەو مرۆڤە كەنارگیری دەكات لە خەڵكی و هۆگریی بە خەزنە زێڕەكەی بۆ دروست دەبێت ئەوەندە باوەڕدار هۆگربوونی بە خودا بۆ دروست دەبێت و نامۆبوون لە خەڵكی رووی تێدەكات، ئەو خۆشترین و بەتامترین كاتەكانی ئەو كاتانەیە لە خەڵك دابڕاوە و لەگەڵ دۆستی راستەقینەدا تەنها كەوتۆتەوە، بۆیە هاتنی شەو لای صاڵحان بە ساتە خۆش و پڕ تام و چێژەكان تەماشا دەكرێت، چونكە لەگەڵ پەروەردگار دەكەونە موناجات و دەربڕینی گەردنكەچی و زەلیلی.

❁ وەحشەت لە خەڵكی مانای دابڕان نییە لە مرۆڤەكان و بەجێهێڵانی كۆمەڵگە و رووكردنە ئەشكەوت و دەشت و سارا، چونكە رەهبانییەت لە ئایینی ئێمەدا بوونی نییە، بەڵكو رەببانییەت جێگەی رەهبانییەتی گرتۆتەوە، باوەڕداری راستەقینە ئەو كەسەیە بەڕۆژدا لەگەڵ خەڵكی و لەناو خەڵكیدا دەژی، بەڵام دڵی لە خودا جیانەبۆتەوە، ئەو لە رۆژدا سەرقاڵی كارو كردەوەیەكە خودا پێی رازییە و ئەمری پێغەمبەری (ﷺ) لەسەرە، لە بانگەوازی مەردوومان و بڵاوەپێكردنی زانست و

خزمەت بە خەڵکی و بەدەستهێنانی رۆزی حەلاڵ و هتد.. لە هەموو ئەم بارانەدا دڵی لەگەڵ خودایە و کارەکە بۆ خودا ئەنجام دەدات و بەپێی ئەو هیدایەتە ئەنجامی دەدات کە پێغەمبەر(ﷺ) هێناویەتی.

❁ ئەم مرۆڤە باوەڕدارە ئەو کەسەیە پێغەمبەر(ﷺ) وەسفی دەکات و دەفەرموێت: ((هەر کەس سێ شتی تێدا بێت بەو سیانەوە شیرینی ئیمانی چەشتووە)) یەکێك لەو سێ شتە ئەوەیە کە((خودا و پێغەمبەری(ﷺ) لە هەموو شتێك زیاتر خۆشبوێت))، ئەو لەناو شیرینی ئیماندایە، بەخودای خۆیەوە هۆگربووەو هەمیشە لە یادی خۆشەویستەکەیدایە، چونکە هۆگربوون لە خۆشەویستییەوە سەرهەڵدەدات، خودا و پێغەمبەری(ﷺ) خۆشدەوێت و هەر کەس و هەر شتێکی تری خۆشویست تەنها لەبەر خودایە.

❁ ❁ ❁

# حیکمەتی سەد و دوو

((مَتَى أَطْلَقَ لِسَانَكَ بِالطَّلَبِ فَاعْلَمْ أَنَّهُ يُرِيدُ أَنْ يُعْطِيَكَ))

## راڤەی وشەکان:

**أطلق لسانك بالطلب:** زمانی بە داواکردن کردییەوە(پژاندی)

**يريد أن يعطيك:** دەیەوێت پێت ببەخشێت

**واتا ((هەرکات خودا زمانی بە داواکردن -لە پەروەردگار- کردییەوە(پژاندی) بزانە دەیەوێت کە پێت ببەخشێت))**

## شرۆڤە:

❁ موریدی خودا هەموو شتێکی لە خوداوەیە، ئەو دەیبزوێنێ و کارەکانی پێ ئەنجام دەدات، وەسیلەکان و ئەنجامەکان خودا بۆی دیاری دەکات، کاتێك بیەوێت پێی ببەخشێت دڵ و زمانی بە داوا و پاڕانەوە لە خزمەت پەروەردگاردا دەکاتەوە، ئەو بڕیاریداوە پێی ببەخشێت، بۆیە فێری داواکردنی دەکات تاکو ئەوەی بۆی بڕیوەتەوە بۆی رەوانە بکات.

❁ موریدی رێگەی خودا هیچ شتێك لە خۆیەوە نابینێت و بە هونەر و ئازایەتی خۆی تەماشای ناکات، بەڵکو ئەوە خودایە فێری کردووە و وای لێکردووە بپاڕێتەوە و داوا بکات، لێرەوە خۆپەسەندی لە دوعادا کۆتایی پێ دێت، مرۆی باوەڕدار ئیعجابی بە کام کاری خۆی هەیە، لە کوێ ئەو خاوەنی راستەقینەی کارەکانە تاکو ئیعجابی بۆ دروست ببێت؟!

❁ هەر بەو جۆرە مورید لە دوعاکانیدا لە حەزی نەفس خاڵی دەبێتەوە، واتە دوعاکانی بۆ حەزێك نییە نەفسی داوای بکات، بەڵکو بە مەبەستی بەندایەتی و ملکەچبوون بۆ خودا ئەو داوایانە بەرز دەکاتەوە، چونکە دوعا مۆخی بەندایەتییە،

ئەو لەو کارەیدا بەندایەتی بۆ خودا نیشان دەدات، ئیتر سەرئەنجامی دوعاکانی چی دەبێت و چی نابێت تەسلیم بە خودای موتەعالی کردووە، ئەو بە پێویستییەکانی بەندایەتی بۆ خودا نیشان دەدات، خودا چۆن مامەڵە لەگەڵ پێویستییەکانی ئەودا دەکات بازنەی کاری بەندە نییە، چونکە ئەوە خودایە ئەوی فێری دوعا و بەندایەتی کردووە، کاتێك فێری داوات دەکات بۆ حیکمەتێکە خۆی دەیزانێت، ئەو دەیەوێت پێت ببەخشێت لە دونیا یان لە دوارۆژ.

۞ ۞ ۞

# حیکمەتی سەد و سێ

((الْعَارِفُ لاَ يَزُولُ اضْطِرَارُهُ وَلاَ يَكُونُ مَعَ غَيْرِ اللهِ قَرَارُهُ))

**راڤەی وشەکان:**

**لا يزول اضطراره:** ناچاری و پەنابردنەکانی کۆتا پێنایەت

**قراره:** ئارامگرتنی

**واتا ((عاریف پێویستی و ناچارییەکانی تەواو نابن و لەگەڵ غەیری خودادا ئارامی و وەقرەگرتنی بۆ نییە))**

**شرۆڤە:**

۞ عاریف ئەو کەسەیە خودای ناسیوەو ڕێگەی خودای گرتۆتەبەرو بەخودا گەیشتووە و گەڕاوەتەوە بۆ ناو خەڵکی و دەیەوێت بۆ لای پەروەردگاریان ببات، عاریف لە زانست و حیکمەتی خودا لە خەلق و ئەمریدا تێگەیشتووە، بۆ ئەو پەردە لەسەر نهێنییەکان لادراوە، گەیشتۆتە کانیاوی ماناکان و مانای ماناکانی بەدەست هێناوە، ئەو لەگەڵ خودا و بۆ لای خودا و بە خوداوە دەژی، شتێکی نییە بالآتر و شیرینتر و عەزیزتر بێت لە خودا.

۞ عاریف بە بەندی بەندایەتی بە خوداوە بەستراوەتەوە، ناسین و نزیکی لە خودا ئەوی لەژێر بڕیاری بەندایەتی دەرنەهێناوە، بەڵکو لە هەموو خەڵکی زیاتر بە خوداوە وابەستەبووە و ملکەچی و زەلیلی لەبەردەمیدا بووە بە کالآی بالآی، هیچ کەس بە بەندایەتی کردن و نزیك بوونەوە لە خودا لە مرۆڤبوون و بەندەبوون ناکەوێت، گەر شتێکی لەو جۆرە بوونی هەبوایە دەبوا فریشتە نزیکەکان و پێغەمبەران(عليهم السلام) لەژێر نیری بەندایەتی بۆ خودا ڕزگاریان ببوایە، هەموو ئەوانەی لەخوار خوداوەن بەندەی خودان و تەنها ڕێز و قبووڵ بوونێك بوونی هەبێت لە تەقوا و بەندایەتییەوەیە،

بەندایەتی بۆ نزیکانی خودا چێژوەرگرتن و ئازادبوونە لە هەرچی کۆت و بەندێك نەفس و شەیتان و دونیا بۆ مرۆڤی دروست دەکەن.

۞ ئەوانەی پێیان وابوو دوای سەردەمێك بەندایەتی کردن مرۆڤ لە کۆتوبەندی بەندایەتی رزگاری دەبێت با بزانن ئەو کارەیان لە شەیتانەوەیە و بە وازهێنان لە بەندایەتی کردن بۆ خودا خۆیان کردووە بە بەندەی شەیتان، چونکە گوێڕایەڵییان لێکردووە، گوێڕایەڵی لە کارێکدا کە گەورەترین تاوان و گومڕاییە، تەنانەت لە بەهەشتدا باوەڕداران بەندەی خودان و لە موڵك و مەملەکەتی خودادان و لە بەندایەتی نەکەوتوون، ئەوان لە بەهەشتدا مەزنترین نیعمەت لەلایان بینینی خودا و گەیشتنە بە خزمەتی، بە هەمیشەیی حەمد و سەنای خودا دەکەن و پاکێتی دەدەن پاڵی، بەڵام لەو حەمد و سەنا و تەسبیحە هەروەك نیعمەتەکانی تری بەهەشت چێژ وەردەگرن و رۆزییەکی رۆحی لێوە بەدەست دەهێنن﴿ فَأَمَّآ إِن كَانَ مِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴿٨٨﴾ فَرَوْحٌ وَرَيْحَانٌ وَجَنَّتُ نَعِيمٍ ﴿٨٩﴾ ﴾ **الواقعة: ٨٨–٨٩**، "روح" -خودا باشتر دەزانێت- لەو ئایەتە پیرۆزەدا بریتییە لەو چێژە رۆحییانەی مرۆڤ لە بەهەشتدا وەریدەگرێت لە بینینی خودا و سەلامی فریشتەکان و حەمد و سەنا و تەسبیح، وەك چۆن"**ريحان**" چێژی هەستەکانە لە بۆنی خۆش و دیمەنی رازاوەی بەهەشت، و "**جنة**" چێژی جەستەییە لە خواردن و خواردنەوە و هاوسەریکردن، کەوابوو لە بەهەشتدا نزیکان لە خودا چێژی رۆحی و هەستیی و جەستەییان بۆ هەیە و ئەمەش کامڵترین تام و چێژە.

۞ ۞ ۞

# حیكمەتی سەد و چوار

((أَنَارَ الظَّوَاهِرَ بِأَنْوَارِ آثَارِهِ، وَأَنَارَ السَّرَائِرَ بِأَنْوَارِ أَوْصَافِهِ لأَجْلِ ذَلِكَ أَفَلَتْ أَنْوَارُ الظَّوَاهِرِ، وَلَمْ تَأْفُلْ أَنْوَارُ الْقُلُوبِ وَالسَّرَائِرِ وَلِذَلِكَ قِيلَ:

إِنَّ شَمْسَ النَّهَارِ تَغْرُبُ بِاللَّيْـــلِ

وَشَمْسُ الْقُلُوبِ لَيْسَتْ تَغِيبُ))

## راڤەی وشەكان:

**أنار:** رۆشنی كردەوە

**الظواهر:** هەموو ئەوەی لە ئاسمانەكان و زەویدایە و مرۆڤ دەیانبینێت.

**أنوار آثاره:** نووری خۆر و مانگ

**السرائر:** دڵ و ناخ و دەروون

**أوصافه:** سیفەتەكانی خودا

**أفلت:** ئاوادەبێت

**لم تأفل:** ئاوا نابێت

**واتا ((دەرەوەی بە نووری ئاساری خۆی نوورانی كردووە، ناوەوەی بە نووری سیفاتی خۆی نوورانی كردووە، بۆیە نووری دەرەوە ئاوا دەبێت بەڵام نووری دڵ و پەنهانی مرۆڤ ئاوا نابێت، لەو پێناوەدا وتراوە:**

**خۆری رۆژ بە شەو ئاوا دەبێت، بەڵام خۆری دڵان هەرگیز ئاوا نابێت))**

## شرۆڤە:

❁ خودای موتەعال زات و سیفەت و ناو و كردار و ئاسەوار(دروستكراوەكان)ی هەیە، پەیبردن و تێگەیشتن لە هەر یەك لەم بەشانە ئاستێك لە ئیمانی گەرەكە، تێڕامان

له ئاسەواری خودا بریتییە له خوێندنەوەی گەردوون، له خوێندنەوەی گەردوونەوە بەرز دەبێتەوە بۆ بینینی کرداری خودا، له کرداری خوداوە بۆ ناو و سیفاتی خودای موتەعال، تا ئەم جێگە بریتییە له بەرزبوونەوەی دڵ له گەشتێکی دوورودرێژ بۆ لای خودا، دەبێت له دوای ناو و سیفات-وەك پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی- بڵێین: **"أنت كما أثنيت على نفسك"** خودایە تۆ بەو جۆرەی کە خۆت وەسفی خۆتت کردووە.

❁ دڵ و ناخی باوەڕدار خاوەنی نوورێکی تایبەتە کە له ناو و سیفەتی"النور" وەرگیراوە، بوونی ئەم نوورە بە قورئان و فەرموودەی دروست ساغ بووەتەوە﴿ **أَوَمَن كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَاهُ وَجَعَلْنَا لَهُ نُورًا يَمْشِي بِهِ فِي النَّاسِ كَمَن مَّثَلُهُ فِي الظُّلُمَاتِ لَيْسَ بِخَارِجٍ مِّنْهَا (١٢٢)** ﴾ الأنعام: ١٢٢، ئەم نوورە خوداییە له قەبر و بەرزەخ و ڕۆژی حەشر و حیسابدا له باوەڕدار جیانابێتەوە﴿ **يَوْمَ تَرَى الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ يَسْعَىٰ نُورُهُم بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَبِأَيْمَانِهِم بُشْرَاكُمُ الْيَوْمَ جَنَّاتٌ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا ذَٰلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ (١٢)** ﴾ الحديد: ١٢

❁ هەموو ئەو شتانەی بە سیفەتەوە وابەستەن بوون و بەردەوامییان زۆرترە لەوەی بە ئاسەوارەوە وابەستەن، چونکە ئاسەوار بۆخۆی له کردارەوە سەرچاوەی گرتووەو کرداریش له ناو و سیفەتەکانەوە سەرچاوە دەگرن، ئەو نوورەی له سیفەتی خوداوە -و لەناو دڵی باوەڕداردا- سەریهەڵداوە جیاوازی زۆرە لەو نوورەی له ئاسەوارەوە سەرچاوەی گرتووە، نووری دڵی باوەڕدار هەرگیز ئاوا نابێت، بەڵام نووری خۆر و مانگ بە شەودا ئاوا دەبن.

❁ بەدەستهێنانی ئەم نوورە پێویستی بە: ئیمانێکی دروست و ڕاست و ڕەوان هەیە، ئیمانی دروست ئەو ئیمانەیە له نووری قورئان و چرای پێغەمبەرایەتییەوە وەرگیرا بێت، ئیمانی دروست ئەو ئیمانەیە دڵی خاوەنەکەی بە خۆشەویستی خودا و پێغەمبەر(ﷺ) لێوانلێو کردبێت، تامەزرۆبوونی هەبێت بۆ لیقای خودا و خانەی دوارۆژ، خاوەنەکەی بەرەو کرداری چاکە هەڵبنێت، ڕەحم و سۆز و بەزەیی و لێبووردن و تەوازوع و خزمەت و کۆمەکی له خاوەنەکەیدا بڕوێنێت.

❁ له باسی نووری خۆر و نووری دڵدا ئاماژەیەك بە چیرۆکەکەی ئیبراهیم(عليه السلام) هەیە، کاتێك هەسارە و مانگ و خۆری بینینی و یەك لەدوای یەك دەیوت((ئەمە

پەروەردگارمە)) بەلاّم کە بینی هەر هەموو ئاوا دەبن تێگەیشت هیچ یەك لەوانە پەروەردگار نییە، بەچیدا بەو راستییە گەیشت؟ ئەو نووری فیترەت بە بەردەوامی لە ناخیدا دەگڕا، نووری فیترەت خودای لە ناخەوە پێناساند بوو، ئیبراهیم(عليه السلام) دەیویست دەرکەوتەی نووری ناوەوەی خۆی لە دەرەوە ببینێت، بۆیە کە بینی خاوەن نوورەکان(هەسارە و مانگ و خۆر) ئاوا دەبن، بەلاّم نووری ناخی ئەو ئاوا نابێت تێگەیشت هیچ کام لەوانە پەروەردگار نین و وتی((من ئاوابووانم خۆشناوێت))، ئەو بەدوای نوورێکدا دەگەڕا ئاوا نەبێت، ئەو نوورەش لە ناخی خۆیدا بوو، نزیکترین نوور بوو بە ئەو، بۆیە لە کۆتاییدا فەرمووی﴿**إِنِّي وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ حَنِيفًا ۖ وَمَا أَنَا مِنَ الْمُشْرِكِينَ ﴿٧٩﴾**﴾ الأنعام: ٧٩، سەرنجی وشەی"**فطر**" بدە تێدەگەیت ئەو بەدیهێنەرەی کە ئاسمانەکان و زەوی دروستکردووە و لەسەر ملکەچی و بەندایەتی بۆ خودا رامیهێناون، هەر ئەو کەسە بە فیترەت مرۆڤی فێری خوداناسی کردووە ئەگەر نەفس و شەیتان و هێزی خراپە لێی بگەڕێن.

# حیكمەتی سەد و پێنج

((لِيُخَفِّفْ أَلَمَ الْبَلاَءِ عَلَيْكَ عِلْمُكَ بِأَنَّهُ سُبْحَانَهُ هُوَ الْمُبْلِى لَكَ فَالَّذِى وَاجَهَتْكَ مِنْهُ الأَقْدَارُ هُوَ الَّذِى عَوَّدَكَ حُسْنَ الاَخْتِيَارِ))

**راڤەی وشەكان:**

**ليخفف**: با ئاسانی بكات

**المبلي**: تاقیكەرەوە

**واجهتك**: رووبەڕووت دەكاتەوە

**حسن الإختيار**: باشی و چاكی هەڵبژاردن

**واتا ((با زانستت بەوەی خودا ئەو كەسەیە تاقیتدەكاتەوە و بەڵاْ و ناخۆشییەكانت بۆ دەنێرێت ئازاری بەڵات لەسەر سووك بكات، ئەو كەسەی قەدەرەكان رووبەڕووی تۆ دەكاتەوە هەر ئەو كەسەیە كە باشترین هەڵبژاردەی بۆ تۆ**

**شرۆڤە:**

ئەم حیكمەتە دڵنەواییە بۆ سالیكی رێگەی خودا، نزیكترین كەس لە بەڵاوە پێغەمبەران(عليهم السلام) و هاوشێوەكانی ئەوانن، بۆیە باوەڕدار و بەڵاْ و ناخۆشییەكان هاوملی یەكترن، مرۆڤ بە سروشتی خۆی لە خۆشییەكان چێژ وەردەگرێت و لە ناخۆشییەكان وەڕس و بێزارە، بەڵام كاتێك بیر لە چەند شتێك دەكاتەوە ناخۆشییەكانی لەسەر سووك دەبێت، بەڵكو بۆ هەندێ لە دۆستانی خودا دەبێت بە تام و چێژ، لەو شتانەی كە ناخۆشییەكانی بەڵاْ سووك دەكەن:

Ê بزانیت ئەو كەسەی بەڵاكەی بۆ ناردووی خودایە، نەك بە هەندێ هۆكاری لابەلاوە گرێی بدەی.

Ê بزانیت خودا بە نیعمەت و بە بەلاّ تاقیتدەکاتەوە، لە کاتی نیعمەتدا شوکر پێویستە و لە کاتی بەلاّدا ئارامگرتن، قورئان دەفەرمویّت:﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَٰتٖ لِّكُلِّ صَبَّارٖ شَكُورٖ ۝٥﴾ إبراهيم: ٥

Ê بزانیت خودا هەمیشە باشترین هەڵبژاردەی بۆ بەندەکەی خۆی هەیە، بۆیە ئەو بەلاّیە باشترین هەڵبژاردەی خودایە بۆ تۆ و پێی رادەست ببە.

Ê دڵخۆشبوون بەو پاداشتە بێ سنوورەی خودا بۆ ئەهلی ئارامگرتنی ئامادە کردووە﴿إِنَّمَا يُوَفَّى ٱلصَّٰبِرُونَ أَجۡرَهُم بِغَيۡرِ حِسَابٖ ۝١٠﴾ الزمر: ١٠

۞ هەندێ بەلاّ و ناخۆشی ژیان هەن لە بێ تەگبیری و نەزانی مرۆڤەوەیە، هەندێکی تر لە گوناه و خراپەی کار و کردەوەی ناباشەوە بەرۆك بە مرۆڤ دەگرن، لەم بارانەدا پێویستە مرۆڤ بەرپرسیارێتی خۆی دیاری بکات، خاڵە لاوازەکان و کارە ناباشەکان کۆتایی پێ بهێنێت، چونکە یەکێك لە مەرجی تەوبە دەستکێشانەوەیە لە کاروکردەوەی خراپە، راستە ئەو جۆرە بەلاّ و ناخۆشییانە لەلای خوداوە بۆ تەمبێکردنی مرۆڤە، بەلاّم پێویستە مرۆڤ رادەی بەرپرسیارێتی خۆی لەو دۆخە ناخۆشە دیاری بکات و بڕیاری راستکردنەوە بدات، خودای موتەعال دەفەرمویّت:﴿أَوَلَمَّآ أَصَٰبَتۡكُم مُّصِيبَةٞ قَدۡ أَصَبۡتُم مِّثۡلَيۡهَا قُلۡتُمۡ أَنَّىٰ هَٰذَاۖ قُلۡ هُوَ مِنۡ عِندِ أَنفُسِكُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ۝١٦٥﴾ آل عمران: ١٦٥، ئەمە بەرپرسیارێتییە و پێویستە مرۆڤی باوەڕدار شان بداتە ژێری(**قُلۡ هُوَ مِنۡ عِندِ أَنفُسِكُمۡ**) ئەو موسیبەتە لە خۆتانەوەیە، هۆیەکەی هەڵە و کەمتەرخەمی ئێوەیە.

۞ ئەو جۆرە لە بەلاّ و ناخۆشی کە ئیبن عەتا باسی لەبارەوە دەکات جیایە لەم جۆرە بەلاّ و ناخۆشییانەی بەری دەستی مرۆڤە و بەرپرسیارێتی هەیە بەرانبەری.

۞ ۞ ۞

# حیکمەتی سەد و شەش

((مَنْ ظَنَّ انْفِكَاكَ لُطْفِهِ عَنْ قَدَرِهِ فَذَلِكَ لِقُصُورِ نَظَرِهِ))

**راڤەی وشەکان:**

**إنفكاك:** جیابوونەوە و دابڕان و هەڵوەشان

**لطفه:** بەزەیی و وردەکاری پڕ لە حیکمەتی خودا

**لقصور:** بەهۆی کورتبینی

**نظره:** سەرنج و تێڕامانی

**واتا ((هەر کەس وا گومان بیات بەزەیی و وردەکاری لە قەدەرەکانی خودا دابڕاوە ئەوە بۆ کورتبینی تێڕوانینی ئەو کەسە دەگەڕێتەوە))**

**شرۆڤە:**

❁ هیچ قەدەرێکی خودا نییە بۆ باوەڕدار لوتف و بەزەیی و حیکمەتی بەرینی لە پشتەوە نەبێت، بەلا و ناخۆشییەکان مرۆی باوەڕدار رووبەڕووی دوعا و پاڕانە و گەردنکەچی دەکاتەوە، لەوێشەوە بەرەو مەقامی تەوەکول بەرز دەبێتەوە، بۆیە جاری وا هەیە بە ناردنی بەلایەك چەندین مەقامی ئیمان بۆ باوەڕدار دەستەبەر دەبێت، لە "ئامگرتن و تەوەکول و گەڕانەوەی بەردەوام(الإنابة)".

❁ ئەو کەسەی پێیوایە کارەکانی خودا لوتفییان لە پشتەوە نییە کەسێکە مەعریفەی بە خودا و ناو و سیفات و کرداری کەموکورتە، ئەو گەر لە مانای ناوی "**اللطيف**"حاڵی ببوایە تێدەگەیشت لوتفی خودا لە هەموو کاروبارەکانیدا رەنگی داوەتەوە، سەرنج بدە چۆن بە دوای باسی خەلقدا خودای موتەعال ناوی "**اللطيف**" دەهێنێت ﴿أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلْخَبِيرُ ﴿١٤﴾﴾ الملك: ١٤، هەروەها چۆن یوسف(عليه السلام) لەناو هەموو کارە خۆش و ناخۆشەکاندا لوتفی خودا دەخوێنێتەوە،

دەفەرموێت: ﴿وَقَدۡ أَحۡسَنَ بِيٓ إِذۡ أَخۡرَجَنِي مِنَ ٱلسِّجۡنِ وَجَآءَ بِكُم مِّنَ ٱلۡبَدۡوِ مِنۢ بَعۡدِ أَن نَّزَغَ ٱلشَّيۡطَٰنُ بَيۡنِي وَبَيۡنَ إِخۡوَتِيٓۚ إِنَّ رَبِّي لَطِيفٞ لِّمَا يَشَآءُ﴾يوسف: ١٠٠، بۆ وردەکاری خودای موتەعالیش لە کارەکانیدا لەسەر زمانی "لوقمان"دەفەرموێت:﴿ يَٰبُنَيَّ إِنَّهَآ إِن تَكُ مِثۡقَالَ حَبَّةٖ مِّنۡ خَرۡدَلٖ فَتَكُن فِي صَخۡرَةٍ أَوۡ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ أَوۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ يَأۡتِ بِهَا ٱللَّهُۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٞ ﴿١٦﴾﴾ لقمان: ١٦، بەرانبەر هەموو بەندەکانیشی لوتفی هەیە و دەفەرموێت:﴿ٱللَّهُ لَطِيفُۢ بِعِبَادِهِۦ يَرۡزُقُ مَن يَشَآءُۖ ﴿١٩﴾﴾ الشورى: ١٩

۞ ۞ ۞

# حیکمەتی سەد و حەوت

((لاَ يُخَافُ عَلَيْكَ أَنْ تَلْتَبِسَ الطُّرُقُ عَلَيْكَ، وَإِنَّمَا يُخَافُ عَلَيْكَ مِنْ غَلَبَةِ الْهَوَى عَلَيْكَ))

**راڤەی وشەكان:**

**لا يخاف عليك:** ترسی ئەوەت لەسەر نییە

**أن تلتبس:** لێت تێكبچێت، لێت ئاڵۆز ببێت

**غلبة الهوى:** زاڵبوونی حەز و ئارەزووكان

**واتا ((ترسی ئەوەت لەسەر نییە ڕێگەكانت لێ ئاڵۆز ببێت، بەڵكو ترسی ئەوەت لەسەرە حەز و ئارەزووەكان زاڵبن بەسەرتدا))**

**شرۆڤە:**

❁ هەموو كاتێك ڕێگەی بەرەو خوداچوون روون و ڕۆشن نییە، بەڵكو ناوبەناو تەمومژ و لێڵی رووی تێدەكەن، ئەمەش لە خۆیدا تاقیكردنەوەیەكی ترە بۆ باوەڕداران، پێغەمبەر(ﷺ) خەونی بینی و فەرمووی ئەم ساڵ فەتحی مەككە دەكەین، بەلاّم ئەو ساڵە سوڵحی حودەیبییە روویدا كە دەروازەی فەتحی مەككە و جەزیرەی عەرەب بوو، هەندێك لە هاوەلاّن پرسیاریان بۆ دروست بوو، بەلاّم ئەبوبەكری صدیق فەرمووی"ئەو پێغەمبەرە"، واتە ئەوەندە بەسە بۆ متمانەی ئێوە كە ئەو "ئەو پێغەمبەرە"، هەر بەو جۆرە لە دابەشكردنی غەنیمەتدا هەندێ لە هاوەلاّن-بە تایبەت ئەنصارەكان- پرسیاریان لا دروست بوو، ئەم جۆرە نموونانە لە ژیانی پێغەمبەری مەزندا (ﷺ) بوونی هەیە.

❁ لەسەرهەڵدانی ئەم ناڕوونی و تەمومژانەدا هەڕەشە و ترس بۆ سەر باوەڕداری راستەقینە سەرهەڵدەدەن، چونكە ماوەیەكی كەمە و تەمومژ دەڕەوێتەوە و رووی خۆری راستەقینە دەردەكەوێتەوە.

❁ ئەوەی هەڕەشە و ترسە بریتییە لە بوونی حەز و ئارەزوو، حەز و ئارەزوو نووری دڵی باوەڕدار خامۆش دەکات، کە نووری دڵ خامۆش بوو لێڵی و تەمومژەکانی دەرەوەی پێ جیاناکرێتەوە، لێرەوە تەمومژەکان دەگۆڕێن بۆ فیتنە لە دین و ئیماندا.

❁ هەتا نووری دڵ درەوشاوە بێت هەڕەشە و ترس بۆ سەر دڵی باوەڕدار بوونی نییە، ئەگەر جارجارێك سەربازەکانی شەیتان لەناو ئەو تەمومژانەوە هێرشیان هێنا دەست بە یادی خودا دەکات، یادی خودا پەردە چڕ و پڕەکان دەڕوێننەوە و چاوی دڵ دەکەنەوە و ڕاستییەکان وەك گەوهەرێك لەناو قوڕ و لیتە دەردەهێنن﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ إِذَا مَسَّهُمۡ طَٰٓئِفٌ مِّنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ تَذَكَّرُواْ فَإِذَا هُم مُّبۡصِرُونَ ﴿٢٠١﴾ ﴾ الأعراف: ٢٠١

❁ ئەوەی دڵ کوێردەکاتەوە بریتییە لە حەز و ئارەزوو، ئەم هەوابازییە وا لە مرۆڤ دەکات هەمیشە عەودالی شتە نارِوون و تەمومژاوییەکان بێت، ئەمەش نەك بۆ گەیشتن بە حەقیقەت، بەڵکو بۆئەوەی لەو ڕێگەیەوە فیتنە و ئاشووب بەرپا بکات، ئەو جۆرە کەسانە لە قورئاندا شوێنی "محکمات" ناکەون بەڵکو بەدوای"متشابهات"دا دەگەڕێن، قورئان دەفەرموێت:﴿ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ مِنۡهُ ءَايَٰتٌ مُّحۡكَمَٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلۡكِتَٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَٰبِهَٰتٌۖ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمۡ زَيۡغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَٰبَهَ مِنۡهُ ٱبۡتِغَآءَ ٱلۡفِتۡنَةِ وَٱبۡتِغَآءَ تَأۡوِيلِهِۦ ﴿٧﴾ ﴾ آل عمران: ٧، سەرنج بدە چۆن سەرەتا دڵیان پڕ دەبێت لە حەز و لادان"زیغ" پاشان ڕوو دەکەنە "متشابهات" لە قورئان، ئەمەش بە مەبەستی نانەوەی فیتنە و ئاشووبی فیکریی، بۆیە لە ئایەتی ژمارە"٨"ی دوای ئەو ئایەتە پیرۆزە خودای موتەعال فێرمان دەکات بڵێین ﴿ رَبَّنَا لَا تُزِغۡ قُلُوبَنَا بَعۡدَ إِذۡ هَدَيۡتَنَا وَهَبۡ لَنَا مِن لَّدُنكَ رَحۡمَةًۚ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡوَهَّابُ ﴿٨﴾ ﴾ آل عمران: ٨

❁ ❁ ❁

# حیکمەتی سەد و هەشت

((**سُبْحَانَ مَنْ سَتَرَ سِرَّ الْخُصُوصِيَّةِ بِظُهُورِ الْبَشَرِيَّةِ، وَظَهَرَ بِعَظَمَةِ الرُّبُوبِيَّةِ فِي إِظْهَارِ الْعُبُودِيَّةِ**))

## راڤەی وشەکان:

**سبحان:** پاکێتی دەدەمە پاڵ خودا

**ستر:** داپیۆشیوە

**سر:** نهێنی

الخصوصيه: تایبەتمەندی

**بظهور البشرية:** بە دەرکەوتنی ئاکارە مرۆییەکان

**بعظمة الربوبية:** بە مەزنی و شکۆمەندی پەروەردگاریی

**في إظهار العبودية:** لە دەرخستنی بەندایەتیدا

**واتا ((پاکێتی دەدەمە پاڵ ئەو خودایەی نهێنی تایبەتمەندیی بە دەرخستنی ئاکارە مرۆییەکان داپۆشیوە، و بە مەزنی و شکۆمەندی پەروەردگارییشەوە لە دەرخستنی بەندایەتیدا دەرکەوتووە))**

## شرۆڤە:

❁ "تایبەتمەندان" بریتین لە پێغەمبەران(عليهم السلام) و دۆستە نزیکەکانی خودا، ئەوان بە کۆمەڵێك نهێنی گەورەی خودایی تایبەت کراونەتەوە، ئەو ئایەتانە چی بوون لە شەوی ئیسرادا پێغەمبەر(ﷺ) بینینی﴿ سُبْحَٰنَ ٱلَّذِيٓ أَسْرَىٰ بِعَبْدِهِۦ لَيْلًا مِّنَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ إِلَى ٱلْمَسْجِدِ ٱلْأَقْصَا ٱلَّذِي بَٰرَكْنَا حَوْلَهُۥ لِنُرِيَهُۥ مِنْ ءَايَٰتِنَآۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿١﴾ ﴾ الإسراء: ١، یان ئەو ئایەتە مەزنانەی شەوی میعراج﴿ لَقَدْ رَأَىٰ مِنْ ءَايَٰتِ رَبِّهِ ٱلْكُبْرَىٰٓ ﴿١٨﴾ ﴾

النجم: ١٨، بینینی هەموو ئەو ئایەتە مەزنانە لەلایەن مرۆڤێکەوە کە خودا بە بەندەی خۆی ناوی دەبات.

۞ مرۆڤبوونی پێغەمبەران(علیهم السلام) و دۆستانی خودا ئەو خۆڵ و خاکەیە گەنجینەی پڕ لە ئەسراری خودای پێ شاراوەتەوە، گەنجینەی خودا لەناو دۆستانیدا بریتییە لەو دڵەی نهێنییەکانی-بە فەرمانی خودا- لا ئاشکرایە.

۞ مرۆڤبوونی پێغەمبەران(علیهم السلام) بۆ گەلان و ئوممەتانیان فیتنەیەکی گەورە بووە، قورەیش دەیوت ئەمە چۆن پێغەمبەرێکە خواردن دەخوات و بە بازاڕدا دەسوڕێتەوە، ئەی بۆ فریشتەیەکی بۆ سەر دانەبەزێت و لەگەڵ ئەو خەڵکی ئاگاداربکەنەوە ﴿وَقَالُوا۟ مَالِ هَٰذَا ٱلرَّسُولِ يَأْكُلُ ٱلطَّعَامَ وَيَمْشِى فِى ٱلْأَسْوَاقِ ۙ لَوْلَآ أُنزِلَ إِلَيْهِ مَلَكٌ فَيَكُونَ مَعَهُۥ نَذِيرًا ﴿٧﴾﴾ الفرقان: ٧، بێباوەڕان و کەم باوەڕان تەنها دەرەوە و ڕووالەتیان دەبینی، بینینی ئەوان شۆڕ نەدەبوویەوە بۆ ئەو دونیا ئەسرارەی دڵی پێغەمبەرەکە هەڵیگرت بوو.

۞ "دەرخستنی بەندایەتی" لەسەر بەندەکانی خودا تەنها عیبادەت نییە، بەڵکو هەموو ئاتاجی و پێویستییەکی مرۆڤ بە خودا بریتییە لە دەرکەوتنی بەندایەتی لەسەر ئەو مرۆڤە، جا کەسەکە یەکتاپەرست بێت یان هاوەڵدانەر، نابینی کاتێك هاوەڵدانەران گەشتێکی دەریا دەکەن و بە شنەبایەکی خۆش کەشتییەکە جاری دەبێت ئەوان لەو بارەدا خۆیان زۆر بەهێز دێتە پێش چاو و لە خۆشی و مەستی خۆیاندان، لەناکاو بای دەریا بەهێزدەبێت و شەپۆلەکانی دەریایان لێ هەڵدەکات، کەشتییەکە دەکەوێتە هەژان و لەرزین و خەریکە وەردەگەڕێت، و مردن لە هەموو لایەکەوە پەلاماریان دەدات، لەو بارەدا هەموو بە ئەوپەڕی ئیخلاصەوە بۆ خودا گەردنکەچ دەبن و ڕووی دڵیان دەکەنە خودا و دەست بە پاڕانەوە دەکەن، قورئان ڕووداوەکەمان بۆ وێنە دەکێشێ و دەفەرموێت:﴿هُوَ ٱلَّذِى يُسَيِّرُكُمْ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا كُنتُمْ فِى ٱلْفُلْكِ وَجَرَيْنَ بِهِم بِرِيحٍ طَيِّبَةٍ وَفَرِحُوا۟ بِهَا جَآءَتْهَا رِيحٌ عَاصِفٌ وَجَآءَهُمُ ٱلْمَوْجُ مِن كُلِّ مَكَانٍ وَظَنُّوٓا۟ أَنَّهُمْ أُحِيطَ بِهِمْ ۙ دَعَوُا۟ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ لَئِنْ أَنجَيْتَنَا مِنْ هَٰذِهِۦ لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿٢٢﴾ فَلَمَّآ

﴿أَنجَىٰهُمۡ إِذَا هُمۡ يَبۡغُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ﴾ يونس: ٢٢- ٢٣، ئەم پاڕانەوە و دوعا و داوایە -بە ئەوپەڕی گەردنکەچییەوە- نیشانەی مەزنیی و شکۆمەندیی پەروەردگارییە، خودا بەو کارەی گەورەیی پەروەردگاریی نیشانی بەندەکانی دەدات.

❁ پێغەمبەران(علیهم السلام) و خانەوادە و شوێنکەوتووانیان نموونەی نیشاندانی عبودییەت و دەرخستنی شکۆمەندی پەروەردگار بوون، سەرنج بدە چۆن باسی زەکەریا(عليه السلام) و هاوسەرەکەی و کوڕەکەیان دەکات و دەفەرموێت: بۆمان گەردنکەچ و خاشیع بوون﴿فَٱسۡتَجَبۡنَا لَهُۥ وَوَهَبۡنَا لَهُۥ يَحۡيَىٰ وَأَصۡلَحۡنَا لَهُۥ زَوۡجَهُۥٓۚ إِنَّهُمۡ كَانُواْ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡخَيۡرَٰتِ وَيَدۡعُونَنَا رَغَبٗا وَرَهَبٗاۖ وَكَانُواْ لَنَا خَٰشِعِينَ ﴿٩٠﴾﴾ الأنبياء: ٩٠

❁ ئەوە تەنها مرۆڤ نییە بە نیشاندانی عبودییەت شکۆمەندیی پەروەردگاریی نیشان دەدات، بەڵکو ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی تیایاندایە بەڵگەی ئەو شکۆمەندیی و مەزنییەی پەروەردگارن﴿تُسَبِّحُ لَهُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ ٱلسَّبۡعُ وَٱلۡأَرۡضُ وَمَن فِيهِنَّۚ وَإِن مِّن شَيۡءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمۡدِهِۦ وَلَٰكِن لَّا تَفۡقَهُونَ تَسۡبِيحَهُمۡۚ إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورٗا ﴿٤٤﴾﴾ الإسراء: ٤٤، ئەستێرە و دار و درەخت، یاخود درەخت و گژوگیا هەموو سوژدە بۆ خودای موتەعال دەبەن ﴿وَٱلنَّجۡمُ وَٱلشَّجَرُ يَسۡجُدَانِ ﴿٦﴾﴾ الرحمن: ٦

❁ چۆن ئایەتەکەی سورەتی "الإسراء"بە کەلیمەی"سبحان" دەستی پێکرد چونکە باس لە ڕووداوێك دەکات کە لەوانەیە لەبەر بیر و زەینی مرۆڤدا وا بێتە پێش چاو کە خودا لە شوێنێکە و پێغەمبەر(ﷺ) براوە بۆ ئەو شوێنە، ئەو (سبحانه وتعالى) بەرز و بڵندترە لەوەی شوێن و چوارچێوە لە ئامێزی بگرێت، بۆیە بە "سبحان"دەستی بەباسکردنی ڕووداوەکە کرد، ئیبن عەتاش باس لە ڕووداوێك دەکات هەندێ خەیاڵ و بیرکردنەوەی لەو جۆرەی لێوە پەیدا دەبێت -کە ئێرە جێگەی باسکردنی نییە- بۆیە ئەسڵەکەی بە وشەی"سبحان" دەست پێکرد.

❁ ❁ ❁

# حیکمەتی سەد و نۆ

((لاَ تُطَالِبْ رَبَّكَ بِتَأَخُّرِ مَطْلَبِكَ، وَلَكِنْ طَالِبْ نَفْسَكَ بِتَأَخُّرِ أَدَبِكَ))

## راڤەی وشەكان:

**لا تطالب**: داوای لێ مەكە

**بتأخر مطلبك**: بە هۆی دواكەوتنی داواكەتەوە

**بتأخر أدبك**: بەهۆی دواكەوتنی ئەدەبتەوە

**واتا ((داوا لـە پەروەردگارت مەكە بەهۆی دواكەوتنی داواكەت لـەلای، بەڵكو داوا لـە نەفست بكە بەهۆی دواكەوتنی ئەدەبییەوە لـە خزمەتی پەروەردگاری))**

## شرۆڤە:

۞ سالیكی ڕێگەی خودا كۆمەڵێك ئاتاجی و داوای لە خزمەتی پەروەردگاردا هەیە، بەو ئاتاجی و داوایانە بەندایەتی خۆی بۆ خودا دەردەبڕێت، واتە ئەو پێویستیانە دەكاتە وەسیلەیەك بۆ دەربڕینی بەندایەتی خۆی، ئەو دەربڕینی بەندایەتی مەبەستە، ئیتر خودا داواكان بەزوویی جێبەجێ دەكات یان بۆ كاتێكی تر دوایان دەخات، یاخود دەیانكات بە زەخیرەیەك بۆ دواڕۆژی سالیك بڕیارەكە لای خودا خۆیەتی و بەپێی زانست و حیكمەتی بڕیاریان لێ دەدات.

۞ كە دەڵێت"داوا لە پەروەردگارت مەكە بەهۆی دواكەوتنی داواكەت لەلای" مەبەستی ئەوە نییە سالیك داوا لە پەروەردگاری نەكات، بەڵكو دواكەوتنی داواكانیش بكات بە وەسیلەی نزیكبوونەوە لە خودا بە داواكردنی زۆرتر و زیاتر بە مەبەستی دەبڕینی بەندایەتی.

۞ تۆمەتباركردنی قەدەرەكانی خودا بەوەی وەڵامی داوا و دوعاكانی ئەو نادەنەوە نیشانەی كەمیی ئەدەبە لە خزمەتی خودادا، بۆیە لە بەشی دووەمی حیكمەتەكەدا

داوا لە سالیك دەكات كە روو لە نەفسی خۆت بكە و داوای لیٚ بكە بۆ لە ئەدەب دواكەوتووە و تاكو ئیٚستا فیٚری ئەدەب نەبووە لە خزمەتی پەروەردگاریدا.

۞ دواكەوتنی داواكان پیٚویستی بە پیٚداچوونەوەی دەروون و شیٚوەی مامەڵە و ئەدەب هەیە لەگەڵ خودا، شایەت حیكمەتی دواكەوتنەكە ئەوەبیٚت كەسەكە پیاداچوونە بۆ ئەدەب و مامەڵەی خۆی بكات لەگەڵ پەروەردگاری.

۞ ۞ ۞

# حیكمەتی سەد و دە

((مَتَى جَعَلَكَ فِي الظَّاهِرِ مُمْتَثِلاً لأَمْرِهِ وَرَزَقَكَ فِي الْبَاطِنِ الاسْتِسْلاَمَ لِقَهْرِهِ فَقَدْ أَعْظَمَ الْمِنَّةَ عَلَيْكَ))

## راڤەی وشەكان:

**ممتثلا لأمره:** فەرمانەكانی جێبەجێ بكەیت، خۆت بە فەرمانەكانی برازێنیتەوە

**في الباطن:** لە ناوەوە

**الإستسلام:** خۆڕادەست كردن

**المنة:** منەت

**واتا ((هەركات لە دەرەوە خۆ رازاندنەوەی بە فەرمانەكان پێ بەخشیت و لە ناوەوە خۆڕادەست كردنی بە زاڵیی پەروەردگار پێ بەخشیت، ئەوە بزانە خودا گەورەترین منەتی بەسەر تۆدا كردووە))**

## شرۆڤە:

۞ لێرەدا ئیبن عەتا باس لە دوو نیعمەتی گەورەی خودا لەسەر بەندەكەی دەكات:

**یەكەمیان لە دەرەوە:** جێبەجێ كردنی فەرمانەكانی شەریعەت لە عیبادەتەكان و سونەتەكان، بەرانبەر بەمەش دووركەوتنەوە لە هەموو كار و كردەوە حەرامكراوەكان و ناپەسەندەكان. **دووەم لە ناوەوە:** خۆڕادەست كردن بە خودا.

۞ ئەم دوو نیعمەتە تەواوكاری یەكترن و هیچ كامیان بەبێ ئەویتریان كامڵ نابێت، جێبەجێ كردنی بڕیارەكانی شەریعەت بەبێ خۆڕادەست كردن بە خودا لە ناوەوە وەك جەستەیەكی بێ رۆح یان كەم رۆحن، خۆڕادەست كردن بە خودا و جێبەجێ نەكردنی بڕیارەكانی شەریعەت بانگەشەیەكی بێ بنەما و ناڕاستە، چونكە گەر خۆی رادەستی خودا بكردبایە خۆی رادەستی بڕیاری خودا دەكرد، مەرجی ئیمان تەسلیم بوونە بە

هەموو ئەو کار و بڕیارانەی خودا لە شەریعەتەکەیدا بەیانی کردووە﴿ وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۗ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًا مُّبِينًا ﴿٣٦﴾ ﴾ الأحزاب: ٣٦

❁ ئیبن عەتا لەو قسە پووچ و بێبنەما دەدات کە هەندێ لە بەناو ئەهلی تەصەوف بانگەشەیان بۆ دەکرد و دەیانوت "شەریعەت" رێگەیەکە و "حەقیقەت"یش رێگەیەکی ترە، شەریعەت بۆ فەقیهەکان و حەقیقەت بۆ ئەهلی تەصەوف، ئەم قسەیە خاڵی کردنەوەی شەریعەتە لە مانا بەرز و بڵندەکانی و هەر کەس بانگەشەی لەو جۆرە بکات دوورە لە حەقیقەت و پەتی ئایین و شەریعەتی لە گەردنی خۆی فڕێداوە و بووە بە هاوەڵی شەیتان.

❁ خۆڕادەست کردن"**الإستسلام**" پلەیەکی بالاّیە لە ئیمان، خۆڕادەست کردن دوای تەصدیق بە هەواڵەکانی وەحی و بڕیارەکان دێت، ئیبراهیم(عليه السلام) پێغەمبەری خودایە و خودا پێی دەفەرموێت:﴿ إِذْ قَالَ لَهُۥ رَبُّهُۥٓ أَسْلِمْ ۖ قَالَ أَسْلَمْتُ لِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٣١﴾ ﴾ البقرة: ١٣١، چ تەصدیقێك لەو تەصدیقە مەزنترە کە کەسەکە پێغەمبەر بێت و لەلای خوداوە وەحی بۆ دابەزێت، لەدوای ئەو تەصدیقە خودا پێی فەرموو: تەسلیم ببە، ئەویش فەرمووی: بە پەروەردگاری جیهانەکان خۆم تەسلیم کردووە.

❁ ❁ ❁

# حیکمەتی سەد و یازدە

((لَيْسَ كُلُّ مَنْ ثَبَتَ تَخْصِيصُهُ كَمَلَ تَخْلِيصُهُ))

## راڤەکردنی وشەکان:

**ثبت:** جێگیر بوو بێت

**تخصیصه:** تایبەتمەندییەکەی

**تخلیصه:** پاکبوونەوە و رزگاربوونی لە حەزو ئارەزوە ناپەسەندەکان

**واتا ((مەرج نییە هەر کەس تایبەتمەندی بۆ جێگیر بوو بێت رزگاربوونی لە حەز و ئارەزووە ناپەسەندەکان کاملْ بوو بێت))**

## شرۆڤە:

❁ **تایبەتمەندبوون:** بریتییە لە بەخشینی کۆمەڵێك بەهرە و مانای بەرز و بڵند بە هەندێ لە بەندەکانی خودا، تایبەتمەندبوون بەخششی خودایە و وەك فەزڵ و منەتێك بەو کەسانەی دەبەخشێت.

❁ پێویستە پیلانی شەیتان لە تایبەتمەندبوون جیا بکرێتەوە کە لێرەدا ئەوەندە دەڵێم: هەر کەسێك فەرزەکانی جێبەجێ نەکرد و تێکەڵ بە حەرامە ئاشکراکان بوو، گەرەکە لە تایبەتمەندبوونەکەی خۆی پرسیاری بۆ دروست ببێت.

❁ بەڵام لێرەدا باشە بزانین مەرجی تایبەتمەندبوون ئەوە نییە کەسەکە کەسێکی کاملْ بێت و لە هەموو حەز و ئارەزووەکان خاڵی بووبێتەوە، چونکە لە بنچینەدا تایبەتمەندبوون بەخشش و بەهرەی خودایە و کەسپی کەسەکەی تێدا نییە.

❁ ئەگەر رۆژێك ئایەتێك لەسەر دەستت جاری بوو مەیکە بە بەڵگەی هێز و دەسەڵاتی مەعنەوی خۆت، بەڵکو بە بەخشش و بەهرەی خودای بزانە و شوکری خودا بکە لەسەری، زۆرجار جاری بوونی ئایەتەکە بۆ خۆت و کەسانی تریش تاقیکردنەوەیە و دەبێت بە شوکر کردن و خۆنەخوێندنەوە تیایدا دەربچیت.

# حیكمەتی سەد و دوازدە

**((لاَ يَسْتَحْقِرُ الْوِرْدَ إِلاّ جَهُولٌ، الْوَارِدُ يُوجَدُ فِي الدَّارِ الآَخِرَةِ، وَالْوِرْدُ يَنْطَوِي بِانْطِوَاءِ هَذِهِ الدَّارِ، وَأَوْلَى مَا يُعْتَنَى بِهِ مَا لاَ يُخْلَفُ وُجُودُهُ، الْوِرْدُ هُوَ طَالِبُهُ مِنْكَ، وَالْوَارِدُ أَنْتَ تَطْلُبُهُ مِنْهُ، وَأَيْنَ مَا هُوَ طَالِبُهُ مِنْكَ مِمَّا هُوَ مَطْلَبُكَ مِنْهُ؟))**

## راڤەی وشەكان:

**لا يستحقر**: بە كەمی نازانێت

**الورد:** هەموو ئەو كار و كردەوانەی خودا لە باوەڕداری داوا دەكات

**جهول:** زۆر نەزان

**الوارد:** ئەو مانا و مەعریفە خواییانەی روو لە دڵ دەكەن

**ينطوي:** دەپێچرێتەوە

**واتا ((تەنها كەسی نەزان كاروكردەوە داواكراوەكان لەلای خوداوە(الورد) بە كەم دەزانێت، ئەو مانا و مەعریفە خواییانەی روو لە دڵ دەكەن(الوارد) لە دوارۆژدا دەبینرێنەوە، بۆیە لەپێشترە سەرقاڵی شتێك ببیت كە لەدەست دەردەچێت، كاروكردەوەكان خودا لە تۆی داواكردووە، مانا و مەعریفە خواییەكان تۆ لە خودات داواكردووە، ئەوە لە كوێ ئەو داوات لێ دەكات لەگەڵ ئەوەی تۆ داوای دەكەی لە ئەو))**

## شرۆڤە:

۞ **ویرد:** بریتییە لە كۆی ئەو كار و كردەوانەی خودا لە بەندەكانی خۆی داوای ئەنجامدانیان دەكات و بە كردەوە چاكەكان(**الأعمال الصالحات**) لە قورئان و فەرموودە ناویان براوە، وەك نوێژ و رۆژ و حەج و زەكات و سەدەقە و تێكۆشان و بانگەواز و یادی خودا و چاندنی تۆوی چاكە و بڵاوە پێكردنی رەوشتی جوان و بەرز و لێبوردەیی و خزمەتی هەژاران و نەداران و هتد..

۞ **وارید:** بریتییه لەو مانا و مەعریفە خواییانەی لە خوداوە بەسەر دڵدا دادەبارێن، ئەم مانا و مەعریفانە مانا و مەعریفەگەلێکن کە لە دوارۆژدا بۆ کەسی باوەڕدار کامڵ دەبن و دڵ لە ناویاندا مەلە دەکات.

۞ کار و کردەوەکان(**الأعمال الصالحات**) داواکاری خودان و پێویستە لەم دونیایەدا ئەنجام بدرێن، بە مردنی مرۆڤ و کۆتاهاتنی دونیا کار و کردەوەکان کۆتاییان پێ دێت و دەپێچرێنەوە، بۆیە پێویستە بەر لەوەی کۆتایی بە تەمەن بێت پەلاماری ئەو کار و کردەوە چاکانە بدرێت و لە ئەنجامدانیان کەمتەرخەمی نەکرێت.

۞ هەندێك لە سالیکان لە جێگەی خێراکردن لە ئەنجامدانی ئەو کار و کردەوانە چاوەڕوانی واریدات و هاتنی مەعاریفە خواییەکان، ئەو ئەوەی لەبیرچووە کە شەپۆلی ماناکان و هاتنی مەعاریفەکان بە ئەنجامدانی کار و کردەوەی چاکەوە بەستراونەتەوە.

۞ ئەوراد بۆ دونیایە و واریدات لە دوارۆژە، بۆیە کارەکانی دونیا ئەنجام بدە و بەری ماناکانی دوارۆژ دروێنە بکە.

۞ هەندێ لەوانەی رێگەی خودا دەگرنەبەر شەیتان فریویان دەدات و کار و کردەوە چاکەکایان لەبەرچاو سوك دەکات و پێیان دەڵێت مانا و مەعاریفە دابەزیوەکان بۆ سەر دڵ گرنگە نەك رووالەتی شەریعەت، ئەو کەسانە با بزانن شەیتان وەحی خۆی بۆ دابەزاندوون و بەو کارەیان چوونەتە ریزی دۆستەکانی شەیتانەوە، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) تا دواهەناسەی تەمەنی سەرقاڵی کار و کردەوەی چاکە بوو، رۆژ لەدوای رۆژ کردارە چاکەکانی زۆرتر و زیاتر دەبوو هەتا گەیشتن بە لیقای خودا، هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر هەمان سوننەت و رەوشتی پێغەمبەر(ﷺ) رۆیشتن و پێشینی چاکانیش لەسەر هەمان رەوگە بوون، بۆیە هەر کەس ئەو جۆرە بانگەشەی کرد هیچ گومانت نەبێت لەوەی بانگ بۆ لای شەیتان دەکات، بەلاّم لە پۆشاکی ئاییندا.

۞ ۞ ۞

# حیکمەتی سەد و سیازدە

(( وُرُودُ الإِمْدَادِ بَحَسَبِ الاسْتِعْدَادِ، وَشُرُوقُ الأَنْوَارِ عَلَى حَسَبِ صَفَاءِ الأَسْرَارِ))

**راڤەی وشەکان:**

**الإمداد:** کۆمەکی

**شروق:** هەڵهاتن

**صفاء الأسرار:** پاڵفتەبوونی ناخی مرۆڤ

**واتا ((هاتنی کۆمەکی بەپێی ئامادەییە، هەڵهاتنی نوور بەپێی پاڵفتەبوونی نهێنی و پەنهان و ناخی کەسەکەیە))**

**شرۆڤە:**

❁ کۆمەکی خودا بۆ مرۆڤ بە ئەندازەی ئامادەیی و لێبڕانی کەسەکەیە بۆ وەرگرتنی کۆمەکی لە خوداوە، ئامادەیی و لێبڕانی کەسەکە بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانە خواییەکان و دوورکەوتنەوە لە حەرامکراوەکان و ئەنجامدانی ئەورادی رۆژانە، هەموو ئەمانەش بە مەبەستی رازیکردنی خودا لە خۆی و پاکبوونەوەی دڵ و دەروون.

❁ بانگەشەی بێبنەما بۆ وەرگرتنی کۆمەکی خوایی بەم ئەسڵە پووچ دەبێتەوە، چونکە خودا تەماشای ئامادەییەکانی دڵ و دەروونی کەسەکە دەکات بۆ رازی کردنی خودا، ئەگەر تەنها بانگەشەیەکی سەر زمان و بێ کردەوە بوو، ئەوا خودا کۆمەکییەکانی لێ دەگرێتەوە.

❁ ئەم حیکمەتە کارکردن بە شەریعەت و کاروکردەوە زاهیرییەکان جێگیر دەکات و هەموو ئەو قسە بێبنەمانە رەد دەکاتەوە کە حەقیقەت بەجیا لە شەریعەت تەماشا دەکات، ئەم ئەسڵە لە حیکمەتەکان پێمان دەڵێت رێگەی گەیشتن بە حەقیقەت بریتییە لە ئەنجامدانی فەرمانەکانی شەریعەت و دوورکەوتنەوە لە نەهی لێکراوەکان.

۞ خودای موتەعال عیبادەتەکانی بۆ پاکبوونەوەی دڵ و پەنهانی مرۆڤ داناوە، نوێژ و ڕۆژ و حەج و زەکات و یادی خودا و تێکۆشان، هەر هەموو حیکمەتی مەزن لە پشتییانەوەیە و لە ڕێگەیانەوە ناوەوە و دەرەوەی مرۆڤ پاك دەبێتەوە، هەڵهاتنی نوور لە دڵ و پەنهانی مرۆڤدا بەپێی ئەو پاکبوونەوەیە، بۆیە گەڕان بەدوای نووردا لە جێبەجێ کردنی فەرمانە خواییەکانەوە دەست پێ دەکات، ئێمە ناگەین بە نوور تا خاوێن نەبینەوە، خاوێن نابینەوە گەر عیبادەتەکان جێبەجێ نەکەین و خۆمان لە حەرامکراوەکان بەدوور نەگرین.

۞ پەنهان و نهێنی مرۆڤ لە دڵی مرۆڤ قووڵترە، پاکبوونەوەی پەنهان و نهێنی بریتییە لە پاکبوونەوە لە پاکبوونەوەی پێشوو، نموونەی ئاوێنەیەك بهێنە پێش چاوی خۆت کە تۆزی لێ نیشتووە، **پاکبوونەوەی یەکەم** بریتییە لە سڕینەوە و لادانی تەپ و تۆز و دەرکەوتنی ڕووی ئاوێنەکە، پاکبوونەوەی دووەم بریتییە لە خاوێنکردنەوەی زیاتری ڕووی ئاوێنەکە تا ڕادەی درەوشانەوە و بریقەداربوون، لە **پاکبوونەوەی دووەمدا** ئاوێنەکە نووری خۆر وەردەگرێت و بەجوانی بۆ دەوروبەر دەیشکێنێتەوە، بۆیە(وەك لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە) دوای ئەنجامدانی فەرزەکان سوننەتەکان دەست پێ دەکات، هەر یەکێك لە عیبادەتەکان سوننەتی تایبەت بە خۆی هەیە، نوێژی فەرز نوێژی سوننەتی لەگەڵە، ڕۆژووی فەرز ڕۆژووی سوننەتی لەگەڵە، حەج کردن عەمرەی لەگەڵە، زەکاتدان بەخشین و خێرو سەدەقەی لەگەڵە، سوننەتەکان بریتین لە پاکبوونەوەی دووەمی نهێنی و پەنهانی مرۆڤ، بۆیە-وەك لە فەرموودە سەحیحەکەدا- هاتووە ئاماژە بەوە دەکات کەسەکە دوای ماوەیەك لە بەردەوامی لەسەر سوننەتەکان دەگاتە خۆشەویستی خودا و خودا کەسەکەی خۆشدەوێت، لەوێوە وەرگەڕانێکی مەزن ڕوودەدات، چاو و گوێ و دەست و لاقی ئەو کەسە دەکەوێتە ژێر چاودێری خوداوە و بۆ خودا و بە خوداوە بەگەڕ دەکەون.

۞ ۞ ۞

# حیکمەتی سەد و چواردە

((الْغَافِلُ إِذَا أَصْبَحَ يَنْظُرُ مَاذَا يَفْعَلُ؟، وَالْعَاقِلُ يَنْظُرُ مَاذَا يَفْعَلُ اللهُ بِهِ؟))

## راڤەی وشەکان:

**الغافل:** بێئاگا

**ماذا يفعل:** چ کارێك ئەنجام بدات

**ماذا يفعل الله به:** خودا چی بە ئەو ئەنجام دەدات

**واتا ((بێئاگا ئەو کەسەیە بەیانی ڕۆژی لێ دەبێتەوە تەماشا دەکات و بیردەکاتەوە چ کارێك ئەنجام بدات، ژیر و بەئاگا ئەو کەسەیە بەیانی ڕۆژی لێ دەبێتەوە تەماشا دەکات بزانێت خودا چ کارێك بە ئەو ئەنجام دەدات))**

## شرۆڤە:

❁ لەم حیکمەتەدا ئیبن عەتا باس لە دوو ئاست دەکات لە مامەڵەکردن لەگەڵ خودا، ئاستێك: کەسەکە هەموو شاندادانێکی لەسەر توانا و هەوڵی خۆیەتی و ئاگای لە ویست و بڕیاری خودا نییە، لەگەڵ ئاستێك کە کەسەکە نزیکی لەگەڵ خودای خۆی هەیە و هەست بە بڕیار و دەستی خودا دەکات لە کاروبارەکانیدا، بۆیە لە ئەنجامدانی کار وکردەوەکانیدا خودای لەبیرنەکردووە.

❁ ئاستێکی زۆر باڵا بوونی هەیە کە عاریفانی مەزن تیایدا دەژین، ئەو ئاستەش کەسەکە وا لێدەکات لە جووڵە و وەستانیدا خۆی ڕادەستی خودا بکات، ئەو هەست دەکات قەدەرەکانی خودان کارەکانی بۆ دەهێننە پێشەوە، ئەو لە هەموو دۆخ و بارێکیدا خۆی ڕادەستی خودا کردووە و خۆش و ناخۆش وەك یەك پیشوازی لێ دەکات، ئەم ئاستە باڵا بۆ کەسانی زۆر باڵایە لە زانایان و عاریفان و ناکرێتە یاسا و ڕێسای ژیانی خەڵکی بەگشتی.

۞ باری ناوەند بۆ ئەم حیکمەتە ئەوەیە: مرۆی باوەڕدار خاوەنی بەرنامەی ورد و دروست بێت بۆ ئەنجامدانی کاروبارەکانی، بەلاّم گرتنەبەری هۆکارەکان تەنها وەك هۆکار تەماشا دەکات و سەرئەنجامی ئەو کارانە لە خوداوە دەبینێت، ئەو باوەڕی بەوە هێناوە هیچ کارێك ناگاتە ئەنجام بە بڕیاری خودا نەبێت، تێگەیشتووە لەو راستییەی زیان و قازانج خودا بڕیاریان لێ دەدات، ئەو وەك رێزگرتن لە سوننەتە خواییەکان دەست بۆ هۆکارەکان دەبات، ئەگینا دەزانێت بەبێ بڕیاری خودا هیچ شتێك ناگاتە ئەنجام، ئەو لەو کارانەدا سەرمەشقی لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) وەردەگرێت کە لە کاتی کۆچکردندا لە شاری مەککەوە بۆ مەدینە کۆمەڵێك هۆکاری گرتۆتە بەر، لە کاتێکدا دەیزانی خودا ئەو دەپارێزێ و بەڵێنی گەڕانەوەی بۆ شاری مەککە پێ درابوو.

۞ ۞ ۞

# حیکمەتی سەد و پازدە

((إِنَّمَا يَسْتَوْحِشُ الْعُبَّادُ وَالزُّهَّادُ مِنْ كُلِّ شَيْءٍ لِغَيْبَتِهِمْ عَنِ اللهِ فِي كُلِّ شَيْءٍ، فَلَوْ شَهِدُوهُ فِي كُلِّ شَيْءٍ لَمْ يَسْتَوْحِشُوا مِنْ شَيْءٍ))

## راڤەی وشەکان:

**يستوحش:** وەحشەت و نامۆبوون رووی تێدەکات

**العباد:** عابیدان

**الزهاد:** زاهیدان

**لغيبتهم:** بەهۆی بزربوونیان

**فلو شهدوه:** گەر خودایان ببینیبایە

**واتا ((عابیدان و زاهیدان لە هەموو شتێك نامۆن و وەحشەت روویان تێدەکات، چونکە لەناو شتەکاندا خودایان بزرکردووە، گەر ئەوان خودایان لەناو هەموو شتێکدا ببینیبایە لە هیچ شتێك وەحشەت و نامۆبوون رووی تێنەدەکردن))**

## شرۆڤە:

❁ ئاستەکان لە یەکتر جیاوازن، عابیدان و زاهیدان لە ئاستێکدان تەنها خودا لەناو عیبادەت و زوهددا دەبیننەوە و لە هەموو شتەکانی تری ناو ژیان و گەردوون بێئاگان، ئەوان کەسانێکن هێشتا ئاسۆی ناسینی خودا لەلایان بەرتەسکە و بەرووی دروستکراوەکانی خودادا نەکراوەتەوە، کەسانێکن لە خوداپەرستیدا خاڵی نەبوونەتەوە لە حەزەکانی دەروون، ئەوە ئەنجام دەدەن لە بەندایەتی کە خۆیان حەزی لێ دەکەن، ئەم خاڵی نەبوونەوە لە حەزەکان ئاسۆی خوداناسی ئەوانی بەرتەسك کردۆتەوە.

❁ عاریفان لە ئاستێکی باڵادان، ئەوان هەموو شتێکی ناو ژیان و گەردوونیان خۆشدەوێت و هۆگرییان پێیانەوە هەیە، ئەمەش نەك لەبەر خودی شتەکان بەڵکو لەبەر

ئەوەی بەڵگە و نیشانەیەکن لەسەر خودا، ئەوان بوون بە ئاوێنەیەك دەزانن بۆ شکاندنەوەی نووری ناو و سیفەتە بەرز و شکۆمەندەکانی خودای موتەعال، عابیدان و زاهیدان بۆیە وەحشەتیان لە شتەکان هەیە، چونکە سیفەت و ناوە جوانەکانی خودای تیا نابیننەوە.

❁ بینینی ناو و سیفەتەکانی خودای موتەعال لە ئاسۆی دەروون و گەردووندا خوداناسی مەزنی گەرەکە، خوداناسێك بە مەعریفەی شەریعەت کامڵ بووبێت و لە نووری قورئان و چرای پێغەمبەرایەتییەوە هیدایەتی وەرگرتبێت، چونکە هەر کەس لەو رێگەیەوە بۆ لای خودا بەرز نەبێتەوە، دواجار رووبەڕووی شکست دەبێتەوە، لەوانە تێکەڵ کردنی خالیق بە مەخلوق کە هەندێ لە سۆفییەکان تیایدا بە چۆکدا هاتن.

❁ ❁ ❁

# حیكمەتی سەد و شازدە

((أَمَرَكَ فِي هَذِهِ الدَّارِ بِالنَّظَرِ فِي مُكَوَّنَاتِهِ، وَسَيَكْشِفُ لَكَ فِي تِلْكَ الدَّارِ عَنْ كَمَالِ ذَاتِهِ))

## راڤەی وشەكان:

**أمرك:** فەرمانی پێكردووی

**بالنظر:** بە سەرنج و تێڕامان و بیركردنەوە

**مكونات:** دروستكراوەكان لە گەردوون و ئەوەی تێیدایە

**كمال ذاته:** كەماڵی زاتی خودای موتەعال

**واتا ((لەم خانەی دونیادا فەرمانی پێكردووی لە دروستكراوەكانی ڕابمێنی، لە خانەی دواڕۆژدا كەماڵی زاتی خۆی نیشانی تۆ دەدات))**

## شرۆڤەكردن:

۞ خودا فەرمانی بە تێڕامان و وردبوونەوەو سەرنجدانی زەوی و ئاسمان و مرۆڤ و ژیان كردووە، لە چەندین ئایەتی قورئاندا ئەم فەرمانە دووبارە دەكاتەوەو هەر جارێك سەرنجمان بۆ لای بوون و دیاردەیەك رادەكێشێت، لەوانە ﴿ ٱلَّذِينَ يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَـٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِى خَلْقِ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَـٰذَا بَـٰطِلًا سُبْحَـٰنَكَ فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿١٩١﴾ ﴾ آل عمران: ١٩١، هەمیشە و لە هەموو بارەكاندا یادی خودا دەكەن، چونكە خودا لە هەموو شتەكاندا دەبینن، هەروەها﴿ أَفَلَا يَنظُرُونَ إِلَى ٱلْإِبِلِ كَيْفَ خُلِقَتْ ﴿١٧﴾ وَإِلَى ٱلسَّمَآءِ كَيْفَ رُفِعَتْ ﴿١٨﴾ وَإِلَى ٱلْجِبَالِ كَيْفَ نُصِبَتْ ﴿١٩﴾ وَإِلَى ٱلْأَرْضِ كَيْفَ سُطِحَتْ ﴿٢٠﴾ ﴾ الغاشية: ١٧-٢٠، سەرنجی خەلقی حوشتر و بەرزی ئاسمان و دامەزرانی چیاكان و راختنی زەوی بدەن، هەروەها﴿ قُلْ سِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَٱنظُرُوا۟ كَيْفَ بَدَأَ ٱلْخَلْقَ ﴾ العنكبوت: ٢٠،

بگەڕێن بە سەر زەویدا و ببینن چۆن خەلق دەستی پێکردووە، قورئان ناسینی خودای بە ناسینی گەردوون و مرۆڤ و ژیانەوە گرێداوە، تەنها دوو ڕێگە بۆ ناسینی خودا بوونی هەیە: ڕێگەی وەحی و پێغەمبەران، هاوتا لەگەڵ ڕێگەی بیرکردنەوە و تێڕامان لە خۆ و لە ژیان و گەردوون، بیرکردنەوە و تێڕامان حەقیقەت و راستەقینەی ئەوەی پێغەمبەران(علیهم السلام) هێناویانە دەسەلمێنێت.

۞ بیرکردنەوە و تێڕامان بەرنامەیەکی تایبەتی پێویستە، لەم مەیدانەدا ئیمامی غەزالی لە **"إحياء علوم الدين"**و کتێبەکانی تردا بەرنامەیەکی ورد بۆ بیرکردنەوە و تێڕامان دیاری دەکات و کتێبێکی تایبەت بە بیرکردنەوە لە دروستکراوەکانی خودا داناوە بە ناوی(**الحكمة في مخلوقات الله**)[٢٠]

۞ ئیبن عەتا لەم حیکمەتەدا ئاماژە بە خاڵێکی زۆر ورد دەکات، ئەویش وردبوونەوە و تێڕامان و خوێندنەوەی گەردوونە، ئەو ئاماژە بەوە دەدات کە چەندە لەم ژیانەدا لە نهێنی و حیکمەتەکانی خودا رابمێنی و لێیان حاڵی ببیت و لەگەڵیان بژیت ئەوەندە لە خانەی دوارۆژدا کەماڵی زاتی خودای موتەعالت نیشان دەدرێت.

۞ ۞ ۞

---

٢٠ ئەم کتێبەم وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی.

# حیکمەتی سەد و حەڤدە

((عَلِمَ مِنْكَ: أَنَّكَ لاَ تَصْبِرُ عَنْهُ، فَأَشْهَدَكَ مَا بَرَزَ مِنْهُ))

## راڤەی وشەکان:

**علم منك:** دەتناسێت، دەزانێت تۆ چۆنیت، زانستی بە تۆ هەیە

**لا تصبر عنه:** ئارام ناگریت لەسەری

**فأشهدك:** پێی نیشانداوی

**ما برز منه:** ئەوەی لە ئەوەوە دەرکەوتووە، مەبەستی ئاسمانەکان و زەوییە

**واتا ((خودا زانستی بە تۆ هەیە کە ئارام ناگریت لەسەری، بۆیە ئەوەی لە ئەوەوە دەرکەوتووە و سەرچاوەی گرتووە بە تۆی نیشاندا))**

## شرۆڤە:

ئەم حیکمەتە تەواوکاری حیکمەتەکەی پێشووە، کە باسی ئەوەی کرد خودا فەرمانی پێکردووی بە سەرنجدان و بیرکردنەوە و تێڕامان لە دروستکراوەکانی خودا، لەم حیکمەتەشدا پێمان دەڵێ حیکمەت لەو فەرمان کردنە چییە.

مرۆڤ بە رۆح تامەزرۆی خودا و گەیشتنەوەیە بە خودا، چونکە رۆحی لەلای خوداوە هاتووە، بۆ ئەوەی کەمێك لەو تامەزرۆبوونەی مرۆڤ کەم بکاتەوە گەردوونی کردووە بە ئاوێنەیەك کە نووری ناوە جوانەکان و سیفەتە بەرز و بڵندەکانی لەسەر پەخش دەبێتەوە، مرۆڤ لەو ئاوێنەوە لە خۆشەویستەکەی خۆی کە خودایە دەڕوانێت و کەمێك لە تامەزرۆبوونەکەی دادەمرکێتەوە، تێربوونی رۆحی بە تێروتەواوی لە رۆژی دواییدایە، کاتێك لە بەهەشتدا خۆی نیشانی دۆستان و خۆشەویستانی دەدات، ئێمە لەم ژیانەدا تەنها نوور و حیکمەتی ناو و سیفەتی خودا هەست پێدەکەین، ئەمەش لەناو ئەو ئاسەوارەدا کە ناو و سیفەتەکانی خودا خولقاندوونی، کاتێك توێکڵی ئاسەوار لادەدەی

دەگەیە نهێنی و حیکمەتی پڕ لە ئەسراری، کاتێك پەردەی ئەسرار لادەدەی نووری سیفەتەکانی خودا گەردوون رووناك دەکاتەوە، کە لەو نووره رادەمێنی زاتێکی خاوەن کەماڵ و جەماڵ و جەلال دەناسی.

۞ ۞ ۞

# حیکمەتی سەد و هەژدە

**((لَمَّا عَلِمَ الْحَقُّ مِنْكَ وُجُودَ الْمَلَلِ لَوَّنَ لَكَ الطَّاعَاتِ، وَعَلِمَ مَا فِيكَ مِنْ وُجُودِ الشَّرَهِ فَحَجَرَهَا عَلَيْكَ فِي بَعْضِ الأَوْقَاتِ لِيَكُونَ هَمُّكَ إِقَامَةَ الصَّلاَةِ لاَ وُجُودَ الصَّلاَةِ، فَمَا كُلُّ مُصَلٍّ مُقِيمٌ))**

### راڤەی وشەکان:

**الحق**: خودای موتەعال

**ملل**: شەکەتی و ماندووبون

**لون لك**: بۆی رەنگاورەنگ کردووی، بۆی هەمەچەشن کردووی

**الشره**: هەڵپە و زیادەڕەوی

**فحجرها عليك**: سنوورداری کردووە لەسەرت

**إقامة الصلاة**: ئەنجامدانی نوێژ بە جوانترین و کامڵترین شێوە

**وجود الصلاة**: بوونی نوێژ

**واتا ((کاتێك خودا دەزانێت بوونی شەکەتی و ماندووبوون لە تۆدا هەیە، عیبادەتەکانی بۆ هەمەچەشن کردووی، هەروەها دەزانێت هەڵپە و زیادەڕەوی لە تۆدایە بۆیە عیبادەتەکانی بە هەندێك لە کاتەکان سنووردار کردووە، بۆ ئەوەی ویست و لێبڕانت ئەنجامدانی نوێژ بێت بە باشترین شێوە، نەك تەنها بوونی نوێژ، چونکە هەموو نوێژکەرێك ئەنجامدەری نوێژ نییە))**

### شرۆڤە:

ئیبن عەتا لەم حیکمەتەدا باس لە دوو بار یان دوو دۆخ دەکات کە مورید تێیدەکەوێت، بارێك کە بە هۆی حەز و لاوازی و سەرقاڵی مرۆڤەوە سەرهەڵدەدات و کەسەکە رووبەڕووی شەکەتی و ماندووبوون دەکاتەوە لە جۆرێك لە بەندایەتی و جێبەجێ

کردنی جۆرێك له عیبادەت، بۆ ئەم بارە لاوازەی مرۆڤ خودا عیبادەتەکانی هەمەچەشن کردووە لە نوێژ و ڕۆژ و حەج و زەکات و یادی خودا و بانگەواز و تێکۆشان و هتد.. کاتێك لە یەکێك لەم عیبادەتانە شەکەتی و ماندووبوون رووت تێدەکات دەتوانی دەست بۆ جۆرێکی تر لە عیبادەت ببەی تاکو چالاکی و حەزت بۆ ئەو عیبادەتە لا دروست دەبێتەوە، عیبادەتەکان هەندێکیان دەبنە هۆی سەرهەڵدانی چێژ و تامەزرۆبوون بۆ هەندێکی تریان، بۆ نموونە ڕۆژوو تام و چێژ بۆ ناو نوێژ دەگێڕێتەوە، نوێژ یادی خودا زیندوو دەکاتەوە، حەج گیانی زەکاتدان لە مرۆڤدا بالاّ دەکات، هتد.. باری دووەم ئەوەیە کە بەهۆی چالاکبوون و زیندەگی زۆرەوە مورید هەڵپە و زیادەڕەوی بۆ دروست دەبێت، بۆ نموونە لە نوێژدا زیادەڕەوی دەکات و لە کاتە نەهیلیێکراوەکاندا نوێژ دەکات، یان ڕۆژانی هەینی بەڕۆژوو دەبێت، بۆ ئەوەی مورید ڕووبەڕووی ئەم زیادەڕەوییە نەبێتەوە خودا عیبادەتەکانی بە کاتی تایبەت سنووردار کردووە، لە ساڵێکدا تەنها یەکجار زەکات دەردەکرێت، مانگی ڕەمەزان بۆ ڕۆژوو دیاریکراوە، حەج مەوسیمی خۆی هەیە، نوێژەکان کاتی تایبەتیان بۆ دیاریکراوە، لەسەرو ئەمانەوە سوننەت و نەوافل هەن، ئەوانیش بە توانا و بۆ ڕەخسانی مرۆڤەوە بەستراونەتەوە.

۞ باشترین بارێك مرۆی باوەڕداری تێدا بێت بریتییە لە باری میانەگیری، نە زیادەڕەوی و نە کەمڕەوی، پێویستە هەموو خاوەن حەقێك حەقی خۆی بۆ بگێڕیتەوە، ئەوەندە بەندایەتی لەسەر خۆت پێویست بکەیت بتوانی شان بدەیە ژێری و حەقی خۆت و دەوروبەری تێدا پێشێل نەکەی.

۞ ۞ ۞

# حیكمەتی سەد و نۆزدە

((الصَّلاَةُ طُهْرَةٌ لِلْقُلُوبِ مِنْ أَدْنَاسِ الذُّنُوبِ، وَاسْتِفْتَاحٌ لِبَابِ الْغُيُوبِ))

**راڤەی وشەكان:**

**طهرة:** پاكبوونەوە

**أدناس:** كۆی "دنس"ە واتە پیسی

**استفتاح:** هەوڵی كردنەوە

**((نوێژ پاكبوونەوەی دڵانە لە پیسی و هەوڵێكە بۆ كردنەوەی دەرگای پەنهانەكان))**

**شرۆڤە:**

❁ لە حیكمەتەكەی پێشتردا ئاماژەی كرد بە عیبادەتەكان بەگشتی و نوێژ بە تایبەتی، لەم حیكمەتەشدا باسی گرنگی نوێژ دەكات بۆ رێبواری رێگەی خودا.

❁ نوێژ پاككەرەوەی دڵانە لە چڵك و پیسی مەعنەوی، قورئان دەفەرموێت:﴿إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِ﴾العنكبوت: ٤٥، بەڵكو وەك لە فەرموودەی شیریندا هاتووە رووبارێكە و لە رۆژێكدا پێنج جار كەسی نوێژكەر خۆی لە ناویدا دەشوات (**عن أبي هريرة رضي الله عنه أنه سمع رسول الله** (ﷺ) **يقول:** ((**أَرَأَيْتُمْ لَوْ أَنَّ نَهْرًا بِبَابِ أَحَدِكُمْ يَغْتَسِلُ مِنْهُ كُلَّ يَوْمٍ خَمْسَ مَرَّاتٍ، هَلْ يَبْقَى مِنْ دَرَنِهِ شَيْءٌ؟ قَالُوا: لا يَبْقَى مِنْ دَرَنِهِ شَيْءٌ، قَالَ: فَذَلِكَ مَثَلُ الصَّلَوَاتِ الْخَمْسِ، يَمْحُو اللَّهُ بِهِنَّ الْخَطَايَا**)) [٢١]

❁ كاتێك رووی ئاوێنەی دڵ بە نوێژ و یادی خودا و عیبادەتەكان خاوێن دەبێتەوە نوور و رووناكی جیهانی پەنهانی لەسەر پەخش دەبێتەوە، بۆیە بە دوای گرنگی نوێژدا دەفەرموێت: "نوێژ هەوڵێكە بۆ كردنەوەی دەرگای پەنهانەكان"

---

٢١ متفق عليه.

۞ نوێژ میعراجی رۆحە، بۆیە لە بەرزبونەوەی رۆحدا پەردە لەسەر بەشێك لە پەنهان بۆ ئەو دڵە خاوێنە لادەدرێت و بەشێك لە حیكمەت و نهێنییە مەزنەكانی خودا پەی پێ دەبات.

۞ ۞ ۞

# حیکمەتی سەد و بیست

((الصَّلاَةُ مَحَلُّ الْمُنَاجَاةِ، وَمَعْدِنُ الْمُصَافَاةِ، تَتَّسِعُ فِيهَا مَيَادِينُ الأَسْرَارِ وَتُشْرِقُ فِيهَا شَوَارِقُ الأَنْوَارِ، عَلِمَ وُجُودَ الضَّعْفِ مِنْكَ فَقَلَّلَ أَعْدَادَهَا، وَعَلِمَ احْتِيَاجَكَ إِلَى فَضْلِهِ فَكَثَّرَ أَمْدَادَهَا))

**راڤەی وشەکان:**

**محل:** شوێن، جێگە

**معدن المصافاة:** کانزای پاڵفتەکراو

**ميادين الأسرار:** مەیدانی نهێنییەکان

**شوارق الأنوار:** نووری هەڵهاتوو

**فقلل أعدادها:** ژمارەکانی کەم کردۆتەوە

**فكثر أمدادها:** فەڕ و خێر و پاداشتی زیادکردووە

**واتا ((نوێژ شوێنی موناجات و کانزای پاڵفتەکراوە، مەیدانی نهێنییەکانی تێدا فراوان دەبێت و نووری هەڵهاتووی تێدا دەدرەوشێتەوە، دەزانێت لاوازیت تێدایە بۆیە ژمارەکانی کەمکردۆتەوە، هەروەها دەزانێت تۆ چەندە بە نوێژ ئاتاجیت بۆیە خێر و فەڕ و پاداشتی نوێژی بۆ زیاد کردووی))**

**شرۆڤە:**

**چوار وەسفی نوێژ دەکات:**

**شوێنی موناجاتە:** چونکە مەدح و سەنای خودا و دوعا و پاڕانەوەی تێدایە.

**کانزای پاڵفتەکراوە:** عیبادەتێکە مرۆڤ تیایدا دەگاتە ئەوپەڕی بەرزبوونەوە و دوورکەوتنەوە لە ماددە و حەز و ئارەزووە دونیاییەکان.

**مەیدانی نهێنییەکانی تێدا فراوان دەبێت:** وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا نوێژ میعراجی رۆحە و زۆرێك لە نهێنی و ئەسراری تێدا بەرچنگ دەکەوێت.

**نووری هەڵهاتووی تێدا دەدرەوشێتەوە:** ئەمەش بە هۆی پالْفتەکردنی دڵ و گۆڕانی بۆ ئاوێنەیەك تاکو نووری ناو و سیفەتە بەرز و بڵندەکانی لەسەر بشکێتەوە، پاش ئەم چوار وەسفە بۆ نوێژ ئاماژە بە دوو خاڵی گرنگ دەکات:

**یەکەمیان:** خودا دەزانێت مرۆڤ لاوازی تێدایە، سەرقاڵی خۆی و خێزان و ژیان دەبێت، بۆیە ژمارەی نوێژەکانی لە پەنجا نوێژەوە بۆ کردووە بە پێنج نوێژ.

**دووەم:** خودا دەزانێت مرۆی باوەڕدار چەندە ئاتاجە بە خێر و فەڕ و پاداشتی نوێژ بۆیە لە جێگەی خێری پێنج نوێژ خێری پەنجا نوێژی بۆ دەنوسێت، چونکە چاکە یەك بە دە و زیاتریشە، خودا ئاگادارە کە تەمەنی شوێنکەوتووانی ئوممەتی محمد (ﷺ) تەمەنێکی کەمە بەراورد بە تەمەنی ئوممەتانی پێشتر، بۆیە بە چەند رێگەیەك خێر و چاکەی بۆ زیاد کردووە، لەوانە چاکە بۆیان یەك بە دە و تا یەك بە حەوسەد و زیاترە، لە رەمەزاندا شەوێکی داناوە کە خێری لە هەزار مانگ عیبادەت زۆرترە، کردوونی بە ئوممەتی حەزرەتی محمد (ﷺ) کە باشترین پێغەمبەر و باشترین ئایین و باشترین کتێبیان لە لای خوداوە بۆ رەوانە کراوە.

۞ مەدەد و کۆمەکی ناو نوێژە مەزن و چاوەڕوان نەکراوە، مرۆڤ هەرکاتێك ترس و خەم و پەژارە دایدەگرێت با دەستنوێژ هەڵبگرێ و دوو رکات نوێژ بۆ خودای موتەعال بکات و ببینێت چۆن ترس و خەمی دەڕەوێتەوە.

۞ ۞ ۞

# حیكمەتی سەد و بیست و یەك

((مَتَى طَلَبْتَ عِوَضًا عَلَى عَمَلٍ طُولِبْتَ بِوُجُودِ الصِّدْقِ فِيهِ، وَيَكْفِي الْمُرِيبَ وِجْدَانُ السَّلاَمَةِ))

**راڤەی وشەكان:**

**طلبت:** داوات كرد

**عوضا:** پاداشت

**طولبت:** داوات لێدەكرێ

**المريب:** كەسی بە گومان

**وجدان السلامة:** ناخێكی سەلامەت

**واتا ((هەر كات لەسەر كارەكەت داوای پاداشتت كرد، ئەوا داوات لێ دەكرێ صدقت لە كارەكەتدا هەبێت، بوونی ناخێكی سەلامەت بەسە بۆ كەسی بەگومان))**

**شرۆڤە:**

❁ خودا داوای كار و عیبادەتی لە ئێمە كردووە، بەندە چ ئەركێكی خۆی هەیە ئەنجامی بدات جگە لە كار و فەرمانی گەورەكەی خۆی؟ كاری بەندایەتی ئێمە پەیوەستە بە بەندەبوونمانەوە، داوای پاداشت لەسەر كارەكانمان كەمی صدقە لە بەندایەتیدا، ئێمە دەبێت خودا بپەرستین لەبەر ئەوەی شایستەی پەرستنە، ئێمەی دروستكردووەو نیعمەتی ژیانی پێ بەخشیوین و هەموو هۆكارەكانی بەردەوامی ژیانی لەم سەر زەوییە بۆ داناوین، خۆر و مانگ و ئەستێرە، دار و درەخت و گژوگیا، گیاندارانی هەمە جۆر، دەریا و وشكانی، هەوا و دەشت و شاخ، هتد.. هەموو ئەم نیعمەتانە خودا بۆ مرۆڤ دایناون، ئیتر چۆن دەبێت بەندایەتی خودا نەكات، یان بەندایەتی بكات و داوای كرێ لە خودا بكات، بۆ مەگەر ئەو دەریا لە نیعمەت چاكەی خودا نییە لەگەڵ ئێمە؟!

۞ ئەوە خودا بۆ خۆیەتی -لە بەزەیی بەرینەوە- لەسەر کار و کردەوە چاکەکانمان پاداشتمان دەداتەوە، نەك ئەوەی کار و کردەوەکان لەسەر خودا پێویستی بکات لەسەر خودا دەبێت پاداشتمان بداتەوە، "دەبێت" فەرمانە و بەندە ناتوانێت بەرانبەر گەورەکەی بەکاریبهێنێت، بەڵکو تەنها زمانی پاڕانەوە و گەردنکەچی لەنێوان خودا و بەندەدا بوونی هەیە.

۞ تۆ کە داوای پاداشت دەکەی لە کار و کردەوەکانتدا لە هەمان کاتدا داوات لێ دەکرێت لەو کارانەدا صدق ئەنجام بدەی، واتە پێت دەوترێت باشە بەرانبەر بە کارەکەت پاداشتت دەدرێتەوە، بەڵام ئێمە کارێك پاداشت دەدەینەوە تەنها و تەنها بۆ من (واتە بۆ خودا) ئەنجام درابێت، ئەو کات پێی دەوترێت قسەکەت راست نییە، کارەکەت تەنها و تەنها بۆ من ئەنجام نەداوە، کارێك صدقی تێدایە و تەنها و تەنها بۆ خودا ئەنجام دراوە بەشی نەفسی تێدا نەبێت، بەڵام تۆ کارەکەت بەشی نەفسی تێدایە، ئەوە نییە داوای پاداشت دەکەیت لەسەری؟ مەگەر پاداشت بۆ حەزی مرۆڤ و تێرکردنی داواکانی مرۆڤ نییە؟

۞ ئەم حیکمەتە ئاماژە بەوە دەکات کە هەر کات صدق لە کارەکاندا بوونی هەبوو، واتە کارەکان تەنها و تەنها بۆ خودا ئەنجامدرا و بەشی نەفسی تێدا نەبوو، ئەوا بەبێ ئەوەی بەندە داوای پاداشت بکات خودا پاداشتی گەورەی بۆ رەوانە دەکات.

۞ **هەندێك جار نەفس دێت و بە خاوەنەکەی دەڵێت:** گەر تۆ خەریکی ئەنجامدانی کاری چاکە بیت و داوای پاداشت نەکەی لەسەر کردەوەکان، ئەوا خودا پاداشتت بۆ رەوانە ناکات، وەك ئەوەی بڵێت خودا تۆی لەبیری خۆی بردۆتەوە و بە داواکانت بیری خودای بهێنەرەوە، بە تایبەت پاداشتە دونیاییەکان، لە ئاسان کردنی کارەکان و رۆزی حەلاڵ و ناوبانگی باش و هتد.. ئەم قسانە لە خۆیاندا سەرهەڵدانی گومانن لە بەڵێنی خودا، مەگەر خودا بۆخۆی نەیفەرمووە﴿ مَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةً طَيِّبَةً ۖ وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٩٧﴾ ﴾ النحل: ٩٧، هەر کەس کرداری چاکە ئەنجام بدات لە باوەڕدارانی ژن و پیاو-بە ئیمانەوە- بە پاکترین و خۆشترین ژیان دەیان ژیەنین و بە باشترین کردەوەیان پاداشتیان دەدەینەوە، سەرهەڵدانی

ئەم خوتوکانەی نەفس خاوەنەکەی دەکات بە کەسێك کە دەروونی بە تەمومژ و لێڵی شك و گومان دەورەدراوە، لەو بارەدا بەو کەسە دەوترێت "المریب" کەوابوو ئەوەی لەسەر بەندەی خودایە ئیمان و گوێڕایەڵییە، ئیتر تەگبیرکردنی کاروبارەکانی ژیانی بەندە لەسەر گەورەکەیەتی، ئەو خۆی رادەستی خودای موتەعال کردووە و هیچ ترس و خەمێکی بۆ ئێستا و داهاتوو نییە، ئەم خۆڕادەست کردنە سەلامەتی ناخ دروست دەکات و مرۆڤ لە خەم و ترس خاڵی دەکاتەوە، ئەمەش پێی دەوترێت سەلامەتی ناخ (**وجدان السلامة**)، گەورەترین پاداشت بۆ کاروکردەوە باشەکان ئەوەیە خودا شك و گومان و تەمومژی ناخت بڕەوێنێتەوەو ناخێکی سەلامەتت پێ ببەخشێت، ئەمەش بەسە بۆ بەندەی راستەقینە گەر بیەوێت گەشتێکی سەلامەت بۆ لای خودا ئەنجام بدات.

۞ دەوترێت خودا فەرمانی بە دوعاکردن کردووە چۆن دەبێت داوا لە خودا نەکەین؟! راستە، خودا فەرمانی بە دوعاکردن کردووە، چونکە دوعاکردن مۆخی عیبادەتە، لە دوعاکردندا مرۆڤ دەگاتە ئەوپەڕی گەردنکەچی بۆ خودا، بۆیە پێویستە دوعاش وەك کار و کردەوەکانی تر لە بەشی نەفس خاڵی بکەیەوە، دوعاکردنت عیبادەت کردن بێت بۆ خودای موتەعال بەبێ بەش و حەزی نەفس، خودا فەرمانی بە دوعا کردن کردووە، نەك بۆ ئەوەی داوا و پێویستییەکانمان بیری خودا بخەینەوە، نەخێر، خودا هیچی لەبیرناچێت ﴿وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيًّا ﴿٦٤﴾﴾ مریم: ٦٤، ئەو تۆ دەبینێت، ئاگادارە بە پێویستییەکانی تۆ، بەڵکو ئاگادارە بە شارەوەکانی دەروونت، تۆ تەنها گەردنکەچی و پاڕانەوەت لەسەرە، وەك بەندەیەك لەبەردەم گەورەکەیدا، سەرئەنجامەکان رادەستی ئەو بکە.

۞ ۞ ۞

# حیکمەتی سەد و بیست و دوو

**((لاَ تَطْلُبْ عِوَضًا عَلَى عَمَلٍ لَسْتَ لَهُ فَاعِلاً، يَكْفِي مِنَ الْجَزَاءِ لَكَ عَلَى الْعَمَلِ أَنْ كَانَ لَهُ قَابِلاً))**

## راڤەی وشەکان:

**عوضا:** پاداشت

**فاعلا:** ئەنجامدەر

**قابلا:** جێگەی کاری چاکە، وەرگری کاری چاکە

**واتا ((داوای پاداشت مەکە لەسەر کارێك کە تۆ بکەرە راستەقینەکەی نیت، ئەوەندەت پاداشت بەسە لەسەر کرداری چاکە کە تۆی کردووە بە جێگە و وەرگری ئەو کارە چاکەیە))**

## شرۆڤە:

۞ بکەری راستەقینەی کار و کردەوە چاکەکانی مرۆڤ خودای موتەعال خۆیەتی، پەروەردگار خۆمان و کردەوەکانمانی دروست کردووە، قورئان دەفەرموێت: ﴿ وَٱللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ ﴿٩٦﴾ ﴾ الصافات: ٩٦، بکەری راستەقینە تەنها خودای موتەعالە، ئیتر چۆن دەبێت لەسەر کار و کار و کردەوە چاکەکانت داوای پاداشت لە خودا بکەی؟ لە جێگەی داوای پاداشت جۆرێکی تر لە عیبادەت لەسەر پێویست دەبێت، ئەوەش بریتییە لە شوکر کردنی خودا کە تۆی بۆ ئەنجامدانی کاری چاکە هەڵبژاردووە.

۞ ئەوەی کە خودا دروستکەری کردەوەکانی ئێمەیە جێگەی ناکۆکی نێوان ئەهلی سوننە و موعتەزیلەیە، ئەهلی سوننە ئاماژە بەو ئایەتە دەڵێن: خودا خالقی کار و کردەوەکانی مرۆڤە، موعتەزیلە دەڵێن: مرۆڤ دروستکەری کار و کردەوەکانی خۆیەتی، چونکە گەر بڵێین خودا کار و کردەوەکانی مرۆڤی خولقاندووە دەبێت کرداری شەڕ و

خراپەش بدەینە پاڵ خودا، ئەمەش بۆ شکۆمەندی و مەزنی خودا شیاو نییە، لە راستیدا موعتەزیلە بە هەڵەداچوون، چونکە گەورەترین شەڕ لە بووندا بریتییە لە شەیتان و دارودەستەکەی، لەگەڵ ئەوەش خودا بۆ تاقیکردنەوەی مرۆڤ دروستی کردوون، خودا خولقێنەری راستەقینەی کردارەکانە و مرۆڤ تەنها کەسپی کردارەکان دەکات بە چاك و خراپەوە﴿ بَلَىٰ مَن كَسَبَ سَيِّئَةً وَأَحَٰطَتۡ بِهِۦ خَطِيٓـَٔتُهُۥ فَأُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٨١﴾ ﴾ البقرة: ٨١، هەروەها ئایەتی﴿ كُلُّ ٱمۡرِيِٕۭ بِمَا كَسَبَ رَهِينٞ ﴿٢١﴾ ﴾ الطور: ٢١، "کسب"ی کردارەکان جیایە لە "خلق"ی کردارەکان، لێرەدا جێگەی باس کردن نییە و ئەوەندە بەسە بزانیت کردەوە چاکەکان بەخششێکی خودایین بۆ تۆ و دەبێت شوکری خودایان لەسەر بکەیت، دیسان شوکرەکەش کردەوەیەکی چاکەی ترە و پێویستە شوکرێکی تری خودای لەسەر بکەی، پەیبردن بەم نهێنییە دیسان بەخششێکی خودایە و گەرەکە شوکرێکی تری خودای لەسەر بکەی، هەتا ناکۆتا شوکر و حەمدی خودا.

# حیکمەتی سەد و بیست و سێ

((إِذَا أَرَادَ أَنْ يُظْهِرَ فَضْلَهُ عَلَيْكَ خَلَقَ وَنَسَبَ إِلَيْكَ))

## ڕاڤەی وشەکان:

**يظهر**: دەریبخات

**فضله**: چاکەی خۆی

**نسب إليك**: دەیداتە پاڵ تۆ

واتا ((**کاتێك خودا دەیەوێت چاکەی خۆی لەسەر تۆ نیشان بدات، کردارە چاکەکە دەخولقێنێ و دەیداتە پاڵ تۆ**))

## شرۆڤە:

❁ ئەم حیکمەتە تەواوکەری حیکمەتەکەی پێشترە و درێژە بەو بەشەی حیکمەتەکە دەدات کە دەفەرموێ ((ئەوەندە پاداشت بەسە لەسەر کرداری چاکە کە تۆی کردووە بە جێگە و وەرگری ئەو کارە چاکەیە))، لێرەشدا باسی ئەوە دەکات خاوەنی ڕاستەقینەی کردارە چاکەکان خودایە و پاشان پێشکەشی تۆیان دەکات.

❁ کرداری چاکە فەزڵی خودایە لەسەر بەندەکانی، ئەو بۆ خۆی کردەوە چاکەکان دروست دەکات و دەیداتە پاڵ بەندەکانی و دەیانکات بە کردەوەی چاکی ئەوان، چ چاکەیەك لەمە مەزنترە خودا بکەری ڕاستەقینە بێت، کەچی تۆ بکات بە خاوەنی کار و کردەوە چاکەکان؟

❁ خودای موتەعال لە پاڵ خولقاندنی کرداری چاکە و بەخشینی بە بەندەکانی کۆمەڵێك نیعمەتی تری مەزنی لەسەر بەندەکانی هەیە: مەگەر ناردنی پێغەمبەران(عليهم السلام) بە پەیامەوە ڕێگەیەك نییە بۆ ناساندنی چاکە و ڕێگەی چاکە، ئیمان و کرداری چاکە مەزنترین چاکەیەکن کە لە ڕێگەی پێغەمبەرانەوە مرۆڤ پێیان ئاشنا دەبێت، ئەقڵ

و فام بۆ دەرککردنی چاکە و خراپە نیعمەتێکی تری خودایە لەسەر مرۆڤ، ویستی کرداری چاکە و دوورکەوتنەوە لە خراپە نیعمەتێکی تری خودایە.

❁ بۆچی خودا بەندەیەك دەکات بە شایستەی کرداری چاکە و بەندەیەکی تر ناکات؟ سەرەتا دەبێ بزانین بەندە مافی ئەوەی نییە گەورەکەی خۆی بخاتە ژێر پرسیارەوە، چونکە خودا ناخرێتە ژێر پرسیارەوە، بەڵکو ئەوە بەندەیە دەبێت پرسیاری لێ بکرێت﴿ لَا يُسْـَٔلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْـَٔلُونَ ﴿٢٣﴾ ﴾ الأنبياء: ٢٣، دووەم لە کوێ زانستی ئێمە ئابلۆقەی زانستی خودای پێ دەدرێت تاکو بزانین لەناو زانستی خودادا لەسەر ئەو دابەش کردنە چ نهێنییەك حەشار دراوە﴿وَلَا يُحِيطُونَ بِشَىْءٍ مِّنْ عِلْمِهِۦٓ إِلَّا بِمَا شَآءَ ﴾البقرة: ٢٥٥، هەروەها ئایەتی﴿ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلَا يُحِيطُونَ بِهِۦ عِلْمًا ﴿١١٠﴾ ﴾ طه: ١١٠، سێیەم، خودا بچووکترین ستەم لە بەندەکانی ناکات و ستەم لە شانوشکۆی خودای موتەعال ناوەشێتەوە﴿ ذَٰلِكَ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيكُمْ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَيْسَ بِظَلَّامٍ لِّلْعَبِيدِ ﴿١٨٢﴾ ﴾ آل عمران: ١٨٢، هەروەها ئایەتی﴿ وَمَن يَعْمَلْ مِنَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُو۟لَٰٓئِكَ يَدْخُلُونَ ٱلْجَنَّةَ وَلَا يُظْلَمُونَ نَقِيرًا ﴿١٢٤﴾ ﴾ النساء: ١٢٤، وشەی"نقیر" بریتییە لەو پەردە زۆر تەنکەی بە دەوری ناوکە خورمادایە، خودای موتەعال بە وەزن و ئەندازەی ئەو پەردە تەنکە ستەم لە بەندەکانی ناکات، چونکە ئەو دادپەروەرە و یەکێك لە ناوەکانی بریتییە لە "العدل".

❁ ❁ ❁

# حیکمەتی سەد و بیست و چوار

((لاَ نِهَايَةَ لِمَذَامِّكَ إِنْ أَرْجَعَكَ إِلَيْكَ، وَلاَ تَفْرُغُ مَدَائِحُكَ إِنْ أَظْهَرَ جُودَهُ عَلَيْكَ))

## راڤەی وشەکان:

**مذامك:** ناپەسەندییەکانت

**أرجعك:** بتگێڕێتەوە

**لا تفرغ:** کۆتایی نایەت، چۆڕایی نایەت، خاڵی نابێتەوە

**مدائحك:** مەدحەکانت، باسی چاکەکانت

**أظهر:** دەریبخات

**جودە:** سەخاوەت و بەخشندەیی خودا

**واتا ((کۆتایی نایەت بە ناپەسەندییەکانت ئەگەر خودا بتگێڕێتەوە بۆ لای نەفسی خۆت، باسی چاکەی تۆ کۆتا نایەت گەر سەخاوەت و بەخشندەیی خۆی لەسەر تۆ دەربخات))**

## شرۆڤە:

❁ خودا بە فەزڵی خۆی تۆی بۆ ئیمان و کرداری چاکە هەڵبژارد، ئەگەر دەستت لێ بەربدات و بتگێڕێتەوە بۆ لای نەفسی خۆت و بتداتە دەست ئەسپی سەرشێتی حەز و ئارەزووەکان ئەوا لە کار و کردەوە خراپە و ناباشەکاندا نوقم دەبیت، هەر ئەوەندە خودا ریعایەتی خۆی لە بەندەیە وەرگرتەوە ئیتر هەموو چرکەکانی تەمەنی بۆی دەبن بە خراپە، شاراوەکانی نەفس و حەزە شەیتانییەکانی دێنە دەرەوە و خۆی و دەوروبەری بە گوناه و تاوان لێوانلێو دەکات، خودا هەمووومان بپارێزێت لە گوناه و لەژێر ریعایەت و چاودێری خۆیدا بمانژییەنێت، کەوابوو ئەم چاکەی خودات لەبیر بێت و شوکری بکە کاتێك تۆی نەداوەتە دەست و نەفس و حەزوئارەزووەکانی نەفس، کارێك مەکە لەبەر چاوی خودا بکەویت، گەر گوناهێکت ئەنجام دا بیدەرە پاڵ نەفسی خۆت و زوو پەلاماری تەوبە بدە.

۞ کاتێك پەروەردگار سەخاوەت و بەخشندەیی خۆی لەسەر تۆ دەردەخات ئەوا چاکەکان دەداتە پاڵ تۆ و لەسەریان پاداشتی مەزن وەردەگریت، پاداشتی چاکە جۆراوجۆرە، لەوانە:

۞ نوورانی بوونی ناخ و ئاسوودەیی دڵ و دەروون

۞ خەڵکی چاو لە کردارە باشەکانی تۆ دەکەن و —بەبێ کەم بوونەوەی پاداشتی ئەوان- پاداشت بۆ تۆ دەنوسرێت

۞ ناوی چاك و پاك لە دوای مردنت، ئەو ناوە باشەی ئیبراهیم(عليه السلام) داوای دەکرد خودا پێی ببەخشیت﴿وَٱجۡعَل لِّي لِسَانَ صِدۡقٖ فِي ٱلۡأٓخِرِينَ ٨٤﴾ الشعراء: ٨٤، کاتێك چاکان ناوت بە چاکە دەهێنن لەلای خودا ئەو ناوهێنانە بە شایەتی وەردەگیرێت و لەسەری پاداشت دەدرێیتەوە.

۞ دوورکەوتنەوە لە ئازار و مەینەتی گوناه، ئاشکرایە ژیان لەگەڵ کرداری چاکەدا مرۆڤ لە گوناه و خۆپەرستی دووردەخاتەوە.

۞ پاداشتی دوارۆژ لە بەهەشتی بەرین و بینینی خودای موتەعال کە مەزنترین پاداشتێکە بە بەندەکانی خۆی ببەخشێت.

۞ ۞ ۞

# حیكمەتی سەد و بیست و پێنج

((كُنْ بِأَوْصَافِ رُبُوبِيَّتِهِ مُتَعَلِّقًا، وَبِأَوْصَافِ عُبُودِيَّتِكَ مُتَحَقِّقًا))

**راڤەی وشەكان:**

**كن:** ببە

**أوصاف:** كۆی "وصف"ە، واتە سیفەتەكان

**ربوبيته:** پەروەردگاریی خودا

**متعلقا:** پەیوەست بوو

**عبوديتك:** بەندایەتی تۆ بۆ خودا

**متحققا:** دەستەبەر كردن

**واتا ((بە سیفەتی پەروەردگاریی خوداوە پەیوەست ببە، و سیفەتی بەندایەتی خۆت بۆ خودا دەستەبەر بكە))**

**شرۆڤە:**

۞ كەمالاتی خودا كۆتایی پێ نایەت، بۆیە ناو و سیفەتەكانی هەر بەو جۆرە ناكۆتان، خودای موتەعال كۆمەڵێك ناو و سیفەتی خۆی لە قورئاندا و لەسەر زمانی پێغەمبەرەكەی (ﷺ) فێری ئێمە كردووە تاكو لە رێگەی ئەو ناوانەوە خودا بناسین و بەو ناوانە داوا لە خودا بكەین﴿وَلِلَّهِ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ فَٱدْعُوهُ بِهَا ﴾الأعراف: ١٨٠

۞ پەیوەست بوون بە ناوە جوانەكانی خوداوە بە تایبەت ئەو ناوانەی پەروەردگاریی خودامان پێ دەناسێنن وەك ناوەكانی(**الغني**، **العزيز**، **القوي**، **العليم**) سەرچاوەیەكی مەزنە بۆ ناسینی خودا و بەندایەتی كردنی، كاتێك بەندە بە ناوە جوانەكان بەندایەتی خودا دەكات خوداش بە ئاسەواری ئەو ناوە جوانانە بەندەكەی دەڕازێنێتەوە، كاتێك بە ناوی "**الغني**" خودا دەپەرستێ و لێی دەپاڕێتەوە خودا ئەو بەندەیە لە خەڵكانی تر بێنیاز دەكات، كاتێك بە ناوی "العزيز" داوا لە خودا دەكات خودا عیززەتی پێ

دەبەخشێت و لە سەرشۆڕی و رسوایی بەدووری دەگرێت، هەر بەو جۆرە تەواوی ناوە جوانەکانی تری خودای موتەعال.

❁ بەندەی خودا دەبێت تەحقیقی بەندایەتی خۆی بۆ خودا ئەنجام بدات، ئەوەی لەسەر مرۆڤ پێویستە تەحقیقی بەندایەتییە، بەشێك لەو تەحقیقە لە رێگەی ناوە جوانەکانی خوداوەیە، خودا خاوەنی ناوی"علیم"ە و بەندە بەم ناوە بەندایەتی خۆی بۆ خودا دەردەبڕێت و خۆی بە زانستی بەسوود دەڕازێنێتەوە، بۆیە گەڕان بە دوای زانست و شەونخونی بۆ دەستەبەرکردنی لە لای خودا عیبادەتە، هەر بەو جۆرە ناوی "الرزاق" گەڕان بە دوای رۆزیدا و هەوڵ و ماندووبوونی مرۆڤ دەکات بە عیبادەت، کەوابوو بەندایەتی بەو ناوە جوانانە دوو روویان هەیە، **روویەکیان** پاڕانەوە و دوعا و داوایە لە خودا بەو ناوە جوانانە، **رووی دووەم** روویەکی کردارییە و کارکردن بۆ تەحقیقی بەندایەتی لەبەر رۆشنایی ناوە جوانەکاندا.

❁ ❁ ❁

# حیکمەتی سەد و بیست و شەش

((مَنَعَكَ أَنْ تَدَّعِيَ مَا لَيْسَ لَكَ مِمَّا لِلْمَخْلُوقِينَ، أَفَيُبِيحُ لَكَ أَنْ تَدَّعِيَ وَصْفَهُ وَهُوَ رَبُّ الْعَالَمِينَ؟))

## راڤەی وشەكان:

**منعك:** ڕێگری لیێ كردووی، قەدەغەی كردووە لێت

**أفيبيح لك:** ئایا بۆت بە شیاو دەزانێت

**تدعي:** بانگەشە بكەیت

**وصفه:** سیفەتی خودا

**واتا ((خودا ڕێگری لێكردووی بانگەشە بكەی بۆ شتێك كە تۆ خاوەنی نیت و هی خەڵكانی ترە، ئایا بۆت بە شیاو دەزانێت بانگەشەی سیفەتێك لـە سیفەتەكانی خودا بكەیت كە پەروەردگاری هەموو جیهانانە))**

## شرۆڤە:

❁ ئەوانەی بە پلەكانی باوەڕدا بەرز دەبنەوە لە قۆناغێكدا بەهۆی خاوێنبوونی ئاوێنەی دڵیان نووری ناو و سیفەتەكانی خودا هەست پیێ دەكەن، نوورانی بوونی ئاوێنەی دڵ بە جۆرێك شەوق پەیدا دەكات هەست كردن بە خودی ئاوێنەكە لەبیر دەباتەوە، ئەو لەبیری دەچێت خۆر لە جێگەیەكی ترە و ئاوێنەی دڵ تەنها وێنەی خۆر و تیشكی خۆری لەسەر شكاوەتەوە، بۆیە وەهمێك بۆ خاوەن ئاوێنە(خاوەن دڵی خاوێن) دروست دەبێت وا دەزانێت ناخی پڕبووە لە خۆر، بەڵكو بەشێكە لە خۆر و پێی تێكەڵ بووە، خۆر (زاتی خودای موتەعال) بە دروستكراوەكانی تێكەڵ نابێت و مەزنتر و شكۆمەندترە لەوەی توانەوە و تێكەڵبوون و یەكگرتن(**الإتحاد والحلول**) لەگەڵ مەخلوقاتدا سیفەتی خودا بێت، ئەوە تەنها وەهمی هەندێ لە سالیكانە كە لە كەمی

زانست و مەعریفەی خوداوە بۆیان دروست دەبێت، مرۆڤ لە ڕۆژێکی خۆرەتاودا لە دوورەوە تیشکی خۆر دەبینێت لە شوێنێکی سەر زەوی هەڵدەقوڵێت، ئەو پێیوایە بەشێك لە خۆر کەوتۆتە سەر زەوی و بە دەوروبەردا تیشك پەخش دەکاتەوە، بەڵام کاتێك دەگاتە شوێنەکە دەبینێت پارچە ئاوێنەیەکە و بەرانبەر بە خۆر دانراوە، ئەمە نموونەی شکانەوەی نووری ناو و سیفەتەکانی خودایە لەسەر ئاوێنەی دڵی باوەڕدار، بۆیە لەم حیکمەتەدا ئیبن عەتا ئاگادارمان دەکاتەوە و پێمان دەڵێت: تۆ کاتێك خودا ڕێگەت پێ نادات شتێکی هاوشێوەکانی خۆت لە مرۆڤ داگیر بکەی و بیکەیت بە موڵکی خۆت و بانگەشەی خاوەنداری بۆ بکەی، ئەی چۆن ڕێگەت پێدەدا بانگەشەی ئەوە بکەی لەگەڵ خودا تێکەڵ بووی و سیفەتەکانی ئەو بوون بە سیفەتی تۆ، پاکێتی و شکۆمەندی بۆ خودای موتەعال لەو جۆرە بانگەشە بێبنەمایە.

۞ دەبێ سالیکی ڕێگەی خودا بە زانستی شەرعییەوە ڕێگەکە بگرێتە بەر، نەبوونی زانستی دروست و تەواو سەرئەنجامەکەی لادان و سەرلێشێوانە.

۞ ۞ ۞

# حیکمەتی بیست و حەوت

((كَيْفَ تُخْرَقُ لَكَ الْعَوَائِدُ وَأَنْتَ لَمْ تَخْرُقْ مِنْ نَفْسِكَ الْعَوَائِدَ؟))

## راڤەی وشەکان:

**تخرق**: لەم شوێنەدا مانای "تێپەڕاندن" یاخود "تێکشکاندن"ی هەیە

**العوائد**: یاسا و ڕێسا باوەکان

**واتا ((چۆن خودا یاسا و ڕێسا باوەکانت بۆ تێدەپەڕێنێت لە کاتێکدا تۆ عادەت و خوخدە باوەکانی خۆت تێناپەڕێنیت(ناشکێنیت))**

## شرۆڤە:

ئیبن عەتا پێمان دەڵێ: هەتا عادەت و خوخدە باوەکان تێنەپەڕێنیت خودا یاسا و ڕێسا باوەکانی ژیان و گەردوونت بۆ ناگۆڕێت، موعجیزات و کەرامات بۆ کەسانێکن لە حەز و ئارەزووە دەقپیێوەگیراوەکان دوورکەوتوونەتەوە، تۆ گەر نەتوانی ڕۆژێك تا ئێوارە نەفسی خۆت لە خواردن و خواردنەوەو حەزەکان بگریتەوە چاوەڕوانی ئەوە مەبە لە کاتی برسێتی و تەنگانەدا خودا بە ڕێگەیەك لە ڕێگەکان تێرت بکات، پێغەمبەر(ﷺ) نەهی کرد لە هاوالانی وەکو ئەو ڕۆژووی بەردەوام"صوم الوصال" بگرن، چونکە دەیفەرموو: من بەڕۆژوو دەبم، بەلام خودا خواردن و خواردنەوەم پێدەدات (عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: ((لا تُوَاصِلُوا. قَالُوا: إِنَّكَ تُوَاصِلُ. قَالَ: إِنِّي لَسْتُ مِثْلَكُمْ، إِنِّي أَبِيتُ يُطْعِمُنِي رَبِّي وَيَسْقِينِي. فَلَمْ يَنْتَهُوا عَنْ الْوِصَالِ، قَالَ: فَوَاصَلَ بِهِمْ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمَيْنِ أَوْ لَيْلَتَيْنِ ثُمَّ رَأَوْا الْهِلالَ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لَوْ تَأَخَّرَ الْهِلالُ لَزِدْتُكُمْ، كَالْمُنَكِّلِ لَهُمْ))[٢٢]، سەرنج بدە چۆن وازهێنان لە دەقپیێوەگیراوەکان موعجیزات و کەرامات لە ژیانی پێغەمبەران(علیهم السلام) و صدیقیندا

٢٢ (روى البخاري (٧٢٩٩) ومسلم (١١٠٣)

دروست دەکات، ئەوە نموونەی پێغەمبەر(ﷺ)، لە قورئانیشدا خودا باسی "مەریەم"مان(علیها السلام) بۆ دەکات کە صدیقە بوو، دەفەرمویت:﴿كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيْهَا زَكَرِيَّا ٱلْمِحْرَابَ وَجَدَ عِندَهَا رِزْقًا ۖ قَالَ يَٰمَرْيَمُ أَنَّىٰ لَكِ هَٰذَا ۖ قَالَتْ هُوَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ يَرْزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٣٧﴾﴾ آل عمران: ٣٧، تۆ دەبێ یاسا و ڕێسای عادەت تێکوپێك بشکێنێت ئەوجا خۆزگەیەکی لەو جۆرەت هەبێت، نابینی خودا چۆن بۆ پێغەمبەران یاسا و ڕێساکانی ژیان و گەردوونی گۆڕیوە؟ بۆ نوح و ئەو دەستە کەمە لە باوەڕداران تۆفان هەموو سەر زەوی دەگرێتەوە، بۆ ئیبراهیم(عليه السلام) یاسای سوتان لە ئاگر وەردەگیرێتەوە، بۆ موسا(عليه السلام) نۆ ئایەتی مەزن روودەدەن و دەریا شەق دەبات و خۆی و هۆزەکەی لێی دەپەڕێنەوە و فیرعەون و دارودەستەکەی نوقم دەکات، بۆ عیسا(عليه السلام) بە فەرمانی خودا مردوو زیندوو دەبێتەوە، بۆ پێغەمبەرمان **محمد** (ﷺ) ئاسمانەکان لە بەشێك لە شەودا دەپێچرێنەوە و دەگاتە **"سدرة المنتهى"** و بە خزمەتی پەروەردگاری دەگات، هەروەها لە یەکێك لە غەزاکانیدا ئاو لە نێوان پەنجەکانیەوە هەڵدەقوڵێ و سوپایەك ئاوی لێ دەخواتەوە، راستە ئەمانە موعجیزاتن و خودا بە پێغەمبەرانی بەخشیوە، بەڵام ئەو پێغەمبەرانە لە لوتکەی ئیمان و یەقیندا بوون بە خودای خۆیان و حەز و ئارەزوو لەواندا خامۆش بووە و ئەوەی مرۆڤە ئاساییەکان کۆت و بەند دەکات ئەوان تێیان پەڕاندووە، مەریەم(**علیها السلام**) پێغەمبەری خودا نەبوو، خودا رۆزی لە بەهەشتەوە بۆ رەوانە دەکرد، کۆمەڵەی ئەشکەوتەکە پێغەمبەر نەبوون خودا کردنی بە ئایەتێکی مەزن بۆ خۆیان و خەڵکی.

# حیکمەتی سەد و بیست و هەشت

**((مَا الشَّأْنُ وُجُودُ الطَّلَبِ، إِنَّمَا الشَّأْنُ أَنْ تُرْزَقَ حُسْنَ الأَدَبِ))**

**راڤەی وشەکان:**

**الشأن:** شانوشکۆ

**وجود الطلب:** بوونی داوا

**حسن الأدب:** ئەدەبی باش و جوان

**واتا ((شانوشکۆ لە بوونی داوادا نییە، بەڵکو شانوشکۆ لە بوونی ئەدەبی باش و جواندایە لە خزمەتی خودادا))**

**شرۆڤە:**

❁ لێرەدا ئیبن عەتا مەبەستی ئەوە نییە لە بەها و پلە و پایەی دوعا و پاڕانەوە کەم بکاتەوە، چونکە قورئان و فەرموودە فەرمانیان پێکردووە، بەڵکو مەبەستی شێوازی داوا کردنە.

❁ داوا لە خزمەتی خودادا ئەدەبی پێویستە، ئەمەش چەند خاڵێکە:

- پایەکانی ئیمان و یەکتاپەرستیت لە خۆتدا بینا کردبێت.
- بە تاوان و گوناهی گەورەوە داواکەت بەرز نەکەیەوە، بەڵکو بەر لە داوای هەر شتێك تەوبە بکەی و داواکەت داوای لێخۆشبوون بێت بۆ گوناهەکانت.
- دوعای گەردنکەچی و زەلیلی و چاوی پڕ لە فرمێسك بێت، نەك وەك کەسێك خودا بە قەرزداری خۆی بزانێت.
- دوعا و داواکەت دوعا و داوای شەڕ نەبێت لە خۆت و غەیری خۆت.
- وەك عیبادەت و بەندایەتی دوعاکە ئەنجام بدەی.

- Ê له دوای ئەوه دوعاکەت رادەستی خودا بکه و بیر له سەرئەنجام مەکەرەوه، چونکه ئەو دەزانێت چی بۆ تۆ باشه.
- Ê به دەنگێکی نزم و پڕ له حوزن دوعاکان ئەنجام بدەیت.

# حیکمەتی سەد و بیست و نۆ

> ((مَا طُلِبَ لَكَ شَيْءٌ مِثْلُ الاضْطِرَارِ، وَلاَ أَسْرَعَ بِالْمَوَاهِبِ إِلَيْكَ مِثْلُ الذِّلَّةِ وَالافْتِقَارِ))

**راڤەی وشەکان:**

**ما طلب:** داوات لیّ نەکراوە

**الإضطرار:** پەنابردن و هانابردنی پڕ لە پێویستی و ناچاری

**المواهب:** شتی بەخشراو

**الذل:** گەردنکەچی و فەرمانبەرداری

**الإفتقار:** نیشاندانی هەژاری و بێدەسەلاتی

> **واتا ((شتێکت داوا لیّ نەکراوە (چاکتر و باشتر بێت) لە پەنابردن و هانابردنی پڕ لە پێویستی و ناچاری بۆ لای خودا، هیچ شتێك وەك نیشاندانی زەلیلی و هەژاری بۆ خودا بەخششەکان بۆ تۆ خێراتر ناکات))**

**شرۆڤە:**

**لەم حیکمەتەدا باس لە دوو خاڵی زۆر گرنگ دەکات بۆ سالیکی ڕێگەی بەرەو خودا چوون:**

**یەکەمیان:** "پەنابردن و هانابردنی پڕ لە پێویستی و ناچارییە بۆ لای خودای موتەعال"، دیارە مرۆڤ هەموو بوونی لە هەموو چرکەیەکدا پێویستی بە خودایە، ئەو بەبیّ خودا هیچ نییە، بەڵکو نەبوونە، بوون و مانەوەی، زیندەگی و ژیانی، هیدایەتی تەنها بە خوداوەیە، بۆیە دەبێت هەمیشە لە هانابردن و پەنابردندا بێت بۆ لای پەروەردگاری بە هانابردن و پەنابردنێکی پڕ لە پێویستی و ناچاری، هەروەك ئەو کەسەی لە دەشت و سارایەکدا دوژمنەکانی شوێنی کەوتوون تاکو بیکوژن، ئەویش لێیان هەڵدیّ

و پەلە دەکات و دەیەوێت بگاتە ئەو قەڵایەی کە داڵدەی دەدات و لە دەست دوژمنەکانی رزگاری دەکات، "پەنابردنی پڕ لە ناچاری و پێویستی" رێگەیەکە بۆ وەڵامدانەوەی خودا، قورئان دەفەرموێت:﴿ أَمَّن يُجِيبُ ٱلْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكْشِفُ ٱلسُّوٓءَ ﴾ **النمل: ٦٢**، تەنها خودایە وەڵامی کەسی پەنابەر و پڕ لە پێویستی دەداتەوە، گەر دەتەوێ خودا وەڵامی پێویستییەکانت بداتەوە ئەوا هانا بۆ خودا ببە، گەر دەتەوێ لە دەستی دوژمنەکەت کە شەیتانە رزگارت ببێت پەنا بۆ خودا ببە و لێی بپاڕێرەوە تاکو داڵدەت بدات، سەیر و سلوکی سەلامەت تەنها لە رێگەی هانابردنەوەیە بۆ خودا، موریدی رێگەی خودا شان لەسەر ویست و هەوڵی خۆی دانادات، بەڵکو هەرچی شتە بە خوداوە و لە خوداوە دەناسێت و دەستیان بۆ دەبات، لێرەدا لە مانای**"لا حول ولا قوة إلا بالله"** کە گەنجینەیەکە لە گەنجینەکانی بەهەشت تێدەگەین. **(عن أبي موسى رضي الله عنه قال: كنا مع النبي صلى الله عليه وسلم في سفر.... إلى "فقال: يا عبد الله بن قيس قل: لا حول ولا قوة إلا بالله فإنها كنز من كنوز الجنة، أو قال: ألا أدلك على كلمة هي كنز من كنوز الجنة: لا حول ولا قوة إلا بالله "**[٢٣]

**دووەم:** بریتییە لە نیشاندانی زەلیلی و گەردنکەچی و هەژاری بۆ خودای موتەعال، هیچ رێگەیەکی تر نییە بۆ دەربڕینی پێویستییەکان لە خزمەتی خودادا جگە لە نیشاندانی زەلیلی و گەردنکەچی و هەژاری، بەندە چ دەسەڵاتێکی لە خزمەتی گەورەکەی خۆیدا هەیە، بە چ زمانێك دەتوانێ لە خزمەتیدا پێویستییەکانی دەرببڕێت، جگە لە زمانی زەلیلی و هەژاری؟

- بەخششەکانی خودا بۆ بەندەی خۆی چەندین جۆری هەیە، لەوانە:
  - بەخششەکانی ئیمان، لە ئیستیقامە و بەردەوامی لەسەر رێگەی ئیمان و ئەنجامدانی کرداری چاکە.
  - بەخششە مەعنەوییەکان و بینینی ئایات بۆ گەیشتن بە یەقین.
  - بەخششە پێویستەکان بۆ ژیان و زیندەگی دونیای مرۆڤ.
  - لادانی لە بەلا و ناخۆشی و تەنگەلانییەکانی ئەم ژیانە.

٢٣ رواه البخاري ومسلم.

# حیکمەتی سەد و سی

((أَنَّكَ لاَ تَصِلُ إِلَيْهِ إِلاَّ بَعْدَ فَنَاءِ مَسَاوِيكَ وَمَحْوِ دَعَاوِيكَ لَمْ تَصِلْ إِلَيْهِ أَبَدًا وَلَكِنْ إِذَا أَرَادَ أَنْ يُوَصِّلَكَ إِلَيْهِ غَطَّى وَصْفَكَ بِوَصْفِهِ، وَنَعْتَكَ بِنَعْتِهِ، فَوَصَلَكَ إِلَيْهِ بِمَا مِنْهُ إِلَيْكَ، لاَ بِمَا مِنْكَ إِلَيْهِ))

**راڤەی وشەکان:**

**فناء مساويك:** تیاچوونی نەنگی و ناتەواوییەکانت

**محو دعاويك:** سڕینەوەی بانگەشەکانت

**غطى:** دایدەپۆشێت

**فوصلك إليه:** دەتگەیەنێت بە خۆی

**بما منه إليك:** بەوەی لە ئەوەوەیە بۆ تۆ

**واتا ((گەر بتەوێ لە دوای تیاچوونی نەنگی و ناتەواوییەکان و سڕینەوەی بانگەشەکانت بە خودا بگەیت، ئەوا هەرگیز پێی ناگەیت، بەڵام کاتێك خودا ویستی تۆ بە خۆی بگەیەنێت سیفەتەکانت بە سیفەتی خۆی و نیعمەتەکانت بە نیعمەتی خۆی دادەپۆشێت، ئەو کات تۆ بە خۆی دەگەیەنێت، ئەمەش بەو بەخششەی لە ئەوەوەیە بۆ تۆ، نەك بەو کردارانەی لە تۆوە بۆ ئەو ڕەوانەیان دەکەی))**

**شرۆڤە:**

ئەم حیکمەتە وردەکاری زۆری تێدایە، لەوانە:

Ê هەرچەند مرۆڤ کۆشش بکات لەگەڵ خۆی و هەوڵی خۆ خاوێن کردنەوە بدات، نەنگی و ناتەواوییەکانی کۆتایی پێ نایەت، چونکە ناتەواویی مرۆڤ لە هەویری مرۆڤدایە، بۆیە خودای موتەعال دەفەرموێت:﴿وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ مَا زَكَىٰ مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ أَبَدًا وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُزَكِّي مَن يَشَآءُ﴾النور: ٢١

Ê هەرچەندە مرۆڤ بیەوێت هەموو شتەکان لە خودا بناسێت و لە هەوڵ و کۆششی خۆی بێتە دەرەوە هێشتا هەر گیانی بانگەشە بۆ لای خۆی تێدا دەمێنێت، ئەگەر تەنها جێگیر کردنی ئیرادەش بێت بۆ خۆی، یان تەنانەت گەر وەك هۆکارێك بۆ ئەنجامدانی کارەکان ویست و هەوڵی خۆی تەماشا بکات، ئەمەش مانای دەستبەردان نییە لە کۆشش و خۆ خاوێن کردنەوە، بەپێچەوانەوە مانای ئەوەیە مرۆڤ لە کۆشش بێهیوا نەبێت و سارد نەبێتەوە کاتێك دەبینێ بانگەشە بۆ لای خۆی لە ناخیدا کۆتایی پێ نایەت.

Ê ئەوە خودایە کەسی باوەڕدار بە ناتەواوییەکانەوە بە خۆی دەگەیەنێت، نەك هەوڵ و کۆششی بەندە و پاڵفتەبوون و خاوێنبوونەوەی، چونکە پاڵفتە و خاوێنی کامڵ و تەواو بوونی نییە، لەم میانەوە ئەبولعەباسی مورسی دەفەرموێت: ((هیچ موریدێك بە خودا ناگات تا لە حەز و ئارەزووی بە خوداگەیشتن خاڵی نەبێتەوە))، چەند حیکمەتێکی مەزنە! ویستی گەیشتنیش بە خودا حەز و ئارەزوو و شەهوەت رووی لێ دەکات، دەبێ لەو بانگەشە بێتە دەرەوە، دەستەوسانی خۆی لەبەردەم خودادا رابگەیەنێت، ئەوجا خودا بە ویستی خۆی بڕیارێك لە بەندەکەی دەدات.

Ê کاتێك خودا بڕیار دەدات بەندەکەی بە خۆی بگەیەنێت، سیفەتەکانی دەگۆڕێت، سیفاتی خراپ و ناباش و ناپەسەندی(**الصفات المذمومة**) بۆ دەگۆڕێت بە سیفاتی باش و پەسەند(**الصفات المحمودة**)، سیفەتە باش و پەسەندەکان لەسیفەت و ناوەجوانەکانی خوداوە وەرگیراون، بۆیە خودا لە رێگەی ئەو ناو و سیفەتە بەرز و بڵندانەوە خۆی بە بەندەکەی دەناسێنێت و دواتر ویست و لێبڕانی بۆ خۆڕازاندنەوە بەو سیفەتانە لا دروست دەکات، ئەو کات بەندە شایستە دەبێت بە دیوانی خودا، ئەگینا مرۆڤ بە پۆشاکی پیس و نەعلەوە ناتوانێت روو لە دیوانی خودا بکات﴿وَثِيَابَكَ فَطَهِّرۡ ٤﴾ المدثر: ٤، پۆشاکەکەت(جل و بەرگەکەت) خاوێن بکەرەوە، هەروەها﴿إِنِّيٓ أَنَا۠ رَبُّكَ فَٱخۡلَعۡ نَعۡلَيۡكَ إِنَّكَ بِٱلۡوَادِ ٱلۡمُقَدَّسِ طُوٗى ١٢﴾ طه: ١٢، من پەروەردگاری تۆم نەعلەکانت دابکەنە، تۆ لە دۆڵی توای موقەددەسدای.

Ê دوای ئەوەی سیفەتەکانی بەندە بە سیفەتە بەرز و بڵندەکانی خۆی دادەپۆشێت، ئەوجا روو دەکاتە نیعمەتەکانی بەندە لە بینین و بیستن و دەست و لاقی، ئەم نیعمەتانەش بە نیعمەتەکانی خۆی دادەپۆشێت، پێغەمبەر(ﷺ) لە فەرموودەیەکی قودسیدا دەفەرموێت: ((عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلى الله عليه وسلم: (إِنَّ اللهَ تَعَالَى قَالَ: مَنْ عَادَى لِي وَلِيًّا فَقَدْ آذَنْتُهُ بِالحَرْبِ، وَمَا تَقَرَّبَ إِلَيَّ عَبْدِيْ بِشَيءٍ أَحَبَّ إِلَيَّ مِمَّا افْتَرَضْتُهُ عَلَيْهِ. ولايَزَالُ عَبْدِيْ يَتَقَرَّبُ إِلَيَّ بِالنَّوَافِلِ حَتَّى أُحِبَّهُ، فَإِذَا أَحْبَبْتُهُ كُنْتُ سَمْعَهُ الَّذِيْ يَسْمَعُ بِهِ، وَبَصَرَهُ الَّذِيْ يُبْصِرُ بِهِ، وَيَدَهُ الَّتِي يَبْطِشُ بِهَا، وَرِجْلَهُ الَّتِي يَمْشِيْ بِهَا، وَلَئِنْ سَأَلَنِيْ لأُعطِيَنَّهُ، وَلَئِنْ اسْتَعَاذَنِيْ لأُعِيْذَنَّهُ))[٢٤] فەرموودەکە بە رۆشنی ئاماژە بەوە دەکات کە بینین و بیستن و وەشاندن و رۆیشتنی بەندەی خۆشەویستی خودا دەکەوێتە ژێر ریعایەتی خودای موتەعالەوە، لە پاڵ ئەوەی ئەم نیعمەتانەی مرۆڤ -بە ویستی خودا- لە خێر و چاکەدا بەکاردەهێنرێن، خودای موتەعال دەروازەیەك بە روویاندا دەکاتەوە کە بالاٌترە لە بینین و بیستن و وەشاندن و رۆیشتنی ئاسایی.

Ê هەموو ئەمانە لە خوداوەیە بۆ بەندەکەی بە فەزڵ و منەتی خۆی، نەك لە بەندەوە بۆ پەروەردگاری بەو گشتە نەنگی و ناتەواوییەوە.

۞ ۞ ۞

---

٢٤ رواه البخاري.

# حیكمەتی سەد و سی و یەك

((لَوْلاَ جَمِيلُ سَتْرِهِ لَمْ يَكُنْ عَمَلٌ أَهْلاً لِلْقَبُولِ))

**راڤەی وشەكان:**

**جميل ستره:** جوانی و باشی داپۆشین

**أهلا للقبول:** شایستەی قبوڵ كردن

**واتا ((گەر جوانی و باشی داپۆشینی خودا نەبوایە هیچ كردارێك شایستەی قبوڵ نەدەبوو))**

**شرۆڤە:**

لە حیكمەتەكەی پێشوودا ئاماژەی بەوە كرد كە بەندە لە نەنگی و ناتەواوی و بانگەشەی بێجێ خاڵی نابێتەوە با ئەوپەڕی هەوڵ و كۆششی خۆشی بخاتە گەڕ، بەڵكو نەنگی و ناتەواوی و بانگەشە كەم دەبنەوە نەك بنبڕ بكرێن، لێرەشدا دەفەرموێ: هیچ كردارێك بە ڕەهایی لە حەزی مرۆڤ خاڵی نابێتەوە، چونكە مرۆڤێك ئەنجامی دەدات كە پڕە لە نەنگی و ناتەواوی، بەڵام خودا بە داپۆشینی جوان و باشی خۆی نەنگی كردارەكانمان دەشارێتەوە و شایستەیان دەكات بە قبوڵ كردن، ئەم ئایەتە پیرۆزە-خودا باشتر دەزانێت- ئاماژەیەكی بۆ ئەو حەزە شاراوەی مرۆڤ تێدایە ﴿ وَمَا يُؤْمِنُ أَكْثَرُهُم بِٱللَّهِ إِلَّا وَهُم مُّشْرِكُونَ ﴿١٠٦﴾ ﴾ یوسف: ١٠٦، ئەم هاوەڵدانان(شرك)ە كە زۆربەی خەڵكی دەگرێتەوە بەشێكی حەزەكانی نەفسە لە كار و كردەوەكاندا، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو((خودایە پەنات پێدەگرین لەوەی شتێك بە زانینەوە بكەین بە هاوەڵی تۆ، داوای لێخۆشبوونیش لێ دەكەین بۆ ئەوەی كە نایزانین و بە نەزانین دەیكەین بە هاوەڵی تۆ)).

# حیكمەتی سەد و سی دوو

((أَنْتَ إِلَى حِلْمِهِ إِذَا أَطَعْتَهُ أَحْوَجُ مِنْكَ إِلَى حِلْمِهِ إِذَا عَصَيْتَهُ))

**راڤەی وشەكان:**

**حلمه:** حیلمی خودا

**إذا أطعته:** گەر گوێڕایەڵیت لیّ كرد

**أحوج:** ئاتاجتر

**عصیته:** لیّی یاخی ببیت

**واتا ((كاتێك گوێڕایەڵی خودا دەبیت ئاتاجتری بە حیلمی خودا تا ئەو كاتەی لە خودا یاخی دەبیت))**

**شرۆڤە:**

❁ ئەو كاتانەی مرۆڤ گوێڕایەڵی خودا دەبێت لا بەلای نەفس و ئازایەتی خۆیدا دەكاتەوە، ئەم لاكردنەوەیە زۆرجار كارەكان دەپوكێنێتەوە و مرۆڤ لەبەر چاوی خودا دەخات، بەلاّم ئەو كاتانەی مرۆڤ گوناه دەكات زۆرجار زەلیلی روو لە نەفس دەكات و مرۆڤ ملكەچی خودا دەكات، بۆیە دەفەرموێت:: بەندە لەباری گوێڕایەڵیدا ئاتاجترە بە حیلمی خودا تا كاتی لە خودا یاخیبوونی، لە كاتی ئەنجامدانی كاری چاكە و لاكردنەوە بە لای نەفسدا مرۆڤ ململانێی ناوی **"المتكبر"** و **"العظیم"** دەكات كە دوو ناون تایبەتن بە خودای موتەعال و هەر كەس ململانێیان بكات خودا لیّی دێتە دەست، بەلاّم لەباری گوناه كردن و زەلیلی نەفس و گەردنكەچ بوون بۆ خودا بەندە بە ناوەكانی **"التواب، الغفور، العفو"** لە خودا نزیك دەبێتەوە.

❁ نابێت ئەم تێڕوانینە كە لە حیكمەتەكەوە وەردەگیرێت مرۆڤ هەڵبنێت بۆ گوناه، گوایە گوناه لەلای خودا باشترە لە گوێڕایەڵی، چونكە لەو بارەدا دوو گوناه رووی تێدەكات، گوناهی لاكردنەوە بە لای نەفس و گوناهی ئەنجامدانی گوناهەكە.

# حیکمەتی سەد و سی و سیٚ

((السَّتْرُ عَلَى قِسْمَيْنِ: سَتْرٌ عَنِ الْمَعْصِيَةِ، وَسَتْرٌ فِيهَا، فَالْعَامَّةُ يَطْلُبُونَ مِنَ اللهِ تَعَالَى السَّتْرَ فِيهَا خَشْيَةَ سُقُوطِ مَرْتَبَتِهِمْ عِنْدَ الْخَلْقِ، وَالْخَاصَّةُ يَطْلُبُونَ مِنَ اللهِ السَّتْرَ عَنْهَا خَشْيَةَ سُقُوطِهِمْ مِنْ نَظَرِ الْمَلِكِ الْحَقِّ))

**راڤەی وشەکان:**

**الستر:** داپۆشینی گوناهان

**سقوط مرتبتهم:** روخانی پلە و پایەیان

**الخاصة:** تایبەتمەندان

**الستر عنها:** داپۆشین لە گوناهـ

**الملك الحق:** پادشای حەق(خودای موتەعال)

**واتا ((داپۆشینی گوناهـ دوو بەشە: داپۆشین لـە گوناهـ و داپۆشین لـەناو گوناهدا، خەڵکی بە گشتی داپۆشینی گوناهـ لـە خودا داوا دەکەن، نەبادا پلـە و پایەیان لـەبەر چاوی خەڵکیدا دابەزێت، بەڵام ئەهلی تایبەتمەندی خودا داوا دەکەن لـە گوناهـ بیانپارێزێت، نەبادا لـەبەر چاوی خودای موتەعال بکەون))**

**شرۆڤە:**

❁ خودا بۆ بەندەکانی دوو جۆر داپۆشینی هەیە: داپۆشینێك بۆ ئەو کەسانەی دەکەونە ناو گوناهەوە و خودا بە سیتری خۆی دایان دەپۆشێت، لەگەڵ داپۆشینێك بۆ بەندە تایبەتەکان کە گوناهیان لیٚ دوور دەخاتەوە و لە گوناهان دەیانپارێزێت.

❁ خەڵکی بە گشتی داوای داپۆشینی یەکەمیان دەکەن، چونکە دەکەونە ناو گوناهان و حەز ناکەن خودا پەردەیان لەسەر لابدات و خەڵکی بە گوناهەکانیان بزانێت، چونکە دەترسن پلە و پایەیان لە دڵی خەڵکیدا بڕوخیٚ و ڕێز و حورمەت

لەدەست بدەن، ئەهلی  خودا لا بەلای سەرنجی خەڵکیدا ناکەنەوە، ئەوان داوا لە خودا دەکەن لە گوناهان بیانپارێزێت بۆ ئەوەی لەبەر چاوی خودا نەکەون.

# حیكمەتی سەد و سی و چوار

((مَنْ أَكْرَمَكَ إِنَّمَا أَكْرَمَ فِيكَ جَمِيلَ سَتْرِهِ، فَالْحَمْدُ لِمَنْ سَتَرَكَ لَيْسَ الْحَمْدُ لِمَنْ أَكْرَمَكَ وَشَكَرَكَ))

**راڤەی وشەكان:**

**من أكرمك:** هەر كەسێك ڕێزی لێگرتی

**لمن سترك:** ئەو كەسەی داپۆشیت(خودای موتەعال)

**((هەر كەسێك ڕێزی لێگرتی ڕێز لەو داپۆشینە باش و جوانەكەی خودا دەگرێت كە هەیەتی لەسەر تۆ، حەمد و ستایش بۆ ئەو كەسەیە داپۆشیویت (واتە خودا) نەك حەمد و ستایش بۆ ئەو كەسەی ڕێزت لێ دەگرێت و شوكرت دەكات))**

**شرۆڤە:**

❁ ڕێز و شوكری مەردوومان بۆ تۆ هیچ لە حەقیقەتی تۆ ناگۆڕێت، تۆ حەقیقەتی خۆت لە هەموو كەس باشتر دەزانی و خوداش لە تۆ باشتر تۆ دەناسێت.

❁ گەر ڕێزت لێگیرا و شوكریان كردی بە هۆی ئەو ڕێز و حورمەتەی لە دڵی مەردوومان‌دا داگیرت كردووە ئەوا بزانە ڕێزی خەڵكی و شوكری خەڵكی بەهۆی داپۆشینی گوناهەكانتەوەیە، گەر خودا پەردەیان لەسەر لابدات هیچ كەسێك ڕێز لە تۆ ناگرێ و شوكری كارەكانت ناكات، بۆیە پێویستە حەمد و ستایشی خودا بكەیت كە لەلای خەڵكی-بەهۆی داپۆشینەوە- بەڕێزی كردووی، نەك حەمد و ستایش بۆ مەردوومان، مەردوومان بە نەزانینی خۆیان لەمەڕ بینینی گوناهەكانت تۆیان لا ڕێزدار بووە، بەڵام خودا لەگەڵ زانستی لەمەڕ گوناهەكانت ڕێزداری كردووی، ئەم دووانە كامیان شایستەی حەمد و سەنایە؟

# حیکمەتی سەد و سی و پێنج

((مَا صَحِبَكَ إلاَّ مَنْ صَحِبَكَ وَهُوَ بِعَيْبِكَ عَلِيمٌ، وَلَيْسَ ذَلِكَ إلاَّ مَوْلاَكَ الْكَرِيمُ، خَيْرُ مَنْ تَصْحَبُ مَنْ يَطْلُبُكَ لاَ لِشَيْءٍ يَعُودُ مِنْكَ إلَيْهِ))

## راڤەی وشەکان:

**صحبك**: هاوەڵێتیت دەکات

**بعيبك عليم**: زانایە بە نەنگییەکانت

**مولاك الكريم**: سەرپەرشتیاری بەخشندە(خودا)

**واتا ((دۆستی راستەقینە ئەو کەسەیە کە زانایە بە نەنگییەکانی تۆ و لەگەڵ ئەوەش دۆستایەتیت دەکات، ئەو کەسەش تەنها خودای بەخشندەیە، باشترین کەسێك دۆستایەتی بکەیت کەسێکە کە دۆستایەتیت دەکات نەك لەبەر سوود و قازانجێك لە تۆدا بۆ ئەو بگەڕێتەوە))**

## شرۆڤە:

خەڵکی کاتێك بە نەنگی و ناتەواوییەکانی کەسێك ئاشنا دەبن لێی دوور دەکەونەوە، گەر بەردەوام بوون لە دۆستایەتی ئەو کەسە ئەوە بۆ سوود و بەرژەوەندی خۆیان دەگەڕێتەوە کە لە رێگەی ئەو کەسەوە بەدەستی دەهێنن، بۆیە بۆ دەستەبەر کردنی بەرژەوەندییەکانیان چاو لە نەنگی و ناتەواوییەکان دەخشێنن، ئەم مرۆڤانە دۆستی بەرژەوەندییەکانی خۆیانن، نەك دۆستی ئەو کەسەی نەنگییەکانی تێدا دەبینن، خودای موتەعال دۆستایەتی بەندەکانی دەکات نەك لەبەر بەرژەوەندییەك بۆ ئەو(ﷻ) بگەڕێتەوە، بەڵکو وەك بەزەیی بە بەندەکانی، پەروەردگار-بە پێچەوانەی مامەڵەی مرۆڤەوە- تەواوی نەنگی و ناتەواوییەکانی ئێمە دەبینێ و لەگەڵ ئەوەش دۆستایەتیمان دەکات و دەست نانێت بە روومانەوە، کەوابوو باشترە بۆت دۆستایەتی پەروەردگارت

بکەی و لە ئەوەوە بڕیاری دۆستایەتی بەندەکانی بدەی، ڕەزامەندی خودا بەسەر ڕازیکردنی بەندەکانیدا هەڵببژێریت﴿وَٱعۡتَصِمُواْ بِٱللَّهِ هُوَ مَوۡلَىٰكُمۡۖ فَنِعۡمَ ٱلۡمَوۡلَىٰ وَنِعۡمَ ٱلنَّصِيرُ ٧٨﴾ الحج: ٧٨

# حیكمەتی سەد و سی و شەش

((لَوْ أَشْرَقَ لَكَ نُورُ الْيَقِينِ لَرَأَيْتَ الآَخِرَةَ أَقْرَبَ إِلَيْكَ مِنْ أَنْ تَرْحَلَ إِلَيْهَا، وَلَرَأَيْتَ مَحَاسِنَ الدُّنْيَا قَدْ ظَهَرَتْ كِسْفَةُ الْفَنَاءِ عَلَيْهَا))

## راڤەی وشەكان:

**أشرق:** هەڵبێت

**ترحل إليها:** سەفەری بۆ بكەی، كۆچی بۆ بكەی

**محاسن الدنيا:** جوانییەكانی دونیا

**كسفة:** پارچەیەك

**الفناء:** تیاچوون

**واتا ((گەر نووری یەقینت بۆ هەڵبێت دوارۆژ دەبینیت نزیكترە لەوەی كۆچی بۆ بكەی، جوانییەكانی دونیاش دەبینی پارچەیەك لە تیاچوون لەسەریان دەركەوتووە))**

## شرۆڤە:

❁ لێرەدا ئاماژە بە حەقیقەتی دونیا و دوارۆژ دەكات، پەیبردن بە حەقیقەتی دونیا و دوارۆژ پەیوەستە بە بوونی "یەقین"ەوە، یەقین بە چی؟ یەقین بە لیقای خودا، بە دوارۆژ و ئەوەی تێیدایە لە دادگایی و سزا و پاداشت، نووری یەقین دوو حەقیقەتمان بۆ رۆشن دەكاتەوە:

**یەكەمیان:** دوارۆژ و لیقای خودا نزیكترە لەوەی كۆچی بۆ بكەی، گەیشتنە ئەو جیهانە بڕینی ماوە و دووری نییە، تەنها گۆڕانی دۆخێكە بۆ دۆخێكی تر، كاتێك بەفر دەبێت بە ئاو هیچ دوورییەك نابڕێت، بەڵكو تەنها دۆخەكەی گۆڕاوە، دۆخی تۆ گۆڕانی بەسەردا دێت و خۆت لەناو ئەو جیهانەدا دەبینییەوە.

**دووەمیان،** دونیا پۆشاکی فەنا و تیاچوونی لەبەردایە، کاتێك وێستگەی دونیا پۆشاکی فەنای لەبەر کردبێت کەوابوو تۆ لەناو دوارۆژدای، کەوابوو تۆش بەشێکی لەو فەنابوونە.

❁ ئەگەر ئەمە حەقیقەتی دونیا و حەقیقەتی دوارۆژ بێت ئایا کەسی ژیر و هۆشمەند کامیان بەسەر کامیاندا هەڵدەبژێرێت؟ دیارە هیچ ژیرێك تیاچوو و بڕاوە بەسەر هەتاهەتاییدا هەڵنابژێرێت، بەلاّم تێگەیشتن لەم حەقیقەتە نووری یەقینی گەرەکە.

❁ چۆن نووری یەقین بەدەست بهێنین؟ یەقین دەرکەوتەی ئیمانە، هەتا ئیمان کامڵ و تێروتەواو نەبێت یەقین سەرهەڵنادات، جێبەجێ کردنی فەرمانەکان و زیادکردنی کارو کردەوەی چاکە و ژیان لەگەڵ قورئاندا (لەگەڵ ئەو ئیمانە دامەزراوە) ڕێگە خۆشکەرن بۆ هەڵهاتنی نووری یەقین، خودا بەهەموومانی ببەخشێت، گەیشتن بە یەقین والآبوونی دەرگا داخراوەکان و لادانی پەردەکانی پەنهانە، قورئان دەفەرمویێت: ﴿ كَلَّا لَوۡ تَعۡلَمُونَ عِلۡمَ ٱلۡيَقِينِ ۝٥ لَتَرَوُنَّ ٱلۡجَحِيمَ ۝٦ ثُمَّ لَتَرَوُنَّهَا عَيۡنَ ٱلۡيَقِينِ ۝٧ ﴾ التكاثر: ٥-٧، گەر زانستی یەقینتان بزانیبایە دۆزەختان دەبینی، پاشان بە چاوی یەقین دەیبینن.

❁ ❁ ❁

# حیكمەتی سەد و سی و حەوت

((مَا حَجَبَكَ عَنِ اللهِ وُجُودُ مَوْجُودٍ مَعَهُ، وَلَكِنْ حَجَبَكَ عَنْهُ تَوَهُّمُ مَوْجُودٍ مَعَهُ))

## راڤەی وشەكان:

**ما حجبك:** پەردەی نەداوە بەسەر تۆدا

**موجود:** بەدیهاتوو

**توهم:** ئەندێشە

**((بوونی هیچ بەدیهاتوویەك لەگەڵ خودا پەردەی نەخستۆتە نێوان تۆ و خوداوە، بەڵكو ئەندێشەی بوونی بەدیهاتوو لەگەڵ خودا پەردەی داوە بەسەر تۆدا))**

## شرۆڤە:

۞ بوونی راستەقینە تەنها بوونی خودای موتەعالە، چونكە بوونەكەی هەرهەری و هەتاهەتاییە، بوونی خودا بە خودی خۆیەوەیە، نەك بە شتێكی ترەوە، لە خوار خوداوە هەرچی بەدیهاتووە بوونەكەی بە خۆیەوە نەبەستراوەتەوە، بەڵكو بوونیان بە خودای موتەعالەوەیە، سەرنجی ئەم ئایەتە پیرۆزە بدە﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُمۡسِكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ أَن تَزُولَاۚ وَلَئِن زَالَتَآ إِنۡ أَمۡسَكَهُمَا مِنۡ أَحَدٖ مِّنۢ بَعۡدِهِۦٓۚ إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورٗا ﴿٤١﴾﴾ فاطر: ٤١، راوەستانی ئاسمانەكان و زەوی بە خوداوەیە، تەنها ئەوە بە سیفەتی"القیوم" رایگرتوون و ناهێڵێت روو لە جیهانی نەبوون بكەن، ئەگینا سەراپای بوون روو لە تیاچوون دەكات.

۞ گەر بوونی بەدیهاتوویەك بە خودی خۆیەوە گرێ نەدرابێت سەرئەنجامەكەی تێكچوون و تیاچوونە، وەك دەفەرموێت:﴿كُلُّ شَيۡءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجۡهَهُۥۚ ﴿٨٨﴾﴾ القصص: ٨٨، هەموو شتێك جگە لە رووی پاكی خودا تیادەچێت، سەراپای ئاسمانەكان و زەوی ئاسەوار و سێبەری كردارەكانی خودان، ئەوەی راستەقینەیە زات و ناو و سیفات و

کردارەکانی خودایە، بەڵام ئاسەوارەکان سێبەرێکی گوزەرکردەن، بۆیە ناتوانن حەقیقەتی خودا بشارنەوە، ئەوەی حەقیقەتی خودا لە مرۆڤ دەشارێتەوە ئەندێشە کردنی بەدیهاتووەکانە، نوێترین زانستی فیزیای سەردەم ئەو راستییەی سەلماندووە گەر بەناو ماددەدا شۆڕ ببینەوە دەبێت بە گەرد و گەردیلە، گەر زیاتر شۆڕببینەوە دەبێت بە ناوك و ئەلەکترۆن، گەر وردتر ببینەوە دەبێتە جۆرێك لە تەنۆلکە، گەر وردتر ببینەوە دەبێت بە وزە، کەوابوو سەراپای بوون بریتییە لە تۆپەڵێك وزە، ئەم تۆپەڵە وزەیە خاسییەتی ترپەی هەیە، واتە کەمتر لە بەشێکی هەزاران بەشی چرکەیەك دەکوژێتەوەو دواتر دادەگیرسێتەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی ماوەی زەمەنی نێوان دوو ترپەی گەردوون زۆر کەمە مرۆڤ هەست بە تیاچوون و کوژانەوەی گەردوون ناکات و وا دەزانێت گەردوون بە بەردەوامی بوونی هەیە، هەر وەك ئەو وەهمەی لە بینینی گڵۆپێکی کارەباییدا لە کاتی ئیشکردندا بۆمان دروست دەبێت، ئێمە وادەزانین گڵۆپەکە بە بەردەوامی دەگرێت، بەڵام لە راستیدا گڵۆپەکە بە بەردەوامی دەکوژێتەوە و دادەگیرسێتەوە و وزەکەی لە شێوەی ترپەدایە، ئەمە بریتییە لە حەقیقەتی ئەو وەهمەی ئیبن عەتا بەرۆحی بالای پێیگەیشتووەو تێیگەیشتووە، بەدیهاتووەکان بە هەمیشەیی دەکوژێنەوە و ریشەیان لەناو تیاچووندایە، بەڵام خودا بە سیفەتی "القیوم"ی خۆی راگیری کردوون و ناهێڵێت تیابچن.

۞ لە کاتێکدا بوونی راستەقینە تەنها بوونی خودایە، ئیتر بۆ دەبێت بەندەی خودا خۆی نەداتە پاڵ ئەو بوونە راستەقینە؟ ئەو پێویستە لە قەڵای وەهمی بوونی شتەکان بێتە دەرەوە، چونکە ئەوە قەڵایەکی وەهمییە، نابینی خەڵکانێکی زۆر بە دەسەڵات و ماڵ و سامان و منداڵ و شوێنکەوتە وەهمی هێزیان بە خۆیان بەخشیوە، بەڵام هێزی راستەقینەی لەبن نەهاتوو خۆدانە پاڵ خودایە، ئەگەر ئەوانە هێزن ئەی بۆ ناتوانن رێگری لە مردنی مرۆڤ بکەن؟

۞ ۞ ۞

# حیكمەتی سەد و سی و هەشت

((لَوْلاَ ظُهُورُهُ فِي الْمُكَوَّنَاتِ مَا وَقَعَ عَلَيْهَا وُجُودُ صَارٍ   لَوْ ظَهَرَتْ صِفَاتُهُ اضْمَحَلَّتْ مُكَوَّنَاتُهُ))

**راڤەی وشەكان:**

**ظهوره:** دەركەوتنی

**المكونات:** بەدیهاتووەكان

**إبصار:** بینین

**اضمحلت:** دەپوكێتەوە

**واتا ((گەر دەركەوتنی خودا لە بەدیهاتووەكاندا بوونی نەبوایە ئەوا بوونی بینین نەدەكەوت بەسەریاندا (چاو پێیان هەڵنەدەهات، واتە نەدەبینران) گەر سیفەتەكانی خودا دەربكەون(جیلوە بكەن) بەدیهاتووەكان دەپوكێنەوە))**

**شرۆڤە:**

❁ ئەم حیكمەتە یەكێكە لەو حیكمەتانەی كە قسەكردن لەسەری لەلام سەخت و گرانە، ئەو حیكمەتانەی كە تیایاندا ئیبن عەتا قسە لەسەر خودا و بوون دەكات بوێریی گەرەكە راڤەیان بكەیت، ئەمەش نەك لەبەر حاڵی نەبوون لە حیكمەتەكان، بەڵكو لەبەر ئەوەی زمان كۆڵ و بەرتەسكە لە دەربڕینی ئەو مانا بەرز و بڵندانە و ترسی ئەوەم هەیە خوێنەری ئەم چەند حیكمەتە لێیان حاڵی نەبێت، یان بە هەڵە تێگەیشتنی لەلا دروست ببێت و ئامانجی راڤەكردنەكە بەدینەیەت، لەگەڵ ئەوەش خۆم رادەستی خودا دەكەم و كۆشش دەكەم تاكو بتوانم مانایەكی دروست بە خوێنەری بەڕێز بگەیەنم.

❁ لە حیكمەتەكانی پێشتردا ئاماژەیەكمان بە زات و ناو و سیفات و كرداری خودای موتەعال كرد، وتمان ئەو زاتە كامڵە خاوەنی كۆمەڵێك ناو و سیفەتی كەماڵە، لەو ناوو سیفەتانەوە خودا كردار(أفعال) ئەنجام دەدات، لە كردارەكانەوە ئاسەوار سەرهەڵدەدات،

سەراپای گەردوون ئاسەواری کردارەکانی خودای موتەعالە، کردارەکان لە پشتی بوونی بەدیهاتووەکانەوەن، ئەگەر ئەو کردارانە بوونیان نەبوایە ئەوا چاومان بە گەردوون و ئاسمان و زەوی هەڵنەدەهات، چونکە بوونیان نەدەبوو، بەڵکو ئێمە و چاوی ئێمەش بوونی نەدەبوو تاکو شتەکانی پێ ببینین، وتمان لە ناو و سیفەتەکانەوە کردارەکان سەریان هەڵداوە و بوونیان بە بەدیهاتووەکان بەخشیوە و رایانگرتوون، کاتێك خودی سیفەتەکان بێنە پێشەوە و لەناو بەدیهاتووەکاندا ئاشکرا ببن، ئەوا بەدیهاتووەکان دەپوکێنەوە و بوونی خۆیان لەدەست دەدەن، سەرنجی ئەم ئایەتە پیرۆزە بدە﴿فَلَمَّا تَجَلَّىٰ رَبُّهُۥ لِلۡجَبَلِ جَعَلَهُۥ دَكّٗا وَخَرَّ مُوسَىٰ صَعِقٗاۚ ١٤٣﴾ الأعراف: ١٤٣، کاتێك پەروەردگاری موسا بۆ چیایەکە جیلوەی کرد تەختی زەوی کرد و موسا لە هۆشی خۆی چوو، سەرنج بدە کاتێك سیفەتی خودا بۆ چیایەك تەجلی دەکات، چی بەسەر ئەو چیایەدا دێنێت، **"جعله دکا"** تەختی زەوی دەبێت و دەپوکێتەوە، گەر بە نموونەیەك ئەم وێنەیە لە زەینمان نزیك بکەینەوە دەڵێین: میزەلانێکی پڕ لە هەوا لە ئەوپەڕی جوانی و قەبارە و بوونی بەرچاودایە، مرۆڤ وەهمی بۆ دروست دەبێت و وا دەزانێت ئەو قەبارە گەورەیە بریتییە لە قەبارەی میزەلانەکە، ئەو لەبیری چووە برێك لە هەوای پەستاو لە پشتی ئەو لاستیکە تەنکەوەیە و بوون و قەبارەی پێ بەخشیوە، لە ناکاو بەهۆیەکەوە هەواکە دەردەپەڕێت، لەگەڵ هاتنە دەرەوەی هەواکە میزەلانەکە بوون و قەبارەی پێشووی خۆی لەدەست دەدات و دەپوکێتەوە، ئەو کات بۆمان دەردەکەوێت ئەوە ئەو برە هەوایە بوو شێوەی بە میزەلانەکە بەخشی بوو، نەك خودی میزەلانە، لەم نموونەیەوە سەرنج بدە و لە پەیوەندی سیفەتەکانی خودا بە بەدیهاتووەکانەوە حاڵی ببە.

# حیكمەتی سەد و سی و نۆ

((أَظْهَرَ كُلَّ شَيْءٍ لأَنَّهُ الْبَاطِنُ، وَطَوَى وُجُودَ كُلِّ شَيْءٍ لأَنَّهُ الظَّاهِرُ))

## راڤەی وشەكان:

**أظهر**: دەریخستووە

**الباطن**: شاراوە، یەكێكە لە ناوە جوانەكانی خودا

**طوى**: پێچاویەتەوە

**الظاهر**: ئاشكرا، یەكێكە لە ناوە جوانەكان

**واتا ((هەموو شتێكی ئاشكرا كردووە (دەرخستووە) چونكە خۆی خاوەنی ناوی "الباطن (شاراوە"یە، بوونی هەرچی شت هەیە پێچاوەتەوە، چونكە خاوەنی ناوی"الظاهر) ئاشكرا"یە))**

## شرۆڤە:

ئیبن عەتا لەم حیكمەتەدا باسی دوو ناوی جوانی خودای موتەعال دەكات كە ناوی"**الباطن، الظاهر**"ە، باس لە پەیوەندی ئەم دوو ناوە دەكات بە بوونەوە، بە پێچەوانەی تێگەیشتنی هەندێ لەوانەی ناوە جوانەكانی خودایان باس كردووە، ئیبن عەتا دەفەرموێ: كاتێك گەردوون و بوون دەردەكەون و ئاشكرا دەبن كە خودا "**الباطن**" بێت، گەر خودا بە ناوی "**الباطن**" مامەڵە لەگەڵ بووندا نەكات ئەوا بوون ئاشكرا نابێت و دەرناكەوێت، چونكە ئاشكرابوون و دەركەوتنی بوونی خودا بوونی شتەكانی تر ناهێڵێت، ئەی بە ناوی "**الظاهر**"چۆن لەگەڵ بووندا مامەڵە دەكات؟ ناوی "**الظاهر**"حەقیقەتی بوونی لە هەموو بەدیهاتووەكان وەرگرتۆتەوە، وەك پێشتر ئاماژەمان پێ كرد بوونی راستەقینە بوونی خودای موتەعالە، بەڵام لە خوار خوداوە بوونەكەی بە خۆیەوە نەبەستراوەتەوە، بۆیە بە هەمیشەیی ریشەی لە نەبووندایە، ئەمەیە كاریگەری ناوی "**الظاهر**" لەسەر بوون.

# حیکمەتی سەد و چل

((أَبَاحَ لَكَ أَنْ تَنْظُرَ مَا فِي الْمُكَوَّنَاتِ وَمَا أَذِنَ لَكَ أَنْ تَقِفَ مَعَ ذَوَاتِ الْمُكَوَّنَاتِ: ﴿قُلِ انْظُرُوا مَاذَا فِي السَّمَوَاتِ﴾ يونس: ١٠١، فَتَحَ لَكَ بَابَ الإِفْهَامِ وَلَمْ يَقُلْ: انْظُرُوا السَّمَوَاتِ لِئَلاَّ يَدُلَّكَ عَلَى وُجُودِ الأَجْرَامِ))

## راڤەی وشەکان:

**أباح لك:** ڕێگەی پێداوی، بۆی بەڕەوا بینیویت

**ذوات المكونات:** خودی بەدیهاتووەکان

**الأفهام:** تێگەیشتن

**الأجرام:** تەنەکان، هەسارە و مانگ و خۆر و ئەستێرەکان

**واتا ((ڕێگەی پێداوی سەرنج و تێڕامان بکەیت لەوەی لەناو بەدیهاتووەکاندایە، مۆڵەتی نەداوی لەگەڵ خودی بەدیهاتووەکاندا بوەستی(قل انظروا ماذا في السموات والأرض-سەرنج بدەن چی لەناو ئاسمان و زەویدایە) دەرگای تێگەیشتنت بۆ دەکاتەوە، نافەرمویێت"انظروا السموات-سەرنجی ئاسمان بدەن" بۆ ئەوەی بوونی تەنەکانت نیشان نەدات))**

## شرۆڤە:

❁ لەم حیکمەتەدا ئیبن عەتا داوامان لێ دەکات: لە چوارچێوەی بوون و گەردووندا خۆمان بەند نەکەین، سەرنجدان و تێڕامان لە ئاسمان و زەوی دەبێت بۆ مەبەستێکی بالاتر بێت، ئەویش ناسینی خودای موتەعالە لە رووی دروستکراوەکانییەوە، سەرنجدان تەنها بۆ سەرنجدان نییە، بەڵکو پێویستە ئەو زانیاریانەی لە گەردوون و ژیانەوە وەردەگیرێن بکرێنە بەڵگە بۆ ئەو دەسەلاتە مەزنەی بوون و شێوەی بە ژیان و گەردوون بەخشیوە، مرۆڤ بە مایکرۆسکۆپ وردترین بوونی پشکنی و بە تەلەسکۆپیش لە

دوورترین گەلەئەستێرە رادەمێنێت، ئەم وردبوونەوە و تێڕامانە بەشێکی زۆر لە زانایانی ژیان و گەردوونی سەراسیمە کردووە، ئەوان ئەو دەسەلاتە مەزنە دەبینن کە لە پشتی بوونەوەیە، دەزانن خاوەنی گەردوون چ خودایەکی مەزنە، قورئان شایەتی بۆ زانایان دەدات و دەفەرمویت:﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجْنَا بِهِۦ ثَمَرَٰتٍ مُّخْتَلِفًا أَلْوَٰنُهَا ۚ وَمِنَ ٱلْجِبَالِ جُدَدٌۢ بِيضٌ وَحُمْرٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهَا وَغَرَابِيبُ سُودٌ ﴿٢٧﴾ وَمِنَ ٱلنَّاسِ وَٱلدَّوَآبِّ وَٱلْأَنْعَٰمِ مُخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهُۥ كَذَٰلِكَ ۗ إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَٰٓؤُا۟ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ غَفُورٌ ﴿٢٨﴾﴾ فاطر: ٢٧-٢٨، ئایەتەکە باس لە داباریینی باران، سەوزبوونی گژوگیا، جۆرکانی شاخ و چیا و بەرد، مرۆڤ و زیندەواران و ئاژەڵان دەکات، دواتر دەفەرموێ: ئەوانەی ترس و خەشیەیان لە خودا هەیە بەندە زاناکانی خودان، لە کۆتایشدا باس لە دوو سیفەتی خودا دەکات کە سیفەتی **"عزیز"** و **"غفور"**ن، سەرنج بدە ئایەتەکە باس لەو زانایانە دەکات کە لە مرۆڤ و گیانداران و زەوی و گەردوون دەکۆڵنەوە.

❁ ئیبن عەتا دەڵێت قورئان دەفەرموێ: "سەرنج بدەن بزانن چی لە ئاسمان و زەویدایە"، نافەرموێ "سەرنجی ئاسمان" بدەن، ئاسمان و زەوی تەنەکانن، ئەوەی لە ئاسمان و زەویدایە ناو و سیفەت و کردارەکانی خودای موتەعالن، فەرمانی کردووە ئەوانە بدۆزنەوە و بناسنەوە، نەك تەنها لە پای تەنەکاندا بوەستن.

❁ ئەگەر ناسینەوەی ناو و سیفەت و کرداری خودا بە توێژینەوە و لێکۆڵینەوە و وردبوونەوەی وردی شتەکان و دواجار دۆزینەوەی یاسا و رێساکانی ژیان و گەردوون بەدەست بێن، ئەوا پێویستە بەو کارە هەڵبستین، چونکە بە وردبوونەوەیەکی سەرپێی لە ژیان و گەردوون مرۆڤ بە ئەنجامە مەزنەکان ناگات.

❁ ئەوەی مەنهەجی ئیسلام بۆ زانستە مرۆیی و گەردوونییەکان لە مەنهەجی خۆرئاوا(مەنهەجی زانستی سەردەم) جیادەکاتەوە ئەم خاڵە زۆر گرنگەیە، ئەویش لێکۆڵینەوە و توێژینەوەکان تەنها بۆ ناسینی گەردوون و ژیان نیین، بەڵکو ناسینی گەردوون و ژیان دەکرێتە هۆکارێك بۆ ناسینی خودای موتەعال، توێژینەوە و لێکۆڵینەوەکان مەبەست و مەرامی باڵاتر لە پشتیانەوەیە، تەنها بۆ ئاوەدان کردنەوەی ژیان نیین، بەڵکو بۆ ژیان و بۆ ناسینی خودان.

# حیکمەتی سەد و چل و یەك

((الأَكْوَانُ ثَابِتَةٌ بِإِثْبَاتِهِ، وَمَمْحُوَّةٌ بِأَحَدِيَّةِ ذَاتِهِ))

## ڕاڤەی وشەكان:

**الأكوان:** گەردوونەكان، بەدیهاتووەكان

**ثابتة:** جێگیر

**بإثباته:** بە جێگیركردنی خودا

**ممحوة:** سڕاوە و تیاچوو

**أحدية:** تاكوتەنهایی

**واتا ((گەردوونەكان جێگیرن بە جێگیر كردنیان لەلایەن خوداوە، سڕاوە و تیاچوون بە تاكوتەنهایی زاتی خوداوە))**

## شرۆڤە:

❁ ئیبن عەتا یەك حەقیقەت چەندین جار بە چەندین دەربڕینی جۆراوجۆر دەخاتە ڕوو، هەڵبەت هەر جارە و لە گۆشەیەكەوە سەرنجەكە دەخاتە ڕوو، ئەم چەندبارە كردنەوە دوو مەبەست لە پشتییەوەیە:

**یەكەمیان،** گرنگی و گەورەیی حەقیقەتەكە نیشان دەدات كە باس لە خودا و ناو و سیفەتەكانی و بوونیان لە ئاسۆی دەروون و گەردووندا دەكات.

**دووەم،** دەیەوێت بە چەند بارە كردنەوە حەقیقەتەكە لە بیر و ناخماندا قووڵ ببێتەوە و نەقش بگرێت.

❁ ئێمە كە سەرنجی گەردوون دەدەین بوونێكی جێگیر دەبینین، بەڵام دەبێ بزانین ئەوە خودایە ئەو بوونە جێگیرەی پێ بەخشیوە، نەك خودی خۆیان، پێشتر ئاماژەمان بە ناجێگیری بەدیهاتووەكان كرد و وتمان بە هەمیشەیی پێیەكیان لەناو تیاچووندایە و

خودا بوونیان پێ دەبەخشێتەوە، ئەوەش بە ناو و سیفەتی "الخلاق"ی خۆی، هەروەها بەم شێوەیەی ئێستایان راگیری کردوون بە ناو و سیفەتی "القیوم"ی خۆی﴿ وَيُمْسِكُ ٱلسَّمَآءَ أَن تَقَعَ عَلَى ٱلْأَرْضِ إِلَّا بِإِذْنِهِۦٓ ﴿٦٥﴾ ﴾ الحج: ٦٥

۞ لە پاڵ سیفەتی تاکوتەنهایی خودا(**الأحدیة**)دا هیچ بوونێکی تر بوونی نییە، بەڵکو ئەم سیفەتە سەراپای بوون دەسڕێتەوە و تەنها بوونێکی حەقیقی رادەگەیەنێت کە بوونی خودای موتەعالە، عاریفان دەڵێن لە پاڵ ناوی "أحد"دا هیچ ناوێکی تر بوونی نییە، بەڵام لە پاڵ ناوی "الواحد"دا بەدیهاتووەکان بوونیان پێ دەبەخشرێت، بەڵام بوونەکەیان بوونی خودا رادەگەیەنێت.

۞ بۆچی ناوی "**أحد**" ئەلف و لامی لەسەر نییە؟ ناوی "**أحد**" تەنها یەك جار لە قورئاندا هاتووە، ئەویش لە سورەتی "**الإخلاص**"دا﴿ قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴿١﴾ ﴾ الإخلاص: ١، لە زمانی عەرەبیدا "ئەلف و لام" بۆ ناساندن و تاك کردنەوەی کەسێکە یان شتێکە لەناو کۆمەڵێك کەس و شتدا، بەڵام لەگەڵ ناوی "أحد"دا هیچ شتێك بوونی نییە جگە لە بوونی خودای موتەعال، ئیتر —بە ئەلف و لام-لە چی تاکی بکاتەوە و بە کێی بناسێنێت؟ خودا هەر خۆی بوونی هەیە و تاکوتەنهایە و لەگەڵ ناوی "أحد" هەرچی بوونە کۆتایی پێهاتووە.

۞ ۞ ۞

# حیكمەتی سەد و چل و دوو

**((النَّاسُ يَمْدَحُونَكَ لِمَا يَظُنُّونَهُ فِيكَ، فَكُنْ أَنْتَ ذَامًّا لِنَفْسِكَ لِمَا تَعْلَمُهُ مِنْهَا))**

## راڤەی وشەكان:

**يمدحونك:** مەدحت دەكەن

**ذاما:** زەمی خۆت بكە، سەزەنشت و سەرەكۆنەی بكە

**واتا ((خەڵكی مەدحت دەكەن بەوەی گومان دەبەن لە تۆدا بوونی هەبێت (لە كردار و سیفەتی باش)، تۆ زەمی نەفسی خۆت بكە بەوەی دەزانیت تێیدایە (لە كردار و سیفەتی خراپ) ))**

## شرۆڤە:

❁ لەم حیكمەتەدا ئیبن عەتا دەمانگێڕێتەوە بۆ لای نەفسی خۆمان، مرۆڤ هەندێ جار بە مەدح و سەنای دەوروبەر بۆی حەقیقەتی خۆی لەبیر دەكات، خەڵكی وا گومان دەبەن تۆ كەسێكی چاك و پاك بیت و رازاوە بیت بە سیفەتی كەماڵ، بۆیە تەوازوعت بۆ دەنوێنن و بۆت ملكەچ دەبن و هەندێ جاریش زمانیان بە مەدح و سەنای تۆ دەپژێت، ئەمە لە خۆیدا بۆ بەندەی راستەقینەی خودا ژەهرێكی كوشندەیە، چونكە گەر وریا نەبێت حەقیقەتی خۆی لەبیر دەچێتەوە و كەماڵ دەداتە پاڵ نەفسی پڕ لە نەنگی و ناتەواوی، ئەوەش سەرەتای تیاچوونە، بۆیە ئامۆژگاریمان دەكات لەو بارەدا كە مەدح دەكرێین كار و كردەوە ناباشەكان و سیفەتە خراپەكانمان بهێنینە پێش چاوی خۆمان، تاكو بەو مەدح و سەنایە لە حەقیقەتی خۆمان دوور نەكەوینەوە.

❁ وەك كەسێكی زانا بەراورد لە نێوان دوو شتدا بكە، **یەكێكیان** گومان هەیە راست بێت، **ئەویتریان** زانستت پێی هەیە، بەڵكو یەقینت هەیە كە راست بێت، لە نێوان ئەم دوانەدا كامیان هەڵدەبژێریت؟ بە دڵنیاییەوە ئەوەیان كە یەقینت هەیە لەسەری،

خەڵکی گومانیان هەیە تۆ کەسێکی چاك و پاك بیت، بەڵاّم بۆ خۆت یەقینت هەیە کە چەندە نەنگی و ناتەواوی و کار و کردەوەی خراپت ئەنجامداوە، کەوابوو یەقینەکەی خۆت هەڵبژێرە و لە گومانی خەڵکی خۆت بەدوور بگرە.

۞ ۞ ۞

# حیکمەتی سەد و چل و سێ

((الْمُؤْمِنُ إِذَا مُدِحَ اسْتَحْيَا مِنَ اللهِ تَعَالَى أَنْ يُثْنَى عَلَيْهِ بِوَصْفٍ لاَ يَشْهَدُهُ مِنْ نَفْسِهِ))

**راڤەی وشەکان:**

**مُدح:** مەدح بکرێت

**استحيا:** شەرم دایدەگرێت

**أن يُثني عليه:** سەنای بکرێت، بە بالأیدا بخوێنرێت

**لا يشهده:** نایبینێت، هەستی پێ ناکات، شکی نابات

**واتا ((کەسی باوەڕدار کاتێك مەدح دەکرێت شەرم لـە خودا دایدەگرێتەوە بەوەی سەنای دەکرێت بە وەسفێك لـە نەفسی خۆدا نایبینێت))**

**شرۆڤە:**

ئەم حیکمەتە تەواوکاری حیکمەتی پێشترە، ئاستێکی بالأتر لەوەی پێشوو نیشان دەدات، لە حیکمەتەکەی پێشوودا دوو ئاستی نیشان دا، **ئاستێکی خراپ:** کە بە مەدح و سەنای خەڵکی فریو دەخوات و یەقینی خۆی بە گومانی خەڵك دەگۆڕێتەوە، **ئاستی دووەم**، ئەوەیە: کە شوێن یەقینی خۆی دەکەوێت و نەنگی و ناتەواوییەکان لە نەفسی خۆی دەبینێت و بە مەدح و سەنای خەڵکی فریو ناخوات، لەم حیکمەتەشدا باس لە ئاستێکی بالأتر دەکات، ئەویش ئەوەیە کە کاتێك مەدح و سەنا دەکرێت شەرمەزاری لەبەردەم خودادا دایدەگرێتەوە، چونکە دەزانێت چەندە کەمتەرخەمی کردووە لە حەقی خودا و چەندە بێئاگا بووە لە پەروەردگاری.

شەرم کردن لە خودا مەقامێکی بالأیە لە مەقامەکانی ئیمان، لە مەقامی چاودێری(المراقبة)ەوە سەرهەڵدەدات، ئەو کەسەی هەست بە چاودێری خودایی و ئامادەبوونی دەکات لە پەروەردگاری شەرم دایدەگرێت، ئەمەش پاڵیدەنێت بۆ دوورکەوتنەوە لە کەمتەرخەمییەکان و جێبەجێ کردنی فەرمانەکان.

# حیكمەتی سەد و چل و چوار

((أَجْهَلُ النَّاسِ مَنْ تَرَكَ يَقِينَ مَا عِنْدَهُ لِظَنٍّ مَا عِنْدَ النَّاسِ))

## ڕاڤەی وشەكان:

**أجهل:** نەزانترین، نەفامترین

**((نەزانترین كەس ئەو كەسەیە یەقینی خۆی بۆ گومانی خەڵكی واز لێ دەهێنێت))**

## شرۆڤە:

❁ ئەم حیكمەتەش پەیوەستە بە دوو حیكمەتەكەی ترەوە، بە توندترین وەسف وەسفی ئەو كەسانە دەكات بە هۆی مەدح و سەنای خەڵكییەوە حەقیقەتی خۆیان لەبیر دەچێتەوە، لە كاتێكدا ئەوان یەقینی تەواویان بە ناتەواوی و كەمتەرخەمی و نەنگییەكانی خۆیان هەیە، ئەو وەسفەش بریتییە لە "نەفامترین و نەزانترین"، چ كەسێك لەو كەسە نەزانتر و نەفامترە بە پیاهەڵدانی خەڵكی خۆی لێ بگۆڕێت؟!

❁ ئەگەر مرۆڤ زانست و زانیاری لەسەر هەرچی شتە لەلا بێت، بەڵام خۆی نەناسێت ئەو مرۆڤە نەزانترین نەزانە، خودای موتەعال باسی كەسێك دەكات كە زۆرێك لە ئایەتی خودای لە ئاسۆی دەروون و گەردووندا بینی، بەڵام دواتر مانای هەموو ئەو ئایەتانەی لە خۆی دارنی، بە جۆرێك گومڕایی رووی تێكرد شەیتان بوو بە شاگردی و شوێنی كەوت﴿ وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ ٱلَّذِيٓ ءَاتَيۡنَٰهُ ءَايَٰتِنَا فَٱنسَلَخَ مِنۡهَا فَأَتۡبَعَهُ ٱلشَّيۡطَٰنُ فَكَانَ مِنَ ٱلۡغَاوِينَ ﴿١٧٥﴾ ﴾ الأعراف: ١٧٥، هەواڵی ئەو كەسەیان پێ بدە كە ئایەتەكانی خۆمان پێ بەخشی و دواتر خۆی لێیان دارنی و شەیتان شوێنی كەوت و چووە ریزی گومڕایا نو سەرلێشێواوانەوە، ئەم كەسە ئەگەر خۆی بناسیبایە بەوجۆرە لەخودا دوورنەدەكەوتەوە، مەگەر گومڕابوونی شەیتان چیترە جگە لە "خۆنەناسین"، ئەم "خۆنەناسین"ە سەردەكێشێت بۆ زیادەڕەوی و لوتبەرزی و خۆبەزلزانین، ئەو گەر خۆی بناسیبایە-

نەعلەتی خودای لیٚ بیٚت- بە ئاگربوونی خۆیەوە فەخری نەدەکرد، ئاخر عومرت نەمیٚنیٚ ئاگر و خاك چ جیاوازییەکیان لە بەردەم خودادا هەیە؟ هەر هەموو دروستکراوی خودان، بەلاٚم نەزانین و نەناسینی خۆ بەو سەرئەنجامە ترسناکەی گەیاند، ئەو کاتانەی مرۆڤ گوێڕایەڵی شەیتان دەکات گوێڕایەڵی لە باوکی هەموو نەفامەکان کردووە، نەزانترین و نەفامترین خەلقی خودای کردووە بە پێشەوا و مامۆستای خۆی، مەکربازی و حیلەبازی شەیتان نیشانەی ئەقلٚ و زانین و کەماڵی ئەو نییە، بەڵکو فیٚلٚ و پیلانەکانیشی لە لاوازی و نەزانینەوەیە، خودا فریشتەکانی پاراست و پاك رایگرتن لەو هەڵە و نەزانین و تیٚکەوتنەی ئیبلیس رووبەڕووی بوویەوە، لەو قسەی خودای موتەعال تیٚگەیشتن کە فەرمووی﴿إِنِّيٓ أَعۡلَمُ مَا لَا تَعۡلَمُونَ﴾ البقرة: ٣٠، من شتێك دەزانم ئێوە نایزانن، بۆیە سنووری خۆیان تیٚنەپەڕاند و لەوە زیاتر لەسەری نەڕۆیشتن، چونکە دەیانزانی وتنی لەوە زیاتر تیٚپەڕاندنی سنووری بەندەبوونە، زانییان خودا مەخلوقیٚکی مەزن دروست دەکات، ئەویش مرۆڤە، بەلاٚم ئیبلیس نەزان بوو، سنووری بەندەبوونی تیٚپەڕاند، هەڵوێستیٚکی لەو مەخلوقە شکۆدارە نواند کە خودای لە خۆی رەنجاند.

# حیکمەتی سەد و چل و پێنج

((إِذَا أَطْلَقَ الثَّنَاءَ عَلَيْكَ وَلَسْتَ بِأَهْلٍ فَأَثْنِ عَلَيْهِ بِمَا هُوَ أَهْلُهُ))

**ڕاڤەی وشەکان:**

**أطلق الثناء عليك:** ئەگەر خودا زمانی خەڵکی بە مەدح و سەنای تۆ پژاند

**لست بأهل:** شایستەی نەبووی

**فأثن عليه:** مەدح و سەنای خودا بکە

**واتا ((ئەگەر خودا زمانی خەڵکی بە مەدح و سەنای تۆ پژاند و تۆش شایستەی نەبوویت و نیت، مەدح و سەنای خودا بکە کە شایستەیەتی))**

**شرۆڤە:**

۞ ئەم حیکمەتەش ئاستێکی باڵاتر لەو ئاستەی حیکمەتەکەی پێشوو ئاماژەی پێکرد باس لێوە دەکات، لەوەی پێشوودا فەرمووی: کاتێك خەڵکی مەدح و سەنات دەکەن شەرم لە خودا داتبگرێتەوە بۆ ئەو نەنگی و ناتەواویانەی لە خۆتدا شکی دەبەی، لەم حیکمەتەشدا داوا دەکات بەرانبەر مەدح و سەنای خەڵك -کە شایستەی نیت- مەدح و سەنای خودا بکە کە شایستەیەتی.

۞ ئیبن عەتا لەم سێ حیکمەتەدا سێ جۆر لە مەدحکەرانی خستە ڕوو:

**جۆری یەکەم:** خەڵکانێکی نەزان و نەفامن کە بەرژەوەندییان لە مەدح و سەنای خەڵکیدایە.

**جۆری دووەم:** مەدحەکەیان بۆ بەرژەوەندی خۆیان نییە، بەڵکو زۆرجار خۆشەویستی و ڕێزە بۆ کەسی مەدحکراو، بەڵام بێئاگا و نەزانن بە نەنگی و ناتەواوییەکانی ئەو کەسە.

**جۆری سێیەم:** جۆرێکی باڵایە، خودا زمانی خەڵکی بەو مەدح و سەنایە پژاندووە، ئەمەش تاقیکردنەوەی خودایە بۆ بەندەکەی، ئایا خۆی لێ بایی دەبێت و بە مەدحی

خەڵكی فریو دەخوات، یاخود وەك شۆڕەبی لەبەردەم خودادا پەلوپۆكانی شۆڕ دەكاتەوە و دەكەوێتە مەدح و سەنای خودای موتەعال كە شایستەی مەدح و سەنایە، چونكە هەر ئەو(ﷻ) كامڵە و دوورە لە هەرچی نەنگی و ناتەواوییەك، حەمد و سەنا تەنها بۆ خودایە﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢﴾ ﴾ الفاتحة: ٢

۞ ۞ ۞

# حیکمەتی سەد و چل و شەش

((الزُّهَّادُ إِذَا مُدِحُوا انْقَبَضُوا لِشُهُودِهِمُ الثَّنَاءَ مِنَ الْخَلْقِ، وَالْعَارِفُونَ إِذَا مُدِحُوا انْبَسَطُوا لِشُهُودِهِمْ ذَلِكَ مِنَ الْمَلِكِ الْحَقِّ))

## راڤەی وشەکان:

**الزهاد:** زاهیدان

**مُدحوا:** مەدح بکرێن

**انقبضوا:** گرژ دەبن، سینەیان دێتەوە یەك

**انبسطوا:** دەکرێنەوە

**واتا ((زاهیدان کاتێك مەدح دەکرێن گرژ دەبن و سینەیان دێتەوە یەك، بەهۆی بینینی مەدح و سەنا لە خەڵکەوە، عاریفان کاتێك مەدح دەکرێن دەکرێنەوە، بەهۆی بینینی مەدح و سەنا لە خوداوە))**

## شرۆڤە:

❁ لەم حیکمەتەدا دوو ئاستی بالاّتر لە سێ ئاستەکەی تر نیشان دەدات، **یەکەمیان ئاستی** زاهیدانە کە بە مەدح و سەنای خەڵکی گرژدەبن و بێزاری و گرانی شانیان قورس دەکات، زاهیدان مەدح و سەنای خەڵکی بە سزادان بۆ خۆیان تەماشا دەکەن، بۆیە سینەیان بەرتەسك دەبێتەوە و بە بیستنی بارگران دەبن، **ئاستی بالاّتر** لەم ئاستە ئاستی عاریفانە، ئەوان بە بیستنی مەدح و سەنا خۆشحاڵ دەبن، نەك لەبەر ئەوەی وا هەست بکەن لە دڵی خەڵکیدا جێی خۆیان کردۆتەوە، یان هەست بە گەورەیی و تەواویی نەفسی خۆیان بکەن، یان نەنگی و ناتەواوییەکانی نەفسیان لەبیر چووبێتەوە، نەخێر ئەوان لەمێژە ئەو دۆخە نزمەیان بەجێهێڵاوە، بەڵکو لەبەر ئەوەی دەزانن قەدەرێکی خودایە بە سەریاندا گوزەر دەکات، قەدەرێکە خودا پێیخۆشە زمانی

خەڵکی بە مەدح و سەنای بەندەکەی بپژێت، ئەم پێخۆشبوونەی خودا ئەوانیش خۆشحاڵ دەکات، چونکە ئەوان خۆشیان دێت لە هەموو ئەو شتانەی خودا پێیخۆشە و بێزارن لە هەموو ئەو شتانەی خودا پێی ناخۆشە.

❁ عاریفان لە ئاستێکدان نە بە مەدحی خەڵکی خۆشحاڵ دەبن و نە بە زەمی خەڵکی دڵتەنگی روویان تێدەکات، ئەی چۆن بەو مەدحەی تر کە هەر لەسەر زمانی خەڵکییە خۆشحاڵ دەبن؟ عاریفان مەدحەکانیان پێ جیادەکرێتەوە، دەزانن کام مەدحە لە خوداوەیە و کامەیان لە خەڵکەوەیە، ئەوان مەدحی نەزانان لە مەدحی زانایان جیادەکەنەوە، دڵی عاریف بە خوداوە پەیوەستە، دەزانێت بە چی خۆشحاڵ دەبێت و بە چی بێزاری رووی لێ دەکات، ئەو مرۆڤەی بە هەمیشەیی دڵی لە خزمەتی خودادایە یاسا و رێسا باوەکانی تێکشکاندووە و کەوتۆتە ناو جۆرێکی تر لە یاسا و رێساوە.

❁ ❁ ❁

# حیکمەتی سەد و چل و حەوت

**((مَتَى كُنْتَ إِذَا أُعْطِيتَ بَسَطَكَ الْعَطَاءُ، وَإِذَا مُنِعْتَ قَبَضَكَ الْمَنْعُ فَاسْتَدِلَّ بِذَلِكَ عَلَى ثُبُوتِ طُفُولِيَّتِكَ وَعَدَمِ صِدْقِكَ فِي عُبُودِيَّتِكَ))**

## راڤەی وشەکان:

**أُعطيت:** پێتبەخشرا

**بسطك العطاء:** پێبەخشینەکە کرانەوەی بۆ دروست کردی

**مُنعت:** لێت قەدەغە کرا، رێگریت لێکرا، مەحرومکرایت لە شتێك

**قبضك المنع:** گرتنەوەکە گرژت بکات، سینەت بهێنێتەوە یەك، بێزارت بکات

**ثبوت طفولیتك:** جێگیربوونی مشەخۆریت، ساغبوونەوەی رەفتاری منداڵانەت

**واتا ((گەر هەر کاتێك پێت بەخشرا بەخشینەکە سروور و کرانەوەی بۆ دروست کردیت، گەر لێتگیرایەوە گرتنەوەکە گرژ و بێزاری کردی، ئەوە بکە بە بەڵگەی مشەخۆریت (یان بەڵگەی رەفتاری منداڵانەت) و نەبوونی صدق لە بەندایەتییەکەت))**

## شرۆڤە:

❁ ئەم مەقامە بەرزانە ئیبن عەتا باسی لەبارەوە دەکات مەقامی عاریفانە، بەلاّم دەبێ وەك ئاسۆیەکی رووناك هەنگاو هەڵبگرین بۆ لای، مرۆڤ بە سروشتی مرۆیی خۆی کاتێك پێی دەبەخشرێت -لە بەخششە مادییەکان و بەخششە مەعنەوییەکان- خۆشحاڵی و سروور و کرانەوە رووی لێ دەکات، کاتێکیش لێی دەگیرێتەوە سنگی دێتەوە یەك و خەم و پەژارە دایدەگرێتەوە، ئیبن عەتا لەم حیکمەتەدا دەفەرموێ ئەگەر حاڵت بەم جۆرە بوو ئەوە بزانە تۆ رێگەی خواناسان و عاریفانت نەگرتۆتە بەر، بەڵکو تۆ مشەخۆری سەر رێگەی خواناسانی، منداڵێکی و بانگەشەی گەوران دەکەیت.

۞ موریدان لەم ئەسڵەدا مەقامی جۆراوجۆریان هەیە، هەیانە بە پێبەخشین و گرتنەوەی دونیایی حاڵی بۆ خۆش و ناخۆش ناگۆڕێت، بەڵام بۆ پێبەخشین و گرتنەوەی مەعنەوی حاڵی بۆ خۆش و ناخۆش دەگۆڕێت، هەیانە بە پێ بەخشینی مەعنەوی خۆشحاڵ نابێت، بەڵام بە گرتنەوەی بێزار دەبێت، هەیانە بە پێچەوانەی ئەمەوە بە پێبەخشین خۆشحاڵ دەبێت، بەڵام بە گرتنەوە بێزاری رووی تێناکات، بەڵام کەسی عاریف لەم مەیدانەدا قسە و هەڵوێستی تری هەیە، ئەوەش دوو ئاستە:

**ئاستی یەکەم،** نە بە بەخشینی مادی و مەعنەوی خۆشحاڵە، نە بە گرتنەوەیان بێزاری رووی لێ دەکات، ئەو کەوتۆتە سەر رێگەی ئیستیقامە و جگە لە خودا لا بەلای هیچ شتێکی تردا ناکاتەوە.

**ئاستی دووەم** کە بالاترە لە ئاستی یەکەم ئەوەیە کە بە پێبەخشین و گرتنەوە خۆشحاڵ دەبێت، چونکە دەزانێت لەلای خوداوەیە و هەڵبژاردەی خودایە بۆ ئەو، خۆشحاڵییەکەی لە پێناوی خودی شتەکەدا نییە، بەڵکو بۆ ئەو قەدەرەیە خودا بەسەر ئەودا تێیدەپەڕێنێت، بۆیە بە خۆش و ناخۆشی قەدەر خۆشحاڵە.

۞ ۞ ۞

# حیكمەتی سەد و چل و هەشت

((إِذَا وَقَعَ مِنْكَ ذَنْبٌ فَلاَ يَكُنْ سَبَبًا لِيَأْسِكَ مِنْ حُصُولِ الاسْتِقَامَةِ مَعَ رَبِّكَ، فَقَدْ يَكُونُ ذَلِكَ آخِرَ ذَنْبٍ قُدِّرَ عَلَيْكَ))

**راڤەی وشەكان:**

**وقع:** روویدا، لێت وەشایەوە

**سببا ليأسك:** هۆیەك بۆ بێهیوابوونت

**الإستقامة:** راست وەستان، وەستانی دروست لەسەر راستە شەقام

**قُدر لك:** بۆت دیاریكرابێت، بۆت بڕابێتەوە

**واتا ((گەر گوناهێكت لێ وەشایەوە با نەبێتە هۆیەك بۆ بێهیوابوونت لە بەدەستهێنانی ئیستیقامە لەگەڵ پەروەردگارت، لەوانەیە ئەو گوناهە دوایین گوناهێك بێت بۆت بڕابێتەوە))**

**شرۆڤە:**

❁ لەم حیكمەتەدا ئیبن عەتا ئامۆژگاری موریدان دەكات -بە تایبەت ئەوانەی لەسەر رێگەی ئیستیقامەن- بەهۆی روودانی گوناهێكەوە لەسەر دەستیان لە ئیستیقامە بۆ پەروەردگار بێهیوا نەبن، دەفەرموێت: لەوانەیە ئەو گوناهە دوایین گوناهێك بێت تۆ ئەنجامی دەدەی، دواتر بە تەواوی بۆ خودا راوەستاو بیت و قولاپی حەزەكانی دونیا بۆ لای خۆیان راتنەكێشن، یان لەوانەیە بەهۆی ئەو گوناهەوە ئەوەندە زەلیلی و گەردنكەچی بۆ خودا دەربڕی خودا جارێكی تر تۆ نەخاتەوە سەر رێگەی گوناه.

❁ بێهیوابوون لە ئیستیقامە بۆ خۆی گوناهێكە، ئەو مرۆڤانەی بەهۆی گوناهەوە لە ئیستیقامە بێهیوا دەبن ئیستیقامەكەیان لە خۆیان ناسیوە نەك لە خوداوە، ئەمە گوناهێك، گوناهی دووەم لە خودی بێهیوابووندایە، باوەڕداری راستەقینە هەرگیز بەهۆی ناسینی خودا و رەحمەتی بەرینییەوە دەستەئەژنۆیی و بێهیوایی بەرۆكی پێ ناگرێت.

۞ عاریفان کاتێك گوناهی براوە روویان لێ دەکات لەو حیکمەت و نهێنییە ورد دەبنەوە بەهۆیەوە گوناهەکە ئاراستەی ئەوان کراوە، ئەوان رەشەبای حەزی گوناهیان تێدا خامۆش بووە، ویست و لێبڕانیان لەسەر خودا کۆبووەتەوە و تەمەنێکە لەسەر رێگەی ئیستیقامە بەرەو خودا هەنگاو هەڵدەگرن، دەپرسن: ئەم گوناهە بۆ؟ حیکمەت و نهێنی ئەم گوناهە لەسەر رێگەی ئیستیقامە چی دەگەیەنێت؟ بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە: تەوبەکردن یەکەمین مەقام و دواهەمین مەقامی ئەم رێگەیە، مورید بە تەوبە دەست بە سەفەرەکەی دەکات و دوای بڕینی زۆرێك لە مەقامات دیسان پێ لە مەقامی تەوبە دەنێتەوە، کردنی ئەو گوناهە هەڵکردنی گڵۆپێکی سوورە بۆ ئاگادار کردنەوەی عاریف کە لەبەردەمتدا مەقامی تەوبە جارێکی تر دەست پێدەکاتەوە ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ءَامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَٱلۡكِتَٰبِ ٱلَّذِي نَزَّلَ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَٱلۡكِتَٰبِ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ مِن قَبۡلُۚ ﴿١٣٦﴾ ﴾ النساء: ١٣٦، ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێنا باوەڕ بهێنن بە خودا و پێغەمبەرەکەی و ئەو کتێبەی بۆ سەر پێغەمبەرەکەی دایبەزاند و ئەو کتێبەی پێشتر دایبەزاند، سەرنج بدە لە ئایەتەکە دەفەرموێت:: "ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێنا باوەڕ بهێنن"، هەروەها﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ تُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ تَوۡبَةٗ نَّصُوحًا ﴾ التحریم:٨، ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێنا بە تەوبەیەکی کۆتایی بۆ لای خودا تەوبە بکەن، دیارە مرۆڤ کە لە سەرەتاوە ئیمان دەهێنێت تەوبە لە شیرك و گوناهان دەکات ئەوجا دەچێتە ناو بازنەی ئیمانەوە، دواتر خودا جارێکی تر داوای تەوبەیان لێدەکاتەوە.

۞ ۞ ۞

# حیکمەتی سەد و چل و نۆ

((إِذَا أَرَدْتَ أَنْ يَفْتَحَ لَكَ بَابَ الرَّجَاءِ فَاشْهَدْ مَا مِنْهُ إِلَيْكَ، وَإِذَا أَرَدْتَ أَنْ يَفْتَحَ لَكَ بَابَ الْخَوْفِ فَاشْهَدْ مَا مِنْكَ إِلَيْهِ))

## ڕاڤەی وشەکان:

**باب الرجاء:** دەرگای ڕجا(هیوا و ئومێدی باش بە خودا)

**ما منه إليك:** ئەوەی لە ئەوەوە بە تۆ دەگات

**باب الخوف:** دەرگای ترس لە خودا

**ما منك إليه:** ئەوەی لە تۆوە بە ئەو دەگات

**واتا ((ئەگەر ویستت خودا دەرگای ڕجات(هیوا و ئومێدی باش بە خودا) بۆ بکاتەوە سەرنجی ئەو نیعمەتانە بدە لە خوداوە بە تۆ دەگات، ئەگەر ویستت خودا دەرگای ترست بە ڕوودا بکاتەوە سەرنجی ئەو کار و کردەوە خراپانە بدە لە تۆوە بە خودا دەگات))**

## شرۆڤە:

❁ دەرگای ڕجا و دەرگای ترس دوو باڵن بەهۆیەوە مورید بۆ لای پەروەردگاری لە شەقەی باڵ دەدات، نەبوونی هەر یەکێك لەم دوو باڵە ڕۆیشتنی مورید پەك دەخات، خودای موتەعال وەسفی زەکەریا(عليه السلام) و هاوسەرەکەی دەکات کە بە گیانی ڕجا حەز و ڕەغبەتیان هەبووە بۆ لای خودا و نیعمەتەکانی خودا، هەروەها بە گیانی ترس ڕەهبەتیان لە سزای خودایی هەبووە﴿وَيَدْعُونَنَا رَغَبًا وَرَهَبًا﴾الأنبياء: ٩٠، بە ڕەغبەت و ڕەهبەتەوە دەیانپەرستین و دوعا و پاڕانەوەیان ئەنجام دەدا.

❁ سەرنجدان لە نیعمەتە بەرینەکانی خودا دەرگای ڕجا بە ڕووی مرۆڤدا دەکاتەوە، خودایەك بەم هەموو بەزەیی و بەخششەوە، خودایەك ئەوەندە مرۆڤی خۆشدەوێت کە

سەراپای ژیان و گەردوونی بۆ کردووە بە نیعمەت، هەروەها ئەو خودایەی لە منداڵییەوە دەستی بە منەوەیە، کۆمەکیم دەکات، لە بەلاّ و ناخۆشییەکان بەدوورم دەگرێت، وەلاّمی داوا و دوعاکانم دەداتەوە، ئەمانە و هەزاران هەزار نیعمەتی تری دیار و شاراوە، تێڕامان لەم نیعمەتانە هیوا بە بەخشینی خودا لە مرۆڤدا دەگەشێنێتەوە، بەلاّم گەر رجا زاڵ بێت بەسەر مرۆڤدا کرانەوە و ساردبوونەوە لە جێبەجێ کردنی ئەرك و فەرمانەکان رووی لێ دەکات، بۆیە دەبێت بە زوویی لایەك بە لای ترسدا بکاتەوە، بۆ کرانەوەی دەروازەی ترس پێویستە لە گوناهەکانی رابردوو و کەمتەرخەمی و نەنگییەکانی ئێستای بڕوانێت، بزانێت چ کار و کردەوەیەکی لە دەفتەردا تۆمار کردووە، ئەو دەفتەرەی رۆژانە دەخرێتە بەردەم خودای موتەعال و هەموو کردەوەکان دەبینێت، لێرەوە ترسێك هەموو بوونی داگیر دەکات، پەلاماری تەوبە و ئیستیغفار دەدات و لە کاری خراپە دەست دەکێشێتەوە و روو بە کاری چاکە هەنگاو هەڵدەگرێت، ترس ئەو قامچییەیە دەدرێت لە ئەسپی نەفس تاکو لە رێگە بڕین سارد نەبێتەوە﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَلۡتَنظُرۡ نَفۡسٞ مَّا قَدَّمَتۡ لِغَدٖۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ ١٨ ﴾ الحشر: ١٨، ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێنا لە خودا بترسن و هەر کەسێك با سەرنج بدات چی بۆ سبەینێ پێشکەش کردووە، لە خودا بترسن، خودا شارەزا و بەئاگایە لەوەی ئەنجامی دەدەن.

# حیکمەتی سەد و پەنجا

((رُبَّمَا أَفَادَكَ فِى لَيْلِ الْقَبْضِ مَا لَمْ تَسْتَفِدْهُ فِى إِشْرَاقِ نَهَارِ الْبَسْطِ
﴿لاَ تَدْرُونَ أَيُّهُمْ أَقْرَبُ لَكُمْ نَفْعًا﴾ النساء: ١١))

**راڤەی وشەکان:**

**أفادك:** سوودت پێ بگەیەنێت

**ليل القبض:** شەوی گرژبوون و بەرتەسکبوونەوە

**لم تستفده:** سوودی لێ نەبینیت

**إشراق النهار البسط:** هەڵهاتنی خۆری کرانەوە

**واتا ((لەوانەیە خودا بە شەوی "گرژبوون" بە جۆرێك سوود پێ بگەیەنێت کە لە ڕۆشنایی ڕۆژی "کرانەوە"دا ئەو سوودە نەبینی))**

**شرۆڤە**

❁ لە حیکمەتی هەشتادا پێناسەی گرژبوون(**القبض**) و کرانەوە(**البسط**)مان کردووە کە لێرەدا تەنها پێناسەکەیان دادەنێینەوە:

**کرانەوە:** حاڵەتێکی خۆشی و سرووڕە کە هەموو بوونی کەسی باوەڕدار داگیر دەکات، زۆرجار سەرچاوەی ئەم خۆشی و سرووڕە نادیارەو هەندێ جاریش دڵخۆشبوون بە بەزەیی و لێبوردەیی و میهرەبانی خودا و شەوقی گەیشتن بە بەهەشت و ناز و نیعمەتەکانی هۆکارەکەیەتی.

**گرژبوونیش:** دۆخێکی توندبوون و گرژبوونی ناخی کەسی باوەڕدارە کە هەموو گەردوونی لێ بەرتەسك دەبێتەوەو تەنانەت لەگەڵ خودی خۆی نامۆ دەبێت، ئەم حاڵەتەش (هەر وەك کرانەوە) زۆر جار سەرچاوەکەی نادیارە و هەندێ جاریش ترسان لە خودا و جێبەجێ نەکردنی مافی بەندایەتی و بیرکردنەوە لە سزای دواڕۆژ ئەم دۆخە دەخولقێنێت

۞ ئەوەی لە م حیکمەتەدا ئیبن عەتا ئاماژەی پێدەدات ئەوەیە کە موریدی ڕێگە بە سروشت خۆشی دێت لە "کرانەوە" و بێزارە لە "گرژبوون"، ئەو دەڵێت: تۆ چووزانیت لەوانەیە شەوی گرژبوون لە ڕۆشنایی ڕۆژی کرانەوە بۆ سەیر و سلوکی تۆ باشتر بێت، لە کرانەوەدا مورید وزەی ڕۆحی وەردەگرێت، بەڵاّم وەستاوە، لە گرژبووندا وزەکە بەخت دەکات، بەڵاّم تەکان بە خۆی دەدات و جوولاّوە، مورید لە باری گرژبووندا نزیکی لە خودا زیاترە، چونکە دەجوڵێت بەرەو خودا تا باری وەستانی کە لە کرانەوەدایە، گرژبوون و کرانەوە بشوبهێنە بە لێدانی دڵ لە باری گرژبوون و خاوبوونەوەیدا، لە خاوبوونەوەدا پڕ دەبێت لە خوێن و گرژبوون و خوێنەکە پاڵپێوەدەنێت بۆ هەموو جەستە، باری گرژبوون بۆ دڵ باری جووڵەیە، بەڵاّم باری خاوبوونەوە باری وەرگرتنە.

۞ ئیبن عەتا گرژبوونی بە شەو شوبهاند و کرانەوەش بە ڕۆشنایی ڕۆژ، چونکە لە ناوەوە مورید بەو جۆرە وێنای گرژبوون و کرانەوە دەکات، لە گرژبووندا نوور کەم دەبێتەوە، بەڵاّم لە کرانەوەدا پڕدەبێت بە نوور، لە شەوی گرژبووندا هەموو نهێنییەکانی مورید شاراوە دەبن و پەردەیان بەسەردا دەدرێت، بەڵاّم لە ڕۆشنایی ڕۆژی کرانەوەدا زۆر شاراوە و پەنهانی مورید دەکەوێتە دەرەوە.

۞ موریدی کامڵ یاخود عاریف ئەو کەسەیە لە هەردوو بارەکەدا خۆی رادەستی خودا کردووە، ئەو(ﷻ) کامیانی بۆ ئەو پێ باش بێت خۆی رادەست دەکات و بیر لە خۆشی و ناخۆشی خۆی ناکاتەوە، بۆیە لە کۆتایی حیکمەتەکەدا ئاماژە بەوە دەکات کە مورید خۆی رادەستی خودا بکات و ئەو کامیانی بۆ هەڵبژارد ئەوە بە شیاو بۆ خۆی تەماشا بکات و ئەم ئایەتە پیرۆزە دەکاتە بەڵگە﴿ لَا تَدْرُونَ أَيُّهُمْ أَقْرَبُ لَكُمْ نَفْعًا ﴾ النساء: ١١، نازانن کامیان نزیکترن بە ئێوە.

۞ ۞ ۞

# حیکمەتی سەد و پەنجا و یەك

((مَطَالِعُ الأَنْوَارِ الْقُلُوبُ وَالأَسْرَارُ))

**راڤەی وشەکان:**

**مطالع الأنوار**: کۆی "**مطلع**"ە بە مانای شوێنی دەرکەوتنی نوور

**القلوب والأسرار**: کۆی "القلب" و "السر"ن، بە مانای دڵ و نهێنی(پەنهان)

**واتا ((شوێنی هەڵهاتنی نوور بریتییە لە دڵ و پەنهان))**

**شرۆڤە:**

۞ شوێنی هەڵهاتن و دەرکەوتنی "ئەستێرەی زانست" و "مانگی مەعریفە" و "**خۆری یەکتاپەرستی**" بریتییە لە دڵ و پەنهانی کەسی باوەڕدار، هەتا دڵ و پەنهان پاك و درەوشاوەتر بن نوور و رۆشنایی ئەو سیانە زۆرتر و زیاتر پەخش دەکەنەوە، دڵ و پەنهان وەك ئاسمان وایە و زانست و مەعریفە و یەکتاپەرستیش وەك ئەستێرە و مانگ و خۆرن.

۞ موریدی رێگە کار لەسەر پاکژکردنەوە و خاوێنکردنەوەی ئاوێنەی دڵ و پەنهانی دەکات تاکو نووری خودایی بەجوانی لەسەر پەخش ببێتەوە، ئەو نوورەی دەبێتە رێنیشاندەرێك بۆ جیاکردنەوەی حەق لە باتڵ و خێر لە شەڕ و چاك لە خراپ ﴿أَوَمَن كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَاهُ وَجَعَلْنَا لَهُۥ نُورًا يَمْشِى بِهِۦ فِى ٱلنَّاسِ كَمَن مَّثَلُهُۥ فِى ٱلظُّلُمَٰتِ لَيْسَ بِخَارِجٍ مِّنْهَا كَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِلْكَٰفِرِينَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٢٢﴾﴾ الأنعام: ١٢٢، ئایا ئەو کەسەی کە مردبوو و زیندوومان کردەوە و نوورێکمان پێ بەخشی لەناو خەڵکیدا پێیەوە بڕوات وەك نموونەی ئەو کەسە وایە لەناو تاریکستاندایە و ناتوانێت لێی بێتە دەرەوە، هەر بەو جۆرە ئەوەی بێباوەڕان ئەنجامی دەدەن بۆیان جوان دەکرێت، زیادە نوورێك بۆ

باوەڕدار بوونی هەیە لە پاڵ نووری شەریعەتدا کە راست و رەوانی لە گومڕایی جیاکردۆتەوە﴿ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشۡدُ مِنَ ٱلۡغَيِّۚ فَمَن يَكۡفُرۡ بِٱلطَّٰغُوتِ وَيُؤۡمِنۢ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱسۡتَمۡسَكَ بِٱلۡعُرۡوَةِ ٱلۡوُثۡقَىٰ لَا ٱنفِصَامَ لَهَا ﴾ البقرة: ٢٥٦، بەدڵنیاییەوە رێگەی راست و رەوان لە گومڕایی جیابۆتەوە، بۆیە هەر کەس بە تاغوت بێباوەڕ بێت و ئیمان بە خودا بهێنێت ئەوە دەستی بە قوڵفی نەپساوەوە گرتووە و لێی جیانابێتەوە، دەستگرتن بە نووری شەریعەتەوە، بە یەکتاپەرستی و دوورکەوتنەوە لە قەدەغەکراوەکان و جێبەجێ کردنی ئەو فەرمانانەی داوامان لێکراوە نوورێکی تر بە کەسی باوەڕدار دەبەخشێت و دەبێتە نوور لەسەر نوور:

﴿ ٱللَّهُ نُورُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ مَثَلُ نُورِهِۦ كَمِشۡكَوٰةٖ فِيهَا مِصۡبَاحٌۖ ٱلۡمِصۡبَاحُ فِي زُجَاجَةٍۖ ٱلزُّجَاجَةُ كَأَنَّهَا كَوۡكَبٞ دُرِّيّٞ يُوقَدُ مِن شَجَرَةٖ مُّبَٰرَكَةٖ زَيۡتُونَةٖ لَّا شَرۡقِيَّةٖ وَلَا غَرۡبِيَّةٖ يَكَادُ زَيۡتُهَا يُضِيٓءُ وَلَوۡ لَمۡ تَمۡسَسۡهُ نَارٞۚ نُّورٌ عَلَىٰ نُورٖۚ يَهۡدِي ٱللَّهُ لِنُورِهِۦ مَن يَشَآءُۚ ﴾النور: ٣٥.

خودا نووری ئاسمانەکان و زەوییە، نموونەی نوورەکەی وەك تاقێك وایە چرایەکی تێدا بێت، چراکە لەناو شوشەیەکدا بێت، شوشەکە -لە پاکی و بێگەردی و درەوشانەوەدا- وەك ئەستێرەیەکی درەوشاوە وابێت، لە دارێکی زەیتوونی موبارەکەوە -کە نە خۆرهەڵاتییە و نە خۆرئاوایی- گڕبگرێت و سوتەمەنییەکەی وەربگرێت، زەیتەکەی-لە پاکی و روونیدا- خەریکە گڕ دەگرێت گەرچی ئاگری بەرنەکەوتووە، نوور لەسەر نوور، خودا هەر کەسی بوێت هیدایەتی دەدات بۆ سەر نوورەکەی.

# حیکمەتی سەد و پەنجا و دوو

((نُورٌ مُسْتَوْدَعٌ فِي الْقُلُوبِ مَدَدُهُ مِنَ النُّورِ الْوَارِدِ مِنْ خَزَائِنِ الْغُيُوبِ))

## راڤەی وشەکان:

**مُستودع**: شوێنی شت هەڵگرتن، قوڵایی دڵ، شوێنی هەڵگرتنی ئەمانەت

**مدد**: کۆمەك

**خزائن الغیوب**: خەزێنەی پەنهانەکان

**واتا ((نوورێك بە ئەمانەت لە قوڵایی دڵاندا دانراوە، لە نووری هاتوو لە خەزێنەی پەنهانەکانەوە سەرچاوە وەردەگرێت))**

## شرۆڤە:

**سێ جۆر نوور بوونی هەیە:**

❖ نوورێکی زاهیر و ئاشکرا کە بە چاو(بصر) دەبینرێت و ئاسەوارەکانی خودا لە گەردووندا رۆشن دەکاتەوە، وەك نوور و رۆشنایی خۆر و مانگ و ئەستێرە و هەسارەکان.

❖ نوورێك کە بە ئەقڵ و فام و هۆشی تەندروست پەی پێدەبرێت، ئەوەش بریتییە لە نووری قورئان و نووری پێغەمبەر(ﷺ)

❖ نوورێك کە بەبەصیرەت پەیی پێ دەبرێت ئەوەش بریتییە لە نووری ناووسیفەتەکانی خودای موتەعال، **نووری یەکەم** هەموو مرۆڤەکان تیایدا بەشدارن بە باوەڕدار و بێباوەڕ و ژیر و نەفامەوە، **نووری دووەم** هەموو باوەڕداران بە گشتی لێی بەهرەمەند دەبن، جگە لەوان لە نووری پەیامی قورئان و نووری فەرموودەی شیرینی پێغەمبەر(ﷺ) بەهرەمەند نابن، چونکە مەرجەکەی بریتییە لە ئیمان و ئیسلام، **نووری سێیەمیان** تەنها ئەوانە پێیدەگەن کە لە پلە باڵاکانی ئیحساندان و بە زانایان و عاریفان ناودەبرێن.

❁ نووری سێیەم بەبێ نووری دووەم هەرگیز بەدەست نایەت، مرۆی باوەڕدار دەبێت بە ئیسلام و ئیماندا گوزەر بکات تا دەگاتە ئیحسان و لەوێشەوە بۆ پلە بالاکانی ئیحسان بەرز ببێتەوە ئەوجا دەگاتە ئەو نوورە خوداییە، نووری دڵ تەنها ناوی نوورە ئەگینا جیاوازە لە نووری بەرهەستی خۆر و مانگ و رۆشناییەکانی تر، ئەو نوورە دڵی زیندوو هەستی پێ دەکات بەبێ ئەوەی چاوی سەر بەشداری بکات لەو هەستپێکردنەدا.

❁ **خەزێنەی پەنهان(خزائن الغيوب):** بریتییە لە سیفەتەکانی خودای موتەعال، ئەو نووری سێیەمە وەك تیشکی هەتاو لە خۆری سیفەتەکانی خوداوە سەرچاوە وەردەگرێت، ئەو نوورە وەك ئەمانەتێك لە دڵی عاریفاندا دادەنرێت، سروشتی ئەمانەت بریتییە لە پاراستن و هەڵگرتنی لە شوێنی ئەمیندا، ئەمینترین شوێنی مرۆڤ دڵی مرۆڤە، لەناو دڵدا ئەمینترین شوێن بریتییە لە ناوەوەی دڵ، بۆیە خودا ئەو نووری ئەمانەتە لەو شوێنەدا دادەنێت، سروشتی ئەمانەت ئاوایە کە کەسەکە ئەمانەتەکە بە موڵك وماڵی خۆی نازانێت، ئەو نوورەش نووری سیفەتەکانی خودایە نەك نووری مرۆڤ، بۆیە نابێت بانگەشەی خاوەندارێتی ئەو نوورە بکات، چونکە بەو کارە خۆی دەکات بە هاوەڵی خودا، یان ئەوسافێك دەداتە پاڵ خۆی کە شایستەی خودایە نەك ئەو، وەك هەندێ لە سۆفییەکان دەیانوت**"سبحاني ما أعظم شأني**-پاکێتی بۆ من چەندە شانوشکۆم مەزنە**!"**، ئاشکراکردنی ئەو نوورە و باس لێوە کردنی لەلای خەڵکی بلاّوە پێکردنی نهێنی خودایە و هۆیەکە بۆ لێ وەرگرتنەوەی ئەمانەت و سزادانی ئەو کەسە، ئەو کەسانەی شوێنی ئەمانەتەکان لای خەڵکی باس لێوە دەکەن با لە شەودا خۆیان بۆ هاتنی دز و جەردە ئامادە بکەن.

❁ ❁ ❁

# حیکمەتی سەد و پەنجا و سێ

((نُورٌ يَكْشِفُ لَكَ بِهِ عَنْ آثَارِهِ، وَنُورٌ يَكْشِفُ لَكَ بِهِ عَنْ أَوْصَافِهِ))

## ڕاڤەی وشەکان:

**یکشف:** پەردە لادەدات، ڕۆشنی دەکاتەوە

**آثاره:** ئاسەوار، دروستکراوەکانی خودا، گەردوون

**أوصاف:** کۆی "وصف"ە، واتە سیفەتەکانی خودا

**واتا ((نوورێك ئاسەوارەکانی خودا ڕۆشن دەکاتەوە، لەگەڵ نوورێك کە پەردە لەسەر سیفەتەکانی خودا لادەدات))**

## شرۆڤە:

❁ ئەم حیکمەتەش تەواوکاری حیکمەتەکەی پێشترە، لە حیکمەتەکەی پێشوودا تەنها ناوی یەك نووری هێنا -هەر چەند ئێمە باسی سێ جۆر لە نوورمان کرد- ئەویش ئەو نوورە بوو کە بە ئەمانەت لە دڵاندا دادەنرێت، لەم حیکمەتەدا باس لە کاری دوو جۆر نوور دەکات، ئاماژە کردنەکەی بە جۆری یەکەم لە نوور بۆ تێگەیشتنە-وەك هێنانەوەی نموونەیەك- لە نووری دووەم، کاری نووری یەکەم ڕۆشنکردنەوەی گەردوونە، کاری نووری دووەم پەردە لادانە لەسەر نووری سیفەتەکانی خودای موتەعال.

❁ جیاوازی چییە لە نێوان نووری سیفەتەکانی خودا کە لە حیکمەتی پێشوودا بە"نووری هاتوو لە خەزێنەی پەنهانەکانەوە" ناوی برد لەگەڵ ئەم نووری دووەمە کە لە حیکمەتی پێشوودا فەرمووی"نوورێکە لە قوڵایی دڵاندا بە ئەمانەت دانراوە"؟ جیاوازییەکەیان وەك جیاوازی تیشکی خۆر وایە لەگەڵ وێنەی تیشکی خۆر لە ئاوێنەدا، تیشکی یەکەمیان تیشکی ڕاستەقینەیە، بەڵام تیشکی دووەمیان وێنەی ئەو تیشکەیە لەناو ئاوێنەکەدا، ئەمە ئەو نهێنییەیە کە هەندێ لە سۆفییەکان پەییان پێ

نەبرد و وایانزانی نووری سەر ئاوێنەی دڵیان حەقیقەتی نووری سیفەتەکانی خودایە، بۆیە کەوتنە ناو وڕێنە و قسەگەلێك کە لەگەڵ ئایین و شەریعەتدا پێکنەدەهاتنەوە، تۆی راستەقینە لەگەڵ وێنەکەت لە ئاوێنەیەکدا چەندە جیاوازی هەیە نووری سیفەتەکانی خودا لەگەڵ نووری سەر ئاوێنەی دڵ ئەوەندە جیاوازی هەیە.

۞ ۞ ۞

# حیکمەتی سەد و پەنجا و چوار

((رُبَّمَا وَقَفَتِ الْقُلُوبُ مَعَ الأَنْوَارِ كَمَا حُجِبَتِ النُّفُوسُ بِكَثَائِفِ الأَغْيَارِ))

**راڤەی وشەکان:**

**حُجبت:** پەردەی بەسەردا دەدرێت

**کثائف:** چڕییەکان

**الأغیار:** کۆی "**غیر**" واتە نەیار

**واتا ((لەوانەیە دڵ لەگەڵ لێشاوی نووردا رابوەستێت، وەك چۆن نەفس لەگەڵ چڕ و پڕی نەیاردا پەردەی بەسەردا دەدرێت))**

**شرۆڤە:**

❁ موریدی راستەقینە هیچ شتێك لە رۆیشتن بۆ لای خودا رایناگرێت، ئەو تەنها خودای کردووە بە ئامانج، بۆیە هەر شتێك ببێتە پەردە لە نێوان ئەو و خودادا لایدەدات، ئەوەی رێگەی باوەڕداران لە رێگەی یۆگا و هونەرەکانی تر جیادەکاتەوە، ئەم خاڵە گرنگەیە، باوەڕدار گەشت بۆ لای خودا دەکات، ئەو بۆ خودا دەستی بە گەشتەکەی کردووە و دەیەوێت بە لیقای ئەو بگات، لەم گەشتەدا جگە لە "ئەو(ﷻ)" ئامانجێکی تری نییە، ئەو بینینی ئایات و روودانی کەرامات و بەدەستهێنانی نووری نەکردووە بە ئامانج، بەڵکو تەنها و تەنها خودا و بەس، کاتێك لە درێژایی وێستگەکانی رێگە ئەو شتانە دێنە بەردەمی پێیانەوە نالکێت و راناوەستێت، بەڵام لە یۆگادا مەبەست گەیشتنە بە هێزێك کە لەسەرو توانای مرۆڤی ئاساییەوەیە، هەر ئەوەندە ئەو وزە و توانا شاراوەی تێدا پەیدا بوو ئیتر ئامانجەکەی کۆتایی پێ دێت.

❁ لەم حیکمەتەدا ئیبن عەتا پێمان دەڵێت نابێت بهێڵین دڵمان لەگەڵ ئەو نوورەی رووی تێکردووە رابوەستێت، چونکە نوورەکە پەردەیە لە نێوان ئەو و تەکانی زۆرتر و زیاتر بۆ لای خودا.

❁ **پەردەکان دوو جۆرن:** پەردەی رەش و تاریك لە حەز و ئارەزووی جۆراوجۆر کە نەفس دادەپۆشن و ناهێڵن بۆ لای خودا بەگەڕ بکەوێت، لەگەڵ پەردەی نوورانی و تەنك لە جۆری ئەو نوورەی روو لە دڵی مورید دەکات، هەردووکیان پەردەن، رەش بێت یان تاریك، پێویستە مورید لە پایان نەوەستێت و تەکانی زۆرتر و زیاتر بە خۆی بدات ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلۡإِنسَـٰنُ إِنَّكَ كَادِحٌ إِلَىٰ رَبِّكَ كَدۡحٗا فَمُلَـٰقِيهِ ﴿٦﴾ ﴾ الانشقاق: ٦، ئەی مرۆڤ تۆ لە هەوڵ و کۆشش و ماندووبووندای بۆ لای پەروەردگارت تا بە لیقای دەگەی.

❁ ❁ ❁

# حیكمەتی سەد و پنجا و پێنج

((ترَ أَنْوَارَ السَّرَائِرِ بِكَثَائِفِ الظَّوَاهِرِ    إِجْلَالاً لَهَا أَنْ تُبْتَذَلَ بِوُجُودِ الإِظْهَارِ وَأَنْ يُنَادَى عَلَيْهَا بِلِسَانِ الاشْتِهَارِ))

## راڤەی وشەكان:

**إجلالا لها:** بۆ بە مەزن ڕاگرتنی ئەو نوورە

**تُبتذل:** كەم بایەخ تەماشا بكرێت

**الإشتهار:** ناودەركردن، ناوزڕاندن

**واتا ((نووری پەنهانی ناو دڵی بە چڕی ڕووالەت داپۆشیوە ئەمەش وەك بەمەزن ڕاگرتنێك بۆ ئەو نوورە نەبادا كەمبایەخ تەماشا بكرێت بە دەركەوتن و ئاشكرابوونی، یان بە زمانی ناوزڕاندن بانگ بكرێت بۆ سەری))**

## شرۆڤە:

❁ لەم حیكمەتەدا باس لە نهێنی شاردنەوەی نووری دڵ دەكات، بۆ ئەو مەبەستەش دوو مەرام لە شاردنەوەی ئاماژە پێ دەدات.

❁ وەك چۆن نووری سیفەتەكانی خودای موتەعال بە ئاسەوارەكان(دروستكراوەكان) داپۆشراوە، هەر بەو جۆرە نووری سەر ئاوێنەی دڵی عاریفانیش بە مرۆڤبوون داپۆشراوە، ئەو كەسەی بیەوێت بگاتە نووری سیفەتەكان پێویستە توێكڵی ئاسەوارەكان لابدات، ئەو كەسەش دەیەوێت بگاتە نووری دڵی باوەڕدار دەبێت توێكڵی مرۆڤبوون وەلا بنێت.

❁ **وەك ئاماژەمان پێكرد دوو مەرام بۆ شاردنەوەی ئەو نوورە دەخاتە ڕوو:**

**یەكەمیان:** لەبەر بە مەزن ڕاگرتنی ئەو نوورەیە، چونكە گەر ئاشكرابوایە و لە دەرەوە ببینرابایە كەمبایەخ تەماشا دەكرا، مرۆڤ كاتێك دەق بە شتێكەوە دەگرێت ئیتر لای كەمبایەخ دەبێتەوە، خۆر كە پێویستترین و مەزنترین نیعمەتێكە كاتێك مرۆڤ دەقی

به بینینیەوە گرتووە هەست ناکات چەندە نیعمەتێکی مەزنە بۆ مرۆڤ و ژیان، نووری دڵی باوەڕداریش گەر ئاشکرا ببێت هەر بەو جۆرە تەماشا دەکرێت، ئەو شتانەی بەنرخ و بەپێزن گەرەکە شاراوە بن تاکو بە چاوی کەم تەماشا نەکرێن.

**دووەم مەرام:** ئەوەیە کاتێك ئاشکرا ببێت بە زمانی ناوزڕاندن بانگ دەکرێت بۆ سەری، خودا ئیمان "بە پەنهان"ی کردووە بەسیفەتی یەکەمی "المتقین"و دەفەرموێت: ﴿ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ ۝٢ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱلْغَيْبِ ﴾ **البقرة: ٢-٣**، قورئان هیدایە بۆ لە خوداترسان، ئەوانەی ئیمان بە پەنهان دەهێنن، کاتێك نووری ئیمان ئاشکرا ببێت ناوی ئیمان دەزڕێت و ئەو حیکمەتە مەزنە لە تاقیکردنەوەی مرۆڤ بۆ باوەڕهێنان پووچ دەبێتەوە، ئەمە جگە لەوەی کە داپۆشین(ستر)ی خودا بۆ بەندەکانی پەردەی لەسەر لادەدرێت و باوەڕدار و بێباوەڕ و دووڕوو لەیەکتر جیادەبێتەوە، خوداش بڕیاری داوە جیاکردنەوەی کۆتایی ئەو دەستانە لە ڕۆژی دواییدا بێت﴿ إِنَّ رَبَّكَ يَقْضِي بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ فِيمَا كَانُوا۟ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ۝٩٣ ﴾ **یونس: ٩٣**، پەروەردگارت ڕۆژی دوایی قەزاوەت لە نێوانیاندا دەکات لەوەی لە ناویدا جیاواز و ناکۆك بوون.

۞ ۞ ۞

## حیکمەتی سەد و پەنجا و شەش

((سُبْحَانَ مَنْ لَمْ يَجْعَلِ الدَّلِيلَ عَلَى أَوْلِيَائِهِ إِلاَّ مِنْ حَيْثُ الدَّلِيلِ عَلَيْهِ، وَلَمْ يُوصِلْ إِلَيْهِمْ إِلاَّ مَنْ أَرَادَ أَنْ يُوصِلَهُ إِلَيْهِ))

### راڤەی وشەكان:

**سبحان:** پاكێتی بۆ خودا

**لم يوصل إليهم:** نایان گەیەنێت پێیان

**يوصله إليه:** بە خۆی بگەیەنێت

**واتا ((پاكێتی بۆ ئەو خودایەی هەروەك بەڵگە لەسەر بوونی خۆی بەڵگەی لەسەر ناسینەوەی دۆستەكانی خۆی داناوە، هیچ كەسێك ناگات بە ئەوان مەگەر كەسێك خودا بیەوێت بە خۆی بگەیەنێت))**

### شرۆڤە:

❁ ناسینەوەی دۆستانی خودا پێویستی بە تێڕامان و سەرنجدانی ورد هەیە، دۆستانی خودا بەڵگە و نیشانەیان لەسەرە، هەروەك بوونی بەڵگە و نیشانە لەسەر ناسینەوەی خودا، بۆ ناسینەوەی خودا پێویستە مرۆڤ لە بەڵگە و نیشانەی دروستكراوەكانی ورد ببێتەوە، ئەوەی بە بینین(بصر) بەدەستی دەهێنێت بكاتە بەڵگە و نیشانە لەسەر بوون و ناسینی خودای موتەعال، هەر بەو جۆرە رەفتاری شیرین و قسەی پڕ لە حیكمەت و ئاكاری جوانی دۆستانی خودا دەكرێنە بەڵگە لەسەر بوونی دۆستایەتی ئەو كەسە لەگەڵ خودای موتەعال، دۆستانی خودا بینینیان خودا بە بیری مرۆڤ دەهێنێتەوە، وتەكانیان دڵ زیندوو دەكاتەوە، كردارەكانیان ئاوەدانی بە ناخ و دەوروبەر دەبەخشن.

۞ کاتێك مرۆڤ توانی بە ژیری و بیری تیژی ئایەتەکانی خودا لە ئاسۆی دەروون و گەردووندا بناسێتەوە و لە ڕێگەی ئەو ئایەتانەوە خودای خۆی ببینێتەوە، ئەوا دەتوانێ لەم ژیانەدا دۆستانی خودا لە پێغەمبەران و عاریفان بناسێتەوە.

۞ ئیبن عەتا پێمان دەڵێ: هەتا خودا نەبینیتەوە دۆستانی خودا ناناسیتەوە، هەتا بە خودا نەگەیت بە دۆستانی خودا ناگەیت، خودا ئەو پەیوەندییەیە دۆستانی خودا لەگەڵ یەکتر کۆدەکاتەوە.

۞ ۞ ۞

# حیکمەتی سەد و پەنجا و حەوت

((رُبَّمَا أَطْلَعَكَ عَلَى غَيْبِ مَلَكُوتِهِ، وَحَجَبَ عَنْكَ الاسْتِشْرَافَ عَلَى أَسْرَارِ الْعِبَادِ))

**راڤەی وشەکان:**

**أطلعك:** نیشانت بدات

**حجب عنك:** لێت بشارێتەوە

**الإستشراف:** رووانین بەسەردا، ئاگاهی

**واتا ((لەوانەیە پەنهانی مەلەکوتی خۆیت نیشان بدات، بەڵام رووانین بەسەر نهێنی بەندەکانیدا لە تۆ بشارێتەوە))**

**شرۆڤە:**

❁ کردنەوەی چاوی دڵ و بینینی نهێنییەکان بە دەستی خودایە، کەی ویستی چاوی دڵ دەکاتەوە و پەنهانی جیهانی مەلەکوتی پێ نیشان دەدات، بەڵام پەنهانی سینەی بەندەکانی لە تۆ دەشارێتەوە، **ئەم راستییە دوو حیکمەت رادەگەیەنێت:**

**یەکەم:** ببینینی چاوی دڵ لە دەستی خودادایە نەك لە دەستی بەندەدا بێت، کەی ویستی دەیخاتە گەڕ و بەشێك لە نهێنی موڵکی بەرینی خودای پێ تەماشا دەکات، هەر کاتێکیش نەیویست کەسەکە بەرپێی خۆیشی نابینێت.

**حیکمەتی دووەم ئەوەیە کە:** خودای موتەعال پەنهان و نهێنی بەندەکانی گرتۆتە دەستی خۆی، نایەوێت جگە لە خۆی و ئەوانەی بەسەر مرۆڤەوە دانراون کەسانی تر ئاگاهی بەو پەنهان و نهێنییانە پەیدا بکەن.

❁ بینینی پەنهانی مەلەکوت بۆ ریشە داکوتینی ئیمان و گەیشتن بە یەقینە ﴿ وَكَذَٰلِكَ نُرِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ مَلَكُوتَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَلِيَكُونَ مِنَ ٱلۡمُوقِنِينَ ﴿٧٥﴾ ﴾ الأنعام: ٧٥، بەو جۆر مەلەکوتی ئاسمانەکان و زەویمان نیشانی ئیراهیم دا تاکو بیگێڕین لە

یەقینداران، بەڵام بینینی پەنهانی خەڵکی تەنها پێغەمبەران و عاریفانی مەزن دەتوانن شان بدەنە ژێری، پێغەمبەر(ﷺ) دووڕووانی شاری مەدینە و دەوروبەری مەدینەی دەناسی و کەچی وەك هاوەڵێکی باوەڕداری خۆی مامەڵەی لەگەڵ دەکردن، هەرگیز ڕەفتارێکی لەگەڵیان نەدەنواند تێبگەن پێغەمبەر(ﷺ) ئەوان دەناسێت و بە دووڕوویان دەزانێت، ئەم هەڵوێستە مەزنە تەنها بە پێغەمبەر(ﷺ) ئەنجام دەدرێت، لە کاتێکدا زیانی دووڕووان بۆ سەر ئیسلام لە زیانی بێباوەڕان گەورەتر بوو.

# حیکمەتی سەد و پەنجا و هەشت

((مَنِ اطَّلَعَ عَلَى أَسْرَارِ الْعِبَادِ وَلَمْ يَتَخَلَّقْ بِالرَّحْمَةِ الإِلَهِيَّةِ كَانَ اطِّلَاعُهُ فِتْنَةً عَلَيْهِ، وَسَبَبًا لِجَرِّ الْوَبَالِ إِلَيْهِ))

## راڤەی وشەکان:

**لم يتخلق:** خۆی نەڕازێنێتەوە

**فتنة عليه:** فیتنەیە لەسەری

**جر الوبال:** ڕاکێشانی مەینەتی و ئازار

**واتا ((هەر کەس ڕووانینی بەسەر نهێنی بەندەکاندا بۆ پەیدا بوو و خۆی بە بەزەیی خودایی نەڕازاندەوە، ئەوا ئەو ڕووانینەی فیتنەیە لەسەری، و هۆیەکە بۆ ڕاکێشانی مەینەتی و ئازار بۆی))**

## شرۆڤە:

❁ ئەم حیکمەتە تەواوکاری حیکمەتەکەی پێشووە، باس لەوە دەکات کەسانێکی زۆر کەم هەن خودا لە هەندێ نهێنی بەندەکانیان ئاگاداریان دەکاتەوە، ئەم جۆرە کەسانە گەر لە پێغەمبەران بن ئاگادارکردنەوەکە پەیوەندی بە ریسالەتەوە هەیە، بەڵام کەسانی تر بن لە شوێنکەوتووانی پێغەمبەران بۆ تاقیکردنەوەیە، **لێرەدا یەکێك لەم دوو ڕێگە لەگەڵ ئەو نهێنیانە دەگرێتەبەر،** گەر بە ئەخلاقی بەزەیی خودایی ڕازابێتەوە نهێنییەکان دەپارێزێ و مامەڵە و هەڵسوکەوتی لەگەڵ ئەو کەسانە ناگۆڕێت تاکو وا هەست نەکەن نهێنییەکانیان کەوتۆتە دەستی ئەو بەندەی خودا، ڕێگەی دووەم دەرنەچوونە لە تاقیکردنەوەکەی خودا بۆ ئەو، بۆیە دەکەوێتە بڵاوە پێکردنی نهێنییەکان لەسەر ئەو کەسانە و مامەڵە و هەڵسوکەوتی خۆی لەمەڕ ئەو کەسانە دەگۆڕێت، ئەم شکستخواردنە لە تاقیکردنەوەی خواییدا بۆ ئەو دەبێتە هۆی ڕاکێشانی مەینەتی و ئازار و هەندێ جاریش تیاچوونی.

۞ دەرچوون لەو تاقیکردنەوەیە کەسەکە شایستە دەکات بەوەی نهێنییەکانی مەلەکوت بە روویدا بکرێتەوە، کەسێك نەتوانێت نهێنی بەندەیەك بپارێزێت ناتوانێت نهێنییەکانی خودا پارێزگاری لێ بکات، بۆیە شکستخواردن لە تاقیکردنەوەکەدا دەرگای نهێنییە خواییەکان بە رووودا دادەخات، ئەمەش گەورەترین مەینەتی و شکستخواردنە.

۞ ۞ ۞

# حیکمەتی سەد و پەنجا و نۆ

((حَظٌّ النَّفْسِ فِى الْمَعْصِيَةِ ظَاهِرٌ جَلِيٌّ، وَحَظُّهَا فِى الطَّاعَةِ بَاطِنٌ خَفِيٌّ، وَمُدَاوَاةُ مَا يَخْفَى صَعْبٌ عِلاَجُهُ))

## راڤەی وشەکان:

**حظ النفس:** بەشی نەفس

**جلي:** روون، ئاشکرا

**خفي:** شاراوە

**مداواة:** تەداویکردن، چارەسەر کردن

**((بەشی نەفس لە گوناه و سەرپێچیدا دیار و روون و ئاشکرایە، بەڵام بەشی لە گوێڕایەڵیدا نادیار و شاراوەیە، تەداویکردنی ئەوەی دەشارێتەوە چارەسەرێکی گرانە))**

## شرۆڤە:

**ئەم حیکمەتە باس لە دوو جۆر بەشی نەفس دەکات:**

**یەکەم:** بەشی نەفس لە گوناه و سەرپێچیکردندا روون و ئاشکرایە، نەفسی مرۆڤ بە سروشتی خۆی حەزی بە خراپەکارییە و لەو کارەش چێژ وەردەگرێت.

**دووەم:** بەشی نەفس لە ئەو کارانەدا کە خێر و چاکەن، بۆ نموونە شەونوێژی کردووە و پێیخۆشە بزانن شەونوێژ دەکات، بەڕۆژووە و پێیخۆشە بچێتە جێگەیەك و خوڵکی خواردنی بکەن و بڵێت: "بەڕۆژووم"، یان دەقی گرتووە بە ئەنجامدانی هەندێ کار و کردەوەی چاکەوە و باشتر و چاکتر لەوەی بێتە بەردەم ئەنجامی نادات، چونکە نەفسی حەز لەوانە دەکات کە لەسەریان راهاتووە، دۆزینەوەی بەشی نەفس لە کاری خێر و چاکەدا کارێکی ئاسان نییە، بوونی زانست بە شەریعەت و سوننەتەکانی پێغەمبەر(ﷺ) لەم مەیدانەدا زۆر پێویستە، هەندێ لە عابیدان کە بەبێ زانست روو لە بەندایەتی

دەکەن چەندین ساڵ سەرقاڵی عیبادەتن و وادەزانن خودا بە تاکوتەنهایی دەپەرستن بێئاگایە لەوەی بەشی نەفس لەناو عیبادەتەکەیدا هەیە، خەڵوەنشینە و لە خەڵکی دوورکەوتۆتەوە، بەلاّم خەڵوەنشینییەکەی بۆ ئەوەیە کە ناتوانیّ شان بداتە ژێر ئازارەکانی تێکەڵ بوون بە خەڵکی، بۆیە لە پاڵ زانست بە شەریعەت و سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) گەرەکە کەسەکە شارەزا بێت بە نەفس و پێچوپەناکانی، تاکو بتوانێت ئەوەی بۆ خودای دەکات لەوەی بۆ نەفسی ئەنجامی دەدات جیابکاتەوە.

۞ ئەهلی ئەم ڕێگەیە هەمیشە کارەکانیان دوو مەرجی تێدایە، ئەو دوو مەرجەش ئەوە بوو کە فوزەیلی کوڕی عەیاز فەرمووی**"أخلصه و أصوبه"**، واتە کارەکەی تەنها و تەنها بۆ خودا بێت و بەشی نەفس و هیچ کەسێکی تری تێدا نەبێت، دووەم دەبێت شوێنکەوتنی پێغەمبەر(ﷺ) (**إتباع**)ی تێدا بێت، واتە لە دەرەوەی سوننەتەکانی پێغەمبەرەوە نەبێت(ﷺ)، نەبوونی هەر یەکێك لەم دوو مەرجە کردەوەکان و عیبادەتەکان پووچ دەکەنەوە.

۞ ۞ ۞

# حیكمەتی سەد و شەست

((رُبَّمَا دَخَلَ الرِّيَاءُ عَلَيْكَ مِنْ حَيْثُ لاَ يَنْظُرُ الْخَلْقُ إِلَيْكَ))

## راڤەی وشەكان:

**ربما:** لەوانەیە

**لا ینظر الخلق إلیك:** خەڵكی تەماشات ناكەن، یاخود سەرنجت نادەن

**واتا ((لەوانەیە لە شوێنێكەوە ریا لێت بێتە ژوورەوە كە خەڵكی تەماشات ناكەن))**

## شرۆڤە:

❁ ریاكردن بریتییە لە ئەنجامدانی كارێكی چاكە حەز بكەیت خەڵكی ببیینن و بەو هۆیەوە خۆت لە دڵی خەڵكیدا جێبكەیەوە، ئەوەی كە باوە ئەوەیە كەسێك بە بەرچاوی خەڵكییەوە كارێك ئەنجام بدات و نێتی بەو جۆرە بێت، بەڵام ئەمە ریای ئاشكرایە، ریای شاراوە لە دەرگایەكی ترەوە دێتە ژوورەوە، وەك نموونەكەی پێشتر، كەسەكە لە خەڵوەدایە، بەڵام بۆ خەڵكی و بە بەرچاوی خەڵكییەوە عیبادەتەكانی ئەنجام دەدات، راستە لە گۆشەیەكدایە و تەنهایە، بەڵام بیر لەوە دەكاتەوە ئێستا خەڵكی چۆن ناوی باشی ئەو دەهێنن، پێی دەڵێن: كەسێكی زاهید و عابیدە و وازی لە دونیا هێناوە، ئەم كەسە تەنها بە جەستە لە خەڵكی دابڕاوە، ئەگینا لە ناوەوە لەگەڵ خەڵكیدایە و كارەكان بۆ ئەوان ئەنجام دەدات.

❁ ئەم جۆرە ریا شاراوە تەنها عاریفان دەتوانن تێیپەڕێنن، چونكە ناخیان بە نووری یەقین لێوانلێو بووە و تەنها بە جەستە لەگەڵ خەڵكیدا ماونەتەوە، لای فوزەیلی كوڕی عەیاز پێناسەیەكی تر بۆ ریا بوونی هەیە، ئەو دەفەرمویٚ((وازهێنان لە كاروكردەوەی چاكە -لە ترسی ئەوەی پێی نەڵێن ریاباز- بۆخۆی ریایە))، ئەی دەبیٚ ئەو كارانەی لە پێناوی خەڵكیدا ئەنجام دەدرێت و ئێمە پێیان دەڵێن "ریا" لای "فوزەیل" چ

پێناسەیەکی بۆ بکرێت؟ ئەو دەفەرموێ"ئەنجامدانی کار لە پێناوی خەڵکیدا هاوەڵدانانە بۆ خودا"، سەرنجی ئەم عاریفە مەزنانە بدە چۆن بە زانستە وردەکەیان لە شاراوە و توناوتونەکانی دەروونی مرۆڤ حاڵی بوون.

۞ ۞ ۞

# حیكمەتی سەد و شەست و یەك

((اسْتِشْرَافُكَ أَنْ يَعْلَمَ الْخَلْقُ بِخُصُوصِيَّتِكَ دَلِيلٌ عَلَى عَدَمِ صِدْقِكَ فِي عُبُودِيَّتِكَ))

## راڤەی وشەكان:

**إستشرافك:** رووانینت

**خصوصیتك:** تایبەتمەندییەكانت

**عبودیتك:** بەندایەتییەكەت

**واتا ((رووانینت بۆ زانینی خەڵكی بە تایبەتمەندییەكانت بەڵگەیە لەسەر نەبوونی صدق لە بەندایەتییەكەتدا))**

## شرۆڤە:

۞ وردتر لە ریای شاراوە ئەم جۆرە ریایە لەم حیكمەتەدا باس دەكرێت، هەندێ لە عابیدان و موریدان خودا بە تایبەتمەندییەك تایبەتیان دەكاتەوە، بۆ نموونە هەیانە دوعای لای خودا گیرایە، یان هەیانە شاراوەی ناخی كەسەكانی بەرانبەر دەخوێنێتەوە، یان هەیانە خەونەكانی وەك هاتنی بەرەبەیان دێنە دی، یان هەیانە ئایەتی(كەرامات) گەورە لەسەر دەستی جاری دەبێت، ئەم تایبەتمەندییانە لە خوداوە بە بەندە دەبەخشرێن، بەشێكی بۆ تاقیكردنەوەی بەندەكەیەتی، نەفس پێیخۆشە خەڵكی بە تایبەتمەندییەكانی بزانن، لەوانەیە پۆشاكێكی خێروچاكەی بە بەردا بكات و بڵێ: ئەگەر ئەو تایبەتمەندییانە بدرێت بە گوێیاندا ئیمانیان بەهێز دەبێت و تۆش خێر و چاكەت بۆ دەنوسرێت، ئەمە هیچی تر نییە جگە لە فێڵی نەفس، لەو رێگەیەوە دەیەوێت بەشی خۆی لەو تایبەتمەندییانە وەربگرێت.

۞ بێدەنگ بوون و شاردنەوەی تایبەتمەندییەكان ئەخلاقی بەرزی عاریفانە، بەڵام كاتێك خودا پێیخۆش بوو ئەو تایبەتمەندییانە دەربكەون ئەوا عاریفان پێخۆشبوونەكەی خودایان پێخۆشە، ئەوان بەشی خەڵكی و بەشی نەفس لە ناخیاندا سڕاوەتەوە، تەنها

خودا لەلایان حەقیقەتە و شتەکانی تر وەك سێبەر و خەیاڵ بە بەردەمیاندا گوزەر دەکەن.

# حیکمەتی سەد و شەست و دوو

**((غَيِّبْ نَظَرَ الْخَلْقِ إِلَيْكَ بِنَظَرِ اللهِ إِلَيْكَ، وَغِبْ عَنْ إِقْبَالِهِمْ عَلَيْكَ بِشُهُودِ إِقْبَالِهِ عَلَيْكَ))**

## راڤەی وشەکان:

**غيب:** بزربکە، ونبکە

**نظر الخلق:** سەرنجدانی خەڵکی

**غب:** بزرببە

**إقبالهم:** رووتێکردنت

**شهود:** بینین

**واتا ((سەرنجدانی خەڵکی بزربکە بە سەرنجانی خودا بۆت، لە رووتێکردنیان بزرببە بە بینینی رووتێکردنی خودا بۆت))**

## شرۆڤە:

**لەم حیکمەتەدا ئیبن عەتا چارەسەر بۆ ریا دەدەنێت، ئەوەش بە دوو رێگە:**

**یەکەم:** سەرنجی خەڵکی بۆت بزربکە و بیسڕەوە، ئەمەش بە ئامادەکردنی سەرنجی خودا بۆ تۆ، ئامادەکردنی سەرنجی خودا سەرنجی خەڵکی کەمبایەخ دەکات و لە کۆتاییدا وەك ئەوەی سەرنجیان بوونی نەبێت، کاتێك خودا لە دڵدا ئامادەیی پەیدا دەکات و بەندە هەست بەو ئامادەبوونە دەکات ئیتر زاڵبوونی ئەو ئامادەبوون و سەرنجە ئامادەبوون و سەرنجی خەڵکی بە تەواوی دەسڕێتەوە.

**چارەسەری دووەم ئەوەیە:** بەندە خۆی لە رووتێکردنی خەڵکی بزربکات، ئەمەش بە بینینی رووتێکردنی خودا بۆ ئەو، بەندە کاتێك بە ئەنجامدانی کردارێکی چاکە لە خودا نزیك دەبێتەوە خوداش بەو نزیکبوونەوەی ئەو زۆرتر لە بەندەکەی نزیك دەبێتەوە، وەك

له فەرموودەیەکی شیریندا هاتووە ((**عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهم عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَالَ قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ أَنَا عِنْدَ ظَنِّ عَبْدِي بِي، إلى.... وَمَنْ تَقَرَّبَ إِلَيَّ شِبْرًا تَقَرَّبْتُ إِلَيْهِ ذِرَاعًا وَمَنْ تَقَرَّبَ إِلَيَّ ذِرَاعًا تَقَرَّبْتُ إِلَيْهِ بَاعًا وَإِذَا أَقْبَلَ إِلَيَّ يَمْشِي أَقْبَلْتُ إِلَيْهِ أُهَرْوِلُ**))، بستێك له خودا نزیك دەبییەوە خودا باڵێك لێت نزیك دەبێتەوە، تۆ باڵێك له خودا نزیك دەبییەوە خودا دوو باڵ له تۆ نزیك دەبێتەوە، تۆ به رۆیشتن بۆ لای خودا دەچیت خودا به راکردن بەپیری تۆوە دێت، ئەم فەرموودە شیرینە ئاماژە به رووتێکردنی خودا دەکات به بەندە گوێڕایەڵەکانی، ریاکردن بۆ ئەوەیە خەڵکی روو له کەسەکە بکات، کاتێك بەندە هەست دەکات بەو کارە چاکە خودا رووی له ئەو کردووەو لێی نزیکبووەتەوە ئیتر رووتێکردنی خەڵکی له ناخی خۆیدا دەسڕێتەوە.

# حیکمەتی سەد و شەست و سێ

((مَنْ عَرَفَ الْحَقَّ شَهِدَهُ فِي كُلِّ شَيْءٍ، وَمَنْ فَنِيَ بِهِ غَابَ عَنْ كُلِّ شَيْءٍ، وَمَنْ أَحَبَّهُ لَمْ يُؤْثِرْ عَلَيْهِ شَيْئًا)).

## راڤەی وشەکان:

**فني به:** بە خوداوە فەنا بێت

**غاب:** بزردەبێت

**لم يؤثر عليه:** هیچ شتێك بەسەر ئەودا هەڵنابژێرێت، یان پێش ناخات

**واتا ((هەر کەس حەق(خودا) بناسێت لە هەموو شتێکدا دەیبینێت، هەر کەس بە خوداوە فەنابێت لە هەرچی شتە بزر دەبێت، هەر کەس خودای خۆشبوێت هیچ شتێك بەسەر ئەودا پێش ناخات))**

## شرۆڤە:

**لەم حیکمەتەدا سێ مەقامی ئیمان ئاماژە پێ دەدات:**

**یەکەمیان:** مەقامی مەعریفەیە، هەر کەس خودا بناسێت لە هەموو شتێکدا دەیبینێت، بۆیە لە کارەکانیدا شتەکان بەسەر خودادا پێش ناخات و کاروکردەوەکانی تەنها بۆ ئەوە.

**مەقامی دووەم کە بالاّترە لە مەقامی یەکەم:** بریتییە لە مەقامی فەنابوون بە خوداوە، هەر کەس ئەم مەقامەی دەستەبەر کرد لە هەرچی شتە بزر دەبێت، وەك ئەوەی هیچ شتێك بوونی نەبێت جگە لە بوونی خودای موتەعال، لەم مەقامەدا شتێك بوونی نییە تاکو لە پێناویدا کار ئەنجام بدات، تەنها بوونێك کارەکانی بۆ ئەنجام دەدرێت بوونی خودای موتەعالە، هەر لەم مەقامەدا ئاستێکی بالاّتر بوونی هەیە ئەویش ئەوەیە کە لە نەفسی خۆ و کاروکردەوەکان خۆی فەنا بکات، ئەو عیبادەتەکان

و کارە باشەکان بە دروستی و وەکو خۆیان ئەنجام دەدات، بەڵاّم بۆ خودا بە هیچیان نازانێت و وەك ئەوەی هیچی ئەنجام نەدابێت، چونکە لە نەفسی خۆ فەنای کردووە، بۆیە شتەکانی خۆی بۆ خودا بە گەورە تەماشا ناکات.

**مەقامی سێیەم:** بریتییە لە مەقامی خۆشەویستی(مەحەبەت)، هەر کەس بەڕاستی خودای خۆشویست هیچ شتێك بەسەر خودادا پێش ناخات، گەورەترین ئامانجی خۆشەویست ئەوەیە مەحبووبەکەی سەرنجی بدات و لێی رازی بێت، لەو پێناوەشدا بۆ ئەو هەموو کارێك ئەنجام دەدات، بەڵکو ئامادەیی هەیە لە پێناوی خۆشەویستەکەیدا هەموو خەڵکی لە خۆی بڕەنجێنێت، لەم مەقامەشدا دیسان ریاکردن و سەرنجدانی خەڵکی بوونی نامێنێت.

❁ ❁ ❁

# حیکمەتی سەد و شەست و چوار

((إِنَّمَا حَجَبَ الْحَقَّ عَنْكَ شِدَّةُ قُرْبِهِ مِنْكَ))

**راڤەی وشەکان:**

**حُجب**: شاراوەتەوە

**شدة قُربه**: زۆری نزیکییەکەی

**((بەهۆی زۆری نزیکی خودا لە تۆوە لێت شاراوەتەوە(پەردەی بەسەردا دراوە)))**

**شرۆڤە:**

❁ **لە دوو باردا مرۆڤ نابینێت: بارێك** کە شتەکە زۆر دوورە لێیەوە و لە سنووری بینینی چاودا نییە، **باری دووەم**، بەهۆی نزیکی زۆرەوە لە چاوی کەسەکە، لەم بارەشدا دیسان شتەکە بزر دەبێت، ئیبن عەتا دەفەرموێت:: خودا بەهۆی نزیکی زۆرەوە لە مرۆڤ شاراوەتەوە، خودا ئەوەندە **"ظاهر"**ە **"باطن"**بووە، خودای موتەعال دەفەرموێت: ﴿وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْ حَبْلِ الْوَرِيدِ ﴿١٦﴾﴾ ق: ١٦، ئێمە لە رەگی بناگوێ لێی نزیکترین، ئەمە نزیکترین نزیکییە، نزیکترین بەش بە مرۆڤ رەگی بناگوێیە، خودای موتەعال دەفەرموێت: ئێمە لەوەش نزیکترین، چاو بۆیە نابینێت چونکە هیچ شتێك لە خودا نزیکتر نییە بە چاو، تەنانەت لەو دەستەی دەینێیە سەر چاو و بینینی چاو ناهێڵێت خودا نزیکترە، ئیتر چۆن دەتوانی بە چاوی سەر خودا ببینیت.

❁ خودا ناشاررێتەوەو هیچ شتێك ناتوانێت زاڵ بێت بەسەر خودادا و ببێت بە پەردە بۆ سەر خودا، چونکە﴿وَهُوَ الْقَاهِرُ فَوْقَ عِبَادِهِ﴾الأنعام: ١٨، ئەو بەسەر بەندەکانیدا زاڵ و دەستڕۆیشتووە، ئەوە لاوازی مرۆڤە شارینەوە دروست دەکات، نەك شتێك بتوانێت خودا بشارێتەوە.

# حیکمەتی سەد و شەست و پێنج

((إِنَّمَا احْتَجَبَ لِشِدَّةِ ظُهُورِهِ، وَخَفِيَ عَنِ الأَبْصَارِ لِعِظَمِ نُورِهِ))

## ڕاڤەی وشەکان:

**احتجب:** شاراوەتەوە

**لشدة ظهوره:** بەهۆی توندی(یان زۆری) ئاشکرابوون و دەرکەوتنی

**خفي عن الأبصار:** لە بینین شاراوەتەوە(دیارنەماوە)

**لعظم نوره:** بەهۆی مەزنی نوورەکەیەوە

**واتا ((بەهۆی زۆری دەرکەوتن و ئاشکرابوونیەوە پەردەپۆش بووە، بەهۆی مەزنی نوورەکەیەوە لـە بینین شاراوەتەوە))**

## شرۆڤە:

ئەم حیکمەتەش پەیوەستە بە حیکمەتەکەی پێشوەوە، لە حیکمەتەکەی پێشوودا فەرمووی: بەهۆی نزیکی لە تۆوە پەردەی پۆشیوە، لێرەش دەفەرموێ: بەهۆی توندی(یان زۆری) ئاشکرابوونیەوە پەردەی پۆشیوە، خودی خۆر بە هۆی تیشکەکەیەوە چاو ناتوانێت بیبینێت، بەڵکو ئێمە تەنها تیشك دەبینین، ئەگینا خۆر بۆخۆی تەنێکی ڕەشە، ئایەتەکانی خودای موتەعالیش (کە نوورو ڕۆشنایین) زاتی خودای موتەعالیان (بەهۆی لاوازی بینینی مرۆڤەوە) شاردۆتەوە، کەوابوو زۆری ئاشکرابوونی خودای موتەعال بەسیفەتی **"الظاهر"** و مەزنی نوورەکەی لەناو ئایەتە پەرشوبڵاوەکانی ئاسۆی گەردوون و دەروونادا بووەتە هۆی نەبینینی خودای موتەعال، بینینی مرۆڤ توانای ئەوەی پێنەدراوە ئەو زاتە مەزنە ببینێت، موسا(عليه السلام) داوای لە پەروەردگار کرد و فەرمووی﴿ رَبِّ أَرِنِيٓ أَنظُرۡ إِلَيۡكَۚ قَالَ لَن تَرَىٰنِي وَلَٰكِنِ ٱنظُرۡ إِلَى ٱلۡجَبَلِ فَإِنِ ٱسۡتَقَرَّ مَكَانَهُۥ فَسَوۡفَ تَرَىٰنِيۚ فَلَمَّا تَجَلَّىٰ رَبُّهُۥ لِلۡجَبَلِ جَعَلَهُۥ دَكّٗا وَخَرَّ مُوسَىٰ صَعِقٗاۚ فَلَمَّآ أَفَاقَ قَالَ سُبۡحَٰنَكَ

تُبۡتُ إِلَيۡكَ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿١٤٣﴾ ﴾ الأعراف: ١٤٣، پێشتر ئاماژە بە مانای ئەم ئایەتە کراوە، مرۆڤ لەم دونیایەدا توانای بینینی خودای موتەعالی پێنەدراوە، ئەگەر هەر بوونێك لەم جیهانی موشاهەدەدا خودا خۆی بۆ دەربخات بوونی خۆی لەدەست دەدات، هەروەك تەختبوونی ئەو چیا مەزنە کە ئایەتەکە ئاماژەی پێدا.

❁ ❁ ❁

# حیکمەتی سەد و شەست و شەش

**((لاَ يَكُنْ طَلَبُكَ تَسَبُّبًا إِلَى الْعَطَاءِ مِنْهُ فَيَقِلَّ فَهْمُكَ عَنْهُ، وَلْيَكُنْ طَلَبُكَ لإِظْهَارِ الْعُبُودِيَّةِ وَقِيَامًا بِحُقُوقِ الرُّبُوبِيَّةِ))**

## ڕاڤەی وشەكان:

**تسببا:** هۆیەك بێت

**یقل:** كەم دەبێت

**قیاما:** هەستان

**واتا ((با داواكانت لە خودا هۆیەك نەبێت بۆ بەدەستهێنانی بەخششەكان لە خوداوە، چونكە ئەوە تێگەیشتنت لە خودا كەم دەكاتەوە، با داواكەت بۆ دەرخستنی بەندایەتی و هەستان بە حەقی پەروەردگاریی بێت))**

## شرۆڤە:

۞ عاریفان دوعا و داوا و پاڕانەوەیان بۆ دەربڕینی بەندایەتی و هەستانە بە مافی پەروەردگاریی خودای موتەعال كە پێویستە لەبەردەمیدا گەردنكەچ بن، ڕاستە ئەوان ئاتاجی و پێویستییان بۆ لای خودا هەیە، بەڵام ئاتاجییەكان دەكەن بە بیانوویەك بۆ دەربڕینی بەندایەتی لە خزمەتی خودادا، ئەوان لە نزا و پاڕانەوەكانیاندا تەنها بەندایەتی بۆ خودا نیشان دەدەن، ئیتر خودا داواكان وەڵام دەداتەوە یان نە؟ زوو وەڵام دەداتەوە یان درەنگ؟ بە چ جۆرێك وەڵام دەداتەوە؟ لا بەلایدا ناكەنەوە و بە ئەركی سەرشانی خۆیانی نازانن، چونكە ئەوان دەزانن هەمیشە پەروەردگار باشترین هەڵبژاردە بۆ ئەو بەندانە هەڵدەبژێرێت كە خۆیان ڕادەست كردووە، بازنەی كاری مرۆڤ بازنەی جێبەجێ كردنی بەندایەتییە، سەرئەنجامەكان چین و چۆن دەبن ڕادەستی خودا دەكرێن و بە ئەركی خۆیانی نازانن، گرنگ ئەوەیە هەموو هەوڵ و كۆششێك بە جوانترین و

باشترین شێوە بەگەڕ بخرێت، لەو هەوڵ و کۆششانە چ سەرئەنجامێك پەیدادەبێت رادەستی خودا دەکرێت.

۞ دەپرسیت خودا فەرموویەتی﴿ٱدۡعُونِيٓ أَسۡتَجِبۡ لَكُمۡ﴾ غافر: ٦٠، داوام لێ بکەن وەڵامتان دەدەمەوە، ئێمە فەرمانمان پێکراوە دوعا بکەین تاکو خودا وەڵامان بداتەوە؟ بەڵێ ئێمە فەرمان پێکراوە بە دوعا تاکو خودا وەڵامی دوعاکانمان بداتەوە، حیکمەتەکەی ئیبن عەتا پێچەوانەی دوعاکردن نییە، بەڵکو داوا دەکات مەبەست و مەرام لە دوعاکردندا بەندایەتی و گەردنکەچبوون بێت بۆ پەروەردگار، نەك تەنها بەدەستهێنانی کەلوپەل و کاڵایەکی دونیایی کەمبایەخ، کەسی عاریف هیچ شتێکی بۆ خۆی نییە، بۆیە دوعا و داواکانیشی بەشی نەفسی خۆی تێدا نییە، تەنانەت ئەگەر داوای بەهەشتیش بێت، مەگەر بەدەستهێنانی رازامەندی خوداو بەهەشت بەعیبادەتێکی پاڵفتە و گەردنکەچ بوون و نیشاندانی زەلیلییەوە نەبەستراوەتەوە، کەوابوو ئێمە نیشاندانی بەندایەتیمان لە دوعا و داواکانماندا مەبەستە، خودا لەو کاتەدا وەڵام دەداتەوە یان بۆمان هەڵدەگرێت ئەرکی ئێمەی بەندە نییە.

۞ ۞ ۞

# حیکمەتی سەد و شەست و حەوت

((**كَيْفَ يَكُونُ طَلَبُكَ اللاَّحِقُ سَبَبًا فِي عَطَائِهِ السَّابِقِ؟**))

**ڕاڤەی وشەکان:**

**اللاحق**: پاشینە

**السابق**: پێشینە

**واتا ((چۆن داوای پاشینەت دەبێتە هۆیەك بۆ بەخششی پێشینەی خودا؟!))**

**شرۆڤە:**

ئەم حیکمەتە تەواوکاری حیکمەتەکەی پێشوە، لە حیکمەتەکەی پێشوودا فەرمووی: با دوعا و داوات بۆ نیشاندانی بەندایەتی و جێبەجێ کردنی ملکەچی بێت بۆ پەروەردگار، نەك داوای بەخشەکانی خودا، لەم حیکمەتەشدا هۆیەك بۆ حیکمەتەکەی پێشوو دەهێنێتەوە و دەفەرموێت: هەرچی بەخششی خودایە بۆ تۆ پێشینەیە و بڕیاری لەسەر دراوە و نە زیاد دەکات، نە کەم، لە لایەکی ترەوە خودا فەرمانی کردووە داوای لێ بکەین و بپاڕێینەوە، کەوابوو دەبێت ئەو داواکردنە بۆ نیشاندانی بەندایەتی و جێبەجێ کردنی گەردنکەچی بێت بۆ پەروەردگار، نەك بۆ بەدەستهێنانی بەخشەکانی خودا کە بۆت بڕاوەتەوە و کۆتاییان پێهاتووە و زیاد و کەم ناکەن، وەك لە فەرموودەدا هاتووە: منداڵ لە ڕەحمی دایکدا فەرمان دەکرێت بە نووسینی چوار شت بۆی: ڕۆزییەکەی، کار و کردەوەکەی، ئەجەلەکەی، لەگەڵ بەهەشت یان دۆزەخ. ((**عن عبد الله بن مسعود رضي الله عنه قال: حدثنا رسول الله صلى الله عليه وسلم وهو الصادق المصدوق: إن أحدكم يجمع خلقه في بطن أمه أربعين يوما نطفة، ثم يكون علقة مثل ذلك، ثم يكون مضغة مثل ذلك، ثم يرسل الله إليه الملك، فينفخ فيه الروح ويؤمر بأربع كلمات: بكتب رزقه وعمله وأجله وشقي أو سعيد، فوالله الذي لا إله غيره إن أحدكم**

**ليعمل بعمل أهل الجنة حتى ما يكون بينه وبينها إلا ذراع، فيسبق عليه الكتاب فيعمل بعمل أهل النار فيدخلها، وإن أحدكم ليعمل بعمل أهل النار حتى ما يكون بينه وبينها إلا ذراع، فيسبق عليه الكتاب فيعمل بعمل أهل الجنة فيدخلها))** [25]

❁ دەوترێت ئەگەر رۆزی مرۆڤ بڕاوەتەوە ئیتر بۆ هەوڵ و کۆشش بکەم بۆ بەدەستهێنانی رۆزی؟ بەندەی خودا کاری بریتییە لە بەندایەتی کردنی خودا ﴿ **وَمَا خَلَقۡتُ ٱلۡجِنَّ وَٱلۡإِنسَ إِلَّا لِيَعۡبُدُونِ** ﴾ الذاريات: ٥٦، لە باسی ناوە جوانەکانی خودادا ئاماژەمان بەوە دا کە هەر ناوێت دوو ئەرك لەسەر شانی باوەڕدار پێویست دەکات، **یەکەمیان** داواکردن لە خودا بەو ناوانە، بۆ نموونە بڵێیت"خودایە تۆ "الرزاق"ی داوات لێ دەکەم رۆزیم بدەی"، **ئەرکی** دووەم ئەوەیە بە داخوازی مانای ئەو ناوە کار ئەنجام بدات، بەو جۆرە کارەکە دەبێت بە بەندایەتی، بۆ نموونە بە داخوازی ناوی "الرزاق" دەست بە هەوڵ و کۆشش دەکەیت بە مەبەستی بەندایەتی خودا و کارکردن بە مانای ناوی "الرزاق"، سەرئەنجامی دوعاکە و هەوڵ و کار و کۆششەکەت چی دەبێت و چی نابێت رادەستی خودای موتەعال دەکرێت.

❁ ❁ ❁

---

٢٥ رواه البخاري ومسلم

# حیکمەتی سەد و شەست و هەشت

((جَلَّ حُكْمُ الأَزَلِ أَنْ يَنْضَافَ إِلَى الْعِلَلِ))

**راڤەی وشەکان:**

**جل:** مەزن، شکۆدار

**حکم الأزل:** بڕیاری ئەزەل

**ینضاف:** بدرێتە پاڵ

**العلل:** هۆکان

**واتا ((بڕیاری ئەزەل مەزن و شکۆداربێت لەوەی بدرێتە پاڵ هۆیەکان))**

**شرۆڤە:**

❁ بڕیاری ئەزەل ئەو بڕیارە کۆتاییانەن خودا لە ئەزەلەوە لەمەڕ مرۆڤ و ژیان و گەردوون داویەتی، خودای موتەعال نووسراو(الکتاب)ی هەیە و دایکی نووسراوەکان (أم الکتاب)یشی هەیە، دایکی نووسراوەکان ئەو نووسراوانەیە کە لەلای خودا خۆیەتی و هیچ کەسێك پێی ئاگادار نییە ﴿يَمْحُوا اللَّهُ مَا يَشَاءُ وَيُثْبِتُ وَعِندَهُ أُمُّ الْكِتَابِ ﴿٣٩﴾﴾ **الرعد: ٣٩**، کۆمەڵێك شت دەسڕێتەوە و کۆمەڵێکی تر جێگیر دەکات، لەلای خودا **"أم الکتاب"**بوونی هەیە، واتە گۆڕانەکان (سڕینەوەو جێگیر کردن) لە نووسراوەکانی تردا ئەنجام دەدرێت، بەڵام هەر ئەو نوسراوە دەردەچێت کە خودا لە ئەزەلەوە لە **"أم الکتاب"**دا جێگیری کردووە، گۆڕانەکان لە نوسراوەکانی تردا بەستراونەتەوە بە دوعا و گرتنەبەری هۆکارەکان و شفاعەت و هتد.. بەڵام هەموو ئەو گۆڕانانە هیچ لە دایکی نوسراوەکان ناگۆڕێت کە لەلای خودا خۆیەتی و هیچ کەس پێی ئاگادار نییە، هەروەها ئایەتی﴿ وَإِنَّهُ فِي أُمِّ الْكِتَابِ لَدَيْنَا لَعَلِيٌّ حَكِيمٌ ﴿٤﴾﴾ **الزخرف:٤**، ئەوە لە **"أم الکتاب"**دایە لەلامان کە بەرز و بڵند و شکۆدار و خاوەن

حیکمەتە، دایکی نووسراوەکان هەموو نووسراوەکانی تر لەئامێز دەگرێت و دەبێتە چەقێك بۆ سوورانەوە و بەگەڕکەوتنی هەموو نووسراوەکانی تر، ئەم نووسراوە تەنها خودا دەزانێت چی تێدا نووسراوەو نزیکترین فریشتەش لێی بەئاگا نییە، لەم نوسراوەدا هیچ گۆڕانێك بەسەر چارەنووسەکاندا نایەت، جگە لەم نووسراوە خودا نووسراوی تری هەیە ﴿وَعِندَهُۥ مَفَاتِحُ ٱلۡغَيۡبِ لَا يَعۡلَمُهَآ إِلَّا هُوَۚ وَيَعۡلَمُ مَا فِي ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِۚ وَمَا تَسۡقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلَّا يَعۡلَمُهَا وَلَا حَبَّةٖ فِي ظُلُمَٰتِ ٱلۡأَرۡضِ وَلَا رَطۡبٖ وَلَا يَابِسٍ إِلَّا فِي كِتَٰبٖ مُّبِينٖ ٥٩﴾ الأنعام: ٥٩، کلیلی پەنهانەکان لای خودایە و هیچ کەس جگە لە ئەو نایزانێت، ئەوەی لە وشکانی و لە دەریادایە خودا دەیزانێت، گەڵایەك لە دار بەرنابێتەوە خودا زانستی پێی هەیە، دەنکە توێك نییە لە تاریکستانەکانی زەویدا، لە تەڕی و وشکیدا هەموو ئەمانە لە نووسراوێکی ڕۆشن و والاکراودایە، لەم ئایەتە پیرۆزەدا ئاماژە بە **"کتاب المبین"** کراوە، ئەم نوسراوە جیایە لە **"أم الکتاب"**.

❁ دەوترێت داواکردن لە خودا هۆیەکە بۆ دەستکەوتنی ئەو شتەی دەتەوێت دەستەبەری بکەیت، ئیبن عەتا دەفەرموێت: دوعاکردنی دەربڕینی بەندایەتی و ملکەچییە بۆ پەروەردگار و دەبێت مەبەست و مەرام لە دوعا و نزادا تەنها ئەوە بێت، نەك بەدەستهێنانی شت لە خوداوە، چونکە ئەوەی بەشی تۆیە لە ئەزەلەوە بۆت بڕاوەتەوە و بڕیاری ئەزەلیش مەزن و شکۆدارترە لەوەی بە هۆکارەکانی ئەم جیهانە گۆڕانی بەسەردا بێت، ئیبن عەتا دەفەرموێ دوعا و نزا لە بڕیارە ئەزەلییەکانی خودا هیچ ناگۆڕێت، تۆ داوای شتێك دەکەی و خودا پێتدەبەخشێت، بەلاّم بزانە خودای موتەعال لە ئەزەلەوە بڕیاری دابوو پێت ببەخشێت، ئەی دوعا و پاڕانەوەکەی تۆ چ دەورێکی گێڕا؟ دوعا و پاڕانەوەکەت دەربڕینی بەندایەتی بوو بۆ خودا، شەرەفێك بوو لە ئەزەلەوە خودا بۆ تۆی بڕیبوویەوە، لێرەدا دەبێت بەصیرەتی خۆت کوێر نەکەیەوە و بڵێیت: کەوابوو دوعاشم نەکردبایە خودا بەشەکەی بۆ دەناردم، چونکە گەر ئەم بیرەت هات بە زەیندا بزانە تۆ ئەهلی ئەم باسە نیت و بەزۆر خۆتت راپێچ کردۆتە ناوی، کاتێك بیرت لەوە نەکردەوە کە لەدەستدانی شەرەفی بەندایەتی بەهۆی ناشایستەی تۆوەیە، ئیتر تۆ عەودالّی کەلوپەلە دونیاییەکانی و باشترە بۆت لە ڕێگەی عاریفان

بکشێیەوە، تا ئەو کاتەی لە نهێنییەکان تێدەگەی و بە تەواوی ملکەچی پەروەردگارت دەبیت، ئەو کات هەوڵێکی تر لەگەڵ خۆت بدە بەڵکو پەروەردگار لە نهێنییەکان حاڵیت بکات و تەکانت بۆ لای خودا ئەوەندە خێرابێت کاروانیانی سەر رێگە بەجێبهێڵیت.

۞ ۞ ۞

# حیکمەتی سەد و شەست و نۆ

**((عِنَايَتُهُ فِيكَ لاَ لِشَيْءٍ مِنْكَ وَأَيْنَ كُنْتَ حِينَ وَاجَهَتْكَ عِنَايَتُهُ وَقَابَلَتْكَ رِعَايَتُهُ لَمْ يَكُنْ فِي أَزَلِهِ إِخْلاَصُ أَعْمَالٍ وَلاَ وُجُودُ أَحْوَالٍ، بَلْ لَمْ يَكُنْ هُنَاكَ إِلاَّ مَحْضَ الإِفْضَالِ وَعَظِيمَ النَّوالِ))**

**راڤەی وشەکان:**

**عناية:** پارێزگاری لێکردن

**واجهتك:** ئاراستەی کردی

**قابلتك:** رووبەڕووت بوویەوە

**رعاية:** سەرۆکاری

**محض الإفضال:** تەنها چاکە

**واتا ((پارێزگاری کردنی خودا بۆ تۆ بۆ هیچ شتێك ناگەڕێتەوە لە تۆدا، تۆ لە کوێ بووی کاتێك پارێزگاری کردنی خودایی ئاراستەت کرا و سەرۆکاری ئەو رووبەڕووت بوویەوە؟ لە ئەزەلی خودادا کاروکردەوەی پڕ لە ئیخلاص نەبوو، ئەحوالْ بوونی نەبوو، بەڵکو تەنها و تەنها چاکە و بەخششی مەزنی خودا هەبوو))**

**شرۆڤە:**

❁ ئیبن عەتا لەم حیکمەتەدا باس لە بڕیارەکانی ئەزەل دەکات لەمەڕ مرۆڤ و دەیەوێت پێمان بڵێت چاکەی خودا بۆ تۆ پەیوەست نییە بە چاکە و خراپەی تۆوە، ئەم حیکمەتە دیسان تەواوکاری ئەو چەند حیکمەتەی تری پێش خۆیەتی، بە تایبەت ئەو حیکمەتەی کە دەڵێت(**لا یکن طلبك تسببا إلی العطاء منه**- با داواکانت لە خودا هۆیەك نەبێت بۆ بەدەستهێنانی بەخششەکان لە خوداوە.

❁ مرۆڤ بوونی نەبووە کاتێك لە ئەزەلەوە خودا پارێزگاری و چاودێری و سەرۆکاری خۆی بۆ دەبڕێتەوە.

❁ مرۆڤ و کار و کردەوە چاکەکانی بوونی نەبوو تا ببێتە وەسیلەیەك بۆ لای خودا و وابکات خودا چاکەی لەگەڵ بکات، نە کاروکردەوەی پڕ لە ئیخلاص، نە حاڵی بەرز و بالاّی ئیمان بوونیان هەبوو، تەنهاوتەنها چاکەی مەزنی خودا بۆ مرۆڤ بوونی هەبووە.

❁ با شوکرکردن (بەوەی لە ئەزەلەوە تۆی گێڕاوە بە ئەهلی ئیمان و ئەهلی شوکر) ببێتە ئەخلاقی شەو و رۆژت، خودایە شوکر بۆ ئەو فەزڵ و منەتە گەورەیە کە تۆ بە منت بەخشی، خودایە شوکر بۆ ئەو رووتێکردنە پڕ لە بەزەییە کە لە ئەزەلەوە هەتبوو بەرانبەر بە من، خودایە من نازانم ئایا دەتوانم لەسەر شوکر و بەندایەتی راوەستاو بم، داوات لێ دەکەم راوەستاوم بکەی، داوات لێ دەکەم شایستەم بکەی بە بەندایەتی و شوکرکردن.

❁ ❁ ❁

# حیکمەتی سەد و حەفتا

((عَلِمَ أَنَّ الْعِبَادَ يَتَشَوَّفُونَ إِلَى ظُهُورِ سِرِّ الْعِنَايَةِ فَقَالَ:
﴿يَخْتَصُّ بِرَحْمَتِهِ مَنْ يَشَاءُ﴾ آل عمران: ٧٤ ،
وَعَلِمَ أَنَّهُ لَوْ خَلاَّهُمْ وَذَلِكَ لَتَرَكُوا الْعَمَلَ اعْتِمَادًا عَلَى الأَزَلِ فَقَالَ:
﴿إِنَّ رَحْمَتَ اللهِ قَرِيبٌ مِّنَ الْمُحْسِنِينَ﴾ الأعراف: ٥٦))

## راڤەی وشەکان:

**يتشوفون:** دەڕوانن بەسەر

**سر العناية:** نهێنی عینایەت(عینایەت: بریتییە لە چاودێری کردن و پارێزگاری لێکردن و پەروەردەکردن)

**خلاهم:** تەنهایان بکاتەوە

**واتا ((خودا زانی بەندەکان دەیانەوێ بڕوانن بەسەر دەرکەوتنی نهێنی عینایەتی خودادا، بۆیە فەرمووی"خودا هەر کەسێکی بوێت تایبەتی دەکات بە بەزەیی خۆی"، هەروەها زانی گەر تەنهایان بکاتەوە لەگەڵ ئەوەدا ئەوا واز لە کردار دەهێنن و شان لەسەر بڕیاری ئەزەل دادەدەن، بۆیە فەرمووی"بەزەیی خودا لە چاکەکارانەوە نزیکە"))**

## شرۆڤە:

**لەم حیکمەتەدا ئیبن عەتا ئاماژە بە دوو خاڵی گرنگ دەکات:**

**یەکەم:** خودا بۆ ئەوەی ڕێگە ببڕێتەوە لەوانەی پێیان وایە بە کار و کردەوەکانیان دەتوانن لەسەر خودا پێویستی بکەن بیانخاتە ناو ڕەحمەتی خۆیەوە فەرمووی"هەر کەسێکی بوێت تایبەتی دەکات بە بەزەیی خۆی"، واتە تەنها ئەوانە تایبەت دەکرێن بە بەزەیی خودا کە خودا بۆخۆی دەیەوێت.

**دووەم:** خودای موتەعال بۆ ئەوەی ڕێگە بگرێت لەوەی مرۆڤەکان شان لەسەر بڕیاری ئەزەل دابدەن و واز لە ئەنجامدانی کاروکردەوەی باش بهێنن فەرمووی"بەزەیی خودا لە چاکەکارانەوە نزیکە"، واتە کە دەزانن بەزەیی خودا لە چاکەکارانەوە نزیکە دەکەونە ئەنجامدانی کاری چاکە تاکو لەو بەزەییە نزیك ببنەوە، واتە ئەنجامدانی کرداری چاکە بکەن بە نیشانەی ئەوەی کە لە ئەزەلەوە ئەوان کەوتوونەتە بەر ڕەحمەتی خودا.

۞ ئەم دوو ئایەتە دەبن بە دوو باڵ بۆ ڕێبواری ڕێگە، **ئایەتی یەکەم** بە هەمیشەیی کاروکردەوە مەزنەکانی خۆی لەبەر چاو کەم دەکاتەوە، چونکە دەزانێت بڕیارێك لە ئەزەلەوە دراوە، ئایا ئەو لەوانەیە بەر ڕەحمەتە کەوتووە یان نە، گەر بەر ئەو بڕیارەی ئەزەل نەکەوتبێت ئەوا هەزاران هەزار کارو کردەوەی چاکە کێشی باڵە مێشوولەیەکی نییە، **ئایەتی دووەم** دەبێت بە باڵی دووەم بۆ ڕێبواری ڕێگە، ئەو لە کارکردن بێهیوا نابێت و بە هۆی شان دادان لەسەر بڕیاری ئەزەل پاڵ ناداتەوە، بەڵکو بە ئەنجامدانی کار و کردەوەی چاکە دڵی خۆی خۆش دەکات کە لە ریزی ئەوانە گەڕاوە لە ئەزەلەوە بەر ڕەحمەتی خودا کەوتوون، چونکە ئایەتەکە دەفەرموێ: ڕەحمەتی خودا لە چاکەکارانەوە نزیکە، کەوابوو دەبم بە چاکەکار بۆ ئەوەی ڕەحمەتی خودا لێمەوە نزیك بێت، ئەو کات بەوە دڵخۆش دەبم کە لەوانەیە لە ئەزەلەوە خودا منی بە ڕەحمەت تایبەت کردبێت، بەم جۆرە کەسی باوەڕدار لە نێوان ترس و ڕجادا دەژی، نە ترسەکە بێهیوای دەکات و نە ڕجاکە پاڵی پێ دەداتەوە.

۞ ۞ ۞

# حیکمەتی سەد و حەفتا و یەك

((إِلَى الْمَشِيئَةِ يَسْتَنِدُ كُلُّ شَيْءٍ وَلاَ تَسْتَنِدُ هِيَ إِلَى شَيْءٍ))

## راڤەی وشەکان:

**المشیئة:** ویستی خودا

**یستند:** شان دادەدات، دەدرێتە پاڵ

**واتا ((هەرچی شتە لەسەر ویستی خودا شان دادەدات، ویستی خودا لەسەر هیچ شتێك شان دانادات))**

## شرۆڤە:

ئەم حیکمەتەش دیسان تەواوکەری حیکمەتەکانی پێشووە، ویست و بڕیاری ئەزەلیی خودا پێشی هەموو شت و هەموو ڕووداوێك کەوتووە، هەرچی لە بووندایە بوون و جووڵە و وەستانی لەسەر ئەو ویست و بڕیارە خوداییە شان دادەدات، ویست و بڕیاری خودا شان لەسەر دروستکراوەکان و ڕووداوەکانی ناویان دانادات، چونکە ویست و بڕیاری ئەو(ﷻ) ئەزەلییە و بەر لە بوونی دروستکراوەکان و ڕووداوەکان بوونی هەبووە، لێرەوە تێدەگەین کە هیچ کەس هەرچەند بکۆشێت لە دیواری پۆڵایینی قەدەرەکانی خودا دەرناچێت، ویستی مرۆڤ ناتوانێك ئەو بازنە پۆڵایینەی ویستی خودا کون بکات، بەڵکو هەموو بوون لەژێر ئەو قەدەرە سەپاوەدان کە زاڵە بەسەر هەموو شتەکاندا، بۆیە دوعا و داواکانی مرۆڤ ناتوانن بڕیار و قەدەرە ئەزەلییەکان هەڵبوەشێننەوە (مەبەست بەو بڕیارە ئەزەلییانەی خودا لە **"أم الكتاب"**دا تۆماری کردوون، بەڵام نوسراوەکانی خوار **"أم الكتاب"**خودای موتەعال بۆ شەرەف و ڕێزلێنان لە هەندێ بەندەی نزیکی خۆی جێگەی دوعای تیا کردوونەتەوە)، بەڵکو تەنها دەربڕینی بەندایەتی و گەردنکەچییە بۆ پەروەردگار، ئەمیش دیسان بە بڕیارێکی ئەزەلی کە تەنها چاکە و شەرەفمەندییەکە و خودا بەو بەندەی بەخشیوە.

۞ دەڵێ: بۆچی دوعا بکەم یان بۆچی داوای دوعای خێر لە باوەڕدارێك بکەم گەر هەموو شتەکان لە ئەزەلەوە بڕاونەتەوە؟! ئەم پرسیارە هەمان ئەو پرسیارەیە کە دەوترا: بۆچی کار و کردەوەی چاکە بکەم ئەگەر هەموو شتێك لە ئەزەلەوە بڕاوەتەوە؟ پێشتر وەڵامان داوەتەوە، لێرەدا تەنها ئەوەندە دەڵێین: خودا لەم ژیانەدا ئەوەندە نیعمەت و بەخششی بە تۆ داوە-گەر پاداشتی دوارۆژیش بوونی نەبوایە- حەقە شوکری بکەی و بەندایەتی بۆ دەربڕی، ئیتر بۆ دەبێ کار و کردەوەی چاکە بە بوونی پاداشت و سزاوە گرێ بدەی؟!

۞ ۞ ۞

# حیكمەتی سەد و حەفتا و دوو

((رُبَّمَا دَلَّهُمُ الأَدَبُ عَلَى تَرْكِ الطَّلَبِ اعْتِمَادًا عَلَى قِسْمَتِهِ وَاشْتِغَالاً بِذِكْرِهِ عَنْ مَسْأَلَتِهِ))

## راڤەی وشەكان:

**ربما:** لەوانەیە

**دلهم:** ڕێنموونییان بكات

**قسمته:** بەشی ئەو، ئەو بەشە بڕاوەی خودا بۆی داناوە

**اشتغالا:** سەرقاڵبوون

**مسألته:** داوالێكردنی

**واتا ((لەوانەیە ئەدەب لە خزمەتی خودادا وازهێنانیان لە داوا پێ نیشان بدات، ئەمەش بەهۆی شان دادان لەسەر ئەو بەشەی خودا بۆی داناون و سەرقاڵبوونیان بە یادی خوداوە لەوەی داوای لێ بكەن))**

## شرۆڤە:

❁ لە حیكمەتی سەد و شەست و شەشەوە تا ئەم حیكمەتە هەر هەموو پەیوەندییان بە یەكترەوە هەیە، واتە هەر حەوت حیكمەتەكە باس لە یەك بابەتی گرنگ دەكەن، ئەویش دوعا و پاڕانەوەی مرۆڤ و كاروكردەوەی چاكەی مرۆڤ بەرانبەر بڕیارە ئەزەلییەكانی خودا و قەدەرە بڕاوەكانی، لە كۆی ئەو حەوت حیكمەتە چەند ئامۆژگارییەك ئاراستەی موریدان دەكات:

❖ مرۆڤ بۆ ئەنجامدانی كاری چاكە منەت بەسەر پەروەردگارییدا نەكات، چونكە ئەوە خودایە بە بڕیاری پێشینە چاكەی بۆ ئەو بڕیوەتەوە، گەر بڵێت: خودا زانستی بەوە هەبوو من كەسێكی چاك و پاك بووم و بەو هۆیەوە شایستەبووم بەوەی عیبادەت

و کاروکردەوەی چاکم بۆ بنووسێت، ئەوا با بزانێت دیسان ئەوە خودایە شایستەیی پێ بەخشیوە چاك و پاك بێت، خودایە ئامادەیی وەرگرتنی ئیمانی پێ بەخشیوە، خودایە ویستی ئەنجامدانی کار و کردەوەی چاکەی بەو بەخشیوە، خودایە ئەوی لە بێباوەڕی و کاروکردەوەی خراپ دوورخستۆتەوە.

❖ مرۆڤ بەرانبەر ئەو چاکەی خودا لەگەڵ ئەو -کە شایستەی کردووە بە ئیمان و کاری چاکە- شوکر و بەندایەتی لەسەرە، سەرنجی هەڵوێستی پێغەمبەری خودا(ﷺ) بدە کاتێ پێیان وت((بۆچی خۆت ئەوەندە-لە عیبادەت کردندا- زەحمەت دەدەیت، لە کاتێکدا خودا لە گوناهی ئەوەڵ و ئاخرت خۆشبووە؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەی نابێ منیش بەندەی شوکرکەر بم؟!)) واتە کاتێك خودا لە گوناهی ئەوەڵ و ئاخری من خۆشبووە، ئەی نابێ منیش بەرانبەر ئەو نیعمەتە مەزنە بەندایەتی و شوکری خودا ئەنجام بدەم؟

❖ ئێمە لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) سەرمەشقی وەردەگرین، خودا فەرمانی کردووە شوێنی پێغەمبەر(ﷺ) بکەوین ﴿ قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ ٱللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ﴾آل عمران: ٣١، ئایا پێغەمبەر(ﷺ) هەتا کاتی مردنی وازی لە بەندایەتی هێنا؟ ئایا دەستبەرداری کار و کردەوەی چاکە بوو لە کاتێکدا خودا لە گوناهی سەرەتا و کۆتایی خۆش بوو؟ بە دڵنیاییەوە نەخێر، کەوابوو ئێمەش دەبێ شوێنی پێغەمبەر بکەوین(ﷺ)و بەندایەتی بۆ خودا ئەنجام بدەین، گەر نزیکترین کەس لە خوداوە بەندایەتی لەسەر هەڵنەگیرابێت ئەوا ئەوانەی خوار ئەو بەبەندایەتی کردن بۆ خودا لەپێشترن.

۞ لەم حیکمەتەدا ئیبن عەتا دەفەرموێ: لەوانەیە عاریفان (بەهۆی ئەدەبیانەوە لە خزمەتی خودادا) واز لە دوعاکردن بهێنن، ئەمەش نەك بەو مانایەی ئەوان دەزانن دوعا هیچ کاریگەرییەکی لەسەر بڕیارە قەدەرییەکان نییە، بۆیە وازیان لە دوعا هێناوە، نەخێر، **بەڵکو دوو هۆ لە پشتی ئەم هەڵوێستەیانەوە هەیە:**

**یەکەم:** ئەوان خۆیان رادەستی خودا کردووە، ئەو(ﷻ) هەر بەشێکی بۆ ئەوان پێ باش بێت ئەوان بە خۆشحاڵییەوە وەریدەگرن و رازیین بەو بەشەی خودا بۆ ئەوانی داناوە، بۆیە ئەدەبیان هەیە لە خزمەتی خودادا و شەرم دەکەن داوای لێ بکەن.

**دووەم:** ئەوان سەرقاڵی یادی خودا و عیبادەت و تەسبیحات بوون، ئەمەش داواکردنی لەبیر بردوونەتەوە.

# حیکمەتی سەد و حەفتا و سێ

((إِنَّمَا يُذَكَّرُ مَنْ يَجُوزُ عَلَيْهِ الإِغْفَالُ، وَإِنَّمَا يُنَبَّهُ مَنْ يُمْكِنُ مِنْهُ الإِهْمَالُ))

## ڕاڤەی وشەکان:

**يذكر**-بتشديد الكاف-: بیری دەخرێتەوە

**الإغفال**: بێئاگایی

**ينبه**: بەئاگا دەهێنرێت

**الإهمال**: پشتگوێ خستن

**واتا ((کەسێك ئاگادار دەکرێتەوە بێئاگایی بۆ شیاو بێت، کەسێك بەئاگا دەهێنرێت پشتگوێ خستنی لێبوەشێتەوە))**

## شرۆڤە:

❁ ئەم حیکمەتەش بۆ پاڵپشتی حیکمەتەکانی پێشووە، دەفەرموێت: خودا بێئاگایی بەسەردا نایەت لەمەڕ بەندەکانی تاکو بە داواو دوعا بەئاگا بهێنرێت و بیری بخرێتەوە، هەروەها خودای موتەعال هیچ شتێك پشتگوێ ناخات تا بە دوعا و داوا لێ کردن لە پێویستی و کاروبارەکانی مرۆڤ بەئاگا بهێنرێت، خودای موتەعال نە وەنەوز و نە خەو رووی تێناکات﴿ لَا تَأْخُذُهُۥ سِنَةٌ وَلَا نَوْمٌ ﴾البقرة: ٢٥٥، خودا تەنها کەسانێك لەبیر دەکات کە خودایان لەبیرکردووە، ئەمەش وەك سزایەك بۆ بێئاگایی و یاخیبوونیان﴿ نَسُوا۟ ٱللَّهَ فَنَسِيَهُمْ ﴾التوبة: ٦٧، لەبیرکردنی ئەوانە مانای وێڵکردنیانە ئەگینا خودا هیچی لەبیر ناچێت﴿ وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيًّا ﴿٦٤﴾ ﴾ مریم: ٦٤، پەروەردگاری تۆ هیچی لەبیر ناچێت، هەر بە هۆی خودا لەبیرچوونەوە خودی خۆیان لەبیر دەچێتەوە، مرۆڤ کە خۆی لەبیرچوویەوە خودای لەبیرچۆتەوە﴿ نَسُوا۟ ٱللَّهَ فَأَنسَىٰهُمْ أَنفُسَهُمْ ﴾الحشر: ١٩، هەموو خۆلەبیرچوونێك خودا لەبیرچوونە، هەموو خودا لەبیرچوونێك وێڵی و گومڕایی و سەرکردنە گوناهە.

۞ خودایەك بە هەمیشەیی چاوی لە بەندەکانییەوە بێت و بۆ تەنها چاوترووکانێکیش لێیان بێئاگا نەبێت، دەبێت مرۆڤ چی وەبیری خودا بهێنێتەوە، خودایەك ئاگادار بێت بە ختوورەکانی ناخی مرۆڤ چجای پێویستییە دیار و بەرچاوەکانی دەبێ لە چی بەئاگا بهێنرێت؟! ئەو(ﷻ) باشترینی بۆ ئەو بەندانە لەلایە کە خۆیان رادەست کردووە، ئەمەش بەسە بۆ ئەوەی دوعا و نزا و پاڕانەوە بە مەبەستی بەندایەتی و دەربڕینی گەردنکەچی بێت بۆ خودای موتەعال.

۞ ۞ ۞

# حیکمەتی سەد و حەفتا و چوار

**((وُرُودُ الْفَاقَاتِ أَعْيَادُ الْمُرِيدِينَ))**

## ڕاڤەی وشەکان:

**ورود:** کۆی "**وارد**"ە، بە مانای هاتن

**الفاقات:** کۆی "**الفاقة**"یە، واتە: پێویستی و هەژاری

**أعیاد:** کۆی "**عيد**" بە مانای جەژن

**واتا ((هاتنی پێویستی و هەژاری بۆ موریدان هاتنی جەژنەکانە))**

## شرۆڤە:

❁ موریدان لە موجاهەدەی نەفسدان و کام بار لەسەر نەفسیان سەخت و دژوار بێت ئەو بارەیان هەڵدەبژێرن، بە سروشت مرۆڤ حەزی بە لەشساغی و دەوڵەمەندی و خۆشگوزەرانییە و رقی لە هەژاری و نەخۆشی و بەلاَ و ناخۆشییەکانە، موریدان باری دووەم هەڵدەبژێرن، لەگەڵ ئەوەی کە وەك هەر مرۆڤێکی تر ئازار بە نەفسیان دەگات، ئەم کارەشیان بۆ زەلیل کردنی نەفس و شکاندیەتی بە توندترین شێوە، ئەوان خاوەنی ویستی پۆلاَیین و لێبڕانی بازنە فراوانن، ئەوان بەو ویست و لێبڕانە ناخۆشییەکانی سەر نەفسییان گۆڕیوە بە خۆشی دڵ و ڕۆحیان، بەڵکو بە ئەندازەیەك لە ناخۆشییەکان چێژ وەردەگرن وەك ئەوەی هاتنیان بۆ سەر ئەوان هاتنی جەژن بێت، **ئەمەش بۆ دوو مەبەست دەگەڕێتەوە:**

**یەکەم:** وەك پێشترمان ئاماژەمان پێ کرد، ناخۆشییەکان دەبێتە هۆی زەلیل کردنی نەفس لەبەردەم خودادا، لەوێوە نەفس گەردنکەچی دەرگای خودا دەبێت و دەست بە پاڕانەوەو دەربڕینی زەلیلی خۆی دەکات، ئەم حاڵەتەش بۆ مورید چێژێکی ڕۆحی گەورەیە، بۆیە ناخۆشییەکان بۆ ئەوان وەك جەژن وایە.

**دووەم:** هاتنی هەژاری و نەخۆشی و بەلاّ و ناخۆشییەکان لە خوداوەیە، هەموو ئەوانەش بۆ تاقیکردنەوەی مرۆڤە، بە پاڵفتەکردنی لە خەوش و لیتەی حەزوئارەزوو، خودای موتەعال دەفەرمویّت: ﴿ أَحَسِبَ ٱلنَّاسُ أَن يُتْرَكُوٓاْ أَن يَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا وَهُمْ لَا يُفْتَنُونَ ﴿٢﴾ ﴾ **العنكبوت: ٢**، ئایا خەڵکی وا دادەنێن وازیان لیّ بهێنرێت هەر بەوەی بڵێن ئیمانمان هێناوە، خودا ڕووبەڕووی فیتنە و تاقیکردنەوەیان نەکاتەوە؟! ئەم تاقیکردنەوەیە تاقیکردنەوەی لابردنی خەوش و لیتە و چەپەڵی نەفسە، ئەمەش بۆ موریدان خۆشییەکی گەورەیە، چونکە دەزانن خودا بە ناردنی ئەو ناخۆشییانە ئەوان پاك دەکاتەوە.

۞ ۞ ۞

# حیكمەتی سەد و حەفتا و پێنج

((رُبَّمَا وَجَدْتَ مِنَ الْمَزِيدِ فِي الْفَاقَاتِ مَا لاَ تَجِدُهُ فِي الصَّوْمِ وَالصَّلاَةِ))

## ڕاڤەی وشەكان:

**المزيد:** زۆرتر

**لا تجده:** نەیبینیتەوە

**واتا ((لەوانەیە زۆرێك (لە پاكبوونەوە و نزیكبوونەوە لە خودا) لە هەژاری و پێویستیدا ببینیتەوە كە لە ڕۆژ و نوێژدا نەیبینیتەوە))**

## شرۆڤە:

❁ هەژاری و نەخۆشی و ناخۆشییەكانی ژیان نەفس زەلیل دەكەن، ڕۆژ و نوێژیش بە هەمان شێوە زەلیلكەری نەفسی مرۆڤن لە بەردەم خودادا، بەڵام ئەو زەلیلی و ملكەچبوونەی لە ناخۆشییەكاندایە لە نوێژ و ڕۆژوودا نابینرێتەوە، نوێژ و ڕۆژ و دەگونجێ بەشی نەفسی تێبكەوێت و كەسەكە پێی بوترێت مرۆڤێكی خوداناس و دیندارە و هتد.. بەڵام لە ناخۆشییەكاندا بەو جۆرە نییە، بەڵكو بە پێچەوانەوە كاتێك مرۆڤ هەژار دەكەوێت خەڵكی بە چاوی كەم تەماشای دەكەن، نەخۆش دەكەوێت و خەڵكی لێی دوور دەكەونەوە، ناخۆشییەكانی بەسەردا دێن و هەندێ كەس پێیان وایە خودا سزای ئەو كەسەی داوە، بەشی نەفس لە ناخۆشییەكاندا بوونی نییە، بۆیە پاكبوونەوەی یەكجاریی دڵ و خاوێنبوونەوەی پەنهانی مرۆڤ لە ڕێگەی هاتنی بەلا و ناخۆشییەكانی ژیانەوەیە، لێرەوەیە كە پێغەمبەران(علیهم السلام) هەموو ژیانیان بریتی بووە لە بەلا و ناخۆشی و نەخۆشی و ئازار و مەینەتی لەدەستی خەڵكی﴿ وَلَنَبْلُوَنَّكُم بِشَيْءٍ مِّنَ الْخَوْفِ وَالْجُوعِ وَنَقْصٍ مِّنَ الْأَمْوَالِ وَالْأَنفُسِ وَالثَّمَرَاتِ ۗ وَبَشِّرِ الصَّابِرِينَ (١٥٥) الَّذِينَ إِذَا أَصَابَتْهُم مُّصِيبَةٌ قَالُوا إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ (١٥٦) أُولَٰئِكَ عَلَيْهِمْ صَلَوَاتٌ مِّن رَّبِّهِمْ وَرَحْمَةٌ ۖ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُهْتَدُونَ (١٥٧) ﴾ البقرة:

**١٥٥–١٥٧**، بە بەشتێك لە ترس و برسێتی و کەمی ماڵ و دارایی و نەفس و بەروبووم تاقیتان دەکەینەوە، مژدە بدە بە ئارامگران، ئەوانەی کاتێك ناخۆشییەك روویان تێدەکات دەڵێن: ئێمە بەشی خوداین و بۆ لای خودا دەگەڕێینەوە، ئەوانە صەڵەوات و رەحمەتی خودایان لەسەرە، ئەوانە هیدایەتدراوانن، سەرنجی ئەو پاداشتە گەورە و سەرئەنجامە مەزنە بدە لە بەلاَ و ناخۆشییەکانەوە سەر هەڵدەدات کە سێ شتە: **"أولئك عليهم صلوات الله"** و **"و رحمة"** و **"وأولئك هم المهتدون"**، سلاَواتی خودا لەسەر ئەوان و رەحمەتی خودا بۆ ئەوان و چوونە ریزی هیدایەتدراوەنەوە، چ نیعمەتێك لەم دەرئەنجامە باشانە مەزنتر و گەورەترە؟!

❁ عاریف هەڵبژاردنی نییە و خۆشی و ناخۆشی ئەو بە هەڵبژاردەکانی خوداوەیە، گەر خۆشی بۆ رەوانە کرد پێی خۆشحاڵ دەبێت، چونکە خودا بۆی رەوانە کردووە، گەر ناخۆشی بۆ رەوانە کرد پێی خۆشحاڵ دەبێت، چونکە هەڵبژاردنی خودایە بۆ ئەو، ئەم مەقامە بەرزانە تەنها بۆ ئەوانەیە لە بەشی نەفسی خۆیان هاتوونەتە دەرەوە و ناوەوە و دەرەوەیان رادەستی پەروەردگارییان کردووە.

❁ ❁ ❁

# حیکمەتی سەد و حەفتا و شەش

((الْفَاقَاتُ بُسُطُ الْمَوَاهِبِ))

**راڤەی وشەکان:**

**بسط:** کرانەوە

**المواهب:** کۆی "الموهبة-بفتح الهاء و بکسر الهاء"یە، بە دوو مانا: بەخشش و ئامادەیی مرۆڤ.

**واتا ((هەژاری و ناخۆشییەکان کردنەوەی دەرگای بەخششەکان و بەگەڕکەوتنی ئامادەییەکانە))**

**شرۆڤە:**

❁ لەم حیکمەتەشدا ئاماژە دەکات بە کردنەوەی دەرگای هەژاری و ناخۆشییەکان بە رووی مرۆڤدا، ئەمەش دوو مەرامی گەورە لە پشتییەوەیە، سەرەتا باشە بزانین وشەی "**المواهب**" لە حیکمەتەکەدا کۆی دوو وشەیە"**الموهِبة**" و "**الموهَبة**":

**یەکەم:** ناخۆشییەکانی ژیان هەموو ئامادەییە ئەقڵی و رۆحییەکانی مرۆڤ دێنێتە دەرەوە و دارِشتەی جوان و بالأیان لێ دروست دەکات، بۆیە دەبینین ئەو مرۆڤانەی گۆڕانکارییان لە ژیانی مرۆڤایەتیدا کردووە-لە مەیدانێك لە مەیدانەکاندا- خەڵکانێك بوون بەئازارو ناخۆشی زۆردا گوزەریان کردووە، چونکە مەینەتی و ئازارو ناخۆشییەکان ئامادەییە ئەقڵی و رۆحییەکانی ناوەوەی ئەوانی هێناوەتە دەرەوە و بەو هۆیەوە توانیویانە مەیدانێك لە ژیانی مرۆڤایەتی ئاوەدان بکەنەوە، بۆ ئەم خاڵی یەکەمە وشەی "**المواهب**" کۆی وشەی "**الموهِبة–بکسر الهاء**"یە.

**دووەم:** بەخششی مەزنی خودا بۆ ئەوانەیە لە تاقیکردنەوە خوداییەکاندا دەردەچن، بە تایبەت ئەو تاقیکردنەوانەی ئازار و مەینەتی و هەژاری بۆ مرۆڤ دەخولقێنن، دەرچوون

لەو تاقیکردنەوانە کەسەکە شایستە دەکات بە کۆمەڵێك بەخششی خودایی کە تەنها بە پێغەمبەران(علیهم السلام) و دۆستانی نزیکی خودا دەدرێن، بۆ ئەم خاڵی دووەمە "المواهب" کۆی وشەی"الموهَبة-بفتح الهاء"یە.

❁ موریدان پەییان بە نهێنی ناخۆشییەکان بردووە و دەزانن چەندین دەروازەی مەزن بە ناخۆشییەکان والاّ دەبن، بۆیە هاتنی ناخۆشییەکان-وەك لە حیکمەتەکەی پێشوودا ئاماژەی پێ کرد- وەك هاتنی جەژن وایە لەلایان.

# حیكمەتی سەد و حەفتا و حەوت

((إِنْ أَرَدْتَ وُرُودَ الْمَوَاهِبِ عَلَيْكَ صَحِّحِ الْفَقْرَ وَالْفَاقَةَ لَدَيْكَ
﴿إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ لِلْفُقَرَاءِ﴾ التوبة: ٦٠))

**راڤەی وشەكان:**

**إن أردْتَ:** گەر ویستت

**صحِح:** راستی بكەرەوە

**الصدقات:** كۆی وشەی"الصدقة"یە واتە خێر و چاكە و بەخشین

**واتا ((گەر دەتەوێ بەخششەكان رووت لێ بكەن (بەسەرتدا داباڕێن) هەژاری و ناخۆشییەكانت راست بكەرەوە"خێر و چاكە و بەخشین بۆ هەژارانە"))**

## شرۆڤە:

ئەم حیكمەتە (بۆ والآبوونی بەخششە خوداییەكان بە رووماندا) داوامان لێ دەكات راستكردنەوە لە هەژاری و ناخۆشییەكانی ژیانماندا بكەین، ئەمەش بە چەند هەنگاوێك:

❖ نەخۆشی و ناخۆشییەكان بەری تەمبەڵی و نەزانینی خۆمان نەبن، بە ناوی هەڵبژاردنی هەژارییەوە نابێت سەربكاتە تەمبەڵی و خۆئاسوودە كردن لە ئەرك و ماندووبوون و تێكۆشان.

❖ هەژاری و پێویستییەكانی نەباتە لای خەڵكی و خۆی زەلیل و تەوەكولی عەیبدار نەكات، چونكە بەو كارەی دەرگای بەخششەكان لە خۆی دادەخات، مرۆڤ هەتا نەبێت بە هەژاری راستەقینەی دەرگای خودا دەروازەی خێر و چاكە و بەخششەكانی خودای لێ ناكرێتەوە، بۆیە ئیبن عەتا ئاماژەی بەبەشێك لەو ئایەتە پیرۆزە كردووە كە دەفەرموێت: (إِنَّمَا ٱلصَّدَقَٰتُ لِلۡفُقَرَآءِ)، ئیبن عەتا لێرەدا مانای "الصدقات"ی بە بەخششە

خوداییەکان لێکداوەتەوە کە بە موریدان دەبەخشرێن، مانای **"الفقراء"**یش بەو موریدە ڕاستگۆیانە لێکداوەتەوە کە تەنها ڕوو لە قاپی خودا دەکەن و پشتوپەنایان هەر ئەوە و ڕوو لە دروستکراوەکانی خودا ناکەن بۆ هەڵگرتنی باری هەژارییەکەیان.

❖ خودا دەروازەکان بە ڕووی کەسانێکدا والآ دەکات کە:

١. سەرگەرمی کار و تێکۆشانن.

٢. کار و تێکۆشان وەك عیبادەت بۆ خودا ئەنجام دەدەن و لەژێر ناوێك لە ناوە جوانەکانی خودادا دەجولێن.

٣. سەرئەنجام لە خوداوە تەماشا دەکەن نەك لە کارەکانەوە، چونکە تەنها خودایە کاریگەریی بە هۆکارەکان دەبەخشێت و سەرئەنجامیان لێوە پەیدا دەبێت.

٤. لەناو کار و تێکۆشاندان و ڕۆحیان بە خوداوە پەیوەستە و لە بازاڕی دونیادا و لەناو بێئاگاییدا نغرۆ نەبوون.

٥. بەو جۆرەی شەریعەت داوای دەکات کار و مامەڵەکانیان ئەنجام دەدەن.

٦. حەقی خودا لە ماڵ و ساماندا دەردەکەن، هەرچەند لای عاریفان هەمووی موڵك و ماڵێك خودا خاوەنییەتی و تەنها بە مۆڵەتی خودا بەشی خۆیانی لێ جیادەکەنەوە.

٧. زیادبوون و کەمبوونی ماڵ و دارایی بە قازانج و بە زەرەر هاوسەنگییان لێ تێکنادات، ئەو بەدەست دەوڵەمەند و بە دڵ زاهید و دوور لە دونیایە.

❖ زوهد و هەژاری بۆ خودا لە دڵی مرۆڤدایە، دەگونجێ کەسێکی دەوڵەمەند لە دونیادا زاهید بێت و زیاتر لە هەژارەکان هەژاری بۆ خودا نیشان بدات، ئەم کەسانە کردنەوەی دەروازەی بەخششەکان بە ڕوویاندا زۆرتر و زیاترە لەوانەی هیچییان نییە و زوهد لە دونیا دەکەن، ئەم مەقامە بەرزە مەقامی هاوەڵانی پێغەمبەر بوو(خوایان لێ ڕازی بێت)، کە زۆربەیان بازرگان و دەوڵەمەند بوون لەگەڵ ئەوەش زاهید و دونیانەویست بوون.

❀ ❀ ❀

# حیکمەتی سەد و حەفتا و هەشت

((تَحَقَّقْ بِأَوْصَافِكَ يَمُدُّكَ بِأَوْصَافِهِ. تَحَقَّقْ بِذُلِّكَ يَمُدُّكَ بِعِزِّهِ. تَحَقَّقْ بِعَجْزِكَ يَمُدُّكَ بِقُدْرَتِهِ. تَحَقَّقْ بِضَعْفِكَ يَمُدُّكَ بِحَوْلِهِ وَقُوَّتِهِ))

**راڤەی وشەكان:**

**تحقق**: دەستەبەری بكە، بەدەستی بهێنە، خۆت بڕازێنەرەوە

**أوصاف**: كۆی "وصف"ە، بە مانای سیفەتەكان

**يمدك**: كۆمەكیت دەكات

**ذلك**: زەلیلیت

**عزه**: عیززەتی خودا

**عجزك**: دەستەوسانیت

**واتا ((بە وەصفی مرۆیی (بۆ خودا) خۆت بڕازێنەرەوە خودا بە وەصفی كەماڵی خۆی كۆمەكیت دەكات، خۆت بە زەلیلی بڕازێنەرەوە بە عیززەتی خۆی كۆمەكیت دەكات، خۆت بە دەستەوسانی و بێدەسەلاتی بڕازێنەرەوە بە دەسەلاتی خۆی كۆمەكیت دەكات، خۆت بە لاوازی بڕازێنەرەوە بە هێز و هەوڵی خۆی كۆمەكیت دەكات))**

**شرۆڤە:**

❁ خودا بۆیە پێویستی و ناتەواوی لە مرۆڤدا داناوە، چونكە خۆی خاوەنی سیفەتی كەماڵە و دەیەوێت بە ئەوصافی كەماڵی پێویستی و ناتەواوییەكانی مرۆڤ پڕ بكاتەوە، ئیبن عەتا داوا دەكات ئەوصافە مرۆییەكانمان بكەین بە دەفرێك بۆ كۆكردنەوەی كۆمەكی ئەوصافە خوداییەكان.

❁ ئەوصافەكانی مرۆڤ -لەبەردەم خودادا- بریتین لە دەربڕینی "زەلیلی و گەردنكەچی" و "دەستەوسانی و بێ دەسەلاتی" و "لاوازی".

۞ گەر دەتەوێ عیززەت لە خوداوە بەدەست بهێنیت پێویستە سیفەتی زەلیلی خۆت بەگەڕ بخەیت، بەلاَم زەلیلی بۆ خودا، نەك بۆ دروستكراوەكانی، گەر دەتەوێ دەسەلاَت (دەسەلاَتی مەعنەوی) بەدەست بهێنیت پێویستە دەستەوسانی و بێ دەسەلاَتی خۆت بۆ خودا نیشان بدەیت، گەر دەتەوێ خاوەنی هێز وپێز بیت پێویستە لاوازی و كەمیی خۆت بۆ خودا دەربڕیت، بەكورتی خۆت بە ئەوصافی بەندایەتی (عبودییەت) برازێنەرەوە خوداش بە ئەوصافی پەروەردگاریی(ربوبییەت) كۆمەكیت دەكات.

۞ دابارینی كۆمەكییە خوداییەكان (لە ئەوصافی كەماڵییەوە) بۆ سەر كەسی باوەڕدار بە ئەندازەی خستنە رووی ئەوصافە مرۆییەكانە، گەر مرۆڤ خۆی لە خودا بێنیاز كرد و لوتبەرزانە لەگەڵ خودای خۆی مامەڵەی كرد خوداش بەو سیفەت و ئەوسافە مامەڵەی دەكات كە شایستەیەتی، ئەو كەسێكی لوتبەرز و خۆبەزلزانە و خوداش بە سیفەتی **"المتكبر"** مامەڵەی لەگەڵ دەكات، ئەو كەسێكە لە خودا بێنیازە خوداش بە سیفەتی **"المستغني"**، ئەو كەسێكە خۆی زۆر بە بەهێز نیشان دەدات خوداش بە سیفەتی **"القوي"** مامەڵەی لەگەڵ دەكات، بۆیە دەبێت زۆر ئاگادار بیت بە سیفەتی بەندایەتی مامەڵەی خودا بكەیت تاكو بە سیفەتی بەزەیی مامەڵەت لەگەڵ بكات.

۞ ۞ ۞

# حیکمەتی سەد و حەفتا و نۆ

((رُبَّمَا رُزِقَ الْكَرَامَةَ مَنْ لَمْ تَكْمُلْ لَهُ الاسْتِقَامَةُ))

**راڤەی وشەکان:**

**رزق الكرامة:** کەراماتی پێبدرێت

**لم تكتمل:** بۆی کامڵ نەبووبێت

**واتا ((لەوانەیە کەسێك کەراماتی پێ ببەخشرێت و هێشتا ئیستیقامەی بۆ نەهاتبێتە راستە))**

**شرۆڤە:**

❁ کەرامات لێوەشانەوەی کۆمەڵێك کارە کە لە دەرەوەی ئەقڵ و عادەتەوەیە، لە بنچینەدا کەراماتی راستەقینە لە ئیستیقامەوە پەیدا دەبێت، دوای زەمەنێك لە راوەستانی دروست لەسەر راستە شەقامی ئیمان و ئیسلام و ئیحسان خودا رێز لەو بەندانە دەنێت و هەندێ یاسا و رێسای ژیان و گەردوونیان بۆ دەگۆڕێت.

❁ کەرامات ئامانج و مەرامی رێگەی سالیکان نییە، ئەوان بۆ لای خودا رێگەیان گرتۆتە بەر نەك بۆ بەدەستهێنانی کەرامات و بینینی ئایات، لێرەوە رێگەی عاریفان و خوداناسان لە رێگەی بوزی و هندۆسییەکان جیا دەبێتەوە، گەیشتن بە خودا جیایە لە گەیشتن بە رەهابوون، باوەڕدار دەیەوێ بە خودا بگات، بەڵام کەسی یوگی دەیەوێت بە رەهابوون بگات.

❁ روودانی کەرامات لەسەر دەستی مرۆڤێك چەند روویەکی هەیە:

❖ لەوانەیە فریودانی شەیتان بێت و ناوی کەراماتی لێ نابێت، بە تایبەت بۆ ئەو کەسانەی ئیمانیان دانەمەزراوە و کاروکردەوەیان بە میزانی شەرع نییە و بە هەندێ کاروکردەوەی خراپ بەناوبانگن.

❖ لەوانەیە بەخششێکی خودا بێت بۆ سالیکی سەرەتای ڕێگە تاکو لەو ڕێگەیەوە ئیمانی دامەزراو و یەقینی بۆ پەیدا ببێت.

❖ لەوانەیە بۆ موریدان تاقیکردنەوەی خودا بێت تاکو دەربکەوێت بۆ لای خودا ڕێگەیان گرتۆتە بەر یان بۆ لای کەرامات.

❖ بۆ ئیمامان و عاریفان و دۆستانی نزیکی خودا کەرامات بەشێکە لە ریسالەتی بچووك (**الرسالة الصغرى**) تاکو پەیامی خودای پێ جێگیر بکەن، واتە کاتێك پەیامی خودا دەکەوێتە ژێر تەحەدای خەڵکانێکی بێباوەڕەوەو حەقبوون و ناحەقبوونی ریسالەتی ئیسلام دەکەوێتە ژێر پرسیارەوە، لەو بارەدا باوەڕداری خاوەن یەقین (بەمۆڵەتی خودا) دادەبەزێتە مەیدانەکە و تەحەدای ئەوان بەرپەرچ دەداتەوە، ئەوەش بە ڕوودانی ئایەتێك (بە مۆڵەتی خودا) لەسەر دەستی کە ئەقڵ و بەڵگەی پووچی ئەوان کۆتایی پێ دەهێنێت و دەبێتە بەڵگە و بورهان بۆ حەقیبوونی ریسالەت.

۞ ئەوەی ئەرکی سەرشانی موریدە ئیستیقامەیە لەسەر یەکتاپەرستی و پابەندبوون بە ئەمر و نەهی شەرعەوە و ڕاوەستان لەسەریان، نەك ڕووانین و سەرکێشان بۆ کەرامات و بینینی ئایات.

۞ ۞ ۞

# حیکمەتی سەد و هەشتا

**((مِنْ عَلاَمَاتِ إِقَامَةِ الْحَقِّ لَكَ فِى الشَّىْءِ: إِقَامَتُهُ إِيَّاكَ فِيهِ مَعَ حُصُولِ النَّتَائِجِ))**

## ڕاڤەی وشەکان:

**إقامة:** مانەوە

**حصول النتائج:** بەدەستهێنانی ئەنجامەکان

**واتا ((لە نیشانەکانی مانەوەی خودا لە شتێکدا بۆ تۆ مانەوەیەتی لەگەڵت لەناو ئەو شتەدا لەگەڵ بەدەستهێنانی سەرئەنجامەکان))**

## شرۆڤە:

۞ موریدی ڕێگە یان لە باری کەسابەتدایە یان لە باری رووتبوونەوە لە کار و کەسابەت، هاتنی هەر یەك لەم بارانە نابێت بە بڕیاری مرۆڤ بێت، بەڵکو پێویستە ئەو بارانە خودا بۆ مرۆڤی هەڵببژێرێت، گەر پێیخۆش بوو لەناو کاروکەسابەت و دەستبردن بۆ هۆکارەکانی بژێویدا بمێنیتەوە پێویستە ئەوەت پێخۆش بێت، گەر یەکلابوونەوە و رووتبوونەوەی لە هۆکارەکان پێباش بوو پێویستە خۆی یەکلابکاتەوە، ئەو هەمیشە ئەم دوعایەی لەسەر زمانە ﴿رَّبِّ أَدۡخِلۡنِي مُدۡخَلَ صِدۡقٖ وَأَخۡرِجۡنِي مُخۡرَجَ صِدۡقٖ وَٱجۡعَل لِّي مِن لَّدُنكَ سُلۡطَٰنٗا نَّصِيرٗا ﴿٨٠﴾﴾ الإسراء: ٨٠، پێویستە چوونەژوورەوە بۆ بارێك(**مُدخل**) و چوونە دەرەوە(**مُخرج**)ی مورید بۆ بار و دۆخێکی تر لەسەر "صدق"بیناکرابێت، چوونە ژوورەوە و چوونە دەرەوەی "صدق" بریتییە لە بارێك کە خودا لێی رازییە و پێی رازییە بۆ بەندەکەی و سەرئەنجامی باش و چاکی لێوە بەرهەم دێت.

۞ ئیبن عەتا باس لە نیشانەکانی ئەو چوونە ژوورەوە و چوونە دەرەوەیە دەکات و دەفەرموێت: **نیشانەی بوونی خودا** لەو بار و دۆخانەدا کە موریدی تێدەکەوێت ئەوەیە کە لە ناویدا خودای لەگەڵدایە و مورید لێی دابڕاو نییە، هەر کاتێك مرۆڤ هەستی بە

گەرموگوڕی کرد لە پەیوەندی لەگەڵ خودا ئەوە خودا لەو بارودۆخەدا لەگەڵیدایە، لەدەستدانی خودا لە هەر کار و کردەوەیەکدا نیشانەی ناڕازیبوونی خودایە لەو بارەی موریدی تێکەوتووە، **نیشانەی دووەم** ئەوەیە ئەو دۆخەی موریدی تێکەوتووە سەرئەنجامی باشی لێوە پەیدا ببێت، گەر لەباری کەسابەتدای خێر و قازانجی لێوە بەدەست بهێنی و دڵت لە کارەکەدا کراوە و شادومان بێت و گیانی بەخشش و کۆمەکیت زیاد بکات و بە هەمیشەیی لە پەروەردگارت دانەبڕێیت و مامەڵەکانت بە پێی شەرع ئەنجام بدەی، دیارە کە بەم جۆرە بوویت ئەو بارە بۆ تۆ گونجاو و شیاوە، چونکە سەرئەنجامی باشی لێوە پەیدا بووە، بەڵام لەو بارەدا هەموو ئەو خاڵە ئاماژە بۆکراوانە بە پێچەوانەوە بوو ئەوە بزانە باری کار و کەسابەت بۆ تۆ شیاو نییە، بە مەرجێ شکستەکانت لەو مەیدانەدا بەرهەمی تەمبەڵی و نەزانی نەبێت، یان بە هۆی ئەوەوە نەبێت کە نەتوانیوە هۆکارەکان بە جوانی بەکاربهێنی، یان ناپسپۆڕی لە کارەکەی خۆتدا، هەر بەو جۆرە گەر مورید کەوتە باری یەکلابوونە و رووتبوونەوە بۆ خودا، ئەوا پێویستە سەرنجی چەند شتێك بدات، ئایا خودا لەگەڵ ئەو -لەو بارەدا- ماوەتەوە یان کۆچی لە خودا کردووە، ئایا بەهۆی دوورکەوتنەوە لە هۆکارەکانی بەدەستهێنانی رۆزی هێشتا هەر چاوی لەسەر هۆکارەکانە؟ ئایا لە تەوەکولەکەیدا لەسەر خودا راستگۆیە، دابڕانی لە هۆکارەکانی بژێوی دونیایی رووبەڕووی زەلیلی و دەست پانکردنەوەی نەکردووە؟ ئەگەر وەڵامی ئەمانەی دەستکەوت ئەو کات دەتوانێت بڕیار بدات ئایا ئەو بارەی کە تێیکەوتووە خودا پێی رازییە بۆ ئەو یان نە، بۆیە لە کۆتایی ئایەتەکەدا دەفەرموێ (**وَٱجۡعَل لِّي مِن لَّدُنكَ سُلۡطَٰنٗا نَّصِيرٗا**) واتە بەڵگەیەکی روون و ئاشکرام پێ ببەخشە بە هۆیەوە سەربکەوم بەسەر بڕیار و حەزەکانی نەفسدا و تاریکی و تەمومژەکانی پێ بڕەوێنمەوە.

۞ ۞ ۞

# حیکمەتی سەد و هەشتا و یەك

**((مَنَ عَبَّرَ مِنْ بِسَاطِ إِحْسَانِهِ أَصْمَتَتْهُ الإِسَاءَةُ، وَمَنْ عَبَّرَ مِنْ بِسَاطِ إِحْسَانِ اللهِ إِلَيْهِ لَمْ يَصْمُتْ إِذَا أَسَاءَ))**

**راڤەی وشەكان:**

**عبر:** دەری بڕی، تەعبیری لێ كرد

**بساط:** راخەر

**أصمتته:** بێدەنگی دەكات

**الإساءة:** خراپە

**واتا ((هەر كەس لە راخەری چاكەكانی خۆیەوە قسە و ئامۆژگارییەكانی دەرببڕێت ئەوا خراپەكانی بێدەنگی دەكەن، بەڵام هەر كەس لە راخەری چاكەی خودا لەگەڵ ئەو قسە و ئامۆژگارییەكانی دەرببڕێت ئەوا كاتێك خراپەیەك ئەنجام دەدات بێدەنگ نابێت))**

**شرۆڤە:**

۞ لەم حیكمەتەدا مورید بۆ ئاستێك بەرز بووەتەوە كە نزیكە بە ئاستی عاریفان، بۆیە پێویست دەبێت لەسەری ئامۆژگاری خەڵكی بكات و بانگ بۆ لای خودا بكات.

۞ **ئەوانەی گەیشتوونەتە ئاستی بانگ كردن دوو جۆرن:**

**جۆرێكیان** لەسەر راخەری چاكە و ئیحسانی خۆیان دانیشتوون و شانیان داداوە و دەیانەوێت ئامۆژگاری خەڵكی بكەن، ئەم جۆرەیان هەر كات خراپەكانی خۆی وەبیر دێتەوە زمانی لاڵ دەبێت و لە قسە كردن و بانگەواز دەوەستێت، چونكە شەرم دەكات شتێك بە خەڵكی بڵێ لە خۆیدا نەبێت، نەهی لە خەڵكی بكات و بۆخۆی رووبەڕووی

هەڵە و تێکەوتن بووبێتەوە، شەرم دەکات ئەو گشتە هەڵە و ناتەواوییەی هەبێت و ئامۆژگاری خەڵکی بکات.

**جۆری دووەم:** ئەوانەن لەسەر راخەری چاکە و ئیحسانی خودا بەرانبەر بە ئەو دانیشتوون، چاکەکانی خۆیان لەبیرکردووە، زمانیان بە شوکر و حەمدی خودا پڕاوە، بانگی خەڵکی دەکەن بۆ لای پەروەردگارێك کە ئەو گشتە چاکە و نیعمەتەی پێبەخشیون، بانگ دەکەن بۆ لای خودایەك کە رەحمەتی لە سزا و تووڕەبوونی زۆرترە، بۆ ئەوانەی رووی تێدەکەن خاوەنی ناوی"**الرحمن، الرحيم، الغفور، الغفار، العفو، الكريم، التواب، الرؤوف، الودود**"ە، ئەم جۆرە کەسانە ئەنجامدانی خراپەیەك یان بوونی هەڵەیەك لە خۆیان و خەڵکیدا بێدەنگیان ناکات، بەڵکو بیر لە میهرەبانیی و بەخشندەیی پەروەردگار دەکەنەوە، بە خۆی و خەڵکی دەڵێت: خودا بە هەڵەکانەوە ئێمەی قبووڵە، ئەو(ﷻ) گەڕانەوەی بەندەکەی خۆی خۆشدەوێت بە هەموو گوناه و هەڵەکانییەوە، نەك گەڕانەوەی مرۆڤێکی مەعسوومی بێ هەڵە.

ئەو مرۆڤانەی مژدەدەرن قسەکانیان زۆرتر دەگاتە ناخی خەڵکی و وەڵامدانەوە بۆ بانگەوازیان زۆرتر و زیاترە لەوانەی بە هەڕەشە و ترسی خودایی خەڵکیان داگرتۆتەوە، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ((ئاسانکار بن، گرانکار مەبن، مژدەدەر بن، خەڵك دەرکەر مەبن لە ئایین)) **عن أنس – رضي الله عنه – قال: قال رسول الله – صلى الله عليه وسلم –:((يسِّروا ولا تعسِّروا، وبشِّروا ولا تنفِّروا))**[٢٦]

۞ ۞ ۞

٢٦ متفق عليه.

# حیکمەتی سەد و هەشتا و دوو

((تَسْبِقُ أَنْوَارُ الْحُكَمَاءِ أَقْوَالَهُمْ، فَحَيْثُ صَارَ التَّنْوِيرُ وَصَلَ التَّعْبِيرُ))

## ڕاڤەی وشەکان:

**تسبق:** پێشی دەکەوێت

**الحکماء:** کۆی "الحکیم"ە، کەسی دانا، یان عاریف

**التنویر:** ڕۆشن بوونەوە

**التعبیر:** دەربڕین

**واتا ((نووری حەکیمان پێش قسەکانیان دەکەوێت، هەر کات ڕۆشنبوونەوە بگاتە جێ دەربڕین دەگاتە جێ))**

## شرۆڤە:

۞ لەم حیکمەتەدا ئاماژە بە قسە و ئامۆژگاری عاریفان دەکات کە بە حەکیم ناوی هێناون، حیکمەتەکەیان لە چەند خاڵێکدایە:

❖ تێگەیشتوون هیدایەتی خەڵکی لەدەستی خودادایە و ئەوان تەنها بانگەوازیان لەسەرە.

❖ تێگەیشتوون بانگ کردن بۆ لای خودایە، نەك بۆ لای خۆ

❖ تێگەیشتوون قسەکانیان کاتێك ڕەواجیان هەیە نوور بگاتە دڵ و گوێی گوێگرەکانیان، بۆیە بە هەمیشەیی لە داوا و نزا و پاڕانەوەدان بۆ ئەوەی خودا دڵ و گوێی گوێگرانیان نوورانی بکات تاکو لە قسەکانی ئەو حاڵی بن و وەریبگرن و پشتی تێ نەکەن.

۞ عاریفان دەزانن هیچ ئاست و پلەیەك ناگاتە ئاست و پلەی پێغەمبەران(عليهم السلام) لەگەڵ ئەوەشدا کۆمەڵێك گوێیان بۆ گرتوون و کۆمەڵێکی تر پشتییان تێکردوون،

بەڵکو رووبەڕوویان بوونەتەوە و هەوڵیانداوە بانگی پێغەمبەران(عليهم السلام) بە مەردوومان نەگات، خودای موتەعال بە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ﴿**وَمَآ أَنتَ بِمُسۡمِعٖ مَّن فِي ٱلۡقُبُورِ ٢٢**﴾ فاطر: ٢٢، تۆ ناتوانی بە کەسێکی ناو گۆڕ ببیستی، واتە ئەوانە دڵیان مردووە، بۆیە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿**إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَذِكۡرَىٰ لِمَن كَانَ لَهُۥ قَلۡبٌ أَوۡ أَلۡقَى ٱلسَّمۡعَ وَهُوَ شَهِيدٞ ٣٧**﴾ ق: ٣٧، قورئان وەبیرهێنانەوەیە بۆ کەسانێك دڵیان هەبێت و گوێهەڵبدەن و ئامادەیی ژیری و فام لەپشت ئەو گوێ هەڵخستنەوە بێت.

# حیکمەتی سەد و هەشتا و سێ

((كُلُّ كَلاَمٍ يَبْرُزُ وَعَلَيْهِ كِسْوَةُ الْقَلْبِ الَّذِى مِنْهُ بَرَزَ))

**راڤەی وشەکان:**

**یبرز:** دەردەکەوێت

**کسوة:** پۆشاك

**واتا ((هەر قسەیەك کە دەردەکەوێت پۆشاکی ئەو دڵەی لەبەردایە لێیەوەی هەڵقوڵاوە))**

**شرۆڤە:**

۞ زمان وەرگێڕی دڵانە، دڵ بە چی پڕ بووبوو زمان لەوە هەڵدەگۆزێت، ئەو دڵانەی بە خۆشەویستی دونیا و شەهەوات لێوانلێون زمان هەر لەو لیتاوە سەتڵی خۆی پڕ دەکات و دەیڕێژێتە گوێی مەردوومانەوە.

۞ ئەو دڵانەی پڕن لە خۆشەویستی خودا و رازیبوون و ترس زمان لەو مەقامە نوورانییانە ماناکان هەڵدەگۆزێت و دەیدات بە گوێی مەردووماندا، مرۆڤە دڵ ساز و خاوێنەکان کاتێك گوێ بۆ قسان دەگرن لە قسەکانەوە دڵی قسەکەرەکە تەماشا دەکەن، دەزانن ئاوی رۆشن هەڵدەگۆزێ یان لیتە و چڵکاو، بۆیە گوڵبژێری قسەی قسەکەران دەکەن و چاکەکان جیادەکەنەوە و لەناو چاکەکاندا چاکترین هەڵدەبژێرن و شوێنی دەکەون﴿ فَبَشِّرۡ عِبَادِ ﴿١٧﴾ ٱلَّذِينَ يَسۡتَمِعُونَ ٱلۡقَوۡلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحۡسَنَهُۥٓۚ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمۡ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴿١٨﴾ ﴾ الزمر: ١٧–١٨، سەرنجی کۆتایی ئایەتەکە بدە، دەفەرموێت: ئەوانەی کە بەو جۆرەن (أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمۡ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ)، ئەوانە خودا هیدایەتی داون، ئەوانە خاوەنی کرۆك و ژیری و هۆشن.

۞ ئەو کەسانەی زمانیان شیرین و دڵیان ناساز و کرمۆڵە و زمان شیرینییەکەیان دەکەنە هۆکارێك بۆ گەیشتن بە کۆمەڵێك مەرامی خراپ، ئەوانە لە ریزی دووڕوواندا سەرژمێر دەکرێن﴿ وَإِن يَقُولُوا۟ تَسۡمَعۡ لِقَوۡلِهِمۡ ﴾ المنافقون: ٤

۞ ۞ ۞

# حیکمەتی سەد و هەشتا و چوار

**((مَنْ أَذِنَ لَهُ فِي التَّعْبِيرِ فُهِمَتْ فِي مَسَامِعِ الْخَلْقِ عِبَارَتُهُ، وَجُلِّيَتْ إِلَيْهِمْ إِشَارَتُهُ))**

## ڕاڤەی وشەکان:

**أذن له:** مۆڵەتی پێبدات

**التعبير:** دەربڕین

**مسامع الخلق:** بیستنی خەڵکی

**جليت:** ڕۆشن کرایەوە

**واتا ((هەر کەس خودا مۆڵەتی قسەکردن و دەربڕینی پێ بدات دەربڕینەکانی لەبەر گوێ و بیستنی مەردوومانداا ژنەوراو دەبن و ئاماژەکانی بۆیان ڕوون و ئاشکرا دەبن))**

## شرۆڤە:

لەم حیکمەتەدا ئاماژە بە خاڵێکی فرە گرنگ دەکات ئەوەش بریتییە لە "مۆڵەت وەرگرتن" بۆ کردنی بانگەواز، لەم میانەدا کە باس لە "بانگەواز" دەکەین دەمەوێت ساتێك خۆمان بدەینە ژێر لێشاوی نووری ئەم ئایەتە پیرۆزە و پایەکانی بانگەواز ئاماژە پێ بدەین:

﴿ قُلْ هَٰذِهِۦ سَبِيلِىٓ أَدْعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِۚ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ أَنَا۠ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِىۖ وَسُبْحَٰنَ ٱللَّهِ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٠٨﴾ ﴾ یوسف: ١٠٨، **پایەکانی بانگەواز لەم ئایەتە پیرۆزەدا:**

## پایەی یەکەم (قُلْ):

ئەم فەرمانە خوداییە کە بۆ سەر پێغەمبەر(ﷺ) دادەبەزێ و داوای لە بانگخواز دەکات ڕێگە و مەنهەجی خۆی بۆ بانگەواز و ڕۆیشتن بەرە و خودا ڕابگەیەنێت، هەر

ئەم فەرمانە دەبێتە بەڵگەی تەواو لەسەر پێویستی وەرگرتنی مۆڵەت لە خودای موتەعال بۆ بانگردنی مەردوومان، واتە ئیمامان و بانگخوازانی ڕێگەی خودا هەرگیز ئیجتیهادی تاکەکەسی(**شخصي**) نەبووە کاتێك هەستاون بە بانگکردنی مەردوومان و ئیمامەت بۆ کردنیان، ئەم ئالۆزییە گەورەی ئەمڕۆ موسڵمانان تیایدا دەژین بەشێکی نەبوونی ئیمامی ڕاستەقینەی مۆڵەتدراوە لە لایەن خوداوە، بەشێکی تری بۆ ئەو گشتە مرۆڤە دەگەڕێتەوە کە بانگەشەی بانگەواز دەکەن و خۆیان لە مەردوومان کردووە بە ئیمام بە بێ ئەوەی لە خوداوە بۆ ئەو کارە مۆڵەت درابن..

## پایەی دووەم (هَٰذِهِۦ سَبِيلِيٓ):

خستنە پاڵ (**إضافة**)ی (**سبيل**) بۆ جێناوی کەسی یەکەمی تاك (**ياء المتكلم**) کە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) دەگەڕێتەوە بۆ چەند مەبەستێکە:

Ê دەبێت بانگەواز بە پێی ئەو مەنهەجە بێت پێغەمبەر(ﷺ) بانگەوازی لەسەر کردووە، بۆیە هەر بانگەوازێکی مەردوومان لە دەرەوەی مەنهەجی بانگەوازی پێغەمبەر (ﷺ) لەلای خودا وەرنەگیراوە.

Ê مەنهەجی بانگەوازی پێغەمبەر(ﷺ) مەنهەجی خودایە و ئەو ڕێگەیەیە خودا لێی ڕازییە و پێی ڕازییە، چونکە خودایە داوا لە پێغەمبەر(ﷺ) دەکات ئەو ڕاستییە ڕابگەیەنێت، لە چەندین جێگەی تری قورئاندا "ڕێگە" دراوەتە پاڵ خودا ﴿**وَلَا تَقُولُواْ لِمَن يُقۡتَلُ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمۡوَٰتُۢ**﴾ البقرة: ١٥٤، بەوانەی لە ڕێگەی خودادا دەکوژرێن مەڵێن مردوو، لێرەدا دەبێ ئاماژە بە وردەکارییەك لە قورئاندا بکەین: "**سبيل**" لە قورئاندا زیاتر لە حەفتا جار دراوەتە پاڵ ناوی "**الله**" بەڵام تەنها یەك جار دراوەتە پاڵ ناوی "**رب**" کە باس لە بانگکردن دەکات بۆ سەر ڕێگەی خودا، ئەم وردەکارییە بۆ چەند مەبەستێکە:

١. کاتێك باس لە بانگکردنی مەردوومان دەکرێت بۆ لای خودا باس لە پەروەردەکردن و پێگەیاندنی مرۆڤە، پرۆسەیەکە بە درێژایی تەمەنی مرۆڤ درێژدەبێتەوە، ئەو کارەش لە ناوی "**رب**"ەوە نزیکترە تا ناوی "**الله**"، پەروەردەو پێگەیاندن بۆ ناوی پەروەردگار دەگەڕێتەوە.

٢. پرۆسەی پەروەردە و پێگەیاندن لەسەر مەنهەجی خودا و ڕەوگەی پێغەمبەر(ﷺ) لە هەندێ جومگەیدا ئیجتیهادی موجتەهیدانی پێویستە کە کارێکە ژیری و ویستی مرۆڤ لە چوارچێوەی مەنهەجی نەگۆڕدا بڕیاری لەسەر دەدات، ئەمەش -جگە لە پەروەردش و پێگەیاندنی کەسەکان بۆ گەیشتنە پلەی ئیجتیهاد- لە ناوی **"رب"** ەوە نزیکترە تا ناوی **"الله"**.

Ê بەیانکردنی ڕێگەی بانگەوازی خودا خۆ جیاکردنەوەیە لە تەواوی ڕێگە و ڕێچکەکانی تر کە جگە لە وێڵی و سەرگەردانی ئەنجامێکی تری لێوە بەرهەم نایەت، ئەم خۆجیاکردنەوەیە لە مەنهەجدا سەردەکێشێ بۆ جیابوونەوە لە جیهانبینی و بیروباوەڕ و میزان و هەڵسەنگاندن و ئەخلاق و مامەڵە لە ژیانی تاك و خێزان و کۆمەڵدا.

Ê بەیانکردنی ڕێگە(**سبیل**) بەرلە بانگردنی مەردوومان مەنهەجی پێغەمبەرانە(علیهم السلام) و دەبێت ئیمامان و بانگخوازان خەڵکی بۆ سەر ڕێگەیەکی ڕۆشن و دیار بانگ بکەن و ئەو ڕێگەیەش هیچ جۆرە لیلی و تەم و مژێك بەدەوریدا نەبێت.

Ê ڕاگەیاندنی ڕێگە (**سبیل**) بوێری و یەقین و دڵنیایی بانگخوازەکەی گەرەکە، بەئەندازەی یەقین و باوەڕ بەخۆبوونی بانگخواز بانگەوازەکەی دەگاتە جێگە و خەڵکی دێن بەدەمییەوە.

**پایەی سێیەم** ﴿أَدْعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ ۚ هُوَ﴾: ئەم پایەیەش چەند خاڵێکە:

Ê بانگکردنی مەردوومان بۆ لای خودایە، واتە بانگخواز دەیەوێت مەردوومان بۆ بەندایەتی خودا ساغ بکاتەوە، ئەو دەیەوێت بە بانگردنی مەردوومان بۆ لای خودا مرۆڤایەتی لە کۆیلایەتی و کۆت و پێوەندی فیکری و ئایدۆلۆژی و سیاسی و کۆمەلآیەتی ڕزگار بکات و بیانگۆڕێت بە بەندەی ڕاستەقینەی خودا.

Ê خۆ خوێندنەوە لە بانگەوازدا سەرەتای شکستی ئەو بانگەوازەیە، بانگخواز لە پێناوی خودادا و بەفەرمانی ئەو دەستی بە بانگەواز کردووەو هیچ جۆرە بەرژەوەندییەکی دونیایی و حەزێکی دەروونی لە پشتی بانگەوازەکەیەوە بوونی نییە ﴿قُل لَّآ أَسۡـَٔلُكُمۡ

عَلَيۡهِ أَجۡرًاۖ إِنۡ هُوَ إِلَّا ذِكۡرَىٰ لِلۡعَٰلَمِينَ ﴿٩٠﴾﴾ الأنعام: ٩٠، ﴿ ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِۖ وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُۚ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعۡلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦۖ وَهُوَ أَعۡلَمُ بِٱلۡمُهۡتَدِينَ ﴿١٢٥﴾﴾ **النحل: ١٢٥**، بانگخواز بەسەر بانگەوازەکەیەوە ناژی و لەبەری درەختەکەشی ناخوات، ئەمەیە نهێنی قبوڵنەکردنی زەکات و صەدەقە لە لایەن پێغەمبەرەوە (ﷺ) بۆ خۆی و خانەوادەی موبارەکی، بەهەمان پێودان ئیمامان و بانگخوازانی مەزنی ڕێگەی خودا بەسەر بانگەوازەکەیانەوە ناژین و نایکەنە وەسیلەیەك بۆ خۆشگوزەرانی خۆیان و خانەوادەکانیان.

Ê ڕێگەی پێغەمبەر(ﷺ) تەنها ڕێگەیەکە مرۆڤ بە خودا دەگەیەنێت، بۆیە گەر مەردوومان دەیانەوێت بەرەو خودا بەگەڕبکەون پێویستە بچن بەدەم ئەو بانگەوازەوە، هیچ کەسێك ناکەوێتە ناو سەیروسلوکی دروست و ناگات بەخودا لە ڕێگەی ئەو مەنهەجەوە نەبێت کە پێغەمبەر(ﷺ) هێناویەتی و ئیمامان و بانگخوازانیش لەسەری بەردەوامن، لەگەڵ هاتنی هەر ئیمامێکدا (کە خودا بۆ نوێکردنەوەی ئایین ڕەوانەی کردوون) گەیشتن بەخودا لە ڕێگەی ئەو ئیمامەدایە و پێویستە هەموو ئەوانەی دەیانەوێت خودا لە خۆیان ڕازی بکەن شوێنی ئەو ئیمامە بکەون و بچن بەدەم بانگەوازەکەیەوە ﴿ رَّبَّنَآ إِنَّنَا سَمِعۡنَا مُنَادِيًا يُنَادِي لِلۡإِيمَٰنِ أَنۡ ءَامِنُواْ بِرَبِّكُمۡ فَـَٔامَنَّاۚ رَبَّنَا فَٱغۡفِرۡ لَنَا ذُنُوبَنَا وَكَفِّرۡ عَنَّا سَيِّـَٔاتِنَا وَتَوَفَّنَا مَعَ ٱلۡأَبۡرَارِ ﴿١٩٣﴾﴾ **آل عمران: ١٩٣**، پەروەردگار ئێمە گوێمان لە بانگخوازێك بوو بانگی بۆ ئیمان دەکرد (و دەیوت) ئیمان بە پەروەردگاری خۆتان بهێنن ئێمەش باوەڕمان هێنا، پەروەردگار لە گوناهەکانمان خۆش ببە و لە خراپەکانمان ببوورە و لەگەڵ چاکاندا بمانمرێنە.

Ê بانگخواز تەنها ئەوەندەی لەسەرە بانگەکەی ڕابگەیەنێ و دەستی مەردوومان بۆ سەر ڕێگەی خودا بگرێت و بیانخاتە سەر شا ڕێگەی بەرەو خوداچوون، ئیتر ویست و لێبڕانی کەسی بانگراو لەسەر ڕێگەکە بەگەڕدەکەوێت و تەکانی زۆرتر بەخۆی دەدات و بەرەو پلە بەرزەکانی باوەڕ بەرز دەبێتەوە تا دەگاتە پلەی ئیحسان، لە ئیمانی یەکەمجارەوە (**لا إله إلا الله محمد رسول الله**) بۆ ئیسلام و لە ئیسلامەوە بۆ پایەکانی ئیمان و لەوێشەوە بۆ پلە باڵاکانی ئیمان کە بریتییە لە ئیحسان وەك لە فەرموودەکەدا هاتووە:

((عن ابن عمر، عن عمر، قال: "كنا جلوسا عند النبي(ﷺ). فجاء رجل شديد بياض الثياب، شديد سواد شعر الرأس، لا يرى عليه أثر السفر، ولا يعرفه منا أحد قال فجلس إلى النبي(ﷺ) فأسند ركبته إلى ركبته، ووضع يده على فخذيه. ثم قال: يا محمد! ما الإسلام ؟ قال ((شهادة أن لا إله إلا الله، وأني رسول الله، وإقام الصلاة، وإيتاء الزكاة، وصوم رمضان، وحج البيت)). قال: صدقت. فعجبنا منه. يسأله ويصدقه. ثم قال: يا محمد! ما الإيمان، قال:((أن تؤمن بالله وملائكته ورسله وكتبه واليوم الآخر والقدر، خيره وشره)). قال: صدقت. فعجبنا منه يسأله ويصدقه. ثم قال: يا محمد ما الإحسان ! قال: ((أن تعبد الله كأنك تراه. فان لم تكن تراه فانه يراك)) الى آخر الحديث)[٢٧]

لەم فەرمووده شیرینەدا باس لەو دۆخ و حاڵەتە دەكات كە ئەهلی ئیحسان تێیدەكەون.

((عن أبي هريرة قال: قال رسول الله (ﷺ) :

(إن الله قال: من عادى لي ولياً فقد آذنته بالحرب، وما تقرب إلي عبدي بشيء أحب إلي مما افترضت عليه، وما يزال عبدي يتقرب إلي بالنوافل حتى أحبه، فإذا أحببته: كنت سمعه الذي يسمع به، وبصره الذي يبصر به، ويده التي يبطش بها، ورجله التي يمشي بها، وإن سألني لأعطينَّه، ولئن استعاذني لأعيذنَّه، وما ترددت عن شيء أنا فاعله ترددي عن نفس المؤمن، يكره الموت وأنا أكره مساءته)[٢٨] فەرموودەكە پێشتر لێكدانەوەی بۆ كراوە.

### پایەی چوارەم (عَلَىٰ بَصِيرَةٍ):

لێرەشدا هەوڵدەدەین بەچەند خاڵێك ئاماژە بۆ ئەم بەشەی ئایەتە پیرۆزەكە بكەین:

Ê (على بصيرة) چەند ئاماژەیەك لە ئامێز دەگرێت، لەوانە:

١. رۆشنی لە وتار (**خطاب**)ی بانگخوازدا بەجۆرێك زانا و نەزان، خوێندەوارو نەخوێندەوار، گەورە و بچووك لێی حاڵی بن و بزانن بانگ بۆچی دەكات و دەیەوێت چی بە مەردوومان رابگەیەنێت.

٢٧ رواه البخاري.

٢٨ رواه البخاري.

٢. روونی و رۆشنی له مەنهەجدا بەجۆرێك هیچ جۆره لێڵی و تەمومژێك له لای بەرانبەر نەهێڵێتەوه، تاكو لەسەر ئەو بەرچاورۆشنییە بڕیاری خۆی بدات و یەكێك لەو دوو ڕێگەكە هەڵبژێرێت: ﴿قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشْدُ مِنَ ٱلْغَيِّ﴾البقرة: ٢٥٦، ﴿لِّيَهْلِكَ مَنْ هَلَكَ عَنۢ بَيِّنَةٍ﴾ الأنفال: ٤٢. **له بانگەوازدا:**

- بانگ بۆ لای خودا دەكرێت، نەك بۆ لای كەس و دەستە و كۆمەڵ.
- لەو بانگەدا تەنها دڵسۆزی و خەمخۆری بۆ كەسی بەرانبەر(بانگكراو)ی تێدایە نەك قازانج و بەرژەوەندی هیچ كەس و لایەنێك.
- وەڵامدانەوەی كەسی بانگكراو بۆ بانگەواز تەنها بۆ خۆیەتی و دەبێت هیچ جۆره منەتێكی بەسەر كەسی بانگخوازدا تێدا نەبێت﴿ مَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا فَلِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَنْ أَسَآءَ فَعَلَيْهَا ۖ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُمْ تُرْجَعُونَ ۝١٥ ﴾ الجاثية: ١٥

Ê كرانەوەی (**بصيرة**)ی بانگخواز، واته گەیشتن بەپله بالاكانی باوەڕو بەدەستهێنانی ئەو نوورەی قورئان ئاماژەی بۆ دەكات﴿أَوَمَن كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَٰهُ وَجَعَلْنَا لَهُۥ نُورًا يَمْشِى بِهِۦ فِى ٱلنَّاسِ كَمَن مَّثَلُهُۥ فِى ٱلظُّلُمَٰتِ لَيْسَ بِخَارِجٍ مِّنْهَا ﴾الأنعام: ١٢٢، گەیشتن بەو نووره كه نووری هیدایەت و باوەڕ و فیترەتە بەرچاوی كەسی بانگخواز بەجۆرێك رۆشن دەكاتەوه ئاسۆ دوورەكان دەبینێ و دەتوانێت دانایانه بانگەوازەكەی حەرەكەت پێبكات و سەرنشینانی كەشتی بانگەواز به سەلامەتی بگەیەنێته جێگەی مەبەست، ئەو (بەهۆی ئەو نوورەوه) دەزانێ كەی و چۆن حەرەكەت به كەشتی بانگەوازەكەی دەكات و له كوێشدا لەنگەری پێدەگرێت، دەزانێ چۆن و له كوێدا مەردوومانی هاتوو بەدەم بانگەوازەكەیەوه بخاته گەڕ و كام ئەركەیان له كەشتی بانگەوازدا پێبسپێرێت.

Ê یەقینی بانگخواز به راستی و دروستی بانگەوازەكەی و دڵنیابوونی له سەركەوتن بەسەر هەموو ڕێچكەكانی تردا سەرچاوەكەی له (**على بصيرة**)ەوەیە، چەنده لەسەر بەصیرەت بێت ئەوەنده خاوەنی یەقینه و دارای دڵنیاییه.

## پایەی پێنجەم (أَنَا۠ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِيۖ):

Ê وشەی (**أنا**) کە بۆ (**توکید**)ی بکەری فرمانی (**أدعو**) کە (**ضمیر**)ێکی شاراوەیە هاتووە بۆ ئیبرازکردنی تاکە کەس و زاڵکردنی (**شخصانیة**) نییە بەسەر بانگەوازدا، بەڵکو بۆئەوەیە بە مەردوومان رابگەیەنێت کە:

١. **منیش** هەروەك تەواوی باوەڕداران ملکەچی ئەو مەنهەجە خوداییەم و ناتوانم لێی لابدەم و لە پابەندبوونم بەو مەنهەجەوەیە بانگ بۆ لای خودا دەکەم و وەك ئەرکێکی خودایی پێی هەڵدەستم.

٢. هەر بانگەوازێك لەدەرەوەی ئەو مەنهەجەوە بێت کە پێغەمبەر(ﷺ) لەسەری بووە لای خودا وەرناگیرێ و کەسیش بە خودا ناگەیەنێت، ئێمە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) بە خودا دەگەین، جگە لەو شوێنکەوتنە پڕاوپڕەی پێغەمبەریش(ﷺ) هیچ چارە و دەروویەکی تر بۆ گەیشتن بەخودا بەیان نەکراوە.

٣.تەواوی سیرەت و کاروکردەوە و فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) دەکرێتە مەنهەجێك بۆ تێگەیشتن لە قورئان و لەوێشەوە و لەبەر نوور و رۆشنایی ئەو دوو نوورەدا (قورئان —پێغەمبەر) مەنهەجی دروستی بانگەواز رادەگەیەنرێت.

Ê (**و من اتبعني**): لێرەشدا و لەم بڕگەیەدا ئاماژە بە چەند خاڵێك دەکەین:

١. بانگەواز لە دوای پێغەمبەر(ﷺ) دەبێت لەسەر مەنهەجی پێغەمبەر(ﷺ) بێت، نەك کاریگەربوون بە چەپ و راست و ئیجتیهادی بێ بنەما و کەموکورت و خۆدانە دەم هەوا و بەرژەوەندییە دونیاییەکان.

٢. ئەوانەی بانگ بۆ لای خودا دەکەن شوێنکەوتەی راستەقینەی پێغەمبەرن (ﷺ) و هەنگاو بە هەنگاو لە دوای ئەوەوە جێ پێی هەڵدەگرن﴿ **قُلۡ إِن كُنتُمۡ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِي يُحۡبِبۡكُمُ ٱللَّهُ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٣١** ﴾ آل عمران: ٣١

٣. کەسێك لەسەر مەنهەجی پێغەمبەر(ﷺ) بێت و لەدوای ئەوەوە وەستابێ و شوێن پێیەکانی ئەو هەڵبگرێت پێویستە پێغەمبەرەکەی (ﷺ) خۆی ناسیبێت و پەیوەندی

تایبەتی لەگەڵ ئەو هەبێت، ناکرێت خۆی بە شوێنکەوتەی ئەو پێغەمبەرە (ﷺ) بزانێ و پێغەمبەرەکەی نەناسێ و دڵی بە خۆشەویستی ئەو لێوانلێو نەبووبێت.

٤. ئاماژەی ئایەتەکە بە(مَن) بۆ هەر کەسێکی ژێری باوەڕدارە بەبێ جیاوازی رەگەزی نێرومێ، هەروەك چۆن پیاوانی باوەڕدار بەرپرسیارن لە کارو ئەرکی بانگەواز هەر بەو جۆرە ئافرەتانی باوەڕداریش بەرپرسیارن، بۆیە ناکرێت رۆڵی ئافرەتان لەو ئەرکە مەزنەدا بەکەم تەماشا بکرێت و ئەو نیوە زۆر گرنگەی کۆمەڵ پشتگوێ بخرێت، چونکە بەوانەوە بانگەواز بارگە و بنەی دەگاتە مەنزڵ و بەبێ بوونی ئەوان سەرکەوتنی بانگەواز زۆر ئەستەمە.

**پایەی شەشەم (وَسُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ):**

لێرەدا و لە کۆتایی ئەم ئایەتە پیرۆزەدا چەند ئاماژەیەك دەخەینە روو:

Ê پوختەی ئەو بانگەوازەی سەرجەم پێغەمبەران(علیهم السلام) پێی هەستاون بریتییە لە بەرز راگرتنی خودا و راگەیاندنی پاکێتی بۆ ئەو و خۆ دارنین و دووركەوتنەوە لە هاوەڵ بڕیاردان بۆ خودا﴿ وَلَقَدۡ بَعَثۡنَا فِي كُلِّ أُمَّةٖ رَّسُولًا أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱجۡتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَ ﴾النحل: ٣٦

Ê جیابوونەوەی رێگەی باوەڕداران لەرێچکەکانی تر یەکێکە لە کۆڵەکەکانی بانگەواز ﴿ قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡكَٰفِرُونَ ١ لَآ أَعۡبُدُ مَا تَعۡبُدُونَ ٢ ﴾ الكافرون: ١- ٢، ﴿ وَٱهۡجُرۡهُمۡ هَجۡرٗا جَمِيلٗا ١٠ ﴾ المزمل: ١٠، ﴿ وَٱلرُّجۡزَ فَٱهۡجُرۡ ٥ ﴾ المدثر: ٥

**پایەی حەوتەم:**

چۆنێتی بانگەواز کە لەم ئایەتە پیرۆزە وەرگیراوە:

قَالَ تَعَالَى: ﴿ ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِۖ وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُۚ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعۡلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦۖ وَهُوَ أَعۡلَمُ بِٱلۡمُهۡتَدِينَ ١٢٥ ﴾

النحل: ١٢٥

**لێرەدا ئاماژە بە چەند خاڵێك دەكەین:**

❁ سەرەتای ئایەتەكە (**أدع الى سبيل ربك**) دووپاتی پوختەی ئەو راستییانە دەكاتەوە لە دووتوێی ئایەتەكەی پێشوودا هاتووە، بانگەواز بانگەوازی خودایە و دەبێت خەڵكی بۆ سەر رێگەی ئەو بانگ بكرێت، ئەمەش بەو مەنهەجەی كە خودا داوای لە پێغەمبەر(ﷺ) كردووەو ئەویش لەسەری رۆیشتووەو بۆ شوێنكەوتووانی بەیانی كردووە.

❁ لەم ئایەتە پیرۆزەدا سێ جۆر لە شێوازی بانگكردن و گفتوگۆكردن لەگەڵ مەردوومان‌دا هاتووە، واتە ئایەتەكە مرۆڤەكان بۆ سێ جۆر دابەش دەكات:

١. **ئەهلی حیكمەت و دانش و زانست:** ئەم دەستەیە پێویستە (**بالحكمة**) بۆ لای خودا بانگ بكرێن، بەزمانی خۆیان و لە مەیدانی زانستی خۆیانەوە قسەیان لەگەڵ بكرێت.

٢. **عەوامی خەڵكی كە زۆرینەی هەر كۆمەڵگەیەكن:** ئەمانەش پێویستە بە (**والموعظة الحسنة**) بۆ لای خودا بانگ بكرێن، واتە بەزمانی شیرین باسی ئەو هەموو پاداشتە خوداییەیان بۆ بكرێت لە دونیا و دوارۆژدا چاوەڕوانیان دەكات و ئاگادار بكرێنەوە لەو گشتە ترسەی چاوەڕوانیان دەكات گەر نەچن بەدەم بانگەوازی خوداوە، زمانی شیرین و هەڵوێستی شیرین رێگەیەكە بۆ بانگكردنی خەڵكی بەگشتی.

٣. **ئەهلی فیكر و ئایدۆلۆژیا و بیروباوەڕی ئایینی و زەمینی:** ئەم جۆرە لە مەردوومان پێویستە بە (**جادلهم بالتي هي أحسن**) بۆ لای خودا بانگ بكرێن، لە رێگەی (**جدال بالتي هي أحسن**)ە وە ئەم دەستەیە قەناعەت پێدەهێنرێ و دینی حەقیان بۆ روون دەكرێتەوە، **لەم شێوازەی بانگەوازدا هەوڵدەدرێت:**

Ê تەنها مەبەست بەیانكردنی حەق و راستی بێت و خۆ خوێندنەوەی تێدا نەبێت.

Ê دەمارگیری جگە لە حەق بۆ هیچ شتێكی تر نەبێت و لە كوێدا و لەسەر زمانی هەر كەسێك حەق بەدەركەوت راستەوخۆ وەریبگرین و دانی پیادا بنێین.

Ê دانەبەزین بۆ ئاستی بریندار كردنی یەكتری و جەنگی دەروونی.

Ê ئارامی كەش و هەوای گفتوگۆكە پارێزگاری لێ بكرێت و گاڵە و تووڕەبوون و دەنگ بەرزكردنەوەی تێدا نەبێت.

Ê له بیرمان نەچێت تۆ دەتەوێ کەسێك بۆ لای خودا بانگ بکەی، بۆیە دەبێت بە قسە و ڕەفتارت خودا و مەنهەجی خودا لای بەرانبەر شیرین بکەیت، نەك لە تۆوە ڕق لە خودا و دینی خودا هەڵبگرێت.

Ê لە بیروباوەڕ و بۆچوونەکانی ئەودا بەڵگەگەلێك بدۆزرێتەوە و کەسی بەرانبەر بخرێتە ناو پرسیار و بیرکردنەوە لەوەی باوەڕی پێهێناوە﴿وَقُل لَّهُمْ فِي أَنفُسِهِمْ قَوْلًا بَلِيغًا ﴿٦٣﴾﴾ النساء: ٦٣، ﴿وَاتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ إِبْرَاهِيمَ ﴿٦٩﴾ إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِ مَا تَعْبُدُونَ ﴿٧٠﴾ قَالُوا نَعْبُدُ أَصْنَامًا فَنَظَلُّ لَهَا عَاكِفِينَ ﴿٧١﴾ قَالَ هَلْ يَسْمَعُونَكُمْ إِذْ تَدْعُونَ ﴿٧٢﴾ أَوْ يَنفَعُونَكُمْ أَوْ يَضُرُّونَ ﴿٧٣﴾ قَالُوا بَلْ وَجَدْنَا آبَاءَنَا كَذَٰلِكَ يَفْعَلُونَ ﴿٧٤﴾ قَالَ أَفَرَأَيْتُم مَّا كُنتُمْ تَعْبُدُونَ ﴿٧٥﴾ أَنتُمْ وَآبَاؤُكُمُ الْأَقْدَمُونَ ﴿٧٦﴾ فَإِنَّهُمْ عَدُوٌّ لِّي إِلَّا رَبَّ الْعَالَمِينَ ﴿٧٧﴾ الَّذِي خَلَقَنِي فَهُوَ يَهْدِينِ ﴿٧٨﴾ وَالَّذِي هُوَ يُطْعِمُنِي وَيَسْقِينِ ﴿٧٩﴾ وَإِذَا مَرِضْتُ فَهُوَ يَشْفِينِ ﴿٨٠﴾ وَالَّذِي يُمِيتُنِي ثُمَّ يُحْيِينِ ﴿٨١﴾ وَالَّذِي أَطْمَعُ أَن يَغْفِرَ لِي خَطِيئَتِي يَوْمَ الدِّينِ ﴿٨٢﴾﴾ الشعراء: ٦٩-٨٢

**لەم سێ شێوازەی بانگەوازەوە دەگەینە ئەو ڕاستییەی کە کەسی بانگخواز کەسێکی ئاسایی نییە، بەڵکو پێویستە ئەم مەرجانەی تێدابێت:**

١. مۆڵەتدراو بێت لە لایەن خوداوە بۆ کاری بانگەاز، ئەم مۆڵەتدانە یان بە ئاگادارکردنەوەی لە ڕێگە جۆراوجۆرەکانی دڵ و دەروونی تەزکیەکراوەوەیە، یاخود لەسەر داوای کەسێکی زانا و خوداناس کە متمانە بە ئیمان و زانستی دەکرێت.

٢. زانایی و شارەزایی بە بیر و دەروون و شێوازی بیرکردنەوەی کەسی بەرانبەر.

٣. ناسینی کەسەکان و هەڵسەنگاندن بۆ کردنیان لەسەر ئاستی تاك و خێزان و کۆمەڵ ئەوجا بانگکردنیان و کەوتنە گفتوگۆ لەگەڵیان.

٤. پۆلێن کردنی مەردوومان و دانانی هەریەکەیان لە خانەی خۆی دا.

٥. بانگخواز کەسێکی سیرەت پاك و زمان شیرین و ئەقڵ و جەستە تەواو بێت ﴿وَأَخِي هَارُونُ هُوَ أَفْصَحُ مِنِّي لِسَانًا فَأَرْسِلْهُ مَعِيَ رِدْءًا يُصَدِّقُنِي إِنِّي أَخَافُ أَن يُكَذِّبُونِ ﴿٣٤﴾﴾ القصص: ٣٤، کە موسا(عليه السلام) دەچێت بۆ لای فیرعەون پێی دەڵێ﴿وَفَعَلْتَ

فَعْلَتَكَ ٱلَّتِي فَعَلْتَ وَأَنتَ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿١٩﴾ ﴾ الشعراء: ١٩، ﴿فَقَدْ لَبِثْتُ فِيكُمْ عُمُرًا مِّن قَبْلِهِۦٓ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿١٦﴾ ﴾ يونس: ١٦، ﴿قَالُوا۟ يَٰصَٰلِحُ قَدْ كُنتَ فِينَا مَرْجُوًّا قَبْلَ هَٰذَآ ﴾هود: ٦

❁ ❁ ❁

# حیکمەتی سەد و هەشتا و پێنج

((رُبَّمَا بَرَزَتِ الْحَقَائِقُ مَكْسُوفَةَ الأَنْوَارِ إِذَا لَمْ يُؤْذَنْ لَكَ فِيهَا بِالإِظْهَارِ))

## راڤەی وشەکان:

**برزت الحقائق**: راستییەکان(حەقیقەتەکان) بەدەربکەون

**مكسوفة الأنوار**: نوورەکەی گیرابێت، رۆشن نەبێت، داپۆشرابێت

**يؤذن لك**: مۆڵەتت پێ بدات

**الإظهار**: دەرخستن، ئاشکرا کردن

**واتا ((لەوانەیە راستییەکان (حەقیقەتەکان) بەدەربکەون و نوورەکەیان گیرابێت گەر خودا مۆڵەتی دەرخستنی ئەو راستییانەت پێ نەدات))**

## شرۆڤە:

۞ دەرخستنی راستییەکانی ئیمان و بانگکردن بۆ سەریان مۆڵەتی دەوێت، ئەو مۆڵەتەش یان زانا و عاریفێکی مەزن دەیبەخشێت، یان خودا بە رێگەیەك کەسەکە حاڵی دەکات بەو کارە هەڵبستێت.

۞ راگەیاندن و ئاشکراکردنی هەر حەقیقەتێك لە حەقیقەتەکانی ئیمان بەبێ مۆڵەت دەربڕینێکی بێ نوورە، واتە تەنها بە زەین وەردەگیرێن و ناگەنە دڵی گوێگران، حەقیقەت دەبێت بگاتە دڵ و دڵ زیندوو بکاتەوە، نەك تەنها لە زەین و لەسەر زمان و لەناو گوێدا خول بخوات، هەر حەقیقەتێك خاڵی بێت لە نوور لە مانا بەرز و بڵندەکان خاڵی دەبێتەوە و تەنها جەستەی حەقیقەت دەگاتە مەردوومان، بەڵام رۆحی حەقیقەت کە زیندەگی دڵ و رۆحی مرۆڤی پێوەیە لەناو نوورەکەدایە، سەرنجی ئەم ئایەتە پیرۆزانە بدە﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدۡ جَآءَكُم بُرۡهَٰنٞ مِّن رَّبِّكُمۡ وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكُمۡ نُورٗا مُّبِينٗا ﴿١٧٤﴾ ﴾ النساء: ١٧٤، "بورهان" ئەو بەشەی وەحییە کە ئەقڵ و بیری مرۆڤ رۆشن دەکاتەوە، "نور" ئەو

بەشەی وەحییە کە دڵ و ناخی مرۆڤ رۆشن و ئاوەدان دەکاتەوە، لەم ئایەتە پیرۆزەشدا ئاماژە بەوە دەدات کە وەحی رۆحە و بەشی سێیەمی مرۆڤ زیندوو دەکاتەوە کە رۆحەکەیەتی﴿وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا ۚ مَا كُنتَ تَدْرِى مَا ٱلْكِتَٰبُ وَلَا ٱلْإِيمَٰنُ وَلَٰكِن جَعَلْنَٰهُ نُورًا نَّهْدِى بِهِۦ مَن نَّشَآءُ مِنْ عِبَادِنَا ۚ وَإِنَّكَ لَتَهْدِىٓ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٥٢﴾﴾ الشورى: ٥٢، کەوابوو وەحی هەر سێ لایەنەکەی مرۆڤ ئاوەدان دەکاتەوە، ئەقڵ و بیری بە بورهان و دڵ و دەروونی بە نوور و زیندوکردنەوەی رۆحیشی بە رۆح.

۞ ۞ ۞

# حیكمەتی سەد و هەشتا و شەش

**((عِبَارَاتُهُمْ إِمَّا لِفَيَضَانِ وَجْدٍ، أَوْ لِقَصْدِ هِدَايَةِ مُرِيدٍ،**
**فَالأَوَّلُ حَالُ السَّالِكِينَ،**
**وَالثَّانِي حَالُ أَرْبَابِ الْمُكْنَةِ وَالْمُحَقِّقِينَ))**

**راڤەی وشەكان:**

**فیضان:** لافاو

**وجْد:** وەجد، گەرمی و تینی دڵ

**المُكنة:** هێز پێز و توندی و دەسەڵات

**واتا ((دەربڕینەكانیان یان بە هۆی لافاوی وەجدەوەیە، یان بۆ مەبەستی هیدایەتی موریدن، یەكەمیان حاڵی سالیكانە، دووەمیان حاڵی خاوەن هێز و دەسـەڵات و وەستاو لـەسەر راستییەكانە))**

**شرۆڤە:**

۞ **دەربڕینەكانی ئەهلی ڕێگە لە دوو ئاستدایە:**

**ئاستی سەرەتا** كە ئاستی سالیكانە، تیایدا لافاوی گەرم و گوڕی ناخیان بە جۆرێك سەر دەكات دەگاتە سەر زمان و دەست بە دەربڕینی راستییەكان دەكەن، ئەم جۆرە دەربڕینانە حاڵێكی ناتەواوە و كامڵ نییە، چونكە لە دەستدانی ویست و ئیرادەی تێدایە و هەندێ جاریش دەربڕینەكان بە جۆرێكن فیتنە بۆ دەوروبەر دروست دەكەن، لەم جۆرە دەربڕینانە ئەو قسە و وڕێنانەن كە لە هەندێ لە سۆفییەكان وەشاوەتەوە، قسەگەلێكیان بەسەر زماندا هاتووە لەگەڵ شەریعەتدا پێكنایەتەوە.

**ئاستی دووەم** بریتییە لە دەربڕینی عاریفان و حەكیمان كە لە دونیای مەعنەویاتدا خاوەنی هێزی دڵن و لەسەر راستییەكان راوەستاون، ئەم دەبڕینە دەربڕینێكی

تێروتەواوە و بەپێی میزانی شەرعە و بە مەبەستی پەروەردەکردنی موریدان دەریدەبڕن.

ئەگەر بۆ سالیکانی رێگە دەربڕینەکان تێر و تەواو نەبێت دەبێ ئەوانەی پێیان نەناوەتە سەر رێگەی بەرەو خوداچوون دەربڕینەکانیان چۆن بێت و چی بێت؟ گومانی تێدا نییە بەشێك لە ئافەتی ئەم سەردەمە وەرگرتنی قسەی کۆمەڵێك مرۆڤی نەزانە کە جگە لە گاڵە و دەستەدەستەیی شتێکی تری لێوە بەرهەم نایەت، خودا ئێمە و موسڵمانان لەم ئافەتە گەورەیە بەدوور بگرێت..**آمين**.

# حیکمەتی سەد و هەشتا و حەوت

((الْعِبَارَاتُ قُوتٌ لِعَائِلَةِ الْمُسْتَمِعِينَ وَلَيْسَ لَكَ إِلاَّ مَا أَنْتَ لَهُ آكِلٌ))

**ڕاڤەی وشەکان:**

**قوت:** خۆراك

**عائلة المستمعين:** خێزانی گوێگران، دەستەی گوێگران

**آکل:** بخۆر

**واتا ((دەربڕینەکان خۆراکی خانەوادەی گوێگرانن، تەنها ئەوەندەی بۆ تۆیە کە لێت خواردبێت))**

**شرۆڤە:**

❁ وەك چۆن جەستە خۆراکی پێویستە دڵ و گیانیش پێویستی بە خۆراکە، حیکمەتی سەر زمانی عاریفان ئەو خۆراکەیە دڵ و گیان تێردەکات، وەك چۆن هەموو جەستەیەك هەموو خواردنێکی بۆ شیاو نییە، بەڵکو هەر جەستەیەك جۆرێك لە خواردنی پێویستە، هەر بەو جۆرە هەموو گوێگرێك بۆ بیستنی هەموو قسەیەك ئامادە نییە، بەڵکو هەر گوێگرە و جۆرێك لە حیکمەتی قسەکردنی دەوێت، خودا فەرمانی بە حیکمەت کردووە لە بانگەوازی مەردوماندا و دەفەرموێت:﴿ ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ ﴾ النحل: ١٢٥

❁ هەر خۆراکێك کەسەکە لێی نەخواردبێت بەکاری ئەوە نایەت بیکات بە دەم گوێگرانەوە، چونکە تۆ نازانی تام و بۆن و سوود و قازانجی ئەو خۆراکە لە کوێدایە و کاتێك بەبێ زانست دەیکەی بە دەم گوێگرانەوە نەخۆشییان دەخەی.

# حیکمەتی سەد و هەشتا و هەشت

((رُبَّمَا عَبَّرَ عَنِ الْمَقَامِ مَنِ اسْتَشْرَفَ عَلَيْهِ، وَرُبَّمَا عَبَّرَ عَنْهُ مَنْ وَصَلَ إِلَيْهِ وَذَلِكَ مُلْتَبِسٌ إِلاَّ عَلَى صَاحِبِ بَصِيرَةٍ))

**راڤەی وشەکان:**

**عبر:** تەعبیری لێ کرد

**استشرف عليه:** بڕوانێت بەسەریدا

**ملتبس:** تەمومژاوی و ئالۆز

**واتا ((لەوانەیە کەسانێك تەعبیر لە مەقام بکەن کە دەڕوانن بەسەریدا، لەوانەیە کەسانێکیش تەعبیری لێ بکەن کە بە مەقام گەیشتوون، ئەوەش بۆ هەمووان(هەردووکیان) ئالۆز و تەمومژاوییە جگە لەوانەی خاوەنی بەصیرەتن))**

**شرۆڤە:**

❁ مەقامەکانی ئیمان زۆر و جۆراوجۆرن، لە مەقامە دیارەکانی ئیمان: شوکر و صەبر و تەوەکول و رازیبوون و خۆشەویستی و ئیخلاص، هتد..

❁ **لەم حیکمەتەدا سێ جۆر مورید ئاماژە پێدەدات لە مەیدانی تەعبیرکردن لە مەقامەکان:**

**جۆرێك لە مورید قسە لە مەقامێك دەکات کە پێی نەگەیشتووە،** بەڵکو تەنها روانیویەتی بەسەریدا، واتە لێی نزیك بووەتەوە، بەلاَم پێی تێنەناوە، قسە و دەربڕینی ئەم جۆرە لە مورید نارۆشن و تەمومژاوییە، چونکە ئاشنا نییە بە مەقامەکە و تەنها قسەی کەسانی تر لەسەری دووبارە دەکاتەوە، یاخود تەنها لە دوورەوە مەعریفەی بە مەقامەکە هەیە و نەچووەتە ناو وردەکارییەکانییەوە.

**جۆری دووەم** لە موریدان ئەوانەن قسە لە مەقامێك دەكەن كە پێیگەیشتوون و پێیان **تێناوە**، بەڵام تیایدا دانەمەزراون و تەمكینیان بۆ دروست نەبووە و شارەزای وردەكارییەكانی نین، ئەم جۆرەش دیسان قسەكانیان لێڵ و تەمومژاوییە، بەڵام بە پلەیەكی كەمتر لەوەی یەكەم.

**جۆری سێیەم** بریتین لە عاریفان یان حەكیمان كە لێرەدا بە **"ئەهلی بەصیرەت"** ناوی **هێناون**، ئەمانە بریتین لەو كەسانەی كە تا پلە باڵاكانی ئیمان بەرزبوونەتەوە، لەسەر مەقامەكانی ئیمان تەمكینیان پەیدا كردووە، دەربڕینی ئەم كەسانە لەمەڕ مەقامەكان ڕۆشن و ڕوونەو وەك ئاوی زوڵاڵ و سازگار وایەو هەناوی مرۆڤە تینووەكان پاراو دەكەن و دڵە مردووەكان بە حیكمەتەكانیان زیندوو دەكەنەوە.

**پێم باشە لەسەر ئەم سێ جۆرە لە موریدی ڕێگەی خودا نموونەیەك بهێنمەوە:**

پیاوێك سەفەرێكی بۆ شاری بەختەوەران گرتۆتە بەر، دەیەوێت زانست و زانیاری لەسەر ئەو شارە لەلا بێت، ئایا پرسیار لە كام لەم سێ كەسە دەكات: **كەسێك** پێی نەناوەتە شارەكە، بەڵكو تەنها بەلایدا گوزەری كردووە و لە دوورەوە تەماشایەكی شارەكەی كردووە، **كەسی دووەم:** سەفەری شارەكەی كردووە و لە نزیكەوە شارەكەی بینیوە، بەڵام زۆر كەم تیایدا ماوەتەوە و ئاشنا نییە بە كوچە و كۆڵانەكانی و شوێنە گشتییەكانی، لەگەڵ كەسێك كە خەڵكی شارەكەیە و چەندین ساڵە ماڵی لەوێیە و تیایدا نیشتەجێ بووە؟ بێگومان پرسیار لە **كەسی سێیەم** دەكرێت، چونكە ئەو وردەكاریی و ئاشناییەی كە لەلای ئەمە لەلای سیانەكەی تر بوونی نییە، ئەمە بریتییە لە نموونەی ئەو سێ جۆرە لە مورید.

# حیکمەتی سەد و هەشتا و نۆ

((لاَ يَنْبَغِي لِلسَّالِكِ أَنْ يُعَبِّرَ عَنْ وَارِدَاتِهِ فَإِنَّ ذَلِكَ يُقِلُّ عَمَلَهَا فِي قَلْبِهِ وَيَمْنَعُهُ وُجُودَ الصِّدْقِ مَعَ رَبِّهِ))

**راڤەی وشەکان:**

**لا ينبغي:** نابێت

**واردات:** زانست و مەعریفە هاتووەکان لەلای خوداوە بۆ سەر دڵی سالیك

**يقل عملها:** کاریگەرییەکەی کەم دەکاتەوە

**وجود الصدق:** بوونی صدق

**((نابێت سالیك باسی وارداتی خۆی بکات، چونکە ئەوە کاریگەرییەکەی لەسەر دڵ کەم دەکاتەوە و ڕێگری دەکات لە بوونی صدق لەگەڵ پەروەردگاری))**

**شرۆڤە:**

حیکمەتەکەی پێشوو باسی سێ جۆر موریدی کرد کە تەعبیر دەدەن لە مەقامەکان، ڕێگری کرد لە جۆری یەکەم و دووەم لەو مەیدانەدا قسە بکەن، چونکە قسەکانیان لێڵ و تەمومژاویی دەردەچێت و کەسی بەرانبەر تێیان ناگات و تووشی فیتنە دەبێت لێیانەوە، لەم حیکمەتەشدا باس لە دەربڕینی واریدات دەکات لەلایەن سالیکی ڕێگەی خوداوە، واریدات کۆمەڵێك زانست و مەعریفەن لەمەڕ خودا و جیهانی پەنهان کە خودا بە فەزڵی خۆی دایدەبارێنێتە سەر دڵی سالیك، پاراستنی نهێنی ئەو وارداتانە ئەرکی سەر شانی سالیکە، چونکە لەگەڵ باس کردنی بۆ دەوروبەر دوو ئافەت ڕووی تێدەکات:

**یەکەم:** کاریگەرییەکەی لەسەر دڵ کەم دەبێتەوە، هاتنی واریدات بۆ زیندەگی دڵە، نەك بۆ قسە و باس، بۆیە کە تەعبیری لێدەدەی ماناکان لە دڵدا وەك پەپوولەیەك باڵ دەگرنەوە.

**دووەم:** کاتێك باسی واریداتی خۆت بۆ دەوروبەر دەکەی صدقت لەگەڵ پەروەردگار کەم دەبێتەوە، چونکە تۆ بڕیار بوو سەرجەم کارەکانت بۆ خودا بێت و بەشی نەفسیان لیٚ نەدەی، باس کردنی ئەو نهێنیانە نەفس پێیخۆشە و بەشی خۆی لیٚ وەردەگرێت، ئەمەش پێچەوانەی صدقە لەگەڵ پەروەردگار، ئەم دوو ئافەتەش سەرچاوەی واریدات وشك دەکەن و لەوانەیە جارێکی تر روو لەو دڵە نەکەنەوە.

# حیکمەتی سەد و نەوەد

((لاَ تَمُدَّنَّ يَدَكَ إِلَى الأَخْذِ مِنَ الْخَلاَئِقِ إِلاَّ أَنْ تَرَى أَنَّ الْمُعْطِيَ فِيهِمْ مَوْلاَكَ، فَإِذَا كُنْتَ كَذَلِكَ فَخُذْ مَا وَافَقَكَ الْعِلْمُ))

**راڤەی وشەکان:**

**لا تمدن يدك:** دەستت درێژ مەکە

**الأخذ:** وەرگرتن

**الخلائق:** خەڵکی، مرۆڤ

**المعطي فيهم:** بەخشەر لە ئەواندا

**فخذ:** وەربگرە

**((دەستت درێژ مەکە بۆ وەرگرتن لە خەڵکی، مەگەر ببینیت بەخشەر لە کارەکەی ئەواندا خودایە، گەر بەو جۆرە بوویت ئەوەندەی زانست پێی رازییە وەریبگرە))**

**شرۆڤە:**

لە حیکمەتەکانی پێشوودا باسی دوو بار(دۆخ)مان کرد بۆ مورید، باری کەسابەت و کارکردن، لەگەڵ باری یەکلابوونەوە و دابڕان بۆ سەفەری ڕێگە، لەم حیکمەتەدا ئاماژە بە ئەخلاقی ئەوانە دەکات بۆ ئەم ڕێگە ساغ بوونەتەوە، ئەوەش بە ویستی خودا نەك بە حەز و تەمبەڵی موریدان، لەم باری یەکلابوونەوەدا کەسەکە دەستی لە کەسابەتی دونیایی دەبڕێت، بەڵکو گەر زۆر لە خۆیشی بکات و بچێت بۆ کار و کەسابەت بە کۆڵێك زیان و زەرەری مادییەوە دەگەڕێتەوە و ناچار دەکرێت بە یەکلابوونەوە، بەڵام خۆ مرۆڤ هەتا پێی لەسەر زەوی بێت خواردن و خواردنەوەی پێویستە، بۆیە لەم حیکمەتەدا باس لە ئەدەبی وەرگرتن دەکات و دەفەرموێت:: نابێت مورید دەست بۆ هیچ کەسێك پان بکاتەوە، گەر دەستی پان کردوە نیشانەی ئەوەیە بە ویستی خۆی

یەکلابوونەوەی هەڵبژاردووە و نەك بە ویستی خودا، بەڵکو تەمبەڵی و حەزی نەفس لە کارەکەیدا هەیە، بۆیە بە زووترین کات دەبێت بگەڕێتەوە بۆ سەر ژیان و کار و کەسابەت، بەڵام گەر یەکلابوونەوەکەی بە ویست و بڕیاری خودا بوو، **ئەوا سێ مەرج بۆ وەرگرتن هەیە:**

**یەکەم:** دەبێ یەقینت هەبێت ئەوە خودایە ئەو کەسەی ڕەوانە کردووە بۆ جێبەجێ کردنی پێویستییەکەی تۆ، چۆن یەقینی هەبێت؟ ئەگەر ئەو کەسە ڕێگەی جیاکردنەوە و ناسینەوە فێر نەبووبوو، واتە نەگەیشتبووە ئاستێکی بالاَ کە کەسەکان و قەدەرەکان بناسێتەوە ئەوا ئەو بە زۆر خۆی یەکلاکردۆتەوە و چاکترە بۆی بگەڕێتەوە سەر کار و کەسابەت.

**دووەم:** ئەوەی وەریدەگرێت دەبێت لەگەڵ شەرعدا تەبا بێت، ماڵی دزراو نەبێت، خواردن و بەکارهێنانی حەرام نەبێت، لەدەستی منداڵ و شێت وەرینەگرتبێت.

**سێیەم:** بەپێی پێویستی بێت، واتە زەخیرەکردن و لاخستن لە وەرگرتنەکەدا نەبێت.

# حیکمەتی سەد و نەوەد و یەك

((رُبَّمَا اسْتَحْيَا الْعَارِفُ أَنْ يَرْفَعَ حَاجَتَهُ إِلَى مَوْلاَهُ لاكْتِفَائِهِ بِمَشِيئَتِهِ فَكَيْفَ لاَ يَسْتَحْيِي أَنْ يَرْفَعَهَا إِلَى خَلِيقَتِهِ؟))

**راڤەی وشەكان:**

**استحيا:** شەرم بكات

**حاجته:** پێویستییەكانی

**لاكتفائه:** بەهۆی رازیبوونی (بەسبوونی)

**واتا ((لەوانەیە عاریف شەرم بكات پێویستییەكانی بۆ لای پەروەردگاری بەرز بكاتەوە بەهۆی رازیبوونی بە ویست و بڕیاری خودا، ئیتر چۆن شەرم ناكات پێویستییەكانی بۆ لای خەڵكی بەرز بكاتەوە؟!))**

**شرۆڤە:**

❁ لە حیكمەتەكەی پێشوودا بە سێ مەرج رێگەی بە مورید دا شت وەربگرێت، وەك پێمان بڵێت موریدان هێشتا لاوازییان تێدایە و ناتوانن بە عەزیمەت كار بكەن، بۆیە روخسەتی وەرگرتنیان پێدراوە، لەم حیكمەتەدا باس لە هەڵوێستی عاریف دەكات و دەفەرموێت: ئەو شەرم دەكات لە پەروەردگاری پێویستییەكان لەلای خودا باس بكات، چونكە بە تەواوی رازی بووە بە ویست و بڕیاری پەروەردگاری، لای عاریف جێبەجێ كردن و جێبەجێ نەكردنی پێویستییەكانی لەلای ئەو یەكسانە، چونكە هەردووكیان بڕیاری خودایە و ئەویش خۆی رادەستی بڕیاری خودا كردووە، ئەگەر عاریف پێی شەرم بێت لە خزمەتی پەروەردگاریدا پێویستییەكانی خۆی باس بكات، ئیتر چۆن شەرم لە پەروەردگار ناكات پێویستییەكانی بباتە بەر دەرگای مەردوومان؟!

۞ دەوترێت: ئەگەر عاریف پێویستییەکانی لە هیچ لایەك باس نەکات و لە دەستی کەسیش هیچ وەرنەگرێت، ئەی چۆن دەژی و پێویستییە زەرورییەکان دەستەبەر دەکات؟ ئەم پرسیارە پرسیاری ئێمەیە، نەك پرسیاری کەسی عاریف، ئەو لەم جۆرە پرسیارانەی بە بیریدا نایەت، چونکە خودای خۆی ناسیوە و دەزانێت چۆن کارەکان بۆ بەندەکانی جێبەجێ دەکات، ئەم پرسیارە پرسیاری کەسێکە کە پێیوایە هەمیشە هۆکارەکانن سەرئەنجامەکان بەدەست دەهێنن، بەلاّم لای عاریف یاساکان شتێکی ترن﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مَخۡرَجٗا ٢ وَيَرۡزُقۡهُ مِنۡ حَيۡثُ لَا يَحۡتَسِبُۚ وَمَن يَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسۡبُهُۥٓ﴾الطلاق: ٢–٣، هەر کەس لە خودا بترسێت دەرووی لێ دەکرێتەوە و لە رێگەیەکەوە رۆزی دەدا کە بیری لێ نەکردۆتەوە، هەر کەس تەوەکولی لەسەر خودا بێت خودا بەسە بۆ ئەو.

۞ ۞ ۞

# حیکمەتی سەد و نەوەد و دوو

((إِذَا الْتَبَسَ عَلَيْكَ أَمْرَانِ فَانْظُرْ أَثْقَلَهُمَا عَلَى النَّفْسِ فَاتَّبِعْهُ، فَإِنَّهُ لاَ يَثْقُلُ عَلَيْهَا إِلاَّ مَا كَانَ حَقًّا))

## راڤەی وشەکان:

**إذا التبس:** گەر لێت ئاڵۆز بوو

**أثقلهما:** قورسترینیان

**فاتبعه:** شوێنی بکەوە

**واتا ((گەر دوو کارت لیٚ ئاڵۆز بوو، تەماشا بکە و بزانە کامیان لەسەر نەفست گرانە شوێنی ئەوەیان بکەوە، چونکە هەمیشە کاروباری حەق لەسەر نەفس گرانە))**

## شرۆڤە:

❁ لەم حیکمەتەدا ئیبن عەتا پێوەرێکمان بۆ جیاکردنەوەی کاری رەوا لە نارەوا، و باش لە باشتر بۆ دیاری دەکات و دەفەرمویٚ: ئەگەر دوو کار کەوتە بەردەمت نەتدەزانی کامەیان لەپێشترە بە ئەنجامدان، ئەوا هەمیشە ئەوەیان هەڵببژێرە کە لەسەر نەفست گرانە، چونکە هەمیشە نەفس لا بەلای حەزەکانی خۆیدا دەکاتەوە و لە ئەرك و مافەکانی سەرشانی هەڵدێت، بۆیە هەمیشە ئەو کارەی لەسەر نەفس گرانە دروست و رەوایە و ئەنجامی بدە.

❁ لەبیرمان نەچێت ئەم جۆرە کارانە ئەوانەن کە دەقێکی رۆشن لە قورئان و فەرموودە لەسەریان نییە، بۆیە کەوتۆتە ناو بازنەی ئیجتیهادی کەسەکانەوە، هەرکات دەقێکی رۆشن لەسەر ئەنجامدانی کارێك بوونی هەبێت کار بە دەقەکە دەکرێت و خۆشی و ناخۆشی نەفس وەلا دەنرێت، قورئان دەفەرموێت:((نوێژ لەسەر باوەڕداران فەرزە و بە کاتی دیاریکراو دیاریکراون))﴿إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ كَانَتۡ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ كِتَٰبٗا مَّوۡقُوتٗا ١٠٣﴾

النساء: ١٠٣، هەروەها لە فەرموودەدا هاتووە((باشترین کار بریتییە لە ئەنجامدانی نوێژەکان لە کاتی خۆیاندا))[٢٩]، بوونی ئەم دەقە ڕۆشنە داوا دەکات نوێژەکان دوانەخرێن-جگە لە نوێژی عیشا- و لە کاتی خۆیاندا ئەنجام بدرێت، لێرەدا لا بەلای پێخۆش بوون و پێناخۆش بوونی نەفسدا ناکرێتەوە، پێویستە کار بە فەرموودەکە بکات و حەز و ئیجتیهادی خۆی وەلا بنێت، لەم میانەدا یەك هەڵاوەردە(**الإستثناء**) بوونی هەیە ئەویش: بوونی ئامادەییە بۆ نوێژکردن، گەر کەسەکە لەو مرۆڤانە بوو کە نوێژەکانی بە ئەوپەڕی ئامادەیی و تامەزرۆبوونەوە ئەنجام دەدا و لە یەکێك لە کاتەکانی هاتنی نوێژدا ئەو ئامادەیی و تامەزرۆبوونەی لە خۆیدا نەدەبینی ئەوا دەتوانێت بە مەبەستی خۆئامادەکردن و گێڕانەوەی تامەزرۆیی بۆ نوێژ کەمێك نوێژەکەی دوابخات، سەرنجی وردی ئەم ئایەتە پیرۆزە بدە، کە پێشتر ئاماژەمان بە بەشێکی کرد﴿فَإِذَا قَضَيْتُمُ الصَّلَوٰةَ فَاذْكُرُوا اللَّهَ قِيَامًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِكُمْ ۚ فَإِذَا اطْمَأْنَنتُمْ فَأَقِيمُوا الصَّلَوٰةَ ۚ إِنَّ الصَّلَوٰةَ كَانَتْ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ كِتَابًا مَّوْقُوتًا ﴿١٠٣﴾﴾ النساء: ١٠٣، سەرنجی ئەو بەشەی ئایەتەکە بدە کە دەفەرموێت: (**فَإِذَا اطْمَأْنَنتُمْ فَأَقِيمُوا الصَّلَوٰةَ** -کاتێك دڵتان ئارام بوویەوە نوێژ ئەنجام بدەن)، ئیمامی **"الطبري"** وشەی(**اطمأننتم**)ی بە (**اطمأننتم**) تەفسیر کردووە لە یەکێك لە تەفسیرەکانی بۆ وشەی**"اطمأننتم"**، واتە تەفسیری ئایەتەکە بەم جۆرەی لێ دێت: هەر کات دڵتان ئارام بوو ئەو کات نوێژ ئەنجام بدەن.

۞ ۞ ۞

---

٢٩ عن عبدالله بن مسعود –رضي الله عنه– قال: سألْتُ النبي –صلى الله عليه وسلم–: أيُّ الأعمال أحَبُّ إلى الله؟ قال: ((الصلاة لوقتها)) الحديث متفق عليه.

# حیکمەتی سەد و نەوەد و سێ

((مِنْ عَلاَمَاتِ اتِّبَاعِ الْهَوَى الْمُسَارَعَةُ إِلَى نَوَافِلِ الْخَيْرَاتِ، وَالتَّكَاسُلُ عَنِ الْقِيَامِ بِالْوَاجِبَاتِ))

## راڤەی وشەکان:

**اتباع الهوى:** شوێنکەوتنی ئارەزوو

**المسارعة:** پەلەکردن

**نوافل الخيرات:** سوننەتەکان، نەوافیلەکان

**التكاسل:** تەمبەڵی

**القيام بالواجبات:** هەستان بە واجبەکان

**واتا ((لە نیشانەکانی شوێنکەوتنی حەز و ئارەزوو پەلەکردنە لە ئەنجامدانی کارە خێرە نەوافلەکان(سوننەتەکان) و تەمبەڵی لە هەستان بە واجبەکان))**

## شرۆڤە:

❁ لەم حیکمەتەشدا ئیبن عەتا پێوەرێکی ترمان بۆ باس دەکات، پێمان دەڵێت: نیشانەکانی شوێنکەوتنی حەز و ئارەزوو بریتییە لە ساردی و تەمبەڵی لە واجبەکاندا و پەلەکردن و گەرموگوڕی لە ئەنجامدانی نەوافلەکاندا.

❁ لە بنچینەدا نەوافلەکان (سوننەتەکان) بۆ پارێزگاری لە واجبەکان (فەرزەکان)ن، کاتێك ئەنجامدانی نەوافلەکان دەبێتە هۆی ساردی و تەمبەڵی لە ئەنجامدانی واجبەکاندا ئەوە نیشانەی دوورکەوتنەوەیە لە شەرع و شوێنکەوتنی حەزوئارەزووەکانە.

❁ هەموو فەرزەکان نەوافل و سوننەتی تایبەت بە خۆیان هەیە، نوێژ و رۆژ و حەج و زەکات نەوافیلیان بۆ دانراوە، گەر کەسێك لە بەخشینی ماڵ و دارایی‌دا پەلەی دەکرد و لە دەرکردنی زەکاتدا تەمبەڵی ئەنجام دەدا، ئەو کەسە شوێنی حەزوئارەزوو کەوتووە،

ئەگەر کەسێك لە شەونوێژدا گەرموگوڕ و چالاك بوو، بەڵام لە نوێژە فەرزەکاندا تەمبەڵی دەکرد، شوێنی ئارەزوو کەوتووە، هەر بەو جۆرە ئەو کەسانەی لە ئەنجامدانی عەمرە و ڕۆژووی سوننەتدا چالاکن و لە ڕەمەزان و ئەنجامدانی حەجدا تەمبەڵی دەکەن.

# حیکمەتی سەد و نەوەد و چوار

((قَيِّدَ الطَّاعَاتِ بِأَعْيَانِ الأَوْقَاتِ كَيْ لاَ يَمْنَعُكَ عَنْهَا وُجُودُ التَّسْوِيفِ، وَوَسَّعَ عَلَيْكَ الْوَقْتَ كَيْ تَبْقَى لَكَ حِصَّةُ الاخْتِيَارِ))

**راڤەی وشەکان:**

**قيد:** بەستوویەتەوە، سنووورداری کردووە، کۆت و بەندی کردووە

**بأعيان الأوقات:** بە کاتی دیاریکراو

**وجود التسوف:** بوونی دواخستن

**وسع عليك:** بۆی فراوان کردووی

**حصة الإختيار:** بەشی هەڵبژاردن

**واتا ((عیبادەتەکانی بە کاتی دیاریکراو دیاری کردووە تاکو بوونی حەزی دواخستن ڕێگری نەکات لە ئەنجامدانیان، کاتی بۆ بەرین کردووی تاکو بەشی هەڵبـژاردنت بۆ بمێنێتەوە))**

**شرۆڤە:**

لەم حیکمەتەشدا هێشتا لە ناو باسی عیبادەتەکاندا ماوەتەوە، باس لە دوو نیعمەتی خودا دەکات لە کاتی عیبادەتەکاندا:

**یەکەمیان:** عیبادەتەکانی بە کاتی دیاریکراو دیاریکردووە، نوێژ بە کاتی خۆی و ڕۆژوو بە کاتی خۆی و هەر بەو جۆرە حەج و زەکات، ئەم دیاریکردنە بە کاتی تایبەت بۆ ئەوەیە عیبادەتەکان دوانەخەیت و لەوێوە واز لە ئەنجامدانیان بهێنیت، چونکە سروشتی نەفس تەمبەڵی و دواخستنە تا لەبیری خۆی دەباتەوە.

**دووەم:** نیعمەت ئەوەیە کە ئەو کاتە دیاریکراوە ماوەی بەدەمەوەیە تاکو بەندەکان بتوانن تیایدا کاتی گونجاو هەڵبژێرن بۆ ئەنجامدانی عیبادەتەکان، واتە دیاریکردنی

کاتی عیبادەتەکان ئەوەندە توندی و بەرتەسکییان تێدا نییە مرۆڤ رووبەڕووی حەرەج بکەنەوە، ئەمەش لە رەحمەتی خودایە بە مرۆڤ، لە لایەکەوە رێگە لە تەمبەڵی و خۆڵەتاندن دەگرێت و لە لایەکی ترەوە ماوەی کاتەکە بەرین دەکات بۆ ئەوەی بێزاری و حەرەج بۆ بەندەکانی دروست نەکات، ئەمەش بۆ ئەوەیە بەندەکان باشترین کات بۆ هەڵبژاردنی عیبادەتەکانیان هەڵبژێرن و بەجوانترین شێوە بەندایەتییەکان ئەنجام بدەن.

۞ ۞ ۞

# حیکمەتی سەد و نەوەد و پێنج

((عَلِمَ قِلَّةَ نُهُوضِ الْعِبَادِ إِلَى مُعَامَلَتِهِ فَأَوْجَبَ عَلَيْهِمْ وُجُودَ طَاعَتِهِ فَسَاقَهُمْ إِلَيْهِ بِسَلاَسِلِ الإِيجَابِ، عَجِبَ رَبُّكَ مِنْ قَوْمٍ يُسَاقُونَ إِلَى الْجَنَّةِ بِالسَّلاَسِلِ))

## راڤەی وشەکان:

**قلة:** کەمی

**نهوض العباد:** هەستانی بەندە بە ئەرکەکانیان

**ساقهم:** دەیاننێرێت

**سلاسل الإيجاب:** زنجیری واجبەکان

**واتا ((خودا کەمی هەستانی بەندەکان بە مامەڵە کردنی ئەو دەزانێت بۆیە بوونی گوێڕایەڵی(عیبادەت)ی لەسەر واجب کردوون و بە زنجیری واجبوون بۆ لای خودا ڕەوانەی کردوون، خودا عەجایەبی لە خەڵکانێك دێت بە زنجیر ڕەوانەی بەهەشت دەکرێن))**

## شرۆڤە:

❁ خودا خالقی مرۆڤە و بەئاگایە لە سروشتی دروستکراوەکەی خۆی، ئەو(ﷻ) دەزانێت گەر مرۆڤ خۆی بداتە دەست خۆی ئەوا ئەرکەکانی سەر شانی بەرانبەر بە خودا جێبەجێ ناکات، بەڵکو تەمبەڵی و کەمتەرخەمی کاڵای باڵایەتی، بۆیە خودا گوێڕایەڵی و بەندایەتی لەسەر مرۆڤ واجب کردووە بە تایبەت لە عیبادەتەکاندا، بەڵێنی گەورەی بەوانە داوە واجبەکان جێبەجێ دەکەن و هەڕەشەی لەوانەش کردووە کەمتەرخەمی دەنوێنن.

❁ خودای موتەعال بە زنجیری واجبوون بۆ لای خۆی بەندەکان رادەکێشێت، ئەوان دەیانەوێ بە شوێنکەوتنی حەز و ئارەزووەکان بەرەو دۆزەخ بچن و خوداش بە واجب

کردنی عیبادەتەکان لەسەریان دەیەوێت زنجیریان بکات و بە زۆر ڕەوانەی بەهەشتیان بکات، ئەمە چ سەرسوڕمانێکە! مرۆڤ خۆی لە دەستی خودا ڕادەپسێنێت و دەیەوێت بەرەو دۆزەخ هەڵبێت، خوداش دەیگرێت و زنجیری دەکات بۆ ئەوەی بەرەو دۆزەخ ڕانەکات و دواتر بەو کۆت و زنجیرەوە ڕەوانەی بەهەشتی دەکات، ئەمە نموونەی ئەو ڕەحمەتە بەرینەیە لە ناردنی پێغەمبەراندا(علیهم السلام) دەردەکەوێت، پەیامی خودا لە ڕێگەی پێغەمبەرانەوە(علیهم السلام) بۆ ئەوەیە مرۆڤ ڕوو لە دۆزەخ نەکات، بەڵکو لە ڕێگەی شوێنکەوتنی ئەوانەوە(علیهم السلام) بگەڕێنەوە بۆ ئەو بەهەشتەی خودا بۆیانی ئامادە کردووە.

۞ ۞ ۞

# حیکمەتی سەد و نەوەد و شەش

((أَوْجَبَ عَلَيْكَ وُجُودَ خِدْمَتِهِ، وَمَا أَوْجَبَ عَلَيْكَ إِلاَّ دُخُولَ جَنَّتِهِ))

**راڤەی وشەکان:**

**أوجب:** واجبی کردووە، پێویستی کردووە

**وجود خدمته:** بوونی خزمەت کردنی، عیبادەت کردنی

**واتا ((خودا بوونی خزمەت کردنی (عیبادەت کردنی) لەسەر واجب کردووی، بەڵام (بەو کارەی) تەنها چوونە بەهەشتی لەسەر واجب کردووی))**

**شرۆڤە:**

❁ عیبادەت کردنی بەندەکان بۆ خودا خێر و قازانجەکەی بۆ خۆیان دەگەڕێتەوە، چونکە خودا لە بەندەکانی بێنیازە و عیبادەتی بکەن و نەکەن مەزنی و شکۆمەندی خودا کەم و زیاد ناکات، ئەی بۆ عیبادەتی لەسەر پێویست کردوون لە کاتێکدا خودا لە عیبادەتی ئەوان بێنیازە؟ چونکە کردارە باشەکانی مرۆڤ ڕێگەیەکن بۆ چوونە بەهەشت، لە کرۆك و حەقیقەتدا خودا بەهەشتی لەسەر ئەوان و بۆ ئەوان واجب کردووە، چونکە عیبادەتەکان هۆکارگەلێکن بۆ بەدەستهێنانی بەهەشت﴿وَنُودُوٓاْ أَن تِلۡكُمُ ٱلۡجَنَّةُ أُورِثۡتُمُوهَا بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿٤٣﴾﴾ الأعراف: ٤٣، لە بەهەشتدا بانگ لە ئەهلی بەهەشت دەکرێت: ئەمە ئەو بەهەشتەیە بە میرات بەدەستتان گەیشت بەو کارە باشانەی ئەنجامتان دەدان، کەوابوو خودا لە ڕێگەی واجبکردنی کاری چاك و عیبادەتەوە چوونە بەهەشتی بۆ ئەوان واجب کردووە.

❁ لێرەدا دەبێت بزانین نرخی بەهەشت ئەو کەمە کردارە نییە ئێمە لە تەمەنێکی کورتدا بۆ خودا ئەنجامیان دەدەین، بەڵکو ئەوە بەزەیی خودایە لە مامەڵەکەدا کە نرخی بەهەشتی بۆ بەندەکانی دابەزاندووە تاکو بتوانن بەو کەمە لە کار و کردەوەی باش بیکڕن، خودایە حەمد و سەنا بۆ تۆ، بەڕاستی خودایەکی بە بەزەیی و میهرەبانی.

# حیکمەتی سەد و نەوەد و حەوت

**((مَنِ اسْتَغْرَبَ أَنْ يُنْقِذَهُ اللهُ مِنْ شَهْوَتِهِ وَأَنْ يُخْرِجَهُ مِنْ وُجُودِ غَفْلَتِهِ فَقَدِ اسْتَعْجَزَ الْقُدْرَةَ الإِلَهِيَّةَ {وَكَانَ اللهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ مُّقْتَدِرًا}** الكهف: ٤٥))

## راڤەی وشەکان:

**استغرب:** لەلای سەیر بێت، لەلای نامۆ بێت

**ينقذه:** قوتاری بکات

**استعجز القدرة الإلهية:** دەسەلاّتی خودا بە کەم توانا تەماشا دەکات، دەستەوسانی دەداتە پاڵ دەسەلاّتی خودایی

**واتا ((هەر کەس لای نامۆ بێت خودا لە حەز و ئارەزووەکان قوتاری بکات و لە بوونی بێئاگایی دەریبهێنێت ئەوا ئەو کەسە دەستەوسانی داوەتە پاڵ دەسەلاّتی خودایی "خودا بەسەر هەموو شتێکدا دەسترۆیشت و خاوەن قودرەتە"))**

## شرۆڤە:

ئەم حیکمەتە پڕە لە بەخشینی هیوا بە مرۆڤ، ئەوانەی لە دەریای حەز و ئارەزووەکانی خۆیاندا نوقم بوون و بێئاگایی بووە بە کالاّی بالاّیان لە ناکاو بریسکەیەك لێیان دەدات و بەئاگایان دەهێنێت و دەیانەوێ بۆ لای خودا بگەڕێنەوە و دەست لە حەز و ئارەزووەکان بکێشنەوە، بەلاّم لە نەزانی خۆیانەوە پێیان وایە بە هۆی زۆری گوناه و تاوانەکەی ئەوانەوە خودا ناتوانێت لە ئارەزووەکان قوتاریان بکات و لە بێئاگایی رزگاریان بکات، ئەم کارەیان دانەپاڵی دەستەوسانییە بۆ دەسەلاّتی خودایی، لەم شوێنەدا گوناه و خراپە و تاوانەکانیان زۆر بچووکترە لەو خراپەیەی لە نەناسینی خوداوە بۆیان پەیدابووە، گوناهەکان هەرچەند گەورە بن بە تەوبە دەسڕێنەوە، بەڵکو بە چاکە بۆیان دەگۆڕرێت، بەلاّم دەستەوسانی دانەپاڵ خودا ناتەواوی لە ئیماندا بەرهەم دەهێنێت و هەر ئەوەش

بەسە بۆ ئەوەی لە ناو گوناھ و بێئاگاییدا بمێننەوە، وەك لە فەرموودەی شیریندا هاتووە: ئەگەر مرۆڤ پڕ بە ئاسمانەکان و زەوی گوناھ و خراپە و تاوان ئەنجام بدات دواتر داوای لێخۆش بوون لە خودا بکات خودا لێی خۆشدەبێت و هیچ باکێکی نییە.(٣٠)

۞ ۞ ۞

٣٠ .((عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ يَقُولُ: قَالَ اللهُ تَعَالَى: "يَا ابْنَ آدَمَ إِنَّكَ مَا دَعَوتَنِيْ وَرَجَوتَنِيْ غَفَرْتُ لَكَ عَلَى مَا كَانَ مِنْكَ وَلا أُبَالِيْ، يَا ابْنَ آدَمَ لَو بَلَغَتْ ذُنُوبُكَ عَنَانَ السَّمَاءِ ثُمَّ استَغْفَرْتَنِيْ غَفَرْتُ لَكَ، يَا ابْنَ آدَمَ إِنَّكَ لَو أَتَيْتَنِيْ بِقِرَابِ الأَرْضِ خَطَايَا ثُمَّ لَقِيْتَنِيْ لاتُشْرِك بِيْ شَيْئَاً لأَتَيْتُكَ بِقِرَابِهَا مَغفِرَةً)) رَوَاهُ التِّرْمِذِيُّ وَقَالَ: حَدِيْثٌ حَسَنٌ صَحَيْحٌ.

# حیكمەتی سەد و نەوەد و هەشت

((رُبَّمَا وَرَدَتِ الظُّلَمُ عَلَيْكَ لِيُعَرِّفَكَ قَدْرَ مَا مَنَّ بِهِ عَلَيْكَ))

**راڤەی وشەكان:**

**الظلم:** كۆی "الظلمة"یە بە مانای تاریكی

**من به عليك:** ئەوەی خودا بە هۆیەوە منەتی كردووە لەسەرت

**واتا ((لەوانەیە تاریكی ڕەوانەی سەر دڵت بكات تاكو قەدری ئەو نیعمەتانە بزانیت خودا بە بەخشینیان منەتی كردووە لەسەرت))**

**شرۆڤە:**

سالیكی ڕێگەی خودا هەندێ جار بە هۆی بەردەوامی هاتنی واریداتی ڕەحمانییەوە بۆ سەر دڵی لەبیری دەچێت ئەوانە نیعمەتگەلێكن لە خوداوە بۆ ئەو و پێویستیان بە شوكركردنە، بۆیە جارجارێك خودا واریداتی ڕەحمانی لە بەندەكەی دەگرێتەوە و لە جێگەیدا تاریكی سەرهەڵدەدات، چونكە هەر بە نەبوونی ڕووناكی تاریكی بۆخۆی پەیدا دەبێت، هەر ئەوەندە نووری واریدات لە سالیك بڕا جێگەی لە دڵدا بە تاریكی دەگیرێتەوە، سالیكی ڕێگەی خودا لە هەست كردن بە تاریكی قەدر و حورمەتی نیعمەتی مەزنی واریداتی ڕەحمانی بۆ دەردەكەوێت، تێدەگات مرۆڤ بەخۆیەوە هیچ نییە و ناتوانێت ڕێگەی دروست بۆ لای خودا بگرێتەبەر، تێدەگات ڕۆشنی و ئاشكرایی شتەكان لەلای بەهۆی خۆیەوە نەبووە، ئەوەتە ئێستا بەرپێی خۆیشی نابینێت، شتەكانی بۆ جیاناكرێتەوە، خێر و شەڕی لا تێكەڵ بووە، حەزەكان و ئارەزووەكان شالاوی بۆ دەهێنن، لێرەوە دەكەوێتە نزا و پاڕانەوە و خۆڕادەست كردنەوە بە خودا، نەفسی بۆ خودا گەردنكەچ دەكات و هەوڵ و كۆشش و زانستی خۆی بە كەم تەماشا دەكات و شوكری ئەو نوور و هیدایەتە خوداییە دەكات كە پێیبەخشی بوو، نوور و هیدایەتێك كە لە تاریكستانی دەروونی خۆی قوتاری دەكەن﴿أَوَمَن كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَٰهُ

﴿وَجَعَلۡنَا لَهُۥ نُورٗا يَمۡشِي بِهِۦ فِي ٱلنَّاسِ كَمَن مَّثَلُهُۥ فِي ٱلظُّلُمَٰتِ لَيۡسَ بِخَارِجٖ مِّنۡهَا ﴾الأنعام: ١٢٢، ئايا ئەوەی مردبوو و زیندوومان کردەوە و نووریکمان پێ بەخشی لەناو خەڵکیدا پێیەوە بڕوات وەك نموونەی ئەو کەسە وایە لەناو تاریکستاندا نوقم بووبێت و نەتوانێت لێی بێتە دەرەوە. تەنها خودایە بە بەزەیی خۆی ئەوانەی ئیمانیان بۆ نوسرا لە تاریکستانی بێباوەڕی و گوناهەوە دەردەهێنێت بۆ ڕۆشنایی ئیمان و کرداری چاکە ﴿ٱللَّهُ وَلِيُّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ يُخۡرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ﴾ البقرة: ٢٥٧

# حیکمەتی سەد و نەوەد و نۆ

((مَنْ لَمْ يَعْرِفْ قَدْرَ النِّعَمِ بِوِجْدَانِهَا، عَرَفَهَا بِوُجُودِ فُقْدَانِهَا))

## ڕاڤەی وشەکان:

**قدر النعم:** قەدرزانی نیعمەتەکان

**بوجدانها:** بە بوون و ئامادەبوونی ئەو نیعمەتانە

**فقدانها:** لەدەستدانی نیعمەتەکان

**واتا ((هەر کەس بە ئامادەبوونی نیعمەتەکان قەدرزانیان نەکات، ئەوا بە لەدەستدانیان قەدری نیعمەتەکانی بۆ دەردەکەوێت))**

## شرۆڤە:

۞ ئەم حیکمەتە تەواوکاری حیکمەتەکەی پێشووە، باس لەو حیکمەتە دەکات کە لە گرتنەوەی نیعمەتدایە لەلایەن خوداوە.

۞ ئەم حیکمەتە پێمان دەفەرموێت:: هەر کەس شوکری نیعمەت نەکات و قەدرزانی ئەو نیعمەتە نەکات کە خودا پێی بەخشیوە، ئەوا خودا بە ڕێگەیەکی تر فێری شوکر و قەدرزانی دەکات، ئەوەش ڕێگەی تەمبێکردنییەتی بە وەرگرتنەوەی نیعمەتەکە، هەمیشە ناسین و قەدرزانی لە بەراورد پێکردنی دژەکاندا سەرهەڵدەدات، گەر بە هەمیشەیی دونیا ڕووناك بێت مرۆڤ قەدرزانی خۆر ناکات، گەر هەمیشە لەشساغ و تەندروست بین قەدرزانی تەندروستی ناکات، بۆیە خودا نیعمەتی تەندروستی دەگرێتەوە، هەر ئەوەندە خودا نیعمەتێك بگرێتەوە ڕاستەوخۆ پێچەوانەی ئەو نیعمەتە لە ناخ و ژیانی مرۆڤدا سەرهەڵدەدات، وەك ئەدەبێك لە بەردەم خودادا ناوترێت خودا نەخۆشی خستم، یان خودا هەژاری کردم، چونکە ئەو کارانە ناتەواوییان تێدایە و خوداش ناتەواوی نادرێتە پاڵ کارەکانی، بەڵکو دەبێ بڵێت: خودا نیعمەتی لەشساغی لێگرتمەوە، خودا نیعمەتی دەوڵەمەندی لێ سەندمەوە، چونکە شوکری ئەو نیعمەتانەم

نەكرد، لێرەوە لە قسەكەی ئیبراهیم(عليه السلام) تێدەگەین كە دەفەرموێت:﴿ وَإِذَا مَرِضْتُ فَهُوَ يَشْفِينِ ۝٨٠ ﴾ الشعراء: ٨٠، نەخۆشییەكەی دایە پاڵ خۆی(مَرِضْتُ)، واتە خۆی بكەری نەخۆشییەكەیە، بەڵام ناردنی شیفای دایە پاڵ خودای موتەعال (يَشْفِينِ)، ناردنی شیفا چییە جگە لە گێڕانەوە و پێدانەوەی نیعمەتی تەندروستی.

# حیکمەتی دووسەد

((لاَ تُدْهِشْكَ وَارِدَاتُ النِّعَمِ عَنِ الْقِيامِ بِحُقُوقِ شُكْرِكَ فَإِنَّ ذَلِكَ مِمَّا يَحُطُّ مِنْ وُجُودِ قَدْرِكَ))

**راڤەی وشەکان:**

**لا تدهشك:** سەرسامت نەکات

**يحط:** دایدەبەزێنێت

**قدرك:** حورمەتت

**واتا ((نیعمەتی هاتووی زۆر سەرسامت نەکات لە هەستان بە جێبەجێ کردنی مافی شوکرکردن، چونکە ئەوە بوونی ڕێز و قەدری تۆ لای خودا کەم دەکاتەوە))**

**شرۆڤە:**

❁ زۆری نیعمەتەکان لەسەر مرۆڤ جۆرێك لە سەرسامی دروست دەکات کە دواتر بێئاگای دەکات لە خاوەنی نیعمەتەکە، هەروەك ئەو کەسە هەژارەی کەسێکی دەوڵەمەند پارەیەکی زۆری بۆ ڕەوانە دەکات، ئەوەندە بە پارەکە سەرسام و دڵخۆش دەبێت ئەو کەسەی لەبیر دەچێتەوە پارەکەی بۆ ڕەوانە کردووە.

❁ نیعمەت مافی هەیە لەسەر ئەو کەسەی نیعمەتەکەی بۆ ڕەوانەکراوە، مافەکەش بریتییە لە شوکرکردنی ئەو خودایەی نیعمەتەکەی بۆ ڕەوانە کرد، عاریف کەسێکە بە خاوەن نیعمەتەکە دڵخۆش دەبێت کە یادی ئەوی کردووە و نیعمەتی بۆ ڕەوانە کردووە، نەك بە خودی نیعمەتەکە، هەندێ جار شانازی منداڵ بە خودی شتەکەوە نییە کە بۆی کڕاوە، بەڵکو بەو کەسەوەیە کە بۆی کڕیوە، شتەکەی خۆی دەهێنێت و دەیخاتە ڕوو و دەڵێت-بۆ نموونە- باوکم بۆی کڕیم، ئەو شانازییەکەی بە باوکییەوەیە، نەك بە خودی شتەکەوە، مرۆڤ-هەندێ جار- بەرانبەر بە خودا و نیعمەتەکانی بە قەدەر ئەو منداڵە فام و هەڵوێستی ئەمەکدارانەی نییە.

۞ زۆری نیعمەت هەموو کاتێك بۆ قەدر و حورمەتی کەسەکە ناگەڕێتەوە لەلای خودا، بەڵکو جگە لە تاقیکردنەوە خوداییەکە هەندێ جار کەسەکە بە نیعمەتی زۆر دەکەوێتە ناو داوەوە، نیعمەتەکان دەداتە پاڵ زانست و هەوڵی خۆی و قارون ئاسا دەڵێت بە زانست و لێزانی خۆم بەدەستم هێناوە﴿قَالَ إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلۡمٍ عِندِيٓ ﴾القصص: ٧٨، ئەمەش لە خۆیدا هەڵنانێکە کاتێك دەگاتە لوتکە بەردەبێتەوە و دەچێت بە ناخی زەویدا﴿سَنَسۡتَدۡرِجُهُم مِّنۡ حَيۡثُ لَا يَعۡلَمُونَ ٤٤﴾ القلم: ٤٤، رووبەڕووی هەڵنانیان دەکەینەوە بە جۆرێك کە خۆیان هەستی پێ ناکەن و نایزانن.

۞ ۞ ۞

# حیكمەتی دووسەد و یەك

((تَمَكُّنُ حَلاَوَةِ الْهَوَى مِنَ الْقَلْبِ هُوَ الدَّاءُ الْعُضَالُ))

**راڤەی وشەكان:**

**تمكن:** ریشەداكوتین، جێگیربوون

**حلاوة الهوى:** شیرینی حەز و ئارەزووەكان

**الداء العضال:** دەردێكی سەخت، نەخۆشییەكی كوشندە

**واتا ((جێگیربوون و ریشەداكوتینی حەز و ئارەزووەكان لە دڵدا دەرد و نەخۆشییەكی كوشندەیە))**

**شرۆڤە:**

❁ دڵ جێگەی ئیمان و یەقینە، ئەو شوێنەیە بە خۆشەویستی و ئیخلاص و رازیبوون و تەوەكول لێوانلێو دەبێت، كاتێك ئیمان لە دڵدا كز و لاواز بوو ئەوا جێگەی ئەو سیفەتە بەرز و بالاَنە بە حەز و ئارەزوو دەگیرێتەوە، ئیتر ئەو دڵە دەبێت بە قەلاَیەكی داگیركراو لەلایەن سەربازەكانی نەفسەوە، بۆیە پڕ دەبێت لە هەڵپە و رق و كینە و حەزی گوناه و ئارەزووی شەیتانی، سەرەتای ئەم دۆخە ئەگەری چارەسەری هەیە، بەلاَم بەپێی تێپەڕینی كات حەز و ئارەزوەكان دەسەلاَتی زۆرتر و زۆرتر بەسەر قەلاَی دڵدا پەیدا دەكەن تا رادەی جێگیربوون و ریشەداكوتان، لەو رۆژەوە دڵ ئومێدی رزگاربوونی زۆر كەم دەبێتەوە، مەگەر بە بروسكەیەكی خودایی سەرجەم سەربازەكانی نەفس لاواز بكات و هێزێك بە بەردا دڵدا بكاتەوە، ئەگینا ئەو مرۆڤە دەردەكەی كوشندە و سەخت و بێ دەرمانە و تیاچوونی زۆر نزیكە، خودا من و ئێوەش بپارێزێ و هێز و سەربازانی دڵمان لەبەردەم حەز و ئارەزوودا بەهێز بكات..آمین..

❁ لە بنچینەدا گوناه و حەزوئارەزوو ژەهرێكی تاڵی كوشندەیە، ئەگەر دڵ زیندەگی تێدا بێت كاتێك كەسەكە گوناه دەكات هەست بەو تاڵییە دەكات، قۆناغێكی تر لە

گوناه ئەوەیە هەست کردن بە تاڵی گوناه لەلای کەسەکە نامێنێت، قۆناغی سێیەمی گوناه ئەوەیە تاڵی گوناهی لێ دەبێت بە شیرینی، هەروەك ئەو مرۆڤە مەیخۆرەی لە سەرەتاوە ئارەق بە دەمی تاڵە و پاش ماوەیەك لەلای خۆش و شیرین دەبێت.

# حیكمەتی دووسەد و دوو

((لاَ يُخْرِجُ الشَّهْوَةَ مِنَ الْقَلْبِ إِلاَّ خَوْفٌ مُزْعِجٌ، أَوْ شَوْقٌ مُقْلِقٌ))

## راڤەی وشەكان:

**خوف مزعج:** ترسێكی بێزاركەر

**شوق مقلق:** شەوقێكی نیگەرانكەر

**واتا ((دوو شت حەز و ئارەزووەكان لە دڵ دەردەكەن: ترسێكی بێزاركەر، یـان شەوقێكی نیگەرانكەر))**

## شرۆڤە:

پێشتر وتمان ئەوەی دەگاتە هانای ئەو دڵە -كە حەز و ئارەزووەكان دەسەڵاتیان بەسەردا پەیداكردووە- بریسكەیەكە لە خوداوە، ئەو بریسكەیە ئیبن عەتا-لەم حیكمەتەدا- بە دوو شت لێكیدەداتەوە: **یەكەمیان**، ترسێكی بێزاركەرە بە بینینی ئایەتێك لە ئایەتەكانی جەلالی خودا كە ترس و هەژان دەخەنە ناخی مرۆڤەوە، لەو ئایەتانە: ئەو هەڕەشە و سزا بڕاوانەیە كە خودا لە قورئاندا بەیانی كردوون بۆ ئەوانەی لە خودا یاخی دەبن، **دووەم** بینینی ئایەتێك لە ئایەتەكانی جەمال كە شەوق و تامەزرۆیی بۆ بەهەشت و نیعمەتەكانی و رازیبوونی خودا لە دڵدا پەیدا دەكات، نموونەی ئەمەش كۆی ئەو ئایەتانەیە باس لە سەرئەنجامی ئیمان و ئیمانداران دەكات، یەكێك لەم دوو بریسكەیە كەسەكە وا لێدەكات دەست لە گوناه بكێشێتەوە و لە حەز و ئارەزووەكان دوور بكەوێتەوە و جارێكی تر عافییەت و تەندروستی بۆ دڵ بگەڕێتەوە.

## حیكمەتی دووسەد و سێ

**((كَمَا لاَ يُحِبُّ الْعَمَلَ الْمُشْتَرَكَ كَذَلِكَ لاَ يُحِبُّ الْقَلْبَ الْمُشْتَرَكَ، الْعَمَلُ الْمُشْتَرَكُ لاَ يَقْبَلُهُ، وَالْقَلْبُ الْمُشْتَرَكُ لاَ يُقْبِلُ عَلَيْهِ))**

### راڤەی وشەكان:

**العمل المشترك:** كاری هاوبەش

**لا یقبله:** قبووڵی ناكات

**لا یقبل علیه:** ڕووی تێناكات

**واتا ((وەك چۆن كاری هاوبەشی خۆشناوێت دڵی دابەشبووی خۆشناوێت، كاری هاوبەشی قبووڵ نییە و دڵی هاوبەشیش ڕوو لـە خودا ناكات))**

### شرۆڤە:

كارێك بەشی خەڵكی لێدرابێت بە ریاكردن -با بەشی خوداشی تێدا بێت- خودا خۆشی ناوێت و قبووڵی ناكات، چونكە كەسی كاركەر خەڵكی كردووە بە شەریكی خودا، لێرەوەیە فوزەیلی كوڕی عەیاز دەفەرموێت:((وازهێنان لە كاری چاكە-لە ترسی ریا- بۆخۆی ریایە، كاركردن لە پێناوی خەڵكیدا هاوەڵدانانە بۆ خودا))، خودای موتەعال تەنها كارێك قبووڵ دەكات كە: **یەكەم:** ئیخلاصی تێدابێت و تەنها بۆ ئەو ئەنجام درابێت، واتە بەشی كەسی تری لێ نەدرابێت، **دووەم:** شوێنكەوتنی پێغەمبەری خودای(ﷺ) تێدا بێت و ئەنجامدانی لە حەز و ئارەزووەوە نەبێت، دڵیش هەروەك كردار وایە، ئەگەر دڵێك خۆشەویستی دونیا و حەز و ئارەزووەكان تیایدا ریشەی داكوتابێت با خۆشەویستی خوداشی تێدا بێت خودا ئەو دڵەی خۆشناوێت، چونكە دابەش بووە لە نێوان خودا و دونیادا، دڵێك ئەمە حاڵی بێت ڕوو لە خودا ناكات و سەفەری بەرەو لای خودا ناگرێتە بەر، تەنها دڵێكی پاكی بێگەرد ڕوو لە خودا دەكات و بە شەوق و تامەزرۆییەوە بەرەو لای ئەو(ﷻ) هەنگاوەكانی هەڵدەگرێت.

# حیکمەتی دووسەد و چوار

((أَنْوَارٌ أَذِنَ لَهَا فِي الْوُصُولِ، وَأَنْوَارٌ أَذِنَ لَهَا فِي الدُّخُولِ))

**راڤەی وشەکان:**

**أذن لها في الوصول:** مۆڵەتی گەیشتنی پێدەدات

**أذن لها في الدخول:** مۆڵەتی چوونە ژوورەوەی پێدەدات

**واتا ((شەپۆلێکی نوور کە خودا مۆڵەتی گەیشتن بە دڵی بەندەی پێ دەدات، لەگەڵ شەپۆلێکی نوور کە مۆڵەتی چوونە ژوورەوەی ناو دڵی پێ دەدات))**

**شرۆڤە:**

❁ هەتا هاتنی نوور بوونی هەبێت دڵی کەسەکە لە سەلامەتی و تەندروستی و عافییەتدایە، نەخۆشی و دەردی دڵ لە نەبوونی نووردایە، چونکە هەر ئەوەندە نیعمەتی نوور لەو دڵە گیرایەوە شاڵاوی تاریکی پەلاماری دەدات.

❁ **نوورەکان دوو جۆرن:** **نوورێکیان** مۆڵەتی هاتن و گەیشتنیان بە دەرەوەی دڵ پێ دەدرێت، بەڵام رێگە بە چوونە ژوورەوەی نادرێت، بوونی ئەم نوورە خاوەنەکەی وا لێدەکات خۆشەویستی بۆ خودا و پێغەمبەر(ﷺ) و ئاینی ئیسلام هەبێت و بە واجبەکان هەڵبستێت و لە حەرامەکان خۆی دوور بخاتەوە، ئەم کەسە-لەگەڵ عیبادەت و کاری چاکە و خۆپاراستن لە حەرام- بەشی خۆی لە دونیا دەست بۆ دەبات و سەرقاڵی ژیانی خۆ و ماڵ و منداڵ دەبێت، **نووری دووەم،** ئەو نوورەیە خودا مۆڵەتی چوونە ناو دڵی پێ دەدات، قوڵایی دڵ رۆشن دەکاتەوە و گەردیلەکانی ناخی نوورانی دەکات، خاوەنی ئەم نوورە کۆچ لە دونیا دەکات و حەز و ئارەزووەکانی بەجێدەهێڵێ و بۆ خودا یەکلادەبێتەوە و دەکەوێتە ناو گەردەشی رۆح و سەفەری بەرەو خوداچوونەوە، نووری داخڵ بوو بە دڵ رێگەیەك بۆ خۆشەویستی شتەکانی تر ناهێڵێتەوە، خودا دەکات بە خۆشەویستی خۆی و لە خۆشەویستی ئەوەوە(ﷻ) دەست بۆ شتە پێویستەکان دەبات.

# حیكمەتی دووسەد و پێنج

((رُبَّمَا وَرَدَتْ عَلَيْكَ الأَنْوَارُ فَوَجَدَتِ الْقَلْبَ مَحْشُوًّا بِصُوَرِ الآثَارِ فَارْتَحَلَتْ مِنْ حَيْثُ نَزَلَتْ))

**راڤەی وشەكان:**

**محشوا:** ناواخن نرابێت

**صور الآثار:** وێنەی ئاسەوار(دونیا و ئەوەی تێیدایە)

**فارتحلت:** کۆچ بکات

**واتا ((لەوانەیە شەپۆلێکی نوور داباریتە سەرت، ببینێت دڵت بە وێنەی ئاسەوار ناواخن نراوە، بۆیە وەك چۆن دابەزیوە ئاواش کۆچ بکات))**

**شرۆڤە:**

❁ لێرەدا ئیبن عەتا باس لە جۆری سێیەمی نوور دەکات، دەفەرموێ: نوورێکە دادەبارێت بۆ سەرت، بەڵام نەیارەکانی دڵ رێگە نادەن بگاتە دەرەوە یان ناوەوەی دڵ، بۆیە لە کوێوە هاتووە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو شوێنە.

❁ نەیارەکانی نوور-وەك پێشتریش ئاماژەی پێدا- حەز و ئارەزووە دونیاییەکانە، بە تایبەت حەز و ئارەزوویەك خاوەنەکەی هەڵنابێت بۆ هەڵپە و لەواڕاندنی نەفس و ئەنجامدانی گوناه، ئەم دۆخە بۆ کەسەکە تاریکییەك بەرهەم دەهێنێت کە نوور و رۆشنایی بەرپەرچ دەداتەوە، دیواری حەزەکانی ئەوەندە ئەستوور دەبێت نوور ناتوانێت بە ناویدا گوزەر بکات.

❁ جیاوازی ئەم کەسانە لەگەڵ ئەو کەسەی لە حیکمەتی پێشوودا ئاماژەی پێکرد کە نوور دەگاتە سەر دڵی و ناچێتە ناو دڵییەوە ئەوەیە کە: کەسی پێشووتر حەزەکان جەستەیان رەنگ نەکردووە بە رەشی گوناه، تەنها حەزێکە و لەلای خاوەنەکەیەوە

دەستی بەسەردا گیراوە و ناهێڵێت تاوان و گوناهی پێ ئەنجام بدات، بەڵاّم ئەم کەسەی کە لەم حیکمەتەدا ئاماژەی پێ دەکرێت کەسێکە جەستەی بە حەزەکان پڕ بووە، هەوەس لەغاوی کردووە و لە هەر شوێنێك لەوەڕی گوناه هەبێت نەفسی روو تێدەکات و دەیلەوەڕێنێت.

۞ دڵێك کە پڕ بووبێت بە وێنەی حەزی جۆراوجۆر ئەو دڵە تەنها لە حەزدا رانەوەستاوە، بەڵکو لە رێگەی جەستە و هەستەکانییەوە کەوتۆتە پیادەکردنی حەزەکانی، لەو حەزانە: حەزی داوێن و حەزی ماڵ و دونیا و حەزی دەسەڵاّت، خراپترین حەز بریتییە لە حەزی دەسەڵاّت، عاریفان دەڵێن(دواین حەزێك صدیقین رزگاریان دەبێت لە دەستی خۆشەویستی دەسەڵاّت و پلە و پایەیە)، هیچ رێبوارێکی رێگەی خودا پێ نانێتە مەقامی صدیقییەت تا خۆشەویستی پلە و پایە واز لێ نەهێنێت.

۞ نووری خودا بە هەمیشەیی و بۆ هەموو کەسێك بوونی هەیە، بەڵاّم کێن ئەوانەی ئاوێنەی دڵیان خاوێن کردۆتەوە تاکو نووری هاتووی لەسەر بشکێتەوە؟! نووری خودایی وەك تیشکی خۆر وایە، خۆر لە باوەڕدار و بێباوەڕ هەڵدێت، بەسەر هەموو دونیادا پەخش دەبێتەوە، بەڵاّم گوناهی خۆر چییە شەمشەمەکوێرە خۆی لە ئەشکەوت و تاریکی دەنێت بۆ ئەوەی تیشکی خۆر لێی نەدات؟!

۞ ۞ ۞

# حیکمەتی دووسەد و شەش

((فَرِّغْ قَلْبَكَ مِنَ الأَغْيَارِ يَمْلأْهُ بِالْمَعَارِفِ وَالأَسْرَارِ))

**راڤەی وشەکان:**

**فرغ:** خاڵی بکەرەوە

**الأغيار:** کۆی "**غير**"ە بە مانای نەیار

**المعارف:** کۆی"**المعرفة**"یە بە مانای زانست و مەعریفەت

**الأسرار:** کۆی "**السر**" واتە نهێنی

**واتا ((دڵت خاڵی بکەرەوە لە نەیار، خودا پڕی دەکات لە زانست و مەعریفە و ئەسرار))**

**شرۆڤە:**

ئەم حیکمەتە تەواوکاری حیکمەتەکەی پێشووە، پێمان دەفەرموێت:: هەتا نەیار لە دڵی مرۆڤدا بوونی هەبێت نووری خودا رووی تێناکات، نەیار-وەك پێشتریش بە "حەز و ئارەزوو" و "وێنەی ئاسەوار" ناوی هێنا بریتییە لە هەر شتێك کێبەرکێ خۆشەویستی خودا بکات لە دونیا و دەسەڵات.

نووری هاتوو بۆ سەر دڵ دوو مانا (دوو رۆح) بە دڵ دەگەیەنێت:

**یەکەمیان: زانست** و **مەعریفەت(المعارف):** زانست و مەعریفەت لەم شوێنەدا زانست و مەعریفەتی کەسبی و زەینی نییە، ئەوەی ئێمە ناومان ناوە "زانست و مەعریفەت" لای ئیمامی غەزالی لە کتێبی "**إحياء علوم الدين**"دا بە هونەر(**فنون**) ناودەبرێن، چونکە هەموو کەسێك-باوەڕدار و بێباوەڕ- دەتوانن فێری بن، زانست(علوم) لای ئیمامی غەزالی ئەم زانستەیە کە ئیبن عەتا ئاماژەی پێ دەکات، ئەمەش بریتییە لە زانستی ناسینی خۆ و ناسینی خودا.

**دووەمیان: بریتییە لە پەردە لادان لەسەر نهێنییەکانی پەنهان**، جیهانی مەلەکوت کە سەر بە جیهانی ئەمرە لێوانلێوە بە نهێنی، کاتێك دڵ دەگاتە ئاستێکی باڵا لە ئیمان دڵۆپێك لەو دەریای ئەسرارە دادەبارێتە سەر دڵ و تۆفانێك لە نهێنی پەیپێبراو بۆ کەسەکە دەخولقێنێت، خودای موتەعال مەلەکوتی نیشانی ئیبراهیم(ﷺ) دەدات تاکو یەقینی زانستیی ئەو(ﷺ) بگۆڕێت بە یەقینێکی شهودی و بینراو﴿ وَكَذَٰلِكَ نُرِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ مَلَكُوتَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَلِيَكُونَ مِنَ ٱلۡمُوقِنِينَ ﴿٧٥﴾ ﴾ الأنعام: ٧٥، خودای موتەعال فەرمانی بە مرۆڤ کردووە تێڕامان بکات لە مەلەکوت تاکو بگات بەو ئیمانە شهودییە﴿ أَوَلَمۡ يَنظُرُواْ فِي مَلَكُوتِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا خَلَقَ ٱللَّهُ مِن شَيۡءٖ وَأَنۡ عَسَىٰٓ أَن يَكُونَ قَدِ ٱقۡتَرَبَ أَجَلُهُمۡ ﴿١٨٥﴾ ﴾ الأعراف: ١٨٥، ئاماژەیەکی ورد لەم ئایەتە بوونی هەیە کە دەربڕینی سەخت و دژوارە و لەم چاخ و سەردەمەی ئێمەدا لەوانەیە هێشتا زوو بێت بۆ تێگەیشتنی دروست و تەواو لە ئایەتە پیرۆزەکە، هەر ئەوەندە دەڵێم: تێڕامان لە مەلەکوت مرۆڤ بە کۆمەڵێك نهێنی مەزن دەگەیەنێت، **دیارە مەلەکوت جیایە لە مولك**، **مەلەکوت** سەر بە جیهانی ئەمرە و **مولك** سەر بە جیهانی خەلقە﴿ أَلَا لَهُ ٱلۡخَلۡقُ وَٱلۡأَمۡرُ ﴾ الأعراف: ٥٤

۞ ۞ ۞

# حیکمەتی دووسەد و حەوت

((لاَ تَسْتَبْطِئْ مِنْهُ النَّوَالَ، وَلَكِنْ اسْتَبْطِئْ مِنْ نَفْسِكَ وُجُودَ الإِقْبَالِ))

## راڤەی وشەکان:

**لا تستبطيء:** بە خاو و هێواشی مەزانە، بە دواکەوتووی مەزانە

**النوال:** بەخشش

**وجود الإقبال:** بوونی رووتێکردن

**واتا ((هاتنی بەخششی خودایی بۆ خۆت بە خاو و هێواش مەزانە، بەڵکو بوونی روو تێکردنت لە خودا بە خاو و هێواش تەماشا بکە))**

## شرۆڤە:

❁ هەندێ جار مورید زیاد لە ئەندازەی کۆششی خۆی لە پەروەردگار داوا دەکات، ئەو دەیەوێت بە کار و کۆششێکی کەم زۆرترین دەرگای رەحمەت بە روویدا بکرێتەوە، ئەمە لە خۆیدا جۆرێك لە نەزانی تێدایە، هاوڕێ لەگەڵ جۆرێك لە کەم ئەدەبی لە خزمەتی خودادا، ئەو دەیەوێت بە کردارە کەموکورتەکانی لەسەر شتە مەزنەکان مامەڵە لەگەڵ خودادا بکات، هاتنی بەخششە خوداییەکان یاسا و رێسای تایبەت بە خۆیان هەیە، لە جێگەی ئەوەی سالیك ناردنی بەخششەکان بە هێواشی و خاویی تۆمەتبار بکات با روو لە نەفسی خۆی بکات و بزانێت چەندە بە گەرمی و گەشی و لێبڕانەوە رووی لە خودا کردووە، خاوی و هێواشی هاتنی بەخشش و نیعمەتەکان بۆ خاوی و هێواشی ئەو دەگەڕێتەوە، گەر دەیەوێت بەخششەکانی خودا بۆ ئەو خێراتر بن با خێراتر و گەرم و گەشتر روو لە پەروەردگاری بکات، بەخششەکانی خودا بۆ بەندەکەی بەرێوەن، بەڵام لەبەر ئەوەی بەندەکە وەستاوە یان خاو دەجوڵێتەوە بەخششەکانیش درەنگ دەگەنە بەرەوە، گەر بەندە بە خێرایی بەرەو خودا بڕوات گومانی تێدا نییە زووتر بە بەخششەکان دەگات، بەڵام دەبێ بەگەڕکەوتنی خێرایی بۆ بەخششەکان نەبێت، بەڵکو بۆ نزیکبوونەوە

بێت لە پەروەردگاری، ئیتر لەسەر ڕێگە دەگات بە بەخششەکان یان ناگات ئەو لە سەفەری خۆی بەردەوامە.

❁ هەندێ مورید کاروکردەوەی کەمەو بەخششەکانی خودا بۆ ئەو زۆرن، بەپێچەوانەوە موریدێك کار و کردەوەی زۆری هەیە و بەخششەکان بۆی کەمن، ئەم حاڵەتە بۆ کاری دڵی دوو کەسەکە دەگەڕێتەوە، **ئەوەی یەکەمیان** ڕاستە لە دەرەوە کار و کردەوەی کەمی هەیە، بەڵام کاری دڵی زۆر مەزنە، **ئەمەی دووەمیان** بە پێچەوانەوە، ئەوە کاری دڵ پیت و فەڕ دەخاتە ناو کار و کردەوەکانە، ئەو کارەی بە ئیخلاصی تەواو و خۆشەویستییەوە ئەنجام بدرێت سەد بەرانبەری ئەو کارەیە بە تەمبەڵی و بێزارییەوە ئەنجام دەدرێت.

❁ ❁ ❁

# حیكمەتی دووسەد و هەشت

**((حُقُوقٌ فِي الأَوْقَاتِ يُمْكِنُ قَضَاؤُهَا، وَحُقُوقُ الأَوْقَاتِ لاَ يُمْكِنُ قَضَاؤُهَا، إِذْ مَا مِنْ وَقْتٍ يَرِدُ إِلاَّ وَلِلّٰهِ عَلَيْكَ فِيهِ حَقٌّ جَدِيدٌ، وَأَمْرٌ أَكِيدٌ، فَكَيْفَ تَقْضِي فِيهِ حَقَّ غَيْرِهِ وَأَنْتَ لَمْ تَقْضِ حَقَّ اللهِ فِيهِ؟))**

**راڤەی وشەكان:**

**حقوق في الأوقات:** كۆمەڵە مافێك لەناو كاتدا

**حقوق الأوقات:** مافی كاتەكان

**قضاؤها:** قەزاكردنەوەی، باربووكردنەوەی

**يرد:** دێت، رووی لیٚ دەكات

**أمر أكيد:** كارێكی پیٚ لەسەرداگیرا

**واتا ((كۆمەڵە مافێك هەیە لەناو كاتدایە و دەتوانریٚ قەزابكرێنەوە، بەلاٚم ناتوانرێت مافی كاتەكان قەزا بكرێتەوە، چونكە هەركاتێك كە دێت خودا مافێكی نویٚ و ئەمرێكی پیٚ لەسەرداگیراوی لەناویدا هەیە و دەبێت رایپەڕێنیت، ئیتر چۆن دەتوانی مافی خەڵكانی تری تێدا جێبەجیٚ بكەیت لە كاتێكدا تۆ نەتوانیوە مافی خودای تێدا جێبەجیٚ بكەیت؟!))**

**شرۆڤە:**

لەم حیكمەتەدا ئیبن عەتا باس لەو كارانە دەكات لەناو كاتدا ئەنجام دەدرێن، واتە ئەو كارانەی بە كاتەوە گرێدراون، وەك نوێژەكان لە پێنج كاتی شەو و رۆژدا، هەروەها رۆژووگرتن لە مانگی رەمەزاندا، حەجكردن لە مەوسیمی حەجدا، هەر بەو جۆرە دەركردنی زەكات ساڵێك یەك جار، ئەم كارانە(عیبادەتانە) گەر بەهۆی نەخۆشی یان تەمبەڵی، یان لەبیرچوونەوە نەتوانرا لە كاتی خۆیاندا جێبەجیٚ بكرێن ئەوا دەتوانریٚ

قەزا بکرێنەوە، ئەمە جۆری یەکەم کە بریتی بوو لە "مافی کار لەناو کاتدا"، جۆرێکی تر لە ماف هەیە ئەویش "مافی کاتە لە کاردا"، واتە هەر کاتێك کە روو لە مرۆڤ دەکات جۆرێك لەکار بۆ خودا لەسەر کەسەکە پێویست دەکات، ئەو کارە بریتییە لە مافی ئەو کاتە کە رووی تێکردووی، ئەمەش بریتییە لە مافی ئەو دۆخ و بارەی بەسەر تۆدا گوزەر دەکات، بۆ نموونە: گەر لەباری نیعمەتدای ئەوا مافی کات بریتییە لە شوکرکردن، گەر لە دۆخی بەلاٌ و ناخۆشیدای مافی کات بریتییە لە ئارامگرتن و بەدڵ گەڕانەوە بۆ لای خودا، ئەم جۆرە مافانە ناتوانرێت قەزا بکرێنەوە، چونکە بارێکە تێپەدەکەویت و پاش ماوەیەك لێی دێیە دەرەوە و بارێکی تر رووت لێ دەکات و ئەویش دیسان مافی تایبەت بە خۆی هەیە، ئەبولعەباسی مورسی دەفەرموێت: ((کاتەکانی بەندە چوارن و پێنجەمیان نییە: نیعمەت و بەلاٌ و گوێڕایەڵی و یاخیبوون، لە هەر یەکێك لەمانەدا بەشی بەندایەتی بۆ خودا لەسەرت پێویست کراوە و بە داوای پەروەردگاریی خودا داوات لێ کراوە، هەرکەس کاتەکەی گوێڕایەڵی بوو ئەوا بینینی منەتی خودا لەسەر ئەو کە هیدایەتی داوە بۆ ئەو کارە چاکە پێویستە، هەر کەس کاتەکەی یاخیبوون و گوناه کردن بوو ئەوا لەو کاتەدا داوای تەوبە و پەشیمانی و ئیستیغفاری لێ دەکرێت و پێویستە لەسەری ئەنجامی بدات، هەر کەس کاتەکەی نیعمەت بوو ئەوا شوکرکردن لەو کاتەدا پێویست کراوە، شوکریش بریتییە لە خۆشحاڵی دڵ بە خوداوە، هەر کەس کاتەکەی بەلاٌ و ناخۆشی بوو ئەوا رازیبوون بە قەزای خودایی و ئارامگرتنی لەسەر پێویست کراوە))، لە فەرموودەیەکی بەرزکراوەدا هاتووە: ((هەر کەس تووشی بەلاٌ بوو و ئارامی گرت، پێی بەخشرا و شوکری کرد، ستەمی لێکرا و لێبووردە بوو، ستەمی کرد و داوای لێخۆشبوونی کرد، پاشان شوکری کرد))، لێرەدا پێغەمبەر(ﷺ) بێدەنگ بوو، وتیان: چی بۆ ئەو کەسە هەیە ئەی پێغەمبەری خودا؟ فەرمووی: ((**"أُولَئِكَ لَهُمُ الأَمْنُ وَهُمْ مُهْتَدُونَ**-ئەوانە ئەمن و ئاسایشیان بۆ هەیە و لەسەر رێگەی هیدایەتن)).(٣١)

---

٣١ ((قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنِ ابْتُلِيَ فَصَبَرَ، وَأُعْطِيَ فَشَكَرَ، وظُلِمَ فَغَفَرَ، وظَلَمَ فاستغفر، ثُمَّ شَكَرَ، ثُمَّ سَكَتَ، قَالُوا: مَا لَهُ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: "أُولَئِكَ لَهُمُ الأَمْنُ وَهُمْ مُهْتَدُونَ)).

# حیکمەتی دووسەد و نۆ

((مَا فَاتَ مِنْ عُمْرِكَ لاَ عِوَضَ لَهُ، وَمَا حَصَلَ لَكَ مِنْهُ لاَ قِيمَةَ لَهُ))

## راڤەی وشەکان:

**فات:** لەدەستت چوو

**لا عوض له:** تەعویز ناکرێتەوە، باربوو ناکرێتەوە

**حصل لك منه:** ئەوەی لێیەوە بەدەستت هێناوە

**واتا ((ئەوەی لە تەمەنت لەدەستچوو باربوو ناکرێتەوە، ئەوەش کە لێیەوە بەدەستت هێناوە بەها و نرخێك نایگاتێ))**

## شرۆڤە:

❁ هەر چرکەیەکی تەمەن گوزەر دەکات و تیایدا مرۆڤ ناتوانێت کارێکی چاکە ئەنجام بدات ئەو بەشە لە تەمەن تیاچووە و بە هیچ جۆرێك تەعویز ناکرێتەوە، چونکە هەر کارێکی تر بۆ تەعویز کردنەوە ئەنجام بدەی لە بەشێکی تری تەمەندا ئەنجامی دەدەی کە دەبێت بەو ئەندازەیە کاری چاکەی تێدا ئەنجام بدەی، بۆیە باربووکردنەوەی تەمەن-بە تێڕوانینی ئیبن عەتا- بوونی نییە.

❁ ئەوەش کە لە تەمەن بەرهەمی دەهێنی و کاری چاکەی تێدا ئەنجام دەدەی هیچ بەها و نرخێکی ناگاتێ، واتە ئەوەندە مەزنە بە بەها و نرخ ناپێورێت.

❁ تەنها ئەوانەی دەد نرخی ژیان و تەمەنیان بۆ دەردەکەوێت، ئەگەر چاکەکارە و لە پێناوی خودادا شەهید بووە داوا لە خودا دەکات جارێکی بیگێڕێتەوە بۆ ژیانی دونیا تاکو کاروکردەوەی زۆرتر و زیاتر بکات و جارێکی تر رۆحی خۆی بەخودا ببەخشێتەوە ﴿ وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًۢا ۚ بَلْ أَحْيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ ﴿١٦٩﴾ فَرِحِينَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ وَيَسْتَبْشِرُونَ بِٱلَّذِينَ لَمْ يَلْحَقُوا۟ بِهِم مِّنْ خَلْفِهِمْ أَلَّا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ

﴿يَحۡزَنُونَ ﴿١٧٠﴾ يَسۡتَبۡشِرُونَ بِنِعۡمَةٖ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَضۡلٖ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجۡرَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿١٧١﴾﴾ آل عمران: ١٦٩–١٧١، شەهیدەکانی بەدر داوایان لە خودا کرد بیانگێڕێتەوە بۆ ژیانی دونیا تاکو جارێکی تر شەهید ببنەوە، بەڵام ئەوە بڕیاری خودایە و کەس ناگەڕێتەوە بۆ سەر زەوی، بۆیە داوایان لە خودا کرد مژدە بدەن بەوانەی دوای ئەوان کە خودا فەزڵ و ڕێز و نیعمەتێکی بەوان بەخشیوە (وَيَسۡتَبۡشِرُونَ بِٱلَّذِينَ لَمۡ يَلۡحَقُواْ بِهِم)، گەر کەسەکە خراپەکار بێت ئەویش داوای گەڕانەوە دەکات و دەڵێت خودایە بمگێڕەوە تاکو کاری چاکە ئەنجام بدەم، بەڵام خودا پێی دەفەرموێ: بێدەنگ بە، ئەوە تەنها قسەیەکە و هەتا ڕۆژی زیندووبوونەوە پەردەیەك دەکەوێتە نێوان ئەوان و گەڕانەوە بۆ ژیانی دونیا ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَهُمُ ٱلۡمَوۡتُ قَالَ رَبِّ ٱرۡجِعُونِ ﴿٩٩﴾ لَعَلِّيٓ أَعۡمَلُ صَٰلِحٗا فِيمَا تَرَكۡتُۚ كَلَّآۚ إِنَّهَا كَلِمَةٌ هُوَ قَآئِلُهَاۖ وَمِن وَرَآئِهِم بَرۡزَخٌ إِلَىٰ يَوۡمِ يُبۡعَثُونَ ﴿١٠٠﴾﴾ المؤمنون: ٩٩–١٠٠

# حیکمەتی دووسەد و دە

((مَا أَحْبَبْتَ شَيْئًا إِلاَّ كُنْتَ لَهُ عَبْدًا، وَهُوَ لاَ يُحِبُّ أَنْ تَكُونَ لِغَيْرِهِ عَبْدًا))

## ڕاڤەی وشەکان:

**ما أحببت شيئا:** شتێکت خۆش نەویستووە

**كنت له عبدا:** بوویت بە بەندەی ئەو شتە

**واتا ((هەر شتێکت خۆشویست بووی بە بەندەی ئەو شتە، خوداش پێیخۆش نییە ببیت بە بەندەی هیچ کەسێك جگە لە خۆی))**

## شرۆڤە:

❁ لەم حیکمەتەدا باس لە خۆشەویستی بەندە دەکات بۆ خودا و شتەکانی تر: لای ئیبن عەتا خۆشەویستی بەندایەتی کردنە، مرۆڤ هەر شتێکی خۆشویست واتە بەندایەتی بۆ ئەو شتە دەکات، چونکە ئەسڵی بەنایەتی بریتییە لە "خۆشەویستی تێکەڵ بە ترس بۆ کەسی پەرستراو"، بۆیە خۆشەویستی یان بۆ خودایە و مرۆڤ بە هۆیەوە خودا دەپەرستێت یان بۆ غەیری خودایە و مرۆڤ تیایدا شتەکانی کردووە بە مەعبوودی خۆی، لە فەرموودەیەکی سەحیحدا پێغەمبەر(ﷺ) دەفەموێت **(تعس عبد الدينار وعبد الدرهم وعبد الخميصة**- تیابچێت بەندەی دینارو بەندەی درهەم و بەندەی پۆشاکی سوور و ڕەش)[٣٢]، کەوابوو بۆی هەیە مرۆڤ ببێت بە بەندەی درهەم و دینار و پۆشاك و جلوبەرگ.

❁ ئایا خۆشەویستی پێغەمبەر(ﷺ) و چاکان کام خۆشەویستییە؟ هەر کەس و شتێکت لەبەر خودا خۆشویست ئەو خۆشەویستییە پەسەندە و مرۆڤ لەسەری پاداشت وەردەگرێت، چونکە بەشێکە لە خۆشەویستی خودا، بەڵام خۆشەویستی هەر کەس و هەر

٣٢ (تعس عبد الدينار وعبد الدرهم وعبد الخميصة)رواه البخاري ومسلم.

شتێك له پێناوی خۆ و بەرژەوەندی خۆدا بێت ئەو خۆشەویستییە ناپەسەندە و مرۆڤ دەکاتە کۆیلەی خۆی.

❁ خۆشەویستییەکی فیتری و خۆڕسك له مرۆڤدا بۆ منداڵ و نەوە بوونی هەیە، ئەم خۆشەویستییە رەحم و بەزەییە و خودا لە ناخی مرۆڤدا دایناوە، بەخشینی ئەم خۆشەویستییە لە سنووری خۆیدا دیسان پەسەندەو مرۆڤ لەسەری پاداشت وەردەگرێت، بەلاّم چ خۆشەویستی پێغەمبەر(ﷺ) کە لە نەفس و ماڵ و دونیا و منداڵ خۆشەویستترە و چ خۆشەویستی چاکان و منداڵ و نەوە نابێت ململانێی خۆشەویستی خودا بکەن، خۆشەویستی ئەو(ﷻ) لەسەرو هەموو خۆشەویستانەوەیە، بەڵکو خۆشەویستان لەپێناوی ئەودا خۆشەویستییان پێ دەدرێت، خودا بەغیرەتە و لە بەندە باشەکەی خۆی قبووڵ ناکات کەسێکی تر لە ناخیدا ململانێی ئەو بکات﴿ **وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَندَادًا يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ ٱللَّهِ ۖ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ** ﴿١٦٥﴾ ﴾ البقرة: ١٦٥، وشەی "أنداد" کۆی وشەی "ند" بە مانای دژ، واتە پەرستراوی دژەخوا، هەندێ خەڵك هەن ئەندادیان لە خوار خوداوە کردووە بە پەرستراوی خۆیان، خۆشیان دەوێن وەك خۆشەویستی خودا، بەلاّم ئەوانەی ئیمانیان هێنا مەزنترین و توندترین خۆشەویستییان بۆ خودایە، پرسیارەکە ئەوەیە: گەر ئەندادەکانت بەئەندازەی خۆشەویستی خودا خۆشبوێت خودا ئەو خۆشەویستییە نیوە بە نیوەی قبووڵ نییە و دەیداتەوە بەسەر خاوەنەکەیدا، ئەی ئەوانەی کە ئەندادەکانیان لە خودا خۆشتر دەوێت دەبێ حاڵیان چۆن بێت؟

❁ ❁ ❁

# حیکمەتی دووسەد و یازدە

((لاَ تَنْفَعُهُ طَاعَتُكَ وَلاَ تَضُرُّهُ مَعْصِيَتُكَ، وَإِنَّمَا أَمَرَكَ بِهَذِهِ وَنَهَاكَ عَنْ هَذِهِ لِمَا يَعُودُ عَلَيْكَ))

**راڤەی وشەکان:**

**لا تنفعه:** قازانجی پێ ناگەیەنێت

**لا تضره:** زیانی پێ ناگەیەنێت

**یعود علیك:** بۆت دەگەڕێتەوە

**واتا ((گوێڕایەڵییەکانت قازانجی پێ ناگەیەنن و یاخیبووەکانت زیانی پێ ناگەیەنن، فەرمانی بەوانە پێکردی و نەهی لەوانە لێکردی بۆ مەبەستی خێر و قازانجێك کە بۆ خۆت دەگەڕێتەوە))**

**شرۆڤە:**

❁ خودای موتەعال ئاتاجی مرۆڤ و کاروکردەوەکانی مرۆڤ نییە، ئەو خاوەنی سیفاتی کەماڵ و جەلال و جەمالە، کەسێك خاوەنی ناوی **"الغني، الحميد"** بێت نابێت هیچ ئاتاجییەکی بە دروستکراوەکانی هەبێت، بەڵکو هەموو دروستکراوەکان ئاتاجی خودای موتەعالن، هەر بەو جۆرە کار و کردەوەی خراپی بەندەکان زیانێك بە ئەو ناگەیەنن، ئەو لەکەماڵی عیززەتدایەو مەزنترو شکۆمەندترە لەوەی بەندە لاوازەکانی بەیاخیبوونەکانیان زیانێك یان ناتەواوییەك بۆ خودا دروست بکەن.

❁ خودا فەرمانی بە کۆمەڵێك کار و کردەوە کردووە و نەهی لە کۆمەڵێك کار و کردەوە کردووە، فەرمانی کردووە بە تەوحید و نەهی کردووە لە شیرك، فەرمانی کردووە بە شوکر و نەهی کردووە لە کوفر، فەرمانی کردووە بە صەبر و نەهی کردووە لە نائارامی(**الهلع و الجزع**)، فەرمانی بە عیبادەت کردن بۆ پەروەردگاری حەق کردووە و نەهی کردووە لە بەندایەتی بۆ کۆلکە خوداکان و دژەخواکان، فەرمانی بە ئیخلاص

کردووه و نەهی کردووه لە ریا و نیفاق، کـاروکردەوە باشـەکان لای خـودا پەسـەندن و پێیخۆشە بەندەکانی کارە پەسەندەکان ئەنجام بدەن، بەڵام لە ئەنجامدانی ئـەو کارانـەدا خێرو قازانجێك بە خودا ناگەڕێتەوە، بەڵکو خێر و سوودی بۆ خودی مرۆڤ دەگەڕێتـەوە، لە دونیادا ژیانێکی خاوێن و ئارام و لە دوارۆژیشدا بەهەشـتی بـەرین و لێخۆشـبوونی خودا و رازیبوونی ئەو چاوەڕوانیان دەکات، کارە خراپ و ناپەسندەکانیش لەلای خـودا ناپەسەندن و پێیخۆش نییە بەندەکانی لـەو جـۆرە کارانـە ئـەنجام بـدەن، بۆیـە نـەهی لێکردوون لە نزیکبوونەوە و ئەنجامدانیان ئاگـاداری کردوونەتـەوە، ئەمـەش بـۆ ئـەوە ناگەڕێتەوە ئەنجامدانی کارە ناباشەکان زیانێك بە شکۆمەندی خودا بگەیەنێت، بـەڵکو دوورکەوتنەوەیان لەو کارانە دوورکەوتنەوەیە لە رێگەی شەڕ و خراپـە، بۆیـە پـەیامی پێغەمبەران(علیهم السلام) هەموو خێر و چاکەیە بۆ مرۆڤ و سەرئەنجامی چاك و پاکی بۆ مرۆڤ لێوە پەیدا دەبێت.

۞ ۞ ۞

# حیكمەتی دووسەد و دوازدە

((لاَ يَزِيدُ فِي عِزِّهِ إِقْبَالُ مَنْ أَقْبَلَ عَلَيْهِ، وَلاَ يَنْقُصُ مِنْ عِزِّهِ إِدْبَارُ مَنْ أَدْبَرَ عَنْهُ))

**راڤەی وشەكان:**

**لا يزيد:** زیادی ناكات

**عزه:** عیززەتی خودا

**إقبال:** رووتێكردن

**إدبار:** پشت تێكردن

**أدبر عنه:** پشتی تێدەكات

**واتا ((روو تێكردنی ئەوانەی روو لە خودا دەكەن مەزنی و شكۆمەندی خودا زیاد ناكەن، پشت تێكردنی ئەوانەی پشت لە خودا دەكەن لە مەزنی و شكۆمەندی خودا كەم ناكەن))**

**شرۆڤە:**

❁ ئەم حیكمەتە تەواوكاری حیكمەتەكەی پێشووە، وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا كار و كردەوەی بەندەكان بە چاك و خراپییەوە قازانج و زیان بە خودا ناگەیەنن، هەر بەو جۆرە رووكردنە خودای بەندەكان و پشتكردنە خودایان سوود و زیانی تەنها بۆ خۆیانە، بەڵام خودا پێیخۆشە بەندەكانی رووی تێبكەن، ئەنەسی كوڕی مالیك لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی((خودا خۆشحاڵترە بە تەوبەی بەندەكەی- كاتێك بۆ لای دەگەڕێتەوە- لە یەكێك لە ئێوە لەسەر وڵاخەكەیەتی لە دەشت و سارایەكی چۆڵ و بێ خواردن و خواردنەوەدا، وڵاخەكەی لەدەست هەڵدێت-لێی بزر دەبێت- خواردن و خواردنەوەكەی لەسەر پشتی وڵاخەكەیەتی، بێهیوا دەبێت لە دۆزینەوەی، دێتە پاڵ درەختێك و لەژێر سێبەرەكەیدا رادەكشێت، ئەو لە هاتنەوەی وڵاخەكەی بێهیوا بووە، دڵنیابووە لە كەناری تیاچووندایە، ئەو لەو بارەدایە لەناكاو

ولاَخەکە لە پاڵیدا وەستاوە، ڕەشوەکەی دەگرێت و لە خۆشی زۆری گەڕانەوەی ولاَخەکەی لێی تێکدەچێت و دەڵێ: خودایە تۆ بەندەی منی و من پەروەردگاری تۆم))[٣٣]، ئەم فەرموودە شیرینە ئاماژە بەو خۆشحاڵییەی خودادا دەدات لەو نموونەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەیهێنێتەوە، ئەوەش گەورەترین خۆشحاڵییە.

❁ کاتێك بەندە ڕوو لە خودا دەکات خوداش ڕوو لە ئەو دەکات، وەك لە فەرموودەیەکی شیریندا هاتووە: ئەو بستێك لە خودا نزیك دەبێتەوە خودا باڵێك لە ئەو نزیك دەبێتەوە، بەندە باڵێك لە خودا نزیك دەبێتەوە خودا دوو باڵ لە ئەو نزیك دەبێتەوە، بەندە بە ڕۆیشتن بۆ لای خودا دەڕوات خودا بە ڕاکردن بە دەم بەندەکەیەوە دێت[٣٤]، هەموو ئەو هاتنانەی خودا بەدەم بەندەکەیەوە نیشانەی ئەوەیە کە خودا ڕووتێکردنی بەندەکەی خۆی پێخۆشە، بەلاَم پێخۆش بوونێك کە لە ڕەحمەتی مەزنی خوداوەیە و خێر و قازانجی بۆ بەندەکە دەگەڕێتەوە، چونکە خودا پێیخۆشە بەندەکەی ڕێگەیەك بگرێتە بەر لە بەهەشتەوە سەر دەربکات، نەك لە دۆزەخەوە.

❁ ❁ ❁

---

٣٣ ((لَلّهُ أشدُّ فَرَحا بتوبةِ عبده (حين يَتُوبُ إليه ) من أحدِكم كان على راحلته بأرضٍ فلاةٍ فَانْفَلَتتْ –غابت عنه– وعليها طعامُه وشرابهُ فَأَيسَ منها، فأتَى شَجرة فاضطَجَع في ظِلِّها قد أيسَ من راحلته – أيقن بالهلاك – فبينا هو كذلك، إذا هو بها قائمةٌ عنده، فأخذ بخِطامِها ثم قال من شِدَّة الفرح: اللهم أنت عَبْدي وأنا ربكَ – أخطأ من شدة الفرح))متفق عليه.

٣٤ ((قُولُ اللَّهُ تَعَالَى: أَنَا عِنْدَ ظَنِّ عَبْدِي بِي وَأَنَا مَعَهُ إِذَا ذَكَرَنِي فَإِنْ ذَكَرَنِي فِي نَفْسِهِ ذَكَرْتُهُ فِي نَفْسِي وَإِنْ ذَكَرَنِي فِي مَلَإٍ ذَكَرْتُهُ فِي مَلَإٍ خَيْرٍ مِنْهُمْ وَإِنْ تَقَرَّبَ إِلَيَّ بِشِبْرٍ تَقَرَّبْتُ إِلَيْهِ ذِرَاعًا وَإِنْ تَقَرَّبَ إِلَيَّ ذِرَاعًا تَقَرَّبْتُ إِلَيْهِ بَاعًا وَإِنْ أَتَانِي يَمْشِي أَتَيْتُهُ هَرْوَلَةً)) رواه البخاري.

## حیکمەتی دووسەد و سیازدە

**((وُصُولُكَ إِلَى اللهِ وُصُولُكَ إِلَى الْعِلْمِ بِهِ، وَإِلاَّ فَجَلَّ رَبُّنَا أَنْ يَتَّصِلَ بِهِ شَىْءٌ، أَوْ يَتَّصِلَ هُوَ بِشَىْءٍ))**

**راڤەی وشەکان:**

**وصولك:** گەیشتنت

**العلم به:** زانست بە خودا

**جل ربنا:** مەزن و شکۆمەند بێت پەروەردگارمان

**((گەیشتنت بە خودا گەیشتنتە بە زانست بە خودا، ئەگینا خودا مەزنتر و شکۆمەندترە لەوەی شتێك پێیەوە پەیوەست ببێت یان پەیوەست ببێت بە شتێکەوە))**

**شرۆڤە:**

❁ ئەم حیکمەتە یەکێکە لە حیکمەتە زۆر بالاکانی ئیبن عەتا، لەناو ئەهلی ڕێگەی بەرەو خوداچووندا چەندین زاراوە هەیە کە عاریفان بەکاریان دەهێنن و ماناکانیان وردەکاری زۆر هەڵدەگرن، لەوانە وشەی "گەیشتن بە خودا" یان "رووکردنە خودا" یان "رۆیشتن بەرەو خودا"، ئەم دەربڕینانە -بەهۆی بەرتەسکی زمانەوە- مانای بەرجەستە و ماددییان لێوە پەیدا دەبێت، بۆ نموونە کە دەڵێین "گەیشتن بە خودا" وێنەیەکی زەینی ماددی دروست دەبێت و وا لێکدەدرێتەوە کە خودا لە شوێنێکدا بێت و بەندەکەی بۆ لای ئەو رۆیشتبێت و پێیگەیشتبێت، یان کە باس لە "رووکردنە خودا" دەکرێت وا دەزانن خودا رووگەیەکی هەیە و بەندەکەی رووی تێکردووە، لە کاتێکدا روو لە هەر شوێنێك بکەیت رووی خودا ئامادەیی هەیە ﴿ وَلِلَّهِ ٱلْمَشْرِقُ وَٱلْمَغْرِبُ فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا۟ فَثَمَّ وَجْهُ ٱللَّهِ ﴾ البقرة: ١١٥، خۆرهەڵات و خۆرئاوا خودا خاوەنییەتی، روو لە هەر کوێ بکەن رووی خودا لەوێوە بوونی هەیە، واتە خۆرهەڵات و خۆرئاوا مەخلوقن و خودا خاوەنیانە، خودا

وەك دروستكراوەكان ئاراستەی خۆرهەلاّت و خۆرئاوا و سەر و خواروو وەرناگرێت، بەڵكو رووی خودا لە هەموو روویەك دەبینرێتەوە، یان كاتێك دەوترێت "رۆیشتن بەرەو خودا" وێنەیەكی زەینی بەرجەستە لە وشەی "رۆیشتن" پەیدا دەبێت و وا دەزانرێت خودا لە شوێنێك وەستاوە و بەندەكەی دەیەوێت بچێت بۆ لای، ئیبن عەتا بەم حیكمەتە هەموو ئەم وێنە زەینییە ماددیانە لە بیرماندا دەسڕێتەوە و دەفەرموێت:: گەیشتنت بە خودا گەیشتنی جەستە نییە بە جەستە وەك چۆن دوو مەخلوق بە یەكتر دەگەن، بەڵكو گەیشتن بە خودا گەیشتنە بەو زانستەی خودامان پێ دەناسێنێت، تۆ كە بە خودا دەگەیت واتە خودات ناسی و خۆشەویستیت لەلا بۆ دروست بوو، تەوەكولت پێ بەست و رازی بووی بە بڕیار و قەدەرەكانی و بڕیاری ملكەچی و بەندایەتی پڕ لە ئیخلاصت بۆ دا، ئەمە ئەو خوداناسییەیە كە لەو زانستەوە بەدەست دەهێنرێت، ئەو زانستە كۆتایی پێ نایەت و قۆناغێك نییە مرۆڤ تیایدا بگاتە كۆتایی، بۆیە تەمەن بەشی كەمێكی زۆر كەمی ئەو زانستە دەكات، بەلاّم خودا بە بەزەیی خۆی بەو بڕە زانست و خوداناسییەی دەربارەی ئەو(ﷻ) هەمانە لێمان رازی دەبێت، خودا دەزانێت ئێمەی مرۆڤی لاواز -لەو تەمەنە كورتەدا- هەر ئەوەندە دەتوانین لە جیهانی ئەو زانستە بڕوانین، مرۆڤ كە گەیشتە زانستی دەستەوسانی لە ناسینی تەواوی خودا ئەوا خودای ناسیوە، بۆیە عاریفان لە یەك ئاستی مەعریفەدا نین بۆ ناسینی خودا.

۞ ئیبن عەتا دەفەرموێت:: خودا مەزن و شكۆمەندترە لەوەی شتێك پەیوەست ببێت پێیەوە، یان ئەو(ﷻ) بە شتێكەوە پەیوەست ببێت، لێرەوە بیروباوەڕی یەكبوون و توانەوە (**الإتحاد** و **الحلول**) كە هەندێ لە سۆفییەكان بە هەڵە تێیكەوتن رەد دەكاتەوە، چونكە خودا بە هیچ شتێكەوە نالكێت و هیچ شتێك بە خوداوە نالكێت.

۞ ئایا لە شەوی میعراجدا پێغەمبەر(ﷺ) پەروەردگاری بینی؟ ئەبو زەڕی غیفاری لە پێغەمبەری خودای(ﷺ) پرسی: ئەی پێغەمبەری خودا پەروەردگاری خۆتت بینی؟ فەرمووی: (نوورم بینی)، لە ریوایەتێكی تردا فەرمووی: ((ئەو نوور بوو چۆن ببینم؟)) فەرموودەكە ئیمامی مسلم لە سەحیحەكەیدا ریوایەتی كردووە، لە فەرموودەیەكی تردا ئیمامی مسلم ریوایەتی كردووە كە ((**حجابە النور**)) واتە حیجابی خودای موتەعالە نوورە، بۆیە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بە "**فؤاد**"ی لە میعراجدا نووری بینیوە.

# حیکمەتی دووسەد و چواردە

((قُرْبُكَ مِنْهُ أَنْ تَكُونَ مُشَاهِدًا لِقُرْبِهِ، وَإِلاَّ فَمِنْ أَيْنَ أَنْتَ وَوُجُودُ قُرْبِهِ؟))

## ڕاڤەی وشەکان:

**قربك منه:** نزیکیت لە خودا

**مشاهدا:** بیبینیت

**واتا ((نزیکیت لە خودا ئەوەیە کە نزیکییەکەی ببینیت، ئەگینا تۆ لە کوێی و بوونی نزیکی ئەو لە کوێ؟!))**

## شرۆڤە:

❁ ئەم حیکمەتەش تەواوکاری حیکمەتەکەی پێشووە و لەوێ باسی ئەو هەڵە تێگەیشتنەی کرد لە وشەی گەیشتن (وصول)ەوە پەیدا دەبێت، لێرەش باس لە هەڵە تێگەیشتنێك دەکات کە لە وشەی نزیبکی لە خودا(قرب)وە پەیدا دەبێت.

❁ نزیکی تۆ لە خوداوە موشاهەدەکردنی نزیکییە لە خوداوە، ئەوەش بریتییە لە هەستێکی ناوەکی تایبەت کە تیایدا دڵ هەست بە بوونی نزیکی دەکات.

❁ نزیکبوونەوە لە خودا بڕینی مسافە و دووری نییە، بەڵکو گەیشتنە بە هەستی نزیکبوونەوە، خودا لە شوێنێك نییە و تۆ بۆ لای ئەو بەگەڕکەوتبیت و بەشێکی زۆر لە دوورییەکەت بڕیبێت، ئیبن عەتا دەفەرموێ تۆ لە کوێ و بوونی نزیکی ئەو لە کوێ، مەبەستی ئەوەیە تۆ بە زاتی خۆت نزیك نەبوویتەوە لە زاتی خودا، بەڵکو تەنها لە سیفەتە بەرز و بڵندەکانی خودا بەهرەمەند بوویت، ئەو بەهرەمەندبوونەش موشاهەدەی مەقامەکانی ئیمانی پێکردی، یەکێك لەو مەقامانە مەقامی نزیکییە لە خوداوە.

❁ ئیبن عەتا لە کۆی حیکمەتەکانیدا هەوڵدەدات وەهمی مرۆڤ بەرانبەر بە خودا و ناسینی خودا بڕەوێنێتەوەو لە حەقیقەت نزیکمان بکاتەوە، لە ڕاستیدا هەموو

حەقیقەتێك بە چەندین وەهم دەورەدراوە، تا سالیکی ڕێگە پەردەی وەهمەکان لانەدات ناگات بە گەوهەری حەقیقەت.

# حیكمەتی دووسەد و پازدە

((**الْحَقَائِقُ تَرِدُ فِي حَالِ التَّجَلِّي مُجْمَلَةً، وَبَعْدَ الْوَعْيِ يَكُونُ الْبَيَانُ {فَإِذَا قَرَأْنَاهُ فَاتَّبِعْ قُرْآنَهُ ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا بَيَانَهُ}** القيامة: ١٨))

**راڤەی وشەكان:**

**في حال التجلي**: لەناو حاڵەتی جیلوەكردندا

**الوعي**: هۆشیاری، بەئاگاهاتنەوە

**البيان**: بەیان كردن، والاكردن، خستنە روو

**واتا ((حەقیقەتەكان لە حاڵەتی جیلوەكردندا بە گشتی دێن و دادەبەزن، دوای بەئاگاهاتنەوە بەیان دەكرێن﴿ فَإِذَا قَرَأْنَاهُ فَاتَّبِعْ قُرْآنَهُ ﴾** القيامة: ١٨، **هەر كاتێك بۆمان خوێندییەوە شوێنی خوێندنەوەكەی بكەوە))**

**شرۆڤە:**

❁ ئەم حیكمەتە یەكێكە لەو حیكمەتانەی زۆر بە ترسەوە دەستی بۆ دەبەم، چونكە باس لە مەقامێك دەكات كە تەنها صادیقان و عاریفانی مەزن پێی دەگەن، بۆیە هەوڵدەدەم (دوای داوای كۆمەكی لە خودا) بەیارمەتی قسەی زانایان و عاریفان لێكدانەوەیە بۆ حیكمەتەكە بكەم، لەم كارەشدا چاوەڕوانی كۆمەكیم لە خودای موتەعال.

❁ ئیبن عەتا دەفەموێت: حەقیقەتەكان كە بۆ عاریفان جیلوە دەكەن بە شێوەیەكی گشتی دادەبەزن، واتە زمانی دابەزینی حەقیقەتەكان زمانێكی ترە، بەڵكو بەكارهێنانی وشەی زمان بۆیان ناچاری و دەستەوسانییە، ئەگینا ماناكان زۆر لە زمان بەرینتر و شكۆمەندترن، ئەو كەسەی كە حەقیقەتەكان بۆی جیلوە دەكەن دەچێتە دۆخێكی ترەوە كە هەستەكانی دەرەوە لەكاردەكەون و لە حاڵەتەكەی خۆیدا نوقم دەبێت، ئەم حاڵەتە بەردەوام دەبێت تا بە تەواوی حەقیقەتەكان لەسەر دڵ نەقش دەبن،

که شەپۆلی حەقیقەتەکان کۆتاییان پێهات کەسەکە دەگەڕێتەوە ناو ئاگاهی و قۆناغێکی تری حەقیقەتەکان دەست پێدەکات ئەویش قۆناغی بەیان کردنی ئەو حەقیقەتانەیە لەناو زمان(**اللغة**)دا، بۆ تێگەیشتن لەم دوو قۆناغەی هاتنی حەقیقەتەکان نموونەیەك دەهێنینەوە، شەپۆلە رادیۆییەکان لەناو هەوادا بوونیان هەیە، ئامێری رادیۆ ئەم شەپۆلانە وەردەگرن و دەیانگۆڕن بۆ دەنگ، بەڵکو هەزاران جۆر لە دەنگ، دڵی عاریف ئەو ئامێرەیە شەپۆلی حەقیقەتەکان وەردەگرێت و دواتر بە زمان حەقیقەتەکان بەیان دەکات، بەلاّم ئایا حەقیقەتەکان بریتین لەو وشانەی عاریف بەسەر زمانیدا جاری دەبێت و تەعبیری لێ دەکات؟ لە یەك کاتدا "بەڵێ" و "نەخێر"، "بەڵێ" چونکە مانای وشەکان لەو حەقیقەتانەوە وەرگیراون، "نەخێر" چونکە دوو دۆخی جیاوازن، دۆخی حەقیقەتەکان وەك شەپۆلی مانا، لەگەڵ دۆخی بەیانکردنی حەقیقەتەکان وەك قسە و گوزارە، ئایا وشەکان دەتوانن پڕاوپڕ تەعبیر لە شەپۆلەکانی مانا بدەن؟ بۆ پێغەمبەران(علیهم السلام) بەڵێ و بۆ غەیری پێغەمبەران نەخێر، چونکە عیسمەت بۆ غەیری پێغەمبەران(علیهم السلام) بوونی نییە.

۞ جیاوازی چییە لە نێوان ئەو حەقیقەتانەی بۆ پێغەمبەران(علیهم السلام) دێن و ئەوەی روو لە شوێنکەوتەی پێغەمبەران(علیهم السلام) دەکات؟ **لێرەدا بەخاڵ جیاوازییەکان ئاماژە پێ دەدەم:**

❖ حەقیقەتەکان بۆ پێغەمبەران(علیهم السلام) پەیامی مەزن(**الرسالة الكبرى**)ن، بەلاّم بۆ شوێنکەوتەی پێغەمبەران(علیهم السلام) پەیامی بچووکن لە چوارچێوەی پەیامە گەورەکەدا کە بۆ نوێکردنەوەی پەیامی گەورە خودا بە یەکێك لە شوێنکەوتەی پێغەمبەرانی دەبەخشێت، واتە پەیامی بچووکی ئەو کەسە تەنها رۆڵی نوێکردنەوە دەبینێت، نەك سڕینەوەی پەیامی پێغەمبەران، یان خستنەسەر و بۆزیادکردن، بۆیە نابێت پەیامی بچووك لەگەڵ بنەما و پایەکانی شەریعەتدا پێچەوانە بوەستێتەوە.

❖پەیامی گەورەی پێغەمبەران(علیهم السلام) عیسمەتی تێدایە، بەلاّم پەیامی بچووك ئەو عیسمەتەی تێدا نییە و بۆی هەیە شەیتان حەزەکانی خۆی هەڵبداتە ناو، بۆ پێغەمبەران(علیهم السلام) شەیتان هەوڵی خۆی دەدات، بەلاّم خودا دەیسڕێتەوەو

ڕێگەی پێ نادات﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رَّسُولٖ وَلَا نَبِيٍّ إِلَّآ إِذَا تَمَنَّىٰٓ أَلۡقَى ٱلشَّيۡطَٰنُ فِيٓ أُمۡنِيَّتِهِۦ فَيَنسَخُ ٱللَّهُ مَا يُلۡقِي ٱلشَّيۡطَٰنُ ثُمَّ يُحۡكِمُ ٱللَّهُ ءَايَٰتِهِۦۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ﴿٥٢﴾ ﴾ الحج: ٥٢

❖ بەیانکردنی وەحی(قۆناغی دووەمی حەقیقەت) بۆ پێغەمبەران(علیهم السلام) عیسمەتی تێدایە و لەژێر چاودێری وەحیدایە، واتە وشەکان وشەی پێغەمبەرەکە نین، بەڵکو وەحی بۆی هەڵبژاردووە﴿ ثُمَّ إِنَّ عَلَيۡنَا بَيَانَهُۥ ﴿١٩﴾ ﴾ القيامة: ١٩، پاشان بەیان کردنی لەسەر ئێمەیە، سەرنج بدە لە دوای قۆناغی یەکەمی وەحی کە فەرمووی ﴿ فَإِذَا قَرَأۡنَٰهُ فَٱتَّبِعۡ قُرۡءَانَهُۥ ﴿١٨﴾ ﴾ القيامة: ١٨، واتە دوای دابەزینی وەحی بۆ سەر دڵی پێغەمبەر(ﷺ) بەیان کردنیش دیسان خودا لە ئەستۆی گرتووە و بۆ خۆی بەیانی دەکات، بۆیە هەر کەس پێی وابێت وەحی سەر دڵی پێغەمبەر(ﷺ) لە خوداوەیە و بەیان کردنی لە ناو زماندا لە پێغەمبەرەوەیە خۆی ڕووبەڕووی هەڵەیەکی گەورە کردۆتەوە، چونکە کەلیماتی قورئان (ڕاستە بە زمانی عەرەبی بەیان کراون) بەڵام خودا بۆ خۆی بۆ دەربڕینی ماناکانی وەحی هەڵیبژاردوون، بەیان کردن بۆ عاریفان زمانی خۆیانە و عاریف بۆ خۆی وشەکان هەڵدەبژێرێت بۆیە قابیلی هەڵە و کەموکورتییە.

۞ ۞ ۞

# حیکمەتی دووسەد و شازدە

((مَتَى وَرَدَتِ الْوَارِدَاتُ الإِلَهِيَّةُ عَلَيْكَ هَدَمَتِ الْعَوَائِدَ عَلَيْكَ
{إِنَّ الْمُلُوكَ إِذَا دَخَلُوا قَرْيَةً أَفْسَدُوهَا} النمل: ٣٤))

**راڤەی وشەکان:**

**هدمت العوائد:** دەقپێوەگیراوەکان دەڕوخێنن

**قرية:** ئاوەدانی

**أفسدوها:** وێرانی دەکەن

**واتا ((هەرکات وارِیداتی خودایی رووی تێکردی دەقپێوەگیراوەکان دەڕوخێنێت (إِنَّ ٱلْمُلُوكَ إِذَا دَخَلُوا۟ قَرْيَةً أَفْسَدُوهَا) "گەر مەلیکەکان روو لە هەر ئاوەدانییەك بکەن وێرانی دەکەن"))**

**شرۆڤە:**

۞ وارِیداتی خودایی گۆڕان بەسەر ناوەوەی مرۆڤدا دەهێنێت، گۆڕانەکانی ناوەوە گۆڕان بەسەر دەرەوەی مرۆڤدا دەهێنن، خواردن و خەوتن و پەیوەندییەکان و کار و کردەوەکان و تێڕوانین و سەرنجەکانی بۆ دەوروبەر.

۞ دەسەڵاتی وارِیدات وەك دەسەڵاتی پادشا بەهێزەکان وایە، پادشایان کاتێك روو لە مەملەکەتێك دەکەن سەرلەبەر وێرانکاری و کاولکاری بەسەردا دەهێنن، وارِیداتیش تەواوی خوخدەکانی مرۆڤ دەگۆڕێت و دەسەڵاتی خۆی بەسەر مەملەکەتی دڵدا دەسەپێنێت، بەڵام وێرانکاری وارِیدات وێرانکارییەکی ئەرێیبە و کۆشکی خوخدە خراپەکان دەڕوخێنێ و مەملەکەتێکی تر لە دڵدا دروست دەکاتەوە.

۞ ئیبن عەتا بۆ حیکمەتەکەی خۆی ئاماژە بە قسەکەی بەلقیس مەلیکەی سەبەء دەکات کاتێك نامەکەی سولەیمانی(عليه السلام) پێگەیشت بۆ خۆڕادەست کردن بە دەسەڵاتی سولەیمان(عليه السلام) وتی بە هۆز و نەتەوەکەی"پادشایان ئەگەر روو لە ئاوەدانی بکەن وێرانی دەکەن"، لەسەر ئەم قسەی بەلقیس خودای موتەعال دەفەرموێت: ﴿وَكَذَٰلِكَ يَفۡعَلُونَ ﴾ النمل: ٣٤، پادشایان هەر بەو جۆرە دەکەن کە بەلقیس باسی لەبارەوە کرد، ئاماژەکەی ئیبن عەتا بەم ئایەتە لە دەروازەی خواستنی مانای قووڵی قورئانە بۆ سەلماندنی مانایەك لە مەیدانی سەیر و سلوکدا.

۞ ۞ ۞

# حیکمەتی دووسەد و حەڤدە

((وَارِدُ يَأْتِي مِنْ حَضْرَةِ قَهَّارٍ لأَجْلِ ذَلِكَ لاَ يُصَادِمُهُ شَيْءٌ إِلاَّ دَمَغَهُ **{بَلْ نَقْذِفُ بِالْحَقِّ عَلَى الْبَاطِلِ فَيَدْمَغُهُ فَإِذَا هُوَ زَاهِقٌ}** الأنبياء: ١٨))

## شرۆڤەی وشەکان:

**من حضرة قهار:** لای کەسێکی زاڵی دەسترۆیشتووەوە

**يصادمه:** پیایدا دەکێشێت

**دمغه:** دەیپلیشێنێتەوە، سەری پان دەکاتەوە

**نقذف:** لێیدەدەین

**((وارید لای خودای زاڵ و دەسترۆیشتووەوە دێت، بۆ ئەو مەبەستەیە هەر شتێك پێیدا بکێشێت سەری پان دەکاتەوە" بَلْ نَقْذِفُ بِالْحَقِّ عَلَى الْبَاطِلِ فَيَدْمَغُهُ فَإِذَا هُوَ زَاهِقٌ -بە حەق بەسەر باتڵدا دەکێشین و شکستی پێ دەهێنین و پووچی دەکەینەوە"))**

## شرۆڤە:

۞ ئیبن عەتا لەم حیکمەتەدا دەفەرموێت: واریدات لە لای خوداوەیە، خودای موتەعالیش خاوەنی سیفەتی زاڵ"القهار"ە، بۆیە هەر شتێك رووبەڕووی ببێتەوە و پیایدا بکێشێت ئەم سیفەتە تێکوپێکی دەشکێنێت، ئەوەی بەرەنگاری واریدات دەبێتەوە بریتییە لە حەز و ئارەزووەکان کە بۆ نەفس دەگەڕێتەوە و شك و گومانەکان کە بۆ ژیری دەگەڕێتەوە، لەگەڵ وەهم و نەناسینەکان کە بۆ سەرەتابوون و سادەبوونی دڵ دەگەڕێتەوە، واریدات بە هێزی زاڵی خۆی بەسەر هەموو ئەمانەدا دەکێشێ و کۆتاییان پێ دەهێنێت.

۞ حەق هەموو ئەو هاتووانەیە لە خوداوە بۆ بەندەکەی رەوانە دەکرێن، باتڵیش هەموو ئەو حەز و گومان و وەهمانەیە لە بەندە دەوەشێتەوە، بڕیاری خودایە هەرگیز

باتڵ نەتوانێت حەق تێکبشکێنێت، بۆیە خۆت بدە پاڵ حەق و سیفەتە باتڵەکانی مرۆڤ بوونی خۆت تێکبشکێنە و بۆ حەق و لەگەڵ بە تەنها بمێنەرەوە.

# حیکمەتی دووسەد و هەژدە

((كَيْفَ يَحْتَجِبُ الْحَقُّ بِشَيْءٍ وَالَّذِي يَحْتَجِبُ بِهِ هُوَ فِيهِ ظَاهِرٌ وَمَوجُودٌ حَاضِرٌ؟))

## راڤەی وشەکان:

**يحتجب**: پەردە دەپۆشێت

**ظاهر**: ئاشکرا، دەرکەوتوو

**حاضر**: ئامادە

**واتا ((خودا چۆن بە شتێك پەردەپۆش دەبێت لە کاتێکدا ئەو شتەی خۆی پێ پەردەپۆش دەکات لەناویدا دەردەکەوێ و بوونی هەیە و ئامادەیە))**

## شرۆڤە:

گەردوون لە رووالەتیدا بووە بە پەردەیەك بۆ داپۆشینی خودای موتەعال، ئیبن عەتا دەفەرموێ گەردوون و دروستکراوەکانی ناوی ناتوانن ببن بە پەردە و بوونی خودا بشارنەوە، چونکە بوونی خودا لەناو خودی دروستکراوەکانیدا دیار و ئاشکرا و هەبوو و ئامادەیە، ئەم ئامادەبوونی خودای موتەعالە ئامادەبوونە بە ناو و سیفەتە بەرز و شکۆمەندەکانی، نەك ئامادەبوون بە زات، چونکە خودای موتەعال شکۆمەندتر و مەزنترە لەوەی تێکەڵ بە مەخلوقەکانی ببێت، دروستکراوەکانی خودا -کە لە زۆر شوێندا ئیبن عەتا بە ئاسەوار- ناویان دەبات قۆناغێکی جیلوەکردنی ناو و سیفەتە بەرز و بڵندەکانییەتی، ئەی بۆ مرۆڤ خودا نابینێت؟ نەبینینی خودا بە چاوی سەر بۆ لاوازی هێزی چاو دەگەڕێتەوە، بەڵام تێڕامان لە ڕێگەی ژیری و هۆشەوە ئایەت و بەڵگە و نیشانەکان دەبینێتەوە و لە کۆی بەدەستهێنانی بەڵگە و نیشانەکانەوە یەقینی زانستی بە بوون و ناسینی خودا سەرهەڵدەدات، ئاستێکی بالاتر لە بینینەوەی خودا موشاهەی دڵە بۆ ناو و سیفەتە بەرز و بڵندەکانی خودا.

# حیکمەتی دووسەد و نۆزدە

((لاَ تَيْأَسْ مِنْ قَبُولِ عَمَلٍ لَمْ تَجِدْ فِيهِ وُجُودَ الْحُضُورِ، فَرُبَّمَا قَبِلَ مِنَ الْعَمَلِ مَا لَمْ تُدْرِكْ ثَمَرَتَهُ عَاجِلاً))

## شرۆڤەی وشەکان:

**لا تيأس:** بێهیوا مەبە

**قبول:** وەرگرتن

**وجود الحضور:** بوونی ئامادەیی دڵ

**عاجلا:** بە خێرایی، بە زوویی

**((لە قبوڵبوونی کردارێك بێهیوا مەبە کە ئامادەیی دڵی تێدا نابینیتەوە، لەوانەیە کردارێك قبوڵ کرابێت کە بە زوویی بەروبوومەکەی بەدەست نەهێنیت))**

## شرۆڤە:

❁ کاملترین کردار ئەو کردارەیە لەدوای ئەوەی بەپێی شوێنکەوتنی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەنجامدرابێت دوو مەرج لە ئامێز بگرێت، یەکەمیان: دڵ لەناو کردارەکەدا ئامادەبێت، ئامادەبوونی دڵ واتە ئیحسان لە کارەکەیدا هەبێت، وەك پێغەمبەر(ﷺ) پێناسەی کردووە((خودا بپەرستیت وەك ئەوەی بیبینیت، گەر نەتتوانی بیبینیت ئەوا خودا تۆ دەبینێت))، کەوابوو بە دڵ هەست بە ئامادەبوونی خودا بکات، مەرجی دووەم: ئیخلاص لە کارەکەیدا هەبێت، ئیخلاص واتە ئەنجامدانی کارەکەی تەنها بۆ رووی خودای موتەعال بێت و بەشی نەفس و هیچ کەسێکی تری تێدا نەبێت.

❁ ئیبن عەتا دەفەرموێت: مەرجی سەرەکی بۆ قبوڵ کردنی کردار بریتییە لە ئیخلاص-هەڵبەت دوای شوێنکەوتنی پێغەمبەر(ﷺ) لو کارەدا-، هەر کردارێك ئیخلاصی تێدا بێت رجاوایە خودا قبوڵی بفەرموێت، بۆیە کاتێك دڵ لە ئەنجامدانی

کارێکدا هەست بە ئامادەبوونی خودای موتەعال ناکات پێویستە مورید بێهیوا نەبێت و پێیوابێت ئەو کردارە لای خودا قبووڵ نەکراوە، چونکە ئامادەبوونی دڵ-لای ئیبن عەتا- بەروبوومی کردارە، بەڵام بوونی ئیخلاص مەرجی قبووڵ بوونی کردارە، گەر مەرجەکەی تێدا بێت خودا بە بەزەیی خۆی قبووڵی دەفەرموێت: با بەروبوومەکەش — کە بریتییە لە ئامادەیی دڵ- بە زوویی روو لە سالیك نەکات.

۞ ۞ ۞

# حیكمەتی دووسەد و بیست

((لاَ تُزَكِّيَنَّ وَارِدًا لاَ تَعْلَمُ ثَمَرَتَهُ، فَلَيْسَ الْمُرَادُ مِنَ السَّحَابَةِ الإِمْطَارَ، وَإِنَّمَا الْمُرَادُ مِنْهَا وُجُودُ الإِثْمَارِ))

## شرۆڤەی وشەكان:

**لا تزكين:** تەزكییەی مەكە، ئەستۆپاكی بۆ مەكە

**السحابة:** هەور

**الإمطار:** باران بارین

**وجود الإثمار:** بوونی بەروبووم

**واتا ((ئەستۆپاكی بۆ واریدێك مەكە بەروبوومەكەی نازانیت، مەبەست لــە هــەور باران بارین نییە، بەڵكو مەبەست لێی سەرهەڵدانی بوونی بەروبوومە))**

## شرۆڤە:

۞ ئەم حیكمەتە پەیوەندی بە حیكمەتی دووسەد و حەڤدەوەیە، ئیبن عەتا دەیەوێت مورید جیاوازی لە نێوان دوو واریدا بكات، واریدێك كە لە خوداوەیە و زاڵ دەبێت بەسەر دڵدا و كاریگەری خۆی لەسەر كەسەكە بەجێدەهێڵێت، لەگەڵ واریدێك كە بەو جۆرە نییە، واتە لە خوداوە نییە.

۞ گەر واریدێك لە خوداوە بێت-وەك لە حیكمەتەكەی پێشتردا ئاماژەی پێكرا- سیفەتە ناباشەكانی دڵ دەسڕێتەوە و سیفەتە باشەكان لە جێگەیان دەڕوێنێت، یان دروستتر وایە بڵێین سیفەتە باشەكان لە مرۆڤدا گەشە پێدەدات و وردە وردە سیفەتە ناباشەكان بۆ خۆیان دەچنە دواوە و شكست دەخۆن و دەپوكێنەوە، چونكە لە نەبوونی سیفەتە باشەكانەوەیە سیفەتە خراپەكان سەرهەڵدەدەن، گەر خۆشەویستی لە مرۆڤدا گەشە بكات رق بۆ خۆی دەپوكێتەوە، گەر ئیخلاص گەشە بكات حەزكردن لە حەمد و

سەنای مەردوومان نامێنێت، گەر رازیبون لە خودا بنج دابکوتێت نائارامی و پەرێشانی(**الهلع و الجزع**) روو لە نەمان دەکات.

❁ ئەگەر وارید بەروبوومی باشی لە دڵدا نەرواند ئەوە پێی دڵخۆش مەبە، چونکە- وەك ئیبن عەتا دەفەرموێ- باران بارین بۆ باران بارین نییە، بەڵکو بۆ ئەوەیە بەروبووم لە کێڵگەکاندا بڕوێنێت، ئەی ئەگەر لە جێگەی رواندنی بەروبووم کشتوکاڵی وێران کرد ئیتر ئەوە پێی ناوترێت باران بەڵکو پێی دەوترێ ئافەت، بۆیە مورید نابێت هەموو واریدێکی لێ ببێت بە واریدی خودایی و دڵی پێخۆش بکات، بەڵکو گەرەکە لێی بەئاگا بێت نەبادا کێڵگەی پڕ لە کشتوکاڵی دڵی وێران بکات.

❁ ❁ ❁

# حیکمەتی دووسەد و بیست و یەك

**((لاَ تَطْلُبَنَّ بَقَاءَ الْوَارِدَاتِ بَعْدَ أَنْ بَسَطَتْ أَنْوَارَهَا، وَأَوْدَعَتْ أَسْرَارَهَا، فَلَكَ فِي اللهِ غِنًى عَنْ كُلِّ شَيْءٍ، وَلَيْسَ يُغْنِيكَ عَنْهُ شَيْءٌ))**

**راڤەی وشەکان:**

**لا تطلبن:** داوای مەکە

**بقاء:** مانەوە

**بسطت أنوارها:** نووری خۆی پەخش کردەوە

**أودعت أسرارها:** نهێنییەکانی خۆی رادەست کرد

**واتا ((داوای مانەوەی واریدات مەکە دوای ئەوەی نووری خۆیان پەخش کرد و نهێنییەکانی خۆیان رادەست کرد، تۆ بە خوداوە لە هەرچی شتە بێنیازی، بەڵام هیچ شتێك لە خودا ناتوانێت تۆ بێنیاز بکات))**

**شرۆڤە:**

❁ لێرەشدا پێناسەکەی"کاشانی" بۆ وشەی "وارد" دووبارە دەکەینەوە کە پێشتر دوو جار پێناسەکەمان ئاماژە پێداوە ئەمەش وەك بیرهێنانەوەیەك بۆ خوێنەر، لە کتێبی"**المصطلحات الصوفية**"ی عبدالرزاق کاشانیدا لەسەر زاراوەی "وارد" دەڵێت: ((وارد بریتییە لە هەر شتێك لە "مانا" کە روو لە دڵ دەکات بەبێ ئەوەی کاری مرۆڤی تێدا بێت)).

❁ ئیبن عەتا بە بەردەوامی لە حیکمەتەکانیدا داوا لە موریدان دەکات حەزی خۆیان تێکەڵ بە سەفەری بەرەو خوداچوون نەکەن، چونکە تێکەڵ کردنی حەزی نەفس بە رێگە کەمبوونەوەی ئیخلاصە و پێچەوانەی ئەو پەیمانەیە لەگەڵ خودا بەستوویانە.

۞ یەکێك لەو حەزانەی تێکەڵ بە ڕێگە دەکرێت بریتییە لە حەزی مانەوەی واریدات، ئەو دەیەوێت بە هەمیشەیی لە جیهانی مەلەکوتەوە مانا بەرز و بڵندەکان داباریێنە سەر دڵی و دابڕان لە نێوان ئەو و واریداتدا دروست نەبێت، بە جۆرێك مورید وابەستەی واریدات دەبێت وەك ئاو و خواردن بۆ جەستە تەماشایان دەکات، ئەو دەبێت بزانێت کە واریدات پەیامێکیان هەیە، لەگەڵ گەیاندنی پەیامەکەدا کۆتایی بە هاتنیان دێت، پەیامی واریدات پەخش کردنەوەی نووره بەسەر مەملەکەتی دڵدا و گەشەپێدانی سیفەتە باش و بەرز و بڵندەکان و لاواز کردن و کۆتاهێنان بە سیفەتە خراپ و دزێوەکانی مرۆڤ، هەروەها پەیامی گەیاندنی نهێنییەکان بە ژووری پاراستنی نهێنییەکان لە قولآیی دڵدا، کاتێك واریدات ئەم پەیامەیان گەیاند ئیتر چاوەڕوانی مورید بۆ بەردەوام بوونی واریدات حەزی دەروونە و دەبێ خۆی لێ بپارێزێت، ئەو نهێنییانە چین واریدات دەیگەیەنن بە بەشی پارێزگاری کردن لە نهێنییەکان لەناو دڵدا؟ پەردە لادان لەسەر ئەو نهێنییانە نیشانەی ئەوەیە کەسەکە شایستە نییە بە پارێزگاری لە نهێنی، بۆیە پێی دەوترێت نهێنی، چونکە نابێت بکرێن بە قسە، پێویستە بە هەمیشەیی لە قولآیی ناخدا بمێننەوە و تەنها لە باری زۆر پێویستدا بۆ ڕێنموونی موریدان کەمێکی زۆر کەمی بەکاربهێنرێت، کە دەڵێم نهێنییەکان نەکرێن بە قسە مەبەستم ئەوە نییە ناتوانیت تەعبیریان لێ بکەیت، دەتوانرێت قسەیان لەبارەوە بکرێت، بەلآم تەنها ئەوانە تێیدەگەن کە گەیشتوونەتە ئەو قۆناغە و بیستنی لەلایەن کەسانی ترەوە جگە لە فیتنە شتێکی تری لێوە پەیدا نابێت.

۞ **دەوترێت:** ئەو نهێنییانە شتگەلێکن زیاتر لەوەی لە قورئان و فەرمووددەدا هاتوون؟ حاشا، هەر شتێك زیاتر بێت لەوەی لە قورئان و فەرمووددەدا هاتوون هیچی تر نییە جگە لە گومڕایی، بەڵکو ماناگەلێکی وردن کە بە تێڕامان لە قورئان و فەرمووده بەڵگە و بورهانیان بۆ دەبینرێتەوە، بەلآم خۆ هەموو مرۆڤێك وەکو یەك لە مانا ورد و بالآکانی قورئان و فەرمووده حاڵی نابێت.

۞ نابێت واریدات ببن بە حیجابێك لە نێوان خودا و بەندەدا، ئەو بڕیارە بەندایەتی و ملکەچبوون و شەوق و یەکلابوونەوەی تەنها بۆ خودای موتەعال بێت، نەك بۆ شتێکی

تر جا شتەکە مادی بێت یان مەعنەوی، مورید تەنها خودا مەبەست و مەرامییەتی و لا بەلای هیچ شتێکی تردا ناکاتەوە، ئەو بە خوداوە لە هەرچی شتی ترە بێنیاز بووە، بەلاّم هیچ شتێك نییە بتوانێت مرۆڤ لە خودا بێنیاز بکات، تەنانەت واریداتیش لە خوداوە ناتوانن مورید لە خودای خۆی بێنیاز بکەن.

# دووسەد و بیست و دوو

((تَطَلُّعُكَ إِلَى بَقَاءِ غَيْرِهِ دَلِيلٌ عَلَى عَدَمِ وِجْدَانِكَ لَهُ، وَاسْتِيحَاشُكَ لِفُقْدَانِ مَا سِوَاهُ دَلِيلٌ عَلَى عَدَمِ وُصْلَتِكَ بِهِ))

## راڤەی وشەکان:

**تطلعك:** مەیل و سەرنجدان و چاودێریت

**بقاء:** مانەوە

**وجدانك:** بینینەوەت

**استیحاشك:** نامۆبوونت، وەحشەتت

**وصلتك:** گەیشتنەکەت

**واتا ((مەیل و سەرنجدانت بۆ مانەوەی شتەکانی تر جگە لە خودا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی نەتبینیوەتەوە، وەحشەت و نامۆبوونت بۆ لەدەستدانی جگە لە خودا بەڵگەی نەگەیشتن و پەیوەست نەبوونتە بە ئەوەوە))**

## شرۆڤە:

ئەم حیکمەتەش پەیوەندی بە حیکمەتەکەی پێش خۆیەوە هەیە، لە حیکمەتەکەی تردا فەرموودی: "داوای مانەوەی واریدات مەکە"، هەروەها فەرمووی: "تۆ بە خوداوە لە هەرچی شتی ترە بێنیازی"، لێرەشدا ئاماژە بەو دۆخە دەکات کە مورید تێیدەکەوێ و پێچەوانەی ئەو دوو ئاماژە بۆکراوە دەوەستێتەوە، واتە "داوای مانەوەی واریدات دەکات" و "دەیەوێت بە شتەکانی ترەوە وابەستە ببێت"، ئیبن عەتا دەفەرموێ: هەر کەس مەیل و سەرنجی بۆ مانەوەی شتەکانی تر لەلا بوو ئەو کەسە لە دڵیدا خودای نەبینیوەتەوە، چونکە ئەوانەی خودا دەبیننەوە مەیل و سەرنجیان بەلای مانەوەی هیچ شتێکی تردا بۆ نامێنێتەوە، لای عاریفان مانەوە و نەمانەوەی شتەکان و دۆخەکان و حاڵ و مەقامەکان یەکسانن، ئەوان خودایان بینیوەتەوە و لە خزمەتیدا دەژین و

شتەکانی تر وەك گوزەرکردنی سێبەر تەماشا دەکەن، هەروەها ئەو کەسانەی بە لەدەستدانی شتەکانی ناوەوە و دەرەوە نامۆبوون دایاندەگرێتەوە و ناخیان پڕ دەبێت لە وەحشەت ئەوانە بە خودا نەگەیشتوون و هێشتا پێیەوە پەیوەست نەبوون، بەڵکو پەیوەستبوونیان بە غەیری خوداوەیە، بۆیە بە لەدەستدانیان وەحشەت روو دڵ و ناخیان دەکات، مرۆڤ گەر گەنجینەیەکی مەزن بدۆزێتەوە لە کوێ بۆ لەدەستدانی چەند دینار و درهەمێك خەم دایدەگرێتەوە، ئەوانەی بە رۆیشتنی شتە بچووکەکان سنگیان تەسك دەبێتەوە هێشتا نەکەوتوون بەسەر گەنجینە مەزنەکەدا کە خودای موتەعالە.

# حیکمەتی دووسەد و بیست و سێ

((النَّعِيمُ وَإِنْ تَنَوَّعَتْ مَظَاهِرُهُ إِنَّمَا هُوَ بِشُهُودِهِ وَاقْتِرَابِهِ، وَالْعَذَابُ وَإِنْ تَنَوَّعَتْ مَظَاهِرُهُ إِنَّمَا هُوَ بِوُجُودِ حِجَابِهِ، فَسَبَبُ الْعَذَابِ وُجُودُ الْحِجَابِ، وَإِتْمَامُ النَّعِيمِ بِالنَّظَرِ إِلَى وَجْهِهِ الْكَرِيمِ ))

**راڤەی وشەكان:**

**النعيم:** ئاسوودەیی و ئارامی و چێژبینین

**مظاهره:** دەركەوتەكانی

**بشهوده:** بە بینینی خوداوە

**اقترابه:** نزیكی لە خوداوە

**الحجاب:** پەردە

**إتمام:** تەواویی

**واتا ((ئاسوودەیی و چێژبینین با دەركەوتەكانی جۆراوجۆریش بێت بەهۆی بینینی خودا و نزیكبوونەوەیە لێی، سزا و ئازار با دەركەوتەكانیشی جۆراوجۆر بێت بەهۆی بوونی پەردەوەیە، بۆیە هۆی سزا و ئازار بوونی پەردەیە، و تەواوی ئاسوودەیی و چێژبینینیش بە سەیركردنی رووی بەخشندەیی خودای موتەعالەوەیە))**

**شرۆڤە:**

❁ لەم حیكمەتەدا ئیبن عەتا ئاماژە بە هۆی ئاسوودەیی و ئازار، و چێژبینین و سزا، و نیعمەت و ناخۆشی دەكات، جۆرەكانی ئاسوودەیی و چێژبینین و نیعمەت لە دونیا و دوارِۆژدا، هەروەها جۆرەكانی ئازار و سزا و ناخۆشی لە دونیا و دوارِۆژدا.

❁ لای ئیبن عەتا هەموو خۆشی و ئاسوودەیی و چێژبینینێك بە هۆی بینینی خودا و نزیكبوونەوەیە لە ئەو(ﷻ) ئامادەبوونی خودا لە دڵدا و نزیكبوونەوە لە ئەو شتەكان

دەگۆڕێت بە خۆشی و ئارامی ونیعمەت، هەروەها بوونی پەردە و دابڕان لە خودا شتەکان دەگۆڕێت بە ئازار و سزا و مەینەتی، ئیبن عەتا دەیەوێت پێمان بڵێت کە: خودی شتەکان خۆشی بەخش و ئازاربەخش نین، ئەوە نزیکی و دووریيە لە خوداوە خۆشی و ناخۆشییان پیێ دەبەخشێت، فریشتەکانی دۆزەخ کە ژمارەیان نۆزدەیە بەهۆی بینینی خودا و نزیکبوونەوە لێی دۆزەخیان بۆ گۆڕاوە بە نیعمەت و خۆشی و ئارامی، دۆزەخ ئەوان ناسوتێنێ و ئازاریان نادات، چونکە پەردە نەکەوتۆتە نێوان ئەوان و خوداوە، ئەهلی دۆزەخ پێشەکی لە بینینی خودا مەحجوب و بێبەش بوون ئەوجا ئازاری دۆزەخ دەچێژن﴿ كَلَّآ إِنَّهُمْ عَن رَّبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّمَحْجُوبُونَ ﴿١٥﴾ ثُمَّ إِنَّهُمْ لَصَالُوا۟ ٱلْجَحِيمِ ﴿١٦﴾ ﴾ المطففين: ١٥– ١٦، ئەوانە لەو رۆژەدا لە بینینی پەروەردگاریان بێبەشن، پاشان رەوانەی دۆزەخ دەکرێن، ئەهلی بەهەشتیش تەماشای رووی جوانی خودای موتەعال دەکەن ﴿ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ ﴿٢٢﴾ إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ ﴿٢٣﴾ ﴾ القيامة: ٢٢–٢٣-کۆمەڵێك روخسار لەو رۆژەدا جوان و رەونەقدارن چونکە تەماشای پەروەردگاری خۆیان کردووە، و پاشان روخساریان جوان و گەشاوە دەبێت لە بەهەشتدا﴿ إِنَّ ٱلْأَبْرَارَ لَفِى نَعِيمٍ ﴿٢٢﴾ عَلَى ٱلْأَرَآئِكِ يَنظُرُونَ ﴿٢٣﴾ تَعْرِفُ فِى وُجُوهِهِمْ نَضْرَةَ ٱلنَّعِيمِ ﴿٢٤﴾ ﴾ المطففين: ٢٦-٢٤، چاکان لە بەهەشتدان و لەسەر کورسی و قەرەوێڵە تەماشا دەکەن و لە روخساریاندا جوانی و رەونەقی خۆشی و ئاسوودەیی و ئارامی بەهەشت دەناسییەوە.

# حیکمەتی دووسەد و بیست و چوار

**((مَا تَجِدُهُ الْقُلُوبُ مِنَ الْهُمُومِ وَالأَحْزَانِ فَلأَجْلِ مَا مُنِعَتْ مِنْ وُجُودِ الْعَيَانِ))**

## راڤەی وشەکان:

**ما تجده:** ئەوەی دەیبینێتەوە

**الهموم:** کۆی "الهم"ە، بە مانای خەم و پەژارە

**الأحزان:** کۆی "الحزن" بە مانای حوزن و دڵتەنگی

**وجود العیان:** بوونی بینین

**واتا ((ئەوەی دڵ لە خەم و پەژارە و دڵتەنگی دەیبینێتەوە بەهۆی بوونی ڕێگری لێ کردنەوەیە لە بینینی خودا))**

## شرۆڤە:

❁ ئەم حیکمەتەش دەربڕینی حیکمەتەکەی پێشووە بە زمانێکی تر، بەڵام پوختتر و پاڵفتەتر.

❁ خەم و پەژارە(**الهموم**) بۆ ئەو شتانەیە کە لە داهاتوودان و لە دووتوێی قەدەرە نادیارەکاندان، حوزن و دڵتەنگیش(**الحزن**) بۆ ئەو شتانەیە کە لە ڕابردوودا تێپەڕیون و گوزەریان کردووە و لەدەستچوون، پێغەمبەر(ﷺ) پەنای بە خودا گرتووە لەم دوو حاڵەتە و دەفەرموێت:((**أللهم إني أعوذ بك من الهم والحزن**))، هەروەها ئەوانەی کە لەسەر ئیمان و ئیستیقامە دەمرن لە سەرەمەرگدا فریشتەکان دادەبەزن بۆ سەریان و پێیان دەڵێن مەترسن و نیگەران مەبن لە داهاتوو و خەم و پەژارەش بۆ ڕابدوو رووتان تێنەکات، مژدەتان لێ بێت بەو بەهەشتەی خودا بەڵێنی پێداون﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَٰمُواْ تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ أَلَّا تَخَافُواْ وَلَا تَحْزَنُواْ وَأَبْشِرُواْ بِٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى كُنتُمْ تُوعَدُونَ ﴿٣٠﴾﴾ فصلت: ٣٠، لای ئیبن عەتا هەموو نیگەرانی و خەم و

پەژارەکانی رابدوو داهاتوو بۆ نەبینی خودا و دابڕان لە ئەو دەگەڕێتەوە، لای عاریفان هەژاری و مەینەتی و ئازار (بە بوونی خوداوە) گەورەترین تام و چێژە، هەر بەو جۆرە خۆشی و چێژ و نیعمەتەکان لەلایان (بە دابڕان لە خودا) دەگۆڕێن بۆ ناخۆشی و خەم و مەینەتی.

# حیکمەتی دووسەد و بیست و پێنج

((مِنْ تَمَامِ النِّعْمَةِ عَلَيْكَ أَنْ يَرْزُقَكَ مَا يَكْفِيكَ، وَيَمْنَعَكَ مَا يُطْغِيكَ))

## ڕاڤەی وشەکان:

**تمام النعمة:** تەواویی نیعمەت، کەماڵی نیعمەت

**یکفیك:** بەشت بکات

**یمنعك:** لێت بگرێتەوە

**یطغیك:** گومڕات بکات، سنووربەزێنیت پێ ئەنجام بدات

**واتا ((لە تەواوێتی نیعمەت ئەوەیە ئەوەندەت ڕۆزی پێ بدات بەشت بکات و هەموو ئەوانەت لێ بگرێتەوە سنوور بەزێنیت پێ ئەنجام دەدەن))**

## شرۆڤە:

❁ مرۆڤ بەهۆی نیعمەتی زۆرەوە لە ماڵ و منداڵ و تەندروستی و سەروەت و سامان و شوێنکەوتە و پلە و پایە و ناوبانگ جۆرێك لە بێنیازی لە خودا بۆ دروست دەبێت، بێنیازبوون لە خوداو شان دادان لەسەر هێزو دەسەلاٌت سەری لە توغیان و سنووربەزێنییەوە دەردەچێت ﴿كَلَّآ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَيَطۡغَىٰٓ ٦﴾ العلق: ٦، مرۆڤ لە سنووری خۆی دەردەچێت کاتێك بێنیازبوون دەبینێت، ئەو کەسانە دەگمەنن هێز و دەسەلاٌت و شوێنکەوتەیان هەبێت و نەخۆشی توغیان ڕوویان تێنەکات، بۆیە پێغەمبەران(علیهم السلام) کەمیان داوای "موڵك"یان لە خودا کردووەو کەمیان بوون بە مەلیك، لەو پێغەمبەرانەی موڵکیان لە خودا داواکردووە سلیمان(عليه السلام) کە دەفەرموێت: ﴿رَبِّ ٱغۡفِرۡ لِي وَهَبۡ لِي مُلۡكٗا لَّا يَنۢبَغِي لِأَحَدٖ مِّنۢ بَعۡدِيٓۖ﴾ ص: ٣٥، خودایە لێم خۆش ببە و موڵکێکم پێ ببەخشە بۆ هیچ کەسی دوای خۆم بەدەست نەیەت، داوای موڵك لەلایەن سلیمانەوە (عليه السلام) بۆ حەزی نەفس نەبووە، بەڵکو بۆ گەیاندنی ڕیسالەت و بلاٌوەپێکردنی

یەکتاپەرستی و چەسپاندنی عەدالەت بووە، چونکە ئەو(الطَّيْكِلاً) پێغەمبەرە و عیسمەتی پێغەمبەرایەتی ڕێگری دەکات لە داواکردنی شتێك لە خودا لە پێناوی حەزی نەفسدا، خودا وەسفی بەندەکەی سلیمان(الطَّيْكِلاً) دەکات و دەفەرموێت: ﴿نِعْمَ الْعَبْدُ إِنَّهُ أَوَّابٌ ﴿٣٠﴾﴾ ص: ٣٠، ئەو باشترین بەندەی ئێمە بوو، بە هەمیشەیی بۆ لای پەروەردگاری دەگەڕایەوە، یەکێکی تر لە پێغەمبەران(عليهم السلام) کە خودا دەسەلاتی پێداوە یوسفە(الطَّيْكِلاً)، ئەمیش بە هەمان شێوە بۆ چەسپاندنی عەدالەت و گەیاندنی ریسالەتە، لەسورەتی یوسفدا باس لەو "ملك" کراوە کە بە یوسف(الطَّيْكِلاً) بەخشرابوو، ئەو "ملك"ەی بۆ گەیاندنی ریسالەت و چەسپاندنی عەدالەتی لە میسردا بەکاری هێنا ﴿رَبِّ قَدْ ءَاتَيْتَنِي مِنَ الْمُلْكِ وَعَلَّمْتَنِي مِن تَأْوِيلِ الْأَحَادِيثِ﴾ یوسف: ١٠١، پەروەردگارم، تۆ موڵکت بە من بەخشی و فێری تەئویلی خەونانت کردم.

❁ نیعمەتێکی گەورەیە گەر خودا هەموو ئەو دەرگانەت لێ دابخات کە ئیمان و دینت ڕووبەڕووی فیتنە دەکەنەوە، بەرپرسیارێتی و داباریني نیعمەتی زۆر شوکری زۆری دەوێت، شوکرکردنیش کەمێکی کەم لە خەڵکی دەتوانن پێی هەڵبستن﴿وَقَلِيلٌ مِّنْ عِبَادِيَ الشَّكُورُ ﴿١٣﴾﴾ سبأ: ١٣، کەمێك لە بەندەکانم زۆر شوکرکەرن، پێغەمبەر(ﷺ) نزای دەکرد و پەنای بە خودای خۆی دەبرد و دەیفەرموو((**أللهم إني أعوذ بك من جهد البلاء، ودرك الشقاء، وسوء القضاء، وشماتة الأعداء**-خودایە پەنات پێ دەگرم لە بەڵایەکی پڕوکێنەر و کردنەوەی دەرگای مەینەتی و کوێرەوەری و دابرینی قەزای خراپ و بە ریشدا دەستهێنانی دوژمنان)) ئیمامی بوخاری و مسلم ریوایەتیان کردووە.

❁ مرۆی باوەڕدار ئەگەر کۆڵی بەرپرسیارێتی مەزنی پێ هەڵناگیرێت با شان نەداتە ژێری و داوایەك بۆ لای خودا بەرز نەکاتەوە تیایدا ئیمانی ڕووبەڕووی فیتنە ببێتەوە، بەڵکو هەمیشە هەڵبژاردەکان بداتە دەستی خودا و لە داواکانیدا بڵێت"خودایە، ئەگەر خێری تێدایە بۆ ئیمان و دین و دونیا و دوارۆژم، ئەو کارەم بۆ بکە"، بۆیە گەر خودا بەرپرسیارێتی بۆ هەڵبژاردی شان بدە ژێری و داوای کۆمەك لە خودا بکە، بە مەرجێك بەرپرسیارێتییەکە بۆ ئیصلاح و چەسپاندنی عەدالەت و گەیاندنی ریسالەت بێت.

۞ بەگشتی خودا ئەوەندەت پێ ببەخشێت بێنیازت بکات لە خەڵکی ئەوا تۆ لەناو تەواوی نیعمەتدایت، پێغەمبەر(ﷺ) دەپاڕایەوە و دەیفەرموو((**أللهم أكفني بحلالك عن حرامك وأغنني بفضلك عن من سواك**-خودایە ئەوەندە حەلاڵم پێ ببەخشە لە حەرام دووربکەومەوە، خودایە بە فەزڵی خۆت لە غەیری خۆت بێنیازم بکەیت)) بوونی نیعمەتی زۆر هەموو کاتێك لە خۆشەویستی خوداوە نییە بۆ بەندەکەی بە تایبەت کاتێك بەندە نەتوانێت مافی ئەو نیعمەتە بدات و شوکری خاوەنەکەی بکات، ئەگەر ڕێز وخۆشەویستی خودا بۆ بەندەکانی بە داباریینی نیعمەت بوایە دەبوا بەنی ئیسرائیلییەکان لەلای خودا خۆشەویستترین گەل و نەتەوە بوونایە، بەلاّم خودا خەشم و ڕقی خۆی بەسەردا داباراندن، چونکە نەیانتوانی مافی ئەو هەموو نیعمەتە بدەن کە خودا پێی بەخشی بوون.

۞ ۞ ۞

# حیكمەتی دووسەد و بیست و شەش

((لِيَقِلَّ مَا تَفْرَحُ بِهِ يَقِلَّ مَا تَحْزَنُ عَلَيْهِ))

## ڕاڤەی وشەكان:

**لیقل**: با كەم بێت

**یقل**: كەم دەبێت

**واتا ((با ئەوەی پێی دڵخۆش دەبیت كەم بێت ئەوەی لەسەری پێی دڵتەنگ دەبیت كەم دەبیت))**

## شرۆڤە:

❁ هەموو نیعمەتێك تیاچوون ڕووی تێدەكات، جگە لە نیعمەتی لەگەڵ خودا ژیان و بۆ خودابوون، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((ڕاستترین قسەی "لبید" ئەو دێڕە هۆنراوەیە كە دەڵێت: دەزانی هەرچی شتە جگە لە خودا پووچ و بێبەهایە)) ئیمامی بوخاری و مسلم ڕیوایەتیان كردووە، تەواوكاری نیوە دێڕەكە ئەوەیە كە دەڵێت((هەرچی نیعمەتە تیاچوون ڕووی تێدەكات: **ألا كل شيء ما خلا الله باطل وكل نعيم لا محالة زائل**)) [٣٥]، هەموو تیاچوونێكی نیعمەت ئازار و خەم و دڵتەنگی بە دوای خۆیدا دەهێنێت، بۆیە هەتا نیعمەتەكان كەمتر بن خەمەكان كەمتر دەبن.

❁ ئەم ئاستە كە ئیبن عەتا باسی لێوە دەكات ئاستی سالیكان و موریدانە، ئەگینا پێغەمبەران(علیهم السلام) و صدیقان كە نیعمەت دێت شوكر دەكەن و كە دەڕوات ئارام دەگرن و لە هەردوو بارەكەدا ئەوان لە نزیكبوونەوەی زیاتردان لە پەروەردگاریان، ئەوان بەخشراوەكانی خودا دەكەن بە پێ پلە بۆ نزیكبوونەوە لە خودا و وەرگرتنەوەی ئەو

٣٥ (روى أبو هريرة-رضي الله عنه- عن النبي -صلى الله عليه وسلم- قال: أصدق كلمة قالها شاعر كلمة لبيد: ألا كل شيء ما خلا الله باطل).

بەخشراوانە دیسان بۆ ئەوان هەر پێ پلە و سەرکەوتنە بۆ لای﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَٰتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ۝٥﴾ إبراهیم: ٥، مرۆی باوەڕدار یان لە زەمینەی نیعمەتدا دەژی و شوکر دەکات، یان لە زەمینەی میحنەتدا دەژی و ئارام دەگرێت، هەردوو بارەکە نیشاندانی بەندایەتی و نزیکبوونەوەیە لە خودا.

# حیكمەتی دووسەد و بیست و حەوت

((إِنْ أَرَدْتَ أَنْ لاَ تُعْزَلَ فَلاَ تَتَوَلَّ وِلاَيَةً لاَ تَدُومُ لَكَ))

**راڤەی وشەكان:**

**تعزل:** عەزل بكرێیت، كەنارگیر بكرێیت

**فلا تتول:** مەگرە دەست

**ولایة:** ویلایەت، بەرپرسیارێتی

واتا ((**گەر ویستت كەنارگیر نەكرێیت، ئەوا ویلایەتێك كە بەردەوامی نییە مەگرە دەست**))

**شرۆڤە:**

❁ ئەم حیكمەتە هێنانەوەی نموونەیە بۆ حیكمەتەكەی پێشوو، پێشتر فەرمووی: گەر دەتەوێ خەم و پەژارەو حوزنت كەم بێت با دڵخۆشی و شادومانیت بە شتەكان كەم بێت، حیكمەتەكەی پێشوو داوا ناكات مرۆڤ هەموو شتەكان وەلا بنێت، بەڵكو پێمان دەڵێ: پێیان دڵخۆش مەبە، چونكە لە كاتی لەدەستدانیان بە ئەندازەی دڵخۆشییەكەت خەم و حوزن رووت لێ دەكات، لەم حیكمەتەدا ئاماژە بە یەكێك لەو شتانە دەكات كە مرۆڤ زۆر حەزی لێ دەكات و تەنها صدیقان دەتوانن لەو حەزە بێنە دەرەوە، ئەوەش خۆشەویستییە بۆ دەسەڵات و پلەوپایە، دیارە بەئەندازەی ئەو خۆشەویستی و حەزلێكردنە لە باری لەدەستدان و كەنارگیركردندا مرۆڤ ئازاروخەم و مەینەتی رووی لێ دەكات.

❁ ئیبن عەتا لەناو هەموو حەزەكاندا لە حەزی كورسی و دەسەڵات ئاگادارمان دەكاتەوە، چونكە دەزانێت چ سەرئەنجامێكی ترسناك چاوەڕوانی دەكات، ئەو دەزانێت تەنها پێغەمبەران(علیهم السلام) و صدیقان بە حەزەوە دەست نابەن بۆ دەسەڵات،

خەڵکانی خوار ئەوان دەستبردنەکەیان حەزی نەفسە، یان تێکەڵە بە حەزی نەفس، ئەو کار و کردەوانەش کە بەشی نەفسیان تێدایە کۆمەکی و یارمەتی خودایان تێدا نییە، کارێکیش خودای تێدا نەبێت پووچ و بێفەڕە، بۆیە ئیبن عەتا داوامان لێ دەکات هەر لە سەرەتاوە خۆمان لەم ئافەتە بپارێزین و بە حەزەوە دەستی بۆ نەبەین، چونکە سەرەتایەکی شیرین و سەرئەنجامێکی تاڵ و دژواری هەیە، دەفەرموێت:: گەر دەتەوێ لە ویلایەت و دەسەلاٌت کەنارگیر نەکرێیت ئەوا ویلایەتێك مەگرە دەست بەردەوامیی بۆ نییە، وەك ئەو پیاو چاکەی ئامۆژگاری عومەری کوڕی عەبدولعەزیزی کرد و پێی فەرموو((**لو دامت لغيرك ما وصلت إليك**–گەر بۆ کەسانی پێش تۆ دەسەلاٌت و ریئاسەت بەردەوام بوایە نەدەگەییە دەستی تۆ)).

ئەی ئەگەر هەموو چاکان خۆیان کەنارگیر بکەن و شان نەدەنە ژێر بەرپرسیارێتی کێ کاروباری مەردوومان رابپەڕێنێت، ئایا مەیدانەکە بۆ خراپەکاران چۆڵ بکەن و دەسەلاٌت بکەن بە ئامڕازێك بۆ تێکدانی خاك و خەڵك؟ ئیبن عەتا نافەرموێت: لەسەرت حەرامە شان بدەیە ژێر بەرپرسیارێتی و گرتنە دەستی دەسەلاٌتێك بچووك یان گەورە، بەڵکو داوامان لێ دەکات خۆمان لە حەزی دەسەلاٌت خاڵی بکەینەوە، هەر کات توانیت حەزت لە دەستبردن بۆ دەسەلاٌت جیابکەیەوە و وەك بەرپرسیارێتی شانت دایە ژێری و هیچ هەوڵ و کۆشش و پەلامارێکی تۆی تێدا نەبوو، بەڵکو هاتنی قەدەرێك بوو کە لات نەویستراو بوو، ئەوا دەتوانی شان بدەیە ژێر ئەو کارە، دڵنیاش بە خودا کۆمەکت دەکات و بە تەنها بەجێت ناهێڵێت، بەڵکو کەسانێکی چاك و پاکت بۆ رەوانە دەکات تاکو لە کارەکەدا کۆمەکت بن، ئەگەر وا نیت خۆت مەخەڵەتێنە و بەرگی پێویستی و خزمەت بە دین مەکە بە بەر حەزەکانتدا.

# حیکمەتی دووسەد و بیست و هەشت

((إِنْ رَغَّبَتْكَ الْبِدَايَاتُ زَهَّدَتْكَ النِّهَايَاتُ، إِنْ دَعَاكَ إِلَيْهَا ظَاهِرٌ نَهَاكَ عَنْهَا بَاطِنٌ))

## راڤەی وشەکان

**رغبتك:** حەزی لا پەیدا کردی

**زهدتك:** زوهدت بۆ دروست دەکات

**دعاك:** بانگت بکات

**واتا ((گەر سەرەتاکان رەغبەتت پێ بدەن-لە گرتنە دەستی ویلایەت- ئەوا کۆتاییەکان زوهدت بۆ دروست دەکەن لێی، گەر دەرەوە بانگت بکات بۆ لای دەسەڵات، ئەوا ناوەوە رێگریت لێ دەکات))**

## شرۆڤە:

❁ ئەم حیکمەتە جەوهەر و راستەقینەی ویلایەت و دەسەڵات دەردەخات، سەرەتاکانی دەسەڵات بەتام و پڕ لە چێژ و خۆشییە، چونکە هێشتا لەگەڵ دەسەڵات و ناو و نیشانەکەی تازەیە و نەکەوتۆتە ناو مەینەتی و ئازارەکانییەوە، هێشتا بەرخوردی لەگەڵ ئافەتەکانیدا نەکردووە، دوای زەمەنێك لە ئالوودەبوون بەو شەرابە تاڵەی دەسەڵات خەم و پەژارە و ئازارەکان وردە وردە سەرهەڵدەدەن، لە یەك کاتدا **دوو خەمی گەورە** رووی لێ دەکات، خەمی لەدەستچوونی دەسەڵاتەکە، لەگەڵ خەمی بەرزبوونەوە و بەهێزبوونی زۆرتر و زیاتر، **بۆ خەمی یەکەمیان** بەزەیی بە هیچ کەسێکدا نایەتەوە ململانێی بکات و بیەوێت ئەو لە دەسەڵات دوور بخاتەوە، بۆیە دەکەوێتە گومان کردن لە دەوروبەر، پاشان کەنارگیرکردنی هەموو ئەوانەی بە ئەو ناخۆن و دەسەڵاتەکەی لەق دەکەن، گەر ئەم هەنگاوانە بۆ مانەوەی دەسەڵاتی بەس نەبوون دەکەوێتە بەکارهێنانی سیاسەتی حەز و ترس(رەغبەت و رەهبەت) گەر بە پارە و پلە کەسانی دەوروبەری پێ دەستەمۆ نەکرا ئەوا دەکەوێتە بەکارهێنانی توندوتیژی، سەرەتا بە زمانی داشۆردن دایان دەشۆرێ، واتە

کەسایەتی مەعنەوییان دەکوژێت، گەر ئەمە چارەسەر نەبوو، بەندیخانە و دوورخستنەوە، گەر هیچ چارەسەرێك نەما ئەوا کوشتن و کۆتا پێهێنان دەبێتە بەشێك لە چارەسەر، بۆ **خەمی دووەم،** دەکەوێتە چەمانەوە و خۆ شۆڕکردنەوە بۆ هەموو ئەوانەی لە خۆی بەهێزترن، تاکو پشتیوانی بکەن و دەسەلاتەکەی بەهێز بکەن، هەر ساتێکیش زەمینەی بۆ رەخسا ئەوانەی سەرەوەی خۆی تێکوپێك دەشکێنێ و شوێنەکەیان لێ داگیر دەکات، ئێستا ئەم هەموو وێنە چەپەلانەی دەسەلات بهێنە بەرچاوی خۆت، ئایا ئەو مرۆڤانەی دەکەونە ناو ئەم گەمە شەیتانییەوە ئاسوودە و ئارامن، یان دۆزەخێکیان لەم دونیا بۆ خۆیان هەلگیرساندووە؟! ئایا ئەم جۆرە مرۆڤانە گیانی مرۆییان تێدا ماوە؟ ئایا ئەمانە دەتوانن خزمەت بە مەردوومان بکەن، یان کۆمەلێك گورگن و خۆیان لە پۆشاکی مرۆڤدا نمایش دەکەن؟ ئەمە بریتییە لەو کۆتاییە ترسناك و پڕ لە ئازارەی رووبەڕووی ئەهلی دەسەلات دەبێتەوە، ئایا تۆ دەتوانی بە ئیمانەکەت بەرگەی ئەو دونیا لە فێلّ و تاوان و ململانێ بگریت؟ ئەگەر وەلامەکەت "بەلّێ"یە ئەوا دەتوانی ویلایەت بگریتە دەست، بەلام "بەلّێ"یەك خالّی بێت لە حەزی نەفس.

❁ دەرەوەی دەسەلات کە پڕە لە زرق و برق و ناوبانگ و مالّ و سامان و چەمانەوەی خەلّك بانگ لە مرۆڤ دەکەن بۆ ئەوەی رووی لێ بکەن، بەلام ناوەوە و راستەقینە و جەوهەری دەسەلات رێگری دەکەن لەوەی مرۆڤ بەو زرق و برقە فریو بخوات، بۆیە کەسی ژیر و هۆشمەند توێکلّی زرق و برق لادەدات و لە کرۆك و جەوهەر دەڕوانێت.

❁ ❁ ❁

## حیکمەتی دووسەد و بیست و نۆ

((إِنَّمَا جَعَلَهَا مَحَلاًّ لِلأَغْيَارِ، وَمَعْدِنًا لِلأَكْدَارِ تَزْهِيدًا لَكَ فِيهَا))

**راڤەی وشەكان:**

**محلا للأغيار**: شوێنی نەیار

**معدنا للأكدار**: كانزای لێڵی و تێكدانی خۆشییەكان

**تزهيدا لك فيها**: تاكو لە دونیا دەست بكێشیتەوە

**واتا ((دونیای كردووە بە شوێنی نەیار و كانزای تێكدانی خۆشییەكان تاكو لە دونیا دەست بكێشیتەوە))**

**شرۆڤە:**

دونیا و خۆشییەكانی دونیا خاڵی نین لە لێڵی و ناخۆشی، بەڵكو لە پاڵ هەر خۆشییەكدا ناخۆشییەك دانراوە، لە پاڵ هەر نیعمەتێكدا تاڵی و دژوارێك راست دەبێتەوە، كامەی بە تۆ یارە نەیارێك لە پاڵیدا نێژراوە، خۆشی پاڵفتە و تام و چێژی ساف و بێگەرد بوونیان نییە، بۆچی؟ چونكە ئێرە (دونیا) شوێنی مانەوەی هەتا هەتایی نییە، ئێرە وێستگەیەكی كاتییە و تاوێك تیایدا دەمێنینەوە و دواتر بەجێی دەهێڵین، دوورگەیەكە كەشتییەكەمان تیایدا لەنگەری گرتووە و پاش كۆكردنەوەی هەندێ لە خۆراك و ئامادەكردنی توێشوو دەست بە سەفەری دەریا دەكەینەوە﴿يَٰقَوۡمِ إِنَّمَا هَٰذِهِ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا مَتَٰعٞ وَإِنَّ ٱلۡأٓخِرَةَ هِيَ دَارُ ٱلۡقَرَارِ ﴿٣٩﴾﴾ غافر: ٣٩، خزمینە ئەم ژیانی دونیایە خۆشییەكی كەموكورتە، ژیانی دوارۆژ ژیانی هەتاهەتایی و ئارامگرتنە، ژیانی هەتاهەتایی و پڕ لە خۆشی و كەماڵ و دوور لە خەم و پەژارە ژیانی دوارۆژە﴿وَمَا هَٰذِهِ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَآ إِلَّا لَهۡوٞ وَلَعِبٞۚ وَإِنَّ ٱلدَّارَ ٱلۡأٓخِرَةَ لَهِيَ ٱلۡحَيَوَانُ﴾ العنكبوت: ٦٤، ئەم ژیانە نزمە هیچیتر نییە جگە لە گاڵتە و گەف، خانەی دوارۆژ ژیانی راستەقینەیە، خودای موتەعال نایەوێت دڵمان بە لای دونیاوە پاڵ بداتەوە، ئەو ناخۆشییەكان و نەیارەكانی لە دونیادا داناوە تاكو كۆچ لە

دونیا بکەین و بە خانەی هەتاهەتایی خۆمانی نەزانین، هەر کەس پاڵیدایەوە بە لای دونیادا خەمی دوارۆژی خۆی ناخوات، ئەمەش گەورەترین زیانۆمەندییە مرۆڤ ڕووبەڕووی دەبێتەوە.

# حیکمەتی دووسەد و سی

((عَلِمَ أَنَّكَ لاَ تَقْبَلُ النُّصْحَ الْمُجَرَّدَ فَذَوَّقَكَ مِنْ ذَوَاقِهَا مَا يُسَهِّلُ عَلَيْكَ وُجُودَ فِرَاقِهَا))

## راڤەی وشەکان:

**النصح المجرد:** ئامۆژگاری رووت

**فذوقك:** دەرخواردی دای، پێی چەشتیت

**ذواقها:** تامەکانی، مەبەستی مەینەتییەکانی دونیایە

**سهل عليك:** لەسەری ئاسان کردی

**وجود فراقها:** بوونی جیابوونەوە و دابڕان لە دونیا

**واتا ((خودا دەزانێت بەتەنها ئامۆژگاری رووت قبووڵ ناکەیت، بۆیە لە مەینەتی و ئازارەکانی دونیای دەرخوارددای بە جۆرێك بـوونی جیابوونـەوەی لەسـەر ئاسان کردی))**

## شرۆڤە:

سروشتی مرۆڤ داوا دەکات بۆ قسە و بۆچوونەکان بەڵگە و بورهانی کرداری لە واقیعی بەرهەستدا بوونی هەبێت، بەڵکو ئەوەندەی بە واقیعی بەرهەست کاریگەر دەبێت ئەوەندە بە قسە و ئامۆژگاری کاریگەر نابێت، مرۆڤ حەز دەکات شتەکان لەبەر چاویدا بەرجەستە بن، هەستەکانی تێدا بەگەڕ بخات، ئەزموونی شتەکان بکات و بۆ خۆی لێیان تێبگات، بۆیە خودای موتەعال زانستی بەوە هەیە کە باس کردنی رووی خراپی دونیا تەنها بە قسە کاریگەری لەسەر مرۆڤ بەجێناهێڵێت، بۆیە بەشێك لە مەینەتی و ئازارەکان دەرخواردی مرۆڤ دەدات تاکو ببێتە بەڵگە بۆ قسەکان و لەوێوە مرۆڤ باوەڕ بەوە بهێنێت کە ئەم دونیایە خانەی هەتاهەتایی نییە و خۆشییەکان و تام و چێژەکانی

کەموکورت و کاتیین، لەم تێگەیشتنەوە بیر لە خۆشی هەتاهەتایی و ژیان و زیندەگی کامڵ و تێر و تەواو بکاتەوە، ئەوەش تەنها ژیانی دواڕۆژە و بە ئیمان و کرداری چاکە بەدەست دێت، کاتێك مرۆڤ کەوتە سەر ئەم ڕەوگەیە ژیان و زیندەگی دونیاش خۆشی و ئارامی و ئاسوودەیی رووی لێ دەکات ﴿ مَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةً طَيِّبَةً ۖ وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٩٧﴾ ﴾ النحل: ٩٧، هەر کەس چاکە بکات-پیاو یان ژن- و خاوەنی ئیمان بێت بە ژیانێکی پاك و خۆش دەیژێنیین و بە باشترین کار و کردەوەیان پاداشتیان دەدەینەوە، خودای موتەعال فێرمان دەکات دوعا بکەین و داوا لە خودا بکەین لە ژیانی دونیا و دواڕۆژمان خێر و خۆشیمان پێ ببەخشێت و دەفەرموێت: ﴿ وَمِنْهُم مَّن يَقُولُ رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿٢٠١﴾ ﴾ البقرة: ٢٠١، بەپێچەوانەوە ئەوانەی ڕێگەی ئیمان و کرداری چاکە بزر دەکەن ژیانی دونیایان دەگۆڕێت بۆ کوێرەوەری و مەینەتی و دواڕۆژیشیان سزا و ئازاری سەخت ﴿ وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِى فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ أَعْمَىٰ ﴿١٢٤﴾ ﴾ طه: ١٢٤، هەر کەس پشت لە یادی من بکات ژیانێکی پڕ لە کوێرەوەری و مەینەتی هەیە و ڕۆژی دواییش بە کوێری حەشری دەکەین.

۞ ۞ ۞

# حیکمەتی دووسەد و سی و یەك

**((الْعِلْمُ النَّافِعُ هُوَ الَّذِی یَنْبَسِطُ فِی الصَّدْرِ شُعَاعُهُ، وَیَنْکَشِفُ بِهِ عَنِ الْقَلْبِ قِنَاعُهُ))**

## راڤەی وشەکان:

**ینبسط**: فی الصدر: لە سنگدا والا دەبێت

**شعاع**: تیشك و روناکی

**قناع**: دەمامك

**واتا ((زانستی بەسوود ئەو زانستەیە تیشك و روناکییەکەی لە سنگدا والا دەبێت و بەهۆیەوە دەمامکی سەر رووی دڵ دەرەوێتەوە))**

## شرۆڤە:

❁ زانست نووری هەیە، بەڵکو زانست نوور و رۆشناییە، هەر زانستێك نەزانی مرۆڤ—کە وەك تاریکی وایە- نەرەوێنێتەوە و وەهمەکانی مرۆڤ کە وەك سێبەر وایە نەسڕێتەوە و شك و گومانەکان کە وەك پەڵە هەوری رەش وان رانەماڵێت ناوەرۆکەکەی زانست نییە با ناوی زانستیشی لێ بنرێت.

❁ زانستی ناسینی خودا و رێگەی پەرستنی و پارێزگاری لە سنووری حەڵاڵ و حەرام لە لوتکەی زانستەکاندایە، بۆیە مەزنترین نووری تێدایە.

❁ ئەو زانستەی کە نووره سنگی پێ والا دەبێت، خودای موتەعال ترازوویەکی لە سینەی مرۆڤدا داناوە کە ترازووی فیترەتە، ئەم ترازووە کارە چاك و پاکەکان جوان و باش و پەسەند تەماشا دەکات و بە هۆیانەوە ئارامی و دڵاوایی رووی لێ دەکات، هەر بەو جۆرە کارە خراپ و ناپەسەندەکان لەلای نەشیاو و ناپەسەندە و بە هۆیانەوە بێزاری و گرژبوون رووی لێ دەکات، بۆیە بە زانستی نوورانی سنگ والا دەبێت و بە نەزانیش سینەی مرۆڤ لە تاریکیدا نوقم دەبێت.

۞ سیفەتێکی تری زانستی بەسوود لێکردنەوەی دەمامکەکانی دڵە، واتە ئەو پەردانەی لەسەر دڵ دەنیشن، قورئان ئاماژە بەو پەردانە دەکات و دەفەرموێت:﴿ كَلَّاۖ بَلۡۜ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ﴿١٤﴾﴾ المطففين: ١٤، وشەی "ران" داپۆشینە بە پەردە و داپۆشەری چڕ وپڕ.

۞ ۞ ۞

# حیکمەتی دووسەد و سی و دوو

((خَيْرُ الْعِلْمِ مَا كَانَتِ الْخَشْيَةُ مَعَهُ))

## راڤەی وشەکان:

**خير العلم**: باشترین زانست

**الخشية**: ترسان لە خودا

**واتا ((باشترین زانست ئەو زانستەیە لە خوداترسانی لەگەڵ بێت))**

## شرۆڤە:

زانستەکان قسە لە مرۆڤ و ژیان و گەردوون دەکەن، ئەم سێ مەیدانەی بوونیش لێوانلێون بە بەڵگە و نیشانە لە بوون و دەسەڵات و مەزنی خودای موتەعال، بەڵکو مرۆڤ و ژیان و گەردوون ئاوێنەیەکن بۆ نیشاندان و پەخش کردنەوەی نووری ناو و سیفەتە بەرز و شکۆمەندەکانی خودای موتەعال، بۆیە دەبێت ئامانج لە زانست تەنها زانست نەبێت، چونکە زانستی رووت بەبێ دۆزینەوەی بەڵگە و نیشانەکان و بینینەوەی ئایەتەکانی ئاسۆی دەروون و گەردوون تەنها توێکڵێکە کە نازانین ناوەوەی چی تێدایە، زانست بەبێ دۆزینەوەی بەڵگە و نیشانەکان وەك ئەوە وایە ئاو بە ئاو پێناسە بکرێت و بوترێت"ئاو بریتییە لە ئاو"، ئەم جۆرە رێچکەیە لە دەستبردن بۆ زانست زانست لە مەودایەکی دووردا بێ ئامانج دەکات، ئەگەر زانست تەنها بەدەستهێنانی بەختەوەری و لەشساغی و خۆشگوزەرانی بێت ئامانجێکی بچووکە و پێویستە لە پاڵیدا ئامانجە گەورەکە بەدەست بهێنین، ئەویش بوون و ناسینی خودای موتەعالە، ئەم قسەیە بەرتەسك کردنەوەی مەیدانی زانست نییە بە بیروباوەڕی ئایینی و کەسانێك پێیان وابێت بەو بیروباوەڕانە مەیدانی کارکردن لە ژیری مرۆڤ تەسك دەکرێتەوە و رێگە بە ژیری نادرێت ئەسپی خۆی ئازادانە تاوبدات، بەڵکو لەپاڵ ئەو ئامانجەی دەستەبەری دەکات پێویستە زانست بکات بە هۆکارێك بۆ ناسینی خودا و

بەدەستهێنانی خۆشبەختی دوارۆژ، لەوێوە مرۆڤ و کۆمەڵگەی تەندروست و هاوسەنگ بەرهەم بهێنرێت، خودای موتەعال وەسفی زانایان دەکات و دەفەرموێ ئەوانەی لە خودا دەترسن بەندە زاناکانی خودان﴿إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَٰٓؤُاْ﴿٢٨﴾﴾ فاطر: ٢٨، هەروەها شایەتی زانایانی بە دوای شایەتی خۆی و فریشتەکاندا -لەمەڕ تاکوتەنهایی خودا- هێناوە﴿ شَهِدَ ٱللَّهُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَأُوْلُواْ ٱلْعِلْمِ قَآئِمًۢا بِٱلْقِسْطِۚ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿١٨﴾﴾ آل عمران: ١٨

# حیکمەتی دووسەد و سی و سێ

((الْعِلْمُ إِنْ قَارَنَتْهُ الْخَشْيَةُ فَلَكَ، وَإِلاَّ فَعَلَيْكَ))

**راڤەی وشەکان:**

**قارنته:** هاوەڵی کرد، هاوتایی کرد

**فلك:** بۆ تۆیە

**فعلیك:** لەسەر تۆیە

**واتا ((گەر ترسان لە خودا هاوەڵی زانستی کرد ئەو زانستە بۆ تۆیە، ئەگەر نە، لەسەر تۆیە))**

**شرۆڤە:**

ئەم حیکمەتە تەواوکاری حیکمەتەکەی پێشووە، پێشتر باسی ئەوەی کرد باشترین زانست ئەوەیە لە خوداترسانی لەگەڵ بێت، لێرەش دەفەرموێ: گەر زانست هاوتای لە خوداترسان بوو، واتە بە ئەندازەی زانستەکە خودای ناسی و لە خوداترسان لە ناخیدا سەریهەڵدا ئەم لە خودا ترسانەش لە نێت و قسە و کرداریدا رەنگی دایەوە، ئەوا ئەو زانستە توێشوویەکی مەزنە بۆ خاوەنەکەی، خودای موتەعال پلەی ئەهلی زانستی خاوەن ئیمانی خستۆتە سەرو پلەی ئیماندارانەوە﴿يَرْفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنكُمْ وَٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ دَرَجَٰتٍ﴾المجادلة: ١١، ئەوانەی ئیمانیان هێنا خودا پلەیان بەرز دەکاتەوە و ئەوانەش خاوەنی زانستن چەندین پلە و پایەیان بەسەر ئەواندا هەیە، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: **((من سلك طريقاً يلتمس فيه علماً سهل الله له به طريقاً إلى الجنة وما اجتمع قوم في بيت من بيوت الله يتلون كتاب الله ويتدارسونه الا نزلت عليهم السكينة وغشيتهم الرحمة وحفتهم الملائكة وذكرهم الله فيمن عنده))**[٣٦]، لەم فەرموودە شیرینەدا فەزڵ و

---

٣٦ رواه مسلم.

گەورەیی ئەهلی زانستمان بۆ ڕۆشن دەبێتەوە، ئاسان بوونی ڕێگەی بەهەشت بەهۆی زانستەوەیە، هەروەها سەکینەت و ڕەحمەت و دابەزینی فریشتەکان بۆ سەر مەجلیسی زانست، گەر زانست ئەم بەرە شیرینانەی لێوە پەیدا نەبوو با خاوەنەکەی بزانێت ئەوە زانستێکە وەباڵەکەی لە ئەستۆیەتی و لە ڕۆژی دواییدا پێیەوە گیرۆدە دەبێت، لەم مەیدانەدا هەڕەشەی زۆر لە ئەهلی زانست هەیە کە کاریان بە زانستەکەیان نەکردووە، لەوانە بەشێك لەو فەرموودەی ئیمامی "مسلم"ە کە دەفەرموێت:((کەسێك زانست فێربووە و خەڵکیشی فێری زانست کردووە و قورئانی خوێندووە... خودا پرسیاری لێ دەکات: چیت بە زانستەکەت ئەنجامداوە؟ ئەویش دەڵێ: زانست فێربووم و خەڵکیم بە زانست فێرکرد و قورئانم دەخوێند لە پێناویدا، خودا پێی دەفەرموێ: درۆ دەکەی، بۆیە زانست فێربووی بۆ ئەوەی پێت بوترێت زانا، بۆیە قورئانت دەخوێند بۆ ئەوەی پێت بوترێت قورئان خوێن، لەوێ پێیان وتیت، پاشان فەرمان دەکات بە ڕوودا ڕایدەکێشن و هەڵیدەدەنە ناو ئاگرەوە)) [٣٧]

٣٧ ((عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ ، قَالَ: تَفَرَّقَ النَّاسُ عَلَى أَبِي هُرَيْرَةَ ، فَقَالَ لَهُ قَائِلٌ مِنْ أَهْلِ الشَّامِ: أَيُّهَا الشَّيْخُ، حَدِّثْنِي حَدِيثًا سَمِعْتَهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: نَعَمْ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، يَقُولُ: " أَوَّلُ النَّاسِ قَضَاءً يَوْمَ الْقِيَامَةِ ثَلَاثَةٌ: رَجُلٌ اسْتُشْهِدَ فَأُتِيَ بِهِ فَعَرَّفَهُ نِعَمَهُ فَعَرَفَهَا، قَالَ: فَمَا عَمِلْتَ فِيهَا ؟ قَالَ: قَاتَلْتُ فِيكَ حَتَّى اسْتُشْهِدْتُ، قَالَ: كَذَبْتَ وَلَكِنَّكَ قَاتَلْتَ لأَنْ يُقَالَ: فُلانٌ جَرِيءٌ، فَقَدْ قِيلَ، ثُمَّ أُمِرَ بِهِ فَيُسْحَبُ عَلَى وَجْهِهِ حَتَّى أُلْقِيَ فِي النَّارِ، وَرَجُلٌ تَعَلَّمَ الْعِلْمَ وَعَلَّمَهُ وَقَرَأَ الْقُرْآنَ فَأُتِيَ بِهِ فَعَرَّفَهُ نِعَمَهُ فَعَرَفَهَا، قَالَ: فَمَا عَمِلْتَ فِيهَا ؟ قَالَ: تَعَلَّمْتُ الْعِلْمَ وَعَلَّمْتُهُ وَقَرَأْتُ فِيكَ الْقُرْآنَ، قَالَ: كَذَبْتَ وَلَكِنْ تَعَلَّمْتَ الْعِلْمَ لِيُقَالَ: عَالِمٌ وَقَرَأْتَ الْقُرْآنَ لِيُقَالَ: قَارِئٌ فَقَدْ قِيلَ، ثُمَّ أُمِرَ بِهِ فَيُسْحَبُ عَلَى وَجْهِهِ حَتَّى أُلْقِيَ فِي النَّارِ، وَرَجُلٌ وَسَّعَ اللَّهُ عَلَيْهِ وَأَعْطَاهُ أَصْنَافَ الْمَالِ كُلِّهِ فَأُتِيَ بِهِ فَعَرَّفَهُ نِعَمَهُ فَعَرَفَهَا، فَقَالَ: مَا عَمِلْتَ فِيهَا ؟ قَالَ: مَا تَرَكْتُ مِنْ سَبِيلٍ، يَعْنِي تُحِبُّ أَنْ يُنْفَقَ فِيهَا إِلا أَنْفَقْتُ فِيهَا لَكَ، قَالَ: كَذَبْتَ وَلَكِنَّكَ فَعَلْتَ لِيُقَالَ: إِنَّهُ جَوَادٌ فَقَدْ قِيلَ، ثُمَّ أُمِرَ بِهِ فَيُسْحَبُ عَلَى وَجْهِهِ حَتَّى أُلْقِيَ فِي النَّارِ))حديث مرفوع

# حیکمەتی دووسەد و سی و چوار

((مَتَى آلَمَكَ عَدَمُ إِقْبَالِ النَّاسِ عَلَيْكَ أَوْ تَوَجُّهُهُمْ بِالذَّمِّ إِلَيْكَ فَارْجِعْ إِلَى عِلْمِ اللهِ فِيكَ، فَإِنْ كَانَ لاَ يُقْنِعُكَ عِلْمُهُ فَمُصِيبَتُكَ بِعَدَمِ قَنَاعَتِكَ بِعِلْمِهِ أَشَدُّ مِنْ مُصِيبَتِكَ بِوُجُودِ الأَذَى مِنْهُمْ))

## راڤەی وشەکان:

**آلمك:** ئازاری دایت

**إقبال:** رووتێکردن

**الذم:** بە خراپ باس کردن

**الأذى:** ئازار، ئێش

**واتا ((هەر کات رووتێنەکردنی خەڵکی و زەمکردنیان ئازاریان پێگەیاندی بگەڕێرەوە بۆ زانستی خودا لەسەر خۆت، گەر بەزانستی خودا قەناعەتت نەکرد ئەوا موسیبەتەکەت بەوەی قەناعەت ناکەیت بە زانستی خودا گەورەترە لە موسیبەتەکەت بە چەشتنی ئازار لە دەستی ئەوانەوە))**

## شرۆڤە:

یەکێك لە ئافەتەکانی ئەهلی زانست ناوبانگ و رووتێکردنی خەڵکییە، بۆیە ئەو زانایانەی کە دەروونی خۆیان تەزکیە نەکردووەو بۆ پلە بالآکانی زانست و ئیمان سەرنەکەوتوون کاتێك خەڵکی لە دەوریان کۆدەبنەوە و قوتابی و شاگردیان زۆر دەبێت لوتبەرزی و فەخرکردن روویان لێ دەکات و چێژ لە ناوبانگ و شوێنکەوتووان وەردەگرن، خۆ گەر خەڵکی روویان تێنەکات و بە خراپ و نەزان ناوی بهێنن ئازار لە ناخیاندا سەرهەڵدەدات، ئەم خۆشحاڵ بوون و ئازار چەشتنە بە رووتێکردن و پشتهەڵکردنی خەڵکی نیشانەی ناتەواوی و کزی باوەڕە، چونکە عاریفان مەدح و زەمی خەڵکی لە

لایان یەکسانە، بەڵکو هەندێ لە چاکان زەمی خەڵکیان لە مەدح کردنیان پێخۆشتر بووە، ئیبن عەتا بۆ ئەم دۆخە خراپەی دەروونی کەسەکە چارەسەر دادەنێت و دەفەرموێت: هەر کات بە خراپ ناوهێنانی لەلای خەڵك ئازاری بدات پێویستە بگەڕێتەوە بۆ زانستی خودا لەسەر خۆی، واتە گەر قسە و رەخنەکانی خەڵکی ناڕاست بوون بە خۆی بڵێت "ئەوەندە بەسە کە خودا من دەبینێت و دەزانێت من بەو جۆرە نیم"، لەگەڵ ئەمەشدا پێویستە ئەو زانستەی خودا لەسەر خۆی ئارامی پێ ببەخشێت و ئازارەکانی قسەی خەڵکی لە ناخیدا بسڕێتەوە، گەر قسە و رەخنەکانی خەڵك راستبوون، پێویستە مرۆڤ پێداچوونەوە بە هەڵە و ناتەواوییەکانیدا بکات و چارەسەری دەرد و نەخۆشییەکانی خۆی بکات، گەر کەسەکە بە زانستی خودا لەسەری ئارامی بۆ نەهات ئەوا ئەو کەسە دوو موسیبەت رووی لێکردووە، **یەکەمیان** ئەو موسیبەتەی کە بە زەمی خەڵکی ئازار دەخوات، ئەوەش نیشانەی ئەوەیە کە خەڵکی دڵ و دەروونی داگیرکردووە و بە کارەکانی دەیەوێت شوێنی خۆی لە دڵیاندا بکاتەوە، **موسیبەتی دووەم** کە لەوەی یەکەم گەورەترە ناڕازیبوونە بە زانستی خودا لەسەر ئەو، ئەمەش نیشانەی لاوازی ئیمان و بێئاگاییە لە خودا و زانستی خودا، ئەگەر موسیبەتی یەکەم نیشانەی خۆشەویستی مەدح و سەنای خەڵك بێت، ئەوا موسیبەتی دووەم نیشانەی دوورییە لە خوداوە، بۆیە موسیبەتی دووەم لە یەکەم گەورەترە.

# حیکمەتی دووسەد و سی و پێنج

((إِنَّمَا أَجْرَى الأَذَى عَلَى أَيْدِيهِمْ كَيْلاَ تَكُونَ سَاكِنًا إِلَيْهِمْ، أَرَادَ أَنْ يُزْعِجَكَ عَنْ كُلِّ شَيْءٍ حَتَّى لاَ يَشْغَلَكَ عَنْهُ شَيْءٌ))

## راڤەی وشەکان:

**أجرى:** تێیدەپەڕێنێت

**ساكنا إليهم:** دڵت بە لایانەوە ئارامی بۆ بێت

**يزعجك:** بێزارت بکات

**واتا ((ئازار لەسەر دەستی ئەوان -بۆ سەر تۆ- تێدەپەڕێنێت بۆ ئەوەی دڵت پاڵنەدات بە لایانەوە و ئارامیت لەلای ئەوان نەبێت، خودا دەیەوێت لە هەموو شتێك بێزارت بکات تاکو هیچ شتێك لە خودا سەرقاڵت نەکات))**

## شرۆڤە:

❁ مرۆڤ کە ئازاری لە دەستی شتێك یان کەسێك خوارد ئیتر ئارامی و سوکنایی لای ئەو کەس و شتە نییە، نەبوونی ئارامی لەلای کەسێك یان شتێك مانای رق لێ بوون ناگەیەنێت، بەڵکو بە جوانترین و دروستترین شێوە پێیان تێکەڵ دەبێت و مافەکانیان جێبەجێ دەکات، بەڵام ئارامی دڵی بە هیچ کەس جگە لە خودا نابەخشێت، بەڵکو ئارامی و سوکنایی تەنها لەلای خودایە، بۆیە عاریفان خۆشترین کاتیان ئەو کاتانەیە لەگەڵ خودا تەنها دەکەون، بە تایبەت لە شەودا، بەڵام کاتێك تێکەڵ بە خەڵکی دەبن بە خۆشەویستی خوداوە و لەبەر خودا رەفتار جوان و رەوشت بەرز و رووخۆشن، ئەمە بریتییە لە ئەخلاقی بەرزی پێغەمبەرانە کە زانایان و عاریفان پێیەوە پابەند دەبن.

❁ کاتێك ئازار لە کەس و شتەکانەوە رووت لێ دەکات بزانە حیکمەتی گەورەی خودا لە پشتی ئەو کارەوەیە، ئەو(ﷻ) دەیەوێت بەندەکەی خۆی پاڵ بە کەسەوە نەدات و

ئارامی و سوکنایی لای کەس بەدەست نەهێنێت جگە لە خۆی، بۆیە لە شتەکان و کەسەکان وەحشەتت بۆ دروست دەکات، وەحشەتێك دوای جێبەجێ کردنی مافی دەوروبەر بە زووترین کات لێیان هەڵبێیت و بگەڕێیەوە بۆ لای پەروەردگارت، مرۆی باوەڕدار بە هەمیشەیی لە هەڵهاتندایە بۆ لای خودا﴿ فَفِرُّوٓاْ إِلَى ٱللَّهِۖ إِنِّي لَكُم مِّنۡهُ نَذِيرٞ مُّبِينٞ ﴿٥٠﴾ ﴾ الذاريات: ٥٠، هەڵبێن بۆ لای خودا من لەلای ئەوەوە بۆ ئێوە ترسێنەرێکی دیار و ئاشکرام، مەقامی هەڵهاتن(**الفرار**) لە ئیماندا لە سەرەتاوە دەست پێدەکات و تا دوایین هەناسە بەردەوامە، چۆن؟ سەرەتا فیرار لە کوفر بۆ لای ئیمان، دواتر فیرار لە شیرك بۆ لای تەوحید، ئەوجا فیرار لە کاروکردەوەی خراپ بۆ لای کاروکردەوەی چاکە، پاشان فیرار لە دۆستان و خەڵکانی خراپ بۆ لای دۆستان و خەڵکانی باش، ئەوجا فیرار لە سیفەتە ناباشەکانی مرۆڤ بەرەو سیفەتە باش و پەسەندەکان، بەدوایدا فیرار لە ئاستە نزمەکانی باوەڕ بەرەو ئاستە بەرزەکانی ئیمان، دواتر فیرار لە وەستان لەپای ئەو ئایەت و بەڵگە و نیشانانەی لە سەفەری بەرەو خوداچووندا دەیبینێت بەرەو خودا خۆی، پاشان فیرار لە واریداتی ڕەببانی بەرەو سەرچاوەی واریدات، بە کورتی فیرارکردن لە هەرچی شتی ماددی و مەعنەوییە بۆ لای خودا خۆی، مرۆی باوەڕدار لە گەشتی ئیماندا بە هیچ کەس و هیچ شت و دیاردەیەکەوە ڕاناوەستێت، بەڵکو لە تەکانی بەردەوامدایە بۆ لای پەروەردگاری﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡإِنسَٰنُ إِنَّكَ كَادِحٌ إِلَىٰ رَبِّكَ كَدۡحٗا فَمُلَٰقِيهِ ﴿٦﴾ ﴾ الانشقاق: ٦، ساتێك نییە مرۆی باوەڕدار تیایدا وەستاو بێت، ئەو بە هەمیشەیی لە جووڵە و گۆڕان و تەکاندایە و هیچ شتێك ناتوانێت ڕایبوەستێنێ و بە خۆیەوە سەرقاڵی بکات، چونکە ئەو تەنها خودای بە ئامانج گرتووە و تا دوا هەناسە لە گەشتی قەلبی خۆی بەردەوامە.

۞ ۞ ۞

# حیکمەتی دووسەد و سی و شەش

((إِذَا عَلِمْتَ أَنَّ الشَّيْطَانَ لاَ يَغْفُلُ عَنْكَ فَلاَ تَغْفُلْ أَنْتَ عَمَّنْ نَاصِيَتُكَ بِيَدِهِ))

**راڤەی وشەكان:**

**لا یغفل عنك**: لێت بێئاگا نابێت

**ناصیتك**: ناوچاوانت، چارەنووست

**واتا ((گەر ئەوەت زانی كە شەیتان لە تۆ بێئاگا نابێت ئەوا تۆش لەو كەسە بێئاگا مەبە كە چارەنووس و ناوچاوانت لە دەستیدایە))**

**شرۆڤە:**

❁ شەیتان-نەفرەتی خودای لێ بێت- بۆ تەنها ساتێكیش لە مرۆڤ بێئاگا نابێت، ئەو سوێندی بۆ خودا خواردووە مرۆڤ گومڕا بكات و لە ڕێگە لایان بدات ﴿ قَالَ فَبِمَآ أَغْوَيْتَنِي لَأَقْعُدَنَّ لَهُمْ صِرَٰطَكَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ﴿١٦﴾ ثُمَّ لَأٓتِيَنَّهُم مِّنۢ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ وَمِنْ خَلْفِهِمْ وَعَنْ أَيْمَٰنِهِمْ وَعَن شَمَآئِلِهِمْ ۖ وَلَا تَجِدُ أَكْثَرَهُمْ شَٰكِرِينَ ﴿١٧﴾ ﴾ الأعراف: ١٦–١٧، سوێند بە عیززەتی خودا دەخوات كە لەسەر ڕاستە شەقامی ڕاست و دروست ڕابوەستێ تاكو ئەوانەی ڕێگەی ئیمان و ئیسلامیان گرتۆتە بەر گومڕایان بكات و فریویان بدات و سەریان لێ بشێوێنێ و وایان لێ بكات زۆربەیان كوفر بەخودا و نیعمەتی خودا بكەن لە جێگەی ئیمان و گەردنكەچی و سوپاسگوزاری بۆ پەروەردگار، ئیبن عەبباس لەسەر ئایەتی حەڤدەی سورەتی **"الأعراف"** كە لە سەرەوە ئاماژەی پێكراوە دەفەرموێت: ((**"من بين أيديهم"**واتە گومانیان لەسر دواڕۆژ و زیندووبوونەوە بۆ دروست دەكەم، **"ومن خلفهم"** حەزی دونیایان لەلا دروست دەكەم، **"وعن أيمانهم"**كاروباری ئایینییان لێ ناڕوون و پڕ لە تەمومژ دەكەم، **"وعن شمائلهم"** گوناه و یاخیبوونیان لەلا جوان و شیرین دەكەم و باتڵییان لێ دەگۆڕم بە حەق و ڕاستی))، مرۆی باوەڕدار ئیمانەكەی ئەو قەڵایەیە ڕووی

لێ دەکات بۆ رزگاربوون لە دەستی دوژمنەکەی، بۆیە پێویستە دەرگای غەفڵەت دابخات و هەمیشە چاودێری خودایی بەسەر خۆیەوە ببینێت، خودا ئەو پشت و پەنایەیە کەسی باوەڕدار لە هێزی شەیتان قوتار دەکات، **"ذو النون المصري"** دەفەرموێت: ((گەر شەیتان ئێمە دەبینێت و ئێمە ئەو نابینین ئەوا خودا ئەو دەبینێت و ئەو خودا نابینێت، بۆیە داوای کۆمەك و یارمەتی لە خودا بکە))

۞ غەفڵەت یەکێکە لەو دەروازە بەرینانەی شەیتان لێیەوە دێتە ژوورەوە، بۆیە بە یادی خودا تاریکی و تەمومژی بێئاگایی بڕەوێنەوە﴿ **إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ إِذَا مَسَّهُمۡ طَٰٓئِفٞ مِّنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ تَذَكَّرُواْ فَإِذَا هُم مُّبۡصِرُونَ ٢٠١** ﴾ الأعراف: ٢٠١، تێڕامان لەم ئایەتە پیرۆزە بکە و ببینە یادی خودا چ گرنگی و کاریگەرییەکی هەیە لەسەر رەواندنەوەی شەپۆلە شەیتانییەکان.

۞ ۞ ۞

# حیکمەتی دووسەد و سی و حەوت

((جَعَلَهُ لَكَ عَدُوًّا لِيَحُوشَكَ بِهِ إِلَيْهِ، وَحَرَّكَ عَلَيْكَ النَّفْسَ لِيَدُومَ إِقْبَالُكَ عَلَيْهِ))

**راڤەی وشەکان:**

**ليحوشك به إليه:** بۆ ئەوەی بە ئەو بۆ لای خۆی بتگێڕێتەوە

**ليدوم إقبالك:** تاکو رووتێکردنت بۆ خودا بەردەوام بێت

**واتا ((شەیتانی بۆ کردووی بە دوژمن تاکو بەهۆی ئەوەوە بۆ لای خودا بگەڕێیەوە(هەڵبێیت بۆ لای خودا)، نەفسی لێت جووڵاندووە تاکو رووکردنە خودات بەردەوام بێت))**

**شرۆڤە:**

❁ دوژمنایەتی شەیتان لەگەڵ رۆڵەکانی ئادەم خودا بۆخۆی لە قورئاندا رایگەیاندووە ﴿ أَلَمْ أَعْهَدْ إِلَيْكُمْ يَا بَنِي آدَمَ أَن لَّا تَعْبُدُوا الشَّيْطَانَ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿٦٠﴾ ﴾ يس: ٦٠، لەم ئایەتەدا عیبادەتی شەیتان بریتییە لە گوێڕایەڵی کردنی و سەرپێچی کردنی فەرمانی خودا و لادان لە رێگەکەی، مرۆڤ بۆ رزگاربوون لەدەست دوژمنەکانی هەمیشە بەدوای پشتوپەنایەکدا دەگەڕێت بۆ ئەوەی خۆی بداتە پاڵ و بەرانبەر بە دوژمنەکەی هێز و پشتیوانی پێ ببەخشێت، خودای موتەعال بە حیکمەتی خۆی شەیتانی خەلق کردووە و دوژمنایەتییەکەشی بۆ مرۆڤ ئاشکرا کردووە بۆ ئەوەی مرۆڤ بەدوای پشت و پەنای مەزندا بگەڕێت و هەڵبێت بۆ لای پەروەردگار، دەبێ کەسی باوەڕدار ئەوە بزانێت کە بە تەنها ناتوانێت دوژمنەکەی ببەزێنێت، بۆیە بە هەمیشەیی دەبێ پەنا بۆ پەروەردگاری ببات﴿ فَإِذَا قَرَأْتَ الْقُرْآنَ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ ﴿٩٨﴾ إِنَّهُ لَيْسَ لَهُ سُلْطَانٌ عَلَى الَّذِينَ آمَنُوا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٩٩﴾ ﴾ النحل: ٩٨-٩٩، لە ئایەتی یەکەمیاندا فەرمانی کرد بە پەناگرتن و هانابردن بۆ لای خودا لەدەست شەیتانی نەفرەتی، لە ئایەتەکەی تردا

ئاماژەی بەوەدا کە شەیتان لەسەر باوەڕداران و ئەوانەی تەوەکولیان بە پەروەردگاریانە هێز و دەسەلاّتی نییە.

❁ خودای موتەعال نەفسی لە مرۆڤدا خولقاندووە و حەز و ئارەزووی تێدا داناوە، ئەم نەفسە تەنها حەزەکانی خۆی دەبینێت و شەیتانیش جوانکردن و فریودانی بۆ دەخاتە روو، دونیاش زرق و برقەکانی خۆی بۆ نمایش دەکات، لێرەوە کەسی باوەڕدار دەکەوێتە نێوان چەندین دوژمنەوە کە هێزو توانای سنوورداری ئەو بەشی رووبەڕووبوونەوەی ئەو هەموو دوژمنە ناکات، بۆیە پێویستە روو لە پەروەردگاری بکات و بکەوێتە پاڕانەوە و نزای بەردەوام تاکو پەنای بدات و بەرانبەر دوژمنەکانی کۆمەکی بکات.

❁ ❁ ❁

# حیکمەتی دووسەد و سی و هەشت

((مَنْ أَثْبَتَ لِنَفْسِهِ تَوَاضُعًا فَهُوَ الْمُتَكَبِّرُ حَقًّا، إِذْ لَيْسَ التَّوَاضُعُ إِلاَّ عَنْ رِفْعَةٍ، فَمَتَى أَثْبَتَّ لِنَفْسِكَ تَوَاضُعًا فَأَنْتَ الْمُتَكَبِّرُ حَقًّا))

**راڤەی وشەکان:**

**أثبت:** جێگیر بکات

**المتكبر:** لوتبەرز

**رفعة:** خۆبالاکردن، خۆبەرزکردنەوە

**واتا ((شەیتانی بۆ کردووی بە دوژمن تاکو بەهۆی ئەوەوە بۆ لای خودا بگەڕێیەوە(هەڵبێیت بۆ لای خودا)، نەفسی لێت جوولاندووە تاکو رووکردنە خودات بەردەوام بێت))**

**شرۆڤە:**

تەوازوع ئەخلاقێکی بەرزی باوەڕدارە، رەوشتێکە لە قسە و رەفتار و دەربڕینی هەستەکاندا رەنگ دەداتەوە، بەڵام خاوەنەکەی هەستی پێ ناکات و بانگەشەی بۆ ناکات، چونکە دەربڕینێکی ئەقڵی و زەینی نییە، بەڵکو هەست و کردارێکی قووڵە و لە قولاییە نادیارەکانی ناخی مرۆڤەوە هەڵدەقولێت، هەر کات کەسێك بانگەشەی تەوازوعی کرد، یان رەفتارێکی نواند بە مەبەستەوە تاکو خەڵکی تەوازوعی لێ بخوێننەوە، بۆ نموونە زەمی نەفسی خۆی بکات، یان کارێك ئەنجام بدات لە ئاستی ئەودا نەبێت تاکو پێی بڵێن کەسێکی متەوازیعە ئەوا ئەو کەسە لوتبەرزە و لە هیچ رێگەیەکەوە رەفتارەکانی ناچنەوە سەر ئەخلاقی تەوازوع، ئەبوبەکری شیبلی دەفەرموێت:((هەر کەس بەها و نرخی بۆ خۆی جێگیر کرد ئەو کەسە لە تەوازوع هیچ بەشێکی نییە))، نیشانەی تەوازوعی کەسی متەوازیع ئەوەیە کاتێك لۆمە دەکرێت

تووڕه نابێت و باكێكی نییه گەر خەڵكی زەمی بكەن یان تۆمەتی گەوره بدەنه پاڵی و هەوڵ و كۆشانی بۆ ئەوه نییه پله و پایه له ناخی خەڵكیدا بەدەست بهێنێت، ئەبو یەزید دەفەرموێت:((هەتا بەنده پێی وابێت كەسێك هەیه لەو خراپتر بێت ئەو كەسه لوتبەرزه)).

# حیکمەتی دووسەد و سی و نۆ

((لَيْسَ الْمُتَوَاضِعُ الَّذِي إِذَا تَوَاضَعَ رَأَى أَنَّهُ فَوْقَ مَا صَنَعَ، وَلَكِنَّ الْمُتَوَاضِعَ الَّذِي إِذَا تَوَاضَعَ رَأَى أَنَّهُ دُونَ مَا صَنَعَ))

## راڤەی وشەکان:

**فوق ما صنع:** لەسەرو ئەوەوەیە کە ئەنجامیداوە

**دون ما صنع:** لەخوار ئەوەوەیە ئەنجامیداوە

**واتا ((کەسی متەوازیع ئەو کەسە نییە کە تەوازوع دەنوێنێت پێیوایە لەسەرو ئەوەوەیە کە ئەنجامیداوە، بەڵکو کەسی متەوازیع ئەو کەسەیە کە تەوازوع نیشان دەدات پێیوایە لەخوار ئەوەوەیە ئەنجامیداوە))**

## شرۆڤە:

تەوازوع بەر لەوەی رەفتار و نمایش بێت ئەخلاقێکی ناوەکییە، بەر لەوەی کردار بێت هەستێکی قووڵی ناخی مرۆڤە، بۆیە نەبوونی هەریەکێك لەم دوو پێکهێنەرە نەنگی دەخاتە رەوشتی تەوازوعەوە، گەر رەفتاری تەوازوع بنوێنێت و ئەخلاق و هەستی تەوازوع لە پشتییەوە نەبێت ئەو کەسە متەوازع نییە و تەوازوعی ئەنجام نەداوە، بۆ نموونە کەسێك لە خوارەوەی مەجلیسدا دادەنیشێت و پێیوایە شوێنی ئەو سەرەوەی مەجلیسە، بەڵام بەهۆی تەوازوعەوە خوارەوەی مەجلیسی هەڵبژاردووە، ئەم کەسە کارەکەی بە تەوازوع ناژمێررێت، چونکە پێیوایە شوێنی ئەو سەرەوەیە نەك خوارەوە ئەمەش لەخۆیدا لوتبەرزییە، یان کەسێك شوێنی دەستنوێژو خۆپاککردنەوە لە مزگەوتدا خاوێن دەکاتەوە و پێیوایە ئەو کارە کاری ئەو نییە و تەنها بۆ تەوازوع ئەو کارە ئەنجام دەدات، ئەم کەسە کەسێکی نەفس بەکەمزان نییەو گیانی لوتبەرزی تێدایە، یان گەر هەست و ئەخلاقی تەوازوعی تێدا بوو، بەڵام رەفتار و کارەکانی

پڕبوون لە لوتبەرزی و خۆبەزلزانیین ئەوا ئەو کەسە دیسان تەوازوعی نیشان نەداوە، چونکە ئەخلاقی تەوازوع لەگەڵ مەردووماندایە و نیشاندانی رەوشتێکی بەرز و شیرینە بە خەڵکی، بەلاّم بۆ ئەمەی دووەمیان ناتوانین بڵێین ئەم کەسە لە ناخیدا لوتبەرزی و خۆبەزلزانیین بوونی هەیە، هەرچەند ئێمە لە رەفتار و کردارەکانەوە بڕیار بەسەر کەسێکدا دەردەکەین، تەوازوعی راستەقینە ئەوەیە کاتێك رەفتار و کرداری تەوازوع دەنوێنیت پێتوابێت تۆ شایستەی خوارتر لەوەی ئەنجامتداوە، خۆت بە شایستەی دانیشتن لە مەجلیسەکە نەزانیت، نەك سەرەوە بۆ خۆت بە شایستە ببینیت، پێتوابێت ئەوەی ئەنجامت داوە کەسە گەورەکان ئەنجامی دەدەن، نەوەك تۆ، ئەمەش تەنها کەسانێك دەتوانن بەدەستی بهێنن کە بەهۆی ناسینی ناو و سیفەتە شکۆمەندەکانی خودای موتەعالەوە بچووکی و ناتەواوی و دەستەوسانی و هەژاری و بیٚ توانایی خۆی بۆ دەرکەوتووە، بۆیە بەها و نرخێك ناداتە پاڵ نەفسی خۆی، ئەم ناسینەش بووە بە هەستێکی قووڵ و ئەخلاقێکی دامەزراو لە ناخیدا.

# حیکمەتی دووسەد و چل

((التَّوَاضُعُ الْحَقِيقِيُّ هُوَ مَا كَانَ نَاشِئًا عَنْ شُهُودِ عَظَمَتِهِ وَتَجَلِّي صِفَتِهِ))

## شرۆڤەی وشەکان:

**ناشئا:** سەرهەڵدەدات

**شهود عظمته:** بینینی مەزنی و شکۆمەندی خودای موتەعال

**تجلي صفته:** جیلوەکردنی سیفەتی خودا

واتا **((تەوازوعی راستەقینە ئەوەیە کە لە بینینی مەزنی و شکۆمەندی خودا و جیلوەکردنی سیفەتەکانییەوە سەریهەڵدابێت))**

## شرۆڤە:

لە حیکمەتەکەی پێشوودا ئاماژەی بە چەند جۆرێك لە تەوازوع کرد، تەوازوعێك کە خاوەنەکەی پێیوایە تەوازوع بێت، ئەوەش ئەو رەفتارانەی تەوازوع دەگرێتەوە کەسەکە ئەنجامی دەدات و پێیوایە پلە و پایە و ئاستی ئەو لە سەرو ئەو رەفتارانەوەیە، بەلاّم کەسەکە بۆ تەوازوع ئەو کارە ئەنجام دەدات، جۆری دووەمی تەوازوع ئەوەبوو کە کەسەکە تەوازوع دەنوێنێت و پێیوایە ئاست و پلەی ئەو لە خوار ئەو کارانەوەیە، لێرەشدا جۆری سێیەم لە تەوازوع باس لێوە دەکات کە بریتییە لە تەوازوعێك لە ناسینی خودا و ناوو سیفەتەکانییەوە سەرچاوە دەگرێت و سەرهەڵدەدات، ئەو دەزانێت تەنها خودا **"الغني"**ە بۆیە هەمیشە خۆی بە هەژار لەبەردەمیدا نیشان دەدات، دەزانێت خودا بەدیهێنەر و دروستکەر و راگری ئەوە لە ناوەکانی**"الباريء، الخالق، القيوم"**ەوە بۆیە بە هەمیشەیی لەبەردەم خودادا گەردنکەچە و لێی دەپاڕێتەوە تاکو بوون و ماهییەتی پارێزگاری لیّ بکات، دەزانێت تەنها خودا خاوەنی ناو و سیفەتی**"الكبير، العظيم، المتكبر، الجبار، القهار"** بۆیە لەم ناو و سیفەتانەدا ململانیّ لەگەڵ پەروەردگاریدا ناکات و بە هەمیشەیی لەبەردەمیدا وەك بەندەیەکی زەلیلی

گەردنکەچ دەمێنێتەوە، بۆیە باڵاترین تەوازوع ئەم جۆرەیە لە تەوازوع کە بەهۆی ناسینی خۆی و خوداوە سەریهەڵداوە و لە ناخیدا نەقشی گرتووە.

# حیکمەتی دووسەد و چل و یەك

((لاَ يُخْرِجُكَ عَنِ الْوَصْفِ إِلاَّ شُهُودُ الْوَصْفِ))

**راڤەی وشەكان:**

**لا يخرجك:** دەرتناكات

**الوصف:** سیفەتێك، وەسفێك

**شهود:** بینین

**واتا ((بینینی وەسفێك(سیفەتێك) لەو وەسفە دەرتدەهێنێت))**

**شرۆڤە:**

**ئەم حیكمەتە دوو رووی هەیە:**

**رووی یەكەمیان** ئەوەیە كە بەبینینی ناو و سیفەتەكانی خودای موتەعال لە سیفەتەكانی نەفسی خۆت دەچییە دەرەوە، بە بینینی بەهێزی خودا(**القوي**) لە خۆبەهێززانین رزگارت دەبێت، بە بینینی دەسەلاَتی خودا(**القدير**) هەوڵ و دەسەلاَتی خۆت بە كەم تەماشا دەكەیت، بە بینینی عیززەتی خودا(**العزيز**) عیززەت نادەیە پاڵ نەفسێكی ناتەواو، بە بینینی مەزنی و شكۆمەندی خودای موتەعال(**العظيم**) هەرچی مەزنی و شكۆمەندییە لە نەفس دووردەخەیەوە، لێرەوە تۆ دەبیت بە كەسێك بۆ خودا كە وەك خاكی بەرپا وایە و بە سیفەتی بەندایەتی خۆی دەڕازێنێتەوە و وەك بەندەیەك هیچ شتێك لە خۆیەوە ناناسێت، بەڵكو هەموو شتێك بۆ پەروەردگاری دەگێڕێتەوە.

**رووی دووەمی ئەم حیكمەتە ئەوەیە بڵێین:** بە بینینی هەر سیفەتێكی باش و چاك لە خۆتدا تۆ لە وەسفی ئەو سیفەتە باش و چاكە دەكاتە دەرەوە، تۆ كاتێك دەبیت بە كەسێكی متەوازیع كە سیفەتی تەوازوع لە خۆتدا نەبینی و نەیدەیە پاڵ خۆت، تۆ كاتێك بەهێزی، سیفەتی بەهێزی نەدەیە پاڵ خۆت و هەمیشە بە لاواز خۆت لە بەردەم

پەروەردگاردا ببینی، کاتێك خاوەنی ئەخلاقی باش(**حسن الأخلاق**)یت پێتوابێت تۆ خاڵی لە رەوشتی بەرز و بڵند و تەتوانیوە رەوشتە بەرزەکانی پێغەمبەران و باوەڕداران لە خۆتدا جێ بکەیەوە، گەر پێچەوانەی ئەمانە سیفەتی باش و بەرز و بڵندت لە خۆتدا بینی ئەوا بزانە تۆ هێشتا بەو سیفەتە باش و بالآیە نەگەیشتووی، چونکە کاتێك سیفەت لە مرۆڤدا دەبێت بە مەلەکە ئیتر دەبێت بە بەشێك لە بوونی ئەو مرۆڤە و هەست ناکات ئەو کەسێکە و سیفەتەکەش شتێکە لەناو ئەودا، بەڵکو ئەو و سیفەتەکە بوون بە یەك بوون و ئەنجامدانی ئەو سیفەتە هیچ زۆر لەخۆکردنێك لە پشتییەوە نییە.

۞ ۞ ۞

# حیکمەتی دووسەد و چل و دوو

((الْمُؤْمِنُ يَشْغَلُهُ الثَّنَاءُ عَلَى اللهِ تَعَالَى عَنْ أَنْ يَكُونَ لِنَفْسِهِ شَاكِرًا، وَتَشْغَلُهُ حُقُوقُ اللهِ عَنْ أَنْ يَكُونَ لِحُظُوظِهِ ذَاكِرًا))

## ڕاڤەی وشەکان:

**يشغله:** سەرقاڵی دەکات

**الثناء:** مەدح و سەنا

**حقوق الله:** مافەکانی خودا

**حظوظه:** بەشی خۆی

**ذاكرا:** باسی بکات

**واتا ((باوەڕدار مەدح و سەنای خودا سەرقاڵی دەکات لەوەی شوکری نەفسی خۆی بکات، جێبەجێ کردنی مافەکانی خودا لەسەری سەرقاڵی دەکات لەوەی باسی بەش و مافی خۆی بکات))**

## شرۆڤە:

ئەم حیکمەتە پەیوەندی بە حیکمەتەکەی پێش خۆیەوە هەیە، هێشتا باس لە تەوازوعە لە سەرنجدان بە سیفەتەکانی خودا و سیفەتەکانی مرۆڤ، کەسی باوەڕدار بەهۆی سەرقاڵبوون بە مەدح و سەنای خودای موتەعالەوە لە بوونی سیفەتە باش و پەسەندەکانی خۆی بێئاگا دەبێت، بۆیە شتێك لە خۆیدا شك نابات تاکو شوکری نەفسی خۆی پێ بکات، ئەو بە هەمیشەیی لە کەماڵی کردار و ناو و سیفەت و زاتی خودای موتەعال رادەمێنێت و بە هەمیشەیی لە مەدح و سەنای ئەو زاتە مەزن و شکۆمەندەدایە، زمانی بە **"أستغفر الله، الحمد لله، سبحان الله، لا إله إلا الله، ألله أكبر، سبحان الله وبحمده، سبحان الله العظيم، لا حول ولا قوة إلا بالله، لا إله إلا الله وحده لا**

**شريك له"** تەڕ و پاراوە، مانای ئەم وشانە دەزانێت، بە دڵ بەسەر زماندا جاری دەبن، بەرانبەر ئەو زاتە مەزن و شکۆمەندە سەرنج لە زاتی خۆی دەدات، زاتێکی ناتەواو، نەزان، دەستەوسان، نائارام، هەژار، گەر سیفەتێکی باشی لێ دەوەشێتەوە بۆ پەروەردگاری دەگەڕێتەوە، ئەگینا نەفسێك ئەوە سیفەت و حەقیقەتی بێت هەرگیز باشە و چاکەی لێ ناوەشێتەوە، بۆیە لەسەر باشەکان حەمدی خودا دەکات ((**یا رب لك الحمد كما ينبغي لجلال وجهك وعظيم سلطانك**))، بۆ گوناه و خراپە و هەڵەکانی لە خودا داوای لێخۆشبوون دەکات ((**أستغفر الله الذي لا إله إلا هو الحي القيوم وأتوب إليه**))

۞ ۞ ۞

# حیکمەتی دووسەد و چل و سێ

((لَيْسَ الْمُحِبُّ الَّذِي يَرْجُو مِنْ مَحْبُوبِهِ عِوَضًا، أَوْ يَطْلُبُ مِنْهُ غَرَضًا، فَإِنَّ الْمُحِبَّ مَنْ يَبْذُلُ لَكَ، لَيْسَ الْمُحِبُّ مَنْ تَبْذُلُ لَهُ))

## راڤەی وشەکان:

**المحب:** ئەو کەسەی کەسێکی خۆشدەوێت

**المحبوب:** ئەو کەسەی خۆشت دەوێت، کەسی خۆشەویست

**يرجو:** هیوا و داوا دەکات

**عوضا:** پاداشت

**غرضا:** مەرام

**يبذل لك:** بۆت دەبەخشێت

**تبذل له:** پێی دەبەخشی

**واتا ((موحیب ئەو کەسە نییە لە مەحبووبەکەی رجای پاداشتی هەبێت یان داوای مەرامێك بکات، موحیب ئەو کەسەیە بۆت دەبەخشێت، موحیب ئەو کەسە نییە پێی دەبەخشیت))**

## شرۆڤە:

۞ لە حیکمەتەدا ئیبن عەتا باس لە مەقامی خۆشەویستی دەکات، مەقامی خۆشەویستی دوای ناسینی خودای موتەعال سەرهەڵدەدات، مرۆڤ تا خودا نەناسێت ترس و خۆشەویستی لە خودا بۆ پەیدا نابێت.

۞ ئەم ئاستە لە خۆشەویستی کە ئیبن عەتا باسی لێوە دەکات تەنها راستگۆیان و عاریفان پێی دەگەن، خۆشەویستی عەتائی(**المحبة العطائية**) ئەوەیە کە دوو مەرجی تێدابێت:

**یەکەم: هیچ رجا و داوایەکی لە مەحبووبەکەی نەبێت،** ئەو تەنها مەحبووبەکەی دەوێت، نایەوێت مەحبووبەکەی بکات بە وەسیلەیەك بۆ گەیشتن بە داوا و مەرامی خۆی، کاتێك خودای کردووە بە خۆشەویستی خۆی مەبەست و مەرامێکی تری نییە لە خۆشەویستییەکەیدا، ئەو بۆ بەدەستهێنانی بەهەشت و رزگاربوون لە ئاگر نییە خودای خۆشدەوێت، بەڵکو خۆشەویستییەکەی تەنها بۆ خودایە و هیچ مەرام و داوایەکی تر لەو خۆشەویستییەوە لە خودا داوا ناکات.

**دووەم: لە پێناوی خۆشەویستەکەیدا ئامادەیە هەموو شتێك ببەخشێت،** ماڵ و دارایی، ئاسوودەیی و ئارامی، پشوو و ئیسراحەتی، هێز و دەسەڵاتی، تەمەن و ژیانی، دڵ و گیانی، هەموو بۆ خۆشەویستەکەی لەسەر دەست گرتووە، خۆی بە خاوەنی هیچ یەکێك لەمانە نازانێت، بەڵکو خودا بە خاوەنیان دەزانێت، هونەرێك لە گێڕانەوەی ئەمانەت بۆ خاوەن ئەمانەت نابینێتەوە، بۆیە دەفەرموێت:: موحیب ئەو کەسە نییە پێی دەبەخشیت، بەڵکو ئەو کەسەیە بۆت دەبەخشێت.

# حیكمەتی دووسەد و چل و چوار

((لَوْلاَ مَيَادِينُ النُّفُوسِ مَا تَحَقَّقَ سَيْرُ السَّائِرِينَ، إِذْ لاَ مَسَافَةَ بَيْنَكَ وَبَيْنَهُ حَتَّى تَطْوِيَهَا رِحْلَتُكَ، وَلاَ قُطْعَةَ بَيْنَكَ وَبَيْنَهُ حَتَّى تَمْحُوَهَا وُصْلَتُكَ))

**راڤەی وشەكان:**

**ميادين:** كۆی "ميدان"ە واتە گۆڕەپان

**ما تحقق:** دەستەبەر نەدەبوو

**سير السائرين:** ڕۆیشتنی كاروانیان(ڕێبواران)

**تطويها:** بیپێچێتەوە

**قطعة:** دابڕان

**تمحوه:** بیسڕێتەوە

**وصلتك:** گەیشتنت

**واتا ((گەر گۆڕەپانی دەروون نەبوایە ڕۆیشتنی ڕێبواران دەستەبەر نەدەبوو، چونكە دوورییەك نییە لە نێوان تۆ و ئەودا تاكو گەشتەكەت بیپێچێتەوە، دابڕانێك نییە لە نێوان تۆ و ئەودا تاكو گەیشتنەكەت بیسڕێتەوە))**

**شرۆڤە:**

❁ ئەم حیكمەتە یەكێكە لە حیكمەتە زۆر بالاكانی ئیبن عەتا، ئاماژە بە دوو خاڵی زۆر گرنگ دەكات لە سەفەری بەرەو خوداچووندا:

**یەكەمیان:** سڕینەوەی وەهمی دووری و مسافەیە لە نێوان مورید و خودادا، ئەوانەی لە سەرەتای گەشتی بەرەو خوداچووندان وەهمی ئەوەیان بۆ دروست دەبێت كە دوورییەك لە نێوان ئەو و خودادا هەیە و پێویستە بە گەشتەكەی بیپێچێتەوە.

**دووەم خاڵ:** ئاماژە بەوە دەكات كە موریدان لە سەرەتاوە لایان وایە دابڕانێك لە نێوان ئەوان و خودادا هەیە و پێویستە گەیشتن بە خودا ئەو دابڕانە بسڕێتەوە.

ئیبن عەتا دەفەرموێ: ئەم دوو جۆرە بیرکردنەوەیە لە سەفەری بەرەو خوداچوون هەڵەیە، چونکە هیچ دوورییەك و هیچ دابڕانێك لە نێوان مرۆڤ و خودادا بوونی نییە، خودا بە هەمیشەیی لەگەڵ مرۆڤدایە، تەنها ئەوەی بوونی هەیە بریتییە لە پەردەکانی دەروونی مرۆڤ، دووری لە نەفسی مرۆڤەوەیە نەك لە خوداوە، دابڕان لە دەروونی پڕ ئارەزووحەزەوەیە نەك لە خوداوە، گەر پەردەکانی ئەو نەفسە لابدرێت خودا دەبینێتەوە و دەزانێت هیچ بوونێك بە ئەندازەی بوونی خودا لە ئەوەوە نزیك نییە﴿وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْ حَبْلِ الْوَرِيدِ ﴿١٦﴾﴾ ق: ١٦

گەشتەکەی مرۆڤ بۆ لای خودا لە دەرەوە دەست پێ ناکات، بەڵکو گەشتەکە لە ناوەوەی مرۆڤدایە، گۆڕەپانی نەفس ئەو مەیدانەیە مرۆڤ ئەسپی ویست و لێبڕانی تێدا تاو دەدات، جا یان سارای دەروونی خۆ دەبڕێت و دەگات بە دەریای بێسنوور، یان ئەسپەکەی دەگلێت و لە مەیداندا شکست دەخوات و دەبێ بە ڕێبوارێکی وێڵی ناو سارای دەروون.

# حیكمەتی دووسەد و چل و پێنج

((جَعَلَكَ فِي الْعَالَمِ الْمُتَوَسِّطِ بَيْنَ مُلْكِهِ وَمَلَكُوتِهِ لِيُعْلِمَكَ جَلاَلَةَ قَدْرِكَ بَيْنَ مَخْلُوقَاتِهِ، وَأَنَّكَ جَوْهَرَةٌ تَنْطَوِى عَلَيْكَ أَصْدَافُ مُكَوَّنَاتِهِ))

**راڤەی وشەكان:**

**العالم المتوسط:** جیهانی ناوەند

**جلالة قدرك:** بەرزی ڕێز و حورمەتت

**جوهرة:** گەوهەر(مرواری)

**تنطوي:** لە ئامێزدەگرێت

**أصداف:** كۆی **"صدف"**ە بە مانای قاوغی گوێچكەماسی

**واتا ((تۆی لە جیهانێكی ناوەندا داناوە لە نێوان مولك و مەلەكوتدا، تاكو بەرزی ڕێز و حورمەتت لە نێوان دروستكراوەكانیدا پێ نیشان بدات، هەروەها بۆ ئەوەی بزانیت كە تۆ گەوهەرێكی(مروارییەكی) لەناو قاوغی دروستكراوەكانیدا))**

**شرۆڤە:**

مرۆڤ بوونێكە لە نێوان جیهانی مولك و جیهانی مەلەكوتدا، واتە مرۆڤ بوونێكە لە نێوان جیهانی خەلق و جیهانی ئەمردا، بە زمانێكی تر بوونێكە لە نێوان جیهانی نزم و جیهانی بالآدا، كۆمەڵێك سیفەت(ئامادەیی) تێدایە سەر بەجیهانی مولك(نزم)ە، ئەوانەش سیفەتگەلێكی نزمن لە حەز و ئارەزوو و هەڵپە و فێڵ و تووڕەیی و یاخیبوون و توغیان هتد.. بەرانبەر بەم سیفەتانە كۆمەڵێك سیفەت(ئامادەیی) تێدایە كە سەر بە جیهانی مەلەكوت(بالآ)یە، لەوانە: ژیری و مەعریفە و بەندایەتی و خۆشەویستی، هتد.. سیفەتی شەیتانی و دڕندەیی و ئاژەڵی و رووەكی تێدایە و لەگەڵ ئەوەشدا سیفەتی

فریشتەیی تێدایە، خاوەنی جەستەیەکە سەر بە جیهانی خەلق و خاوەنی رۆحێك سەر بە جیهانی ئەمر﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْـرِ رَبِّي ﴾ الإسراء: ٨٥، رۆح سەر بە جیهانی ئەمرە، بەرانبەر جیهانی ئەمر جیهانی خەلق دانراوە﴿أَلَا لَهُ ٱلْخَلْقُ وَٱلْأَمْرُ ﴾ الأعراف: ٥٤، خەلق و ئەمر بۆ خودایە و ئەو خاوەنییەتی، ئەم تایبەتمەندییەی مرۆڤ لە نێوان جیهانی مولك و مەلەکوتدا رێز و قەدرێکە خودای موتەعال لە مرۆڤی ناوە، رێز و قەدری پێ بەخشینی ویست و ئیرادە، ئەو ویستەی مرۆڤ لە رێگەیەوە یەکێك لەم دوو رێگەیە دەگرێتە بەر، یان سیفەتە باشەکان پەرە پێ دەدات و روو لە جیهانی مەلەکوت دەکات، یان بە پێچەوانەوە پەرەپێدانی سیفەتە باشەکان وازلێ دەهێنێ و دەروونی دەبێتە مۆڵگەی سیفەتە نباشەکان سیفە نباش و دزێوەکان و روو لە جیهانی نزم دەکات﴿وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّىٰهَا ﴿٧﴾ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَىٰهَا ﴿٨﴾ قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ﴿٩﴾ وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا ﴿١٠﴾ ﴾ الشمس:٧–١٠، سەرنج بدە دەفەرموێ: رزگاری و سەرفەرازی بەدەستهێناوە ئەو کەسەی دەروونی خۆی خاوێن و پاك دەکاتەوە، زیانۆمەندبووە ئەو کەسەی نەفسی خۆی پشتگوێ دەخات، هەر ئەوەندە مرۆڤ بە کاری تەزکییەی نەفسەوە خەریك نەبوو دەروونی دەبێت بە مۆڵگەی نەخۆشینە جۆراوجۆرەکان، رۆحی مرۆڤ مرواریییەکە لە قاوغی گوێچکەماسیدا، رۆح بەردە بەنرخەکەیە و جەستەش قاوغەکە، لە نێوان رۆح و جەستەدا نەفسی مرۆڤ بەرهەم هاتووە کە کۆمایەکە لە ئامادەیی و مرۆڤ دەتوانێت بە پاکژکردنەوەی نەفس روو لەجیهانی مەلەکوت بکات و بەپشتگوێخستنی پاکژکردنەوەش روو لە جیهانی نزم دەکات و خودای موتەعال ئەو جۆرە مرۆڤانەی کە لە رێز و بەهای مرۆیی خۆیان دادەبەزن و لە جێگەی پەرستنی خودای موتەعال دەست بە پەرستنی ئەو شتانە دەکەن کە بۆ خزمەتی مرۆڤ دروستکراوان، ئەو جۆرە مرۆڤانە خودا بە پەستتر و نزمتر لە ئاژەڵان باسیان دەکات و دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ ذَرَأْنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرًا مِّنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِۖ لَهُمْ قُلُوبٌ لَّا يَفْقَهُونَ بِهَا وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لَّا يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ ءَاذَانٌ لَّا يَسْمَعُونَ بِهَآۚ أُوْلَٰٓئِكَ كَٱلْأَنْعَٰمِ بَلْ هُمْ أَضَلُّۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْغَٰفِلُونَ ﴿١٧٩﴾ ﴾ الأعراف: ١٧٩، ئەوەی ئەوانی گەیاندووە بەو ئاستە لە پەستی: بەکارنەهێنانی دڵ و چاو و گوێیە، ئەمەش سەری لە بێئاگاییەوە دەرکردوون و رووبەڕووی ئەو چارەنووسە پەستەی کردوونەتەوە.

# حیکمەتی دووسەد و چل و شەش

((إِنَّمَا وَسِعَكَ الْكَوْنُ مِنْ حَيْثُ جُسْمَانِيَّتِكَ، وَلَمْ يَسَعْكَ مِنْ حَيْثُ ثُبُوتِ رُوْحَانِيَّتِكَ))

## راڤەی وشەكان:

**وسعك الكون:** گەردوون لە ئامێزی گرتووی

**جسمانيتك:** جەستەیی

**ثبوت روحانيتك:** جێگیربوونی ڕۆحییتەوە

**واتا ((گەردوون لە رووی جەستەییەوە لە ئامێزی گرتووی لە رووی جێگیربوونی ڕۆحییتەوە لە ئامێزی نەگرتووی))**

## شرۆڤە:

**مرۆڤ بوونەوەرێكی دوو ڕەهەندە،** ڕەهەندێكی سەر بە جیهانی خەلقە و بەشێكە لەم گەردوونە كە بریتییە لەو توخمانەی جەستەی مرۆڤی پێكهێناوە، هەموو ئەو توخمانانە لەسەر زەوی بوونیان هەیە و لە ڕێگەی ئەو خۆراكەوە دایك دەیخوات (لەناو رەحمدا) منداڵ جەستەیی بۆ دروست دەبێت﴿ يَخْلُقُكُمْ فِي بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمْ خَلْقًا مِّنۢ بَعْدِ خَلْقٍ ﴾ الزمر: ٦، ڕەهەندی دووەمی مرۆڤ بریتییە لە ڕۆح، ڕۆحی مرۆڤ سەر بە جیهانی خەلق نییە و ئەم گەردوونە پان و بەرینە ناتوانێت لە ئامێزی بگرێت، بەڵكو ڕۆح سەر بە جیهانێكی ترە كە پێی دەوترێت جیهانی ئەمر﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِ ۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّى وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٨٥﴾ ﴾ الإسراء: ٨٥، ئەوەی حەقیقەت و ڕاستەقینەیە بریتییە لە ڕۆحی مرۆڤ، مرۆڤ ڕۆحەكەیەتی، جەستە بە دەرچوونی ڕۆح دەبێتەوە بە بەشێك لەم جیهانی خەلقە و گەرد و گەردیلەكانی تێكەڵ بە خاك دەبنەوە، بەڵام ڕۆحی مرۆڤ كە جەوهەر و حەقیقەتەكەیەتی دەمێنێتەوە و بوون و ماهییەتی خۆی پارێزگاری

لیٚ دەکات، لە ڕۆژی زیندووبوونەوەدا خودای موتەعال بە دەسەڵاتی بێسنووری خۆی جارێکی تر جەستە دەکاتەوە بە بەر ئەم ڕۆحەدا و دادگایی دەکات و سزا و پاداشتی بەپێی کردارەکانی بۆ بڕیار دەدات ﴿وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَإِذَا هُم مِّنَ ٱلْأَجْدَاثِ إِلَىٰ رَبِّهِمْ يَنسِلُونَ ﴿٥١﴾ قَالُوا۟ يَٰوَيْلَنَا مَنۢ بَعَثَنَا مِن مَّرْقَدِنَا ۜ هَٰذَا مَا وَعَدَ ٱلرَّحْمَٰنُ وَصَدَقَ ٱلْمُرْسَلُونَ ﴿٥٢﴾﴾ یس: ٥١–٥٢، هاوار بۆ ئێمە ئەوە کیٚ بوو ئێمەی لە گۆڕەکانمان زیندوو کردەوە، ئەمە ئەو بەڵێنە بوو ڕەحمان بە ئێوەی دابوو، پێغەمبەران ڕاستیان فەرموو.

❁ ❁ ❁

# حیكمەتی دووسەد و چل و حەوت

((الْكَائِنُ فِي الْكَوْنِ وَلَمْ تُفْتَحْ لَهُ مَيَادِينُ الْغُيُوبِ مَسْجُونٌ بِمُحِيطَاتِهِ وَمَحْصُورٌ فِي هَيْكَلِ ذَاتِهِ))

**راڤەی وشەكان:**

**الكائن:** مرۆڤ

**ميادين الغيوب:** مەیدانی پەنهانەكان

**مسجون:** بەندی، دیل

**محيطاته:** چواردەوری، چوارچێوەكانی

**محصور:** سنووردارە

**هيكل ذاته:** پەیكەری خودی خۆی

**واتا ((مرۆڤ لە گەردووندا گەر مەیدانی پەنهانەكانی بۆ نەكرێتەوە دیلە(بەندە) بە چواردەورەكانی و سنووردارە بە پەیكەری خودی خۆی))**

**شرۆڤە:**

❁ رۆحی مرۆڤ لە جیهانی ئەمرەوە (جیهانی مەلەكوت) رەوانەی جیهانی خەلق (جیهانی مولك) دەكرێت و بە سێ دیوار —وەك بەندی- چوار دەور دەدرێت:

**دیواری یەكەم:** دیواری پەیكەری جەستەی خۆیەتی كە پڕە لە حەز و ئارەزوو و هەڵپەی جۆراوجۆر.

**دیواری دووەم:** دیواری ئەو چواردەورەیە دەوری مرۆڤی داوە لە خێزان و ماڵ و منداڵ و كۆمەڵگە و بەند و باو و دونیا و شتەكانی ناوی، هەموو ئەمانەش قورسایی و كاریگەریی نەرێیی دەخەنە سەر مرۆڤ.

**دیواری سێیەم:** دیواری ئەم گەردوونە بەرینەیە، ئەم دیوارەش-گەر تێڕامانەکانی مرۆڤ تەنها لە رووالەتدا بێت- مرۆڤ سنووردار دەکات و بە یاسا و رێساکانی خۆی و دۆزینەوە زانستییەکانی چواچێوەداری دەکات.

۞ ئەو مرۆڤانەی ناتوانن دیواری یەکەم ببڕن و لە حەز و ئارەزووەکانی خۆیاندا نغرۆ بوون مرۆڤگەلێکن کە مانای مرۆییان لەدەستداوە هەروەك ئاژەڵان کە تەنها غەریزە دەیانبزوێنێت و ژیان بەسەر دەبەن، ئەو مرۆڤانەش کە تەنها ژیان و جوانییەکانی دونیا هەڵدەبژێرن دیسان مرۆڤگەلێکی پەست و نزمن، چونکە نەیانتوانیوە چوار دیوارەکانی ژیان ببڕن و بالاتر لەم ژیانە وێنا بکەن، ئەوانەش کە لە گەردوون رادەمێنن و پێیان وایە بوون تەنها بریتییە لەم گەردوونە بەرین و فراوانە-راستە لە دوو دەستەکەی تر بالاترن- بەلام هێشتا دیلی چواچێوەی گەردوونن و نەیانتوانیوە بەرەو جیهانی تر لە شەقەی باڵ بدەن.

۞ تەنها ئەوانە گرەوەکە دەبەنەوە کە لە هەیکەلی حەزو ئارەزووەکانی جەستەیان هاتوونەتە دەرەوە و چوارچێوەی ژیان نەیکردوون بە کۆیلە و گەردوون سنووری بۆ دانەناون، بەڵکو کۆی ئەو زانست و زانیارییەی لە رێگەی "بیستن و بینین و ژنەوتن"ەوە وەریان گرتووە دەرگاکانی پەنهانی بەڕوودا والا کروون و لەم جیهانی مولکەوە جیهانی مەلەکوت دەبینن، ئەمەش لە رێگەی ئەو وەحییە خوداییەوە کە دایبەزاندۆتە سەر دڵی پێغەمبەران(علیهم السلام) و هەواڵەکانی جیهانی پەنهانیان بە ئێمە راگەیاندووە، هەندێ لە عاریفان ئەو هەوالانەی وەحی لە قورئان و فەرموودەدا بەیانی کردوون بە دڵ ئەزموونیان دەکەن و لە هەواڵێکی زانستییەوە دەیگۆڕن بۆ حەقیقەتێك کە موشاهەدەی دەکەن، واتە لە یەقینی زانستییەوە بەرز دەبنەوە بۆ یەقینێك کە دەیبینن، هەندێ لە پێغەمبەران(علیهم السلام) داوای ئەم یەقینەیان لە خودا کردووە، نەك لە گومانەوە، بەڵکو بۆ گواستنەوەی یەقینی زانستی بۆ یەقینی بینین و بەرهەست، لەوانە ئیبراهیم(عليه السلام): ﴿وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ رَبِّ أَرِنِى كَيْفَ تُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰ ۖ قَالَ أَوَلَمْ تُؤْمِن ۖ قَالَ بَلَىٰ وَلَـٰكِن لِّيَطْمَئِنَّ قَلْبِى ۖ قَالَ فَخُذْ أَرْبَعَةً مِّنَ ٱلطَّيْرِ فَصُرْهُنَّ إِلَيْكَ ثُمَّ ٱجْعَلْ عَلَىٰ كُلِّ جَبَلٍ مِّنْهُنَّ جُزْءًا ثُمَّ ٱدْعُهُنَّ يَأْتِينَكَ سَعْيًا ۚ وَٱعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٦٠﴾﴾ البقرة:

٢٦٠، سەرنج بدە ئیبراهیم(عليه السلام) کە داواکە دەکات و خودا-کە زاناترە بە ئیمانی ئیبراهیم- دەپرسێت بۆ ئیمانت پێی نییە؟ ئیبراهیم(عليه السلام) دەفەرموێ: بەڵێ، ئیمانم پێیەتی، بەڵام بۆ ئەوەی دڵم دڵنیا ببێتەوە، واتە ئیبراهیم(عليه السلام) بە بیستن یەقینی تەواوی بە زیندووبوونەوە هەبوو، دەیویست بە چاو موشاهەدەی بکات و یەقینەکەی بۆ ئاستێکی تر بەرزببێتەوە و دڵ قەرار بگرێت و ئارام ببێتەوە.

# حیکمەتی دووسەد و چل و هەشت

**((أَنْتَ مَعَ الأَكْوَانِ مَا لَمْ تَشْهَدْ الْمُكَوِّنَ، فَإِذَا شَهِدْتَهُ كَانَتِ الأَكْوَانُ مَعَكَ))**

## راڤەی وشەكان:

**الأكوان:** گەردوونەكان، دیوارەكان، بەدیهاتووەكان

**المكون:** خودای موتەعال

**واتا (( تۆ لەگەڵ بەدیهاتووەكاندای گەر بەدیهێنەر (خودا) نەبینیت، كاتێك بینیت بەدیهاتووەكان لەگەڵ تۆدان))**

## شرۆڤە:

❁ خودای موتەعال مرۆڤی دروست كرد و هەموو شتێكی لە ئاسمان و زەوی بۆ رامهێنا ﴿أَلَمْ تَرَوْا۟ أَنَّ ٱللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ وَأَسْبَغَ عَلَيْكُمْ نِعَمَهُۥ ظَٰهِرَةً وَبَاطِنَةً﴾لقمان: ٢٠، نابینن خودا ئەوەی لە ئاسمانەكان و زەویدان بۆ ئێوەی رامهێناون، نیعمەتە دیار و شاراوەكانی بەسەرتاندا داباراندووە، ئەم رامهێنانەی دروستكراوەكان بۆ مرۆڤ بۆ ئەوە بوو ژیانی مرۆڤ بەردەوام بێت و بەدیهێنەری دروستكراوەكان بپەرستێت و شوكری نیعمەتەكانی بكات، بەڵام كاتێك مرۆڤ لەم قەدر و رێزە خوداییە دادەبەزێت و شتەكان دەكات بە سەروەر و سەرداری خۆی، بەڵكو بە پەرستراوی خۆی ئیتر لەو پلە و پایە بەرزە بەردەبێتەوە، ئاسمان و زەوی لێی بێزار دەبن و بە رۆیشتنی فرمێسكێك ناڕێژن﴿فَمَا بَكَتْ عَلَيْهِمُ ٱلسَّمَآءُ وَٱلْأَرْضُ وَمَا كَانُوا۟ مُنظَرِينَ ﴿٢٩﴾﴾ الدخان: ٢٩، ئەوانەی خودا بەربادی كردن و تیاچوون ئاسمان و زەوی بۆیان نەگریان، بڕیارە مرۆڤ لە بەدیهاتووەكانەوە بەدیهێنەر ببینێتەوە و بیناسێت و بیپەرستێت، بەڵام مرۆڤ لە چوار دیواری دیوارە جۆراوجۆرەكاندا خۆی بەند دەكات و نایەوێت ئازادی بە رۆحی خۆی ببەخشێت.

۞ کاتێك مرۆڤ لە ڕێگەی ئیمانەوە خودا دەناسێت و دەیپەرستێت ڕۆحی خۆی لە چوار دیوارەکان ئازاد کردووە، ئەو کات هەموو بەدیهاتووەکان لەگەڵ ئەودا دەبن، واتە بۆی رام و موسەخەر دەبن﴿ وَلِلَّهِ جُنُودُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿٤﴾ ﴾ الفتح: ٤-سەربازانی ئاسمان و زەوی بۆ خودایە و ئەو خاوەنیانە، خودا زانا و دانایە، ئەو کات گەردوون و ژیان، ئاسمان و زەوی لە خزمەتی مرۆڤدا دەبن﴿ فَقُلۡتُ ٱسۡتَغۡفِرُواْ رَبَّكُمۡ إِنَّهُۥ كَانَ غَفَّارًا ﴿١٠﴾ يُرۡسِلِ ٱلسَّمَآءَ عَلَيۡكُم مِّدۡرَارًا ﴿١١﴾ وَيُمۡدِدۡكُم بِأَمۡوَٰلٍ وَبَنِينَ وَيَجۡعَل لَّكُمۡ جَنَّٰتٍ وَيَجۡعَل لَّكُمۡ أَنۡهَٰرًا ﴿١٢﴾ ﴾ نوح: ١٠–١٢، سەرنج بدە چۆن گەڕانەوەیان بۆ لای خودا و دەستکێشانەوە لە گوناه و خراپە ژیانیان دەگۆڕێت و ئاسمان و زەوی لە خزمەتیاندا دەبن، خودا فەرمان بە ئاسمان دەکات باران دەبارێنێ، ماڵ و منداڵیان بۆ زیاد دەکات و باخچە و سەوزییان بۆ دەڕوێنێ و کانی و ڕووباریان بۆ دەتەقێنێ، بەرانبەر بەمە لادانی مرۆڤ و نەناسین و نەپەرستنی خودای موتەعال ژیان و گەردوون دەشوێنێت﴿ ظَهَرَ ٱلۡفَسَادُ فِي ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِ بِمَا كَسَبَتۡ أَيۡدِي ٱلنَّاسِ ﴾ الروم: ٤١، تێکچوون(فەساد) لە وشکانی و دەریادا بەدەرکەوت بەهۆی کار و کردەوەی مرۆڤەوە، هەروەها﴿ وَلَوِ ٱتَّبَعَ ٱلۡحَقُّ أَهۡوَآءَهُمۡ لَفَسَدَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ وَمَن فِيهِنَّ ﴾ المؤمنون: ٧١، گەر حەق شوێن حەز و ئارەزووەکانی ئەوانە بکەوێت ئاسمان و زەوی و ئەوەی تێیاندایە تێکچوون ڕوویان لێ دەکات.

۞ ۞ ۞

# حیکمەتی دووسەد و چل و نۆ

((لاَ يَلْزَمُ مِنْ ثُبُوتِ الْخُصُوصِيَّةِ عَدَمُ وَصْفِ الْبَشَرِيَّةِ، إِنَّمَا مَثَلُ الْخُصُوصِيَّةِ كَإِشْرَاقِ شَمْسِ النَّهَارِ ظَهَرَتْ فِي الأُفُقِ وَلَيْسَتْ مِنْهُ، تَارَةً تُشْرِقُ شُمُوسُ أَوْصَافِهِ عَلَى لَيْلِ وُجُودِكَ، وَتَارَةً يَقْبِضُ ذَلِكَ عَنْكَ فَيَرُدُّكَ إِلَى حُدُودِكَ، فَالنَّهَارُ لَيْسَ مِنْكَ وَإِلَيْكَ، وَلَكِنَّهُ وَارِدٌ عَلَيْكَ))

## راڤەی وشەکان:

**الخصوصية:** تایبەتمەندی

**إشراق:** هەڵهاتن

**الأفق:** ئاسۆ

**شموس:** کۆی "شمس"ە، واتە خۆر

**فيردك:** دەتگێڕێتەوە

**واتا ((جێگیربوونی تایبەتمەندی نەمانی وەسفی مرۆیی ناگەیەنێت، نموونەی تایبەتمەندی وەك هەڵهاتنی رۆژ–** رۆژ(النهار) کە بەرانبەر شەو(الليل) بەکاردەهێنرێت، مەبەستم "خۆر" نییە- **وایە کە لە ئاسۆوە دەردەکەوێت، نەك رۆژ لە ئاسۆ بێت، جارێك خۆری سیفەتەکانی بەسەر شەوی بوونی تۆدا هەڵدێت و جارێکیش لێت دەگرێتەوە و دەتگێڕێتەوە بۆ سنووری خۆت، رۆژ لە تۆوە نییە بۆ لای تۆ، بەڵکو هاتووە بۆ سەرت))**

## شرۆڤە:

❁ خودای موتەعال تایبەت کردنەوەی بۆ پێغەمبەران(عليهم السلام) و هەندێ لە دۆستانی خۆی هەیە، بەڵام تایبەتمەندییەك کە خودا بەوانەی دەبەخشێت ئەوان لە وەسفی مرۆڤبوون دەرناکات، ئەوان هەر مرۆڤن، بەڵام خودا لە نووری سیفەتەکانی

خۆی بەشیداون، ئەو نوورەیان نوورێکی زاتی نییە و لە خۆیانەوە هەڵنەقولاوە، بەڵکو نوورێکە لە خوداوە بە بەندە نزیکەکانی خۆی بەخشیوە، هەویری مرۆڤ بە نەزانی و دەستەوسانی و هەژاریی و ئاتاجییەوە شلێرراوە، کەسێك ئەمە سیفەتی بێت نوور و بالأبوونی لە خودی خۆیەوە نییە، بەڵکو بەخششی خودایە، بۆیە هەڵبژاردنی پێغەمبەران(علیهم السلام) فەزڵێکە لە خوداوە بۆ ئەوان، نەك بە هەوڵ و کەسبی ئەوان بێت ﴿أَوَمَن كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَٰهُ وَجَعَلْنَا لَهُۥ نُورًا يَمْشِى بِهِۦ فِى ٱلنَّاسِ كَمَن مَّثَلُهُۥ فِى ٱلظُّلُمَٰتِ لَيْسَ بِخَارِجٍ مِّنْهَا﴾ الأنعام: ١٢٢، ئایا ئەو کەسەی مردبێت و ئێمە زیندوومان کردبێتەوە و نوورێکمان پیێ بەخشی بێت لەناو خەڵکیدا پێیەوە بڕوات وەك ئەو کەسە وایە لەناو تاریکیدایە و ناتوانێت لێی بێتە دەرەوە؟

۞ نموونەی ئەم نووره خودایە وەك هەڵهاتنی سپێدەی بەرەبەیان و ڕۆژبوونەوەیە وایە لە ئاسۆوە، نوور و ڕۆشناییەکەی بەرەبەیان بۆ خودی ئاسۆکە ناگەڕێتەوە، بەڵکو بۆ خۆرێك دەگەڕێتەوە کە لە جێگەیەکی ترەوە نوورەکەی بۆ ئاسۆکان ڕەوانە کردووە، نووری تایبەتمەندانیش هەر بەو جۆرەیە، لە خودی خۆیانەوە نییە، بەڵکو لە خۆری ناوو سیفەتە بەرزو بڵندەکانی خودای موتەعالەوەیە، بۆیە خودای موتەعال تاوێك ئەو نوورە ڕەوانە دەکاتە سەردڵی بەندەکەیی و هەموو بوونی ڕۆشن دەکاتەوەو هەنگاوەکانی بە نوورەوە هەڵدەگرێت، تاوێکیش نوورەکەی لیێ دەگرێتەوەو هەموو بوونی دەکات بە تاریکستان بۆ ئەوەی پێی بسەلمێنێت کە نوورەکە بۆ خودی خۆی ناگەڕێتەوە، بەڵکو ئەوە پەروەردگارە ئەوی بەنوور تایبەتمەند کردووە، لێرەوە دەکەوێتە شوکری پەروەردگاری بەرانبەر ئەو نیعمەتە مەزنەی بۆی ڕەوانە کردووە، بالأتر دەبێت کەسەکە لە پای نوور نەوەستێت و بەهۆی نیعمەتەکەوە خاوەنی نیعمەتەکەی لەبیرنەچێت، بەم جۆرە بەندەی ڕاستەقینە بە هەمیشەیی لەگەڵ خودا دەبێت و هیچ شتێك ناتوانێت ڕایبوەستێنێت.

۞ ئەوەی ئیبن عەتا دەیەوێت هۆشداری لەسەر بدات ئەو هەڵە و تێکەوتنەیە هەندێ لە سۆفییەکان ڕووبەڕووی بوونەوە و پێیان وابوو ئەو نوورە هەڵقولاوی خودی خۆیانە و ئەوان لە وەسفی مرۆیی چوونەتە دەرەوە و لەگەڵ خودادا تێکەڵ بوون﴿ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا

يَقُولُونَ عُلُوًّا كَبِيرًا ﴿٤٣﴾ الإسراء: ٤٣، پاكێتی و شكۆمەندی و بەرز و بڵندی بۆ خودای موتەعال لەوەی دەیڵێن.

# حیكمەتی دووسەد و پەنجا

((دَلَّ بِوُجُودِ آثَارِهِ عَلَى وُجُودِ أَسْمَائِهِ، وَبِوُجُودِ أَسْمَائِهِ عَلَى ثُبُوتِ أَوْصَافِهِ، وَبِثُبُوتِ أَوْصَافِهِ عَلَى وُجُودِ ذَاتِهِ، إِذْ مُحَالٌ أَنْ يَقُومَ الْوَصْفُ بِنَفْسِهِ، فَأَرْبَابُ الْجَذْبِ يَكْشِفُ لَهُمْ عَنْ كَمَالِ ذَاتِهِ، ثُمَّ يَرُدُّهُمْ إِلَى شُهُودِ صِفَاتِهِ، ثُمَّ يُرْجِعُهُمْ إِلَى التَّعَلُّقِ بِأَسْمَائِهِ، ثُمَّ يَرُدُّهُمْ إِلَى شُهُودِ آثَارِهِ، وَالسَّالِكُونَ عَلَى عَكْسِ هَذَا، فَنِهَايَةُ السَّالِكِينَ بِدَايَةُ الْمَجْذُوبِينَ، وَبِدَايَةُ السَّالِكِينَ نِهَايَةُ الْمَجْذُوبِينَ لَكِنْ لاَ بِمَعْنًى وَاحِدٍ، فَرُبَّمَا الْتَقَيَا فِي الطَّرِيقِ، هَذَا فِي تَرَقِّيهِ، وَهَذَا فِي تَدَلِّيهِ))

واتا ((بوونی ئاسەوارەكانی خودای موتەعال بكە بە بەڵگە لەسەر ناوە جوانەكانی، و بوونی ناوەكانی بكە بە بەڵگە لەسەر جێگیر كردنی سیفەتەكانی، و بوونی سیفەتەكانی بكە بە بەڵگە لەسەر زاتی خودای موتەعال، چونكە محاڵە هیچ وەسفێك بە خۆیەوە راوەستاو بێت، خاوەن جەزبەكان كەماڵی زاتی خودای موتەعالیان بۆ كەشف دەبێت و پاشان دەگەڕێنەوە سەر موشاهەدەی سیفات و پاشان دەیانگێڕێتەوە بۆ پەیوەستبوون بە ناوەكانی و پاشان بینینی ئاسەوارەكانی، سالیكان پێچەوانەی ئەمەن، كۆتایی سالیكان سەرەتای مەجزوبانە و سەرەتای سالیكان كۆتایی مەجزوبانە، بەڵام نەك بە یەك مانا، چونكە لەوانەیە لە رێگەدا بەیەكتر بگەن، ئەمەیان لە بەرزبوونەوەدا و ئەوەیان لە دابەزیندا))

**راڤەی وشەکان:**

**دل:** بەڵگە بهێنەرەوە

**بوجود آثاره:** بە بوونی ئاسەواری

**ثبوت أوصافه:** جێگیر کردنی سیفەتەکانی

**أرباب الجذب:** خاوەن جەزبەکان

**التعلق بأسمائه:** پەیوەستبوون بە ناوەکانییەوە

**إلتقيا:** بەیەکتر دەگەن

**ترقيه:** بەرزبوونەوە

**تدليه:** دابەزین

..................................................................

**شرۆڤە:**

❁ دوو ڕێگە هەیە بۆ گەیشتن بە خودای موتەعال، یان وردتر بڵێین سەفەری بەرەو خودا دوو ئاراستەی هەیە، بەپێی ئەو دوو جۆرە سەفەرە دوو جۆر مورید سەرهەڵدەدەن، ئەو دووانەش: **مەجزوب و سالیکن**.

**مەجزوب:** ئەو موریدەیە خودای موتەعال بۆ لای خۆی جەزبی دەکات و کەماڵی زاتی خۆی پێ دەناسێنێت، ئەوانە مورادی خودان و بە هەڵبژاردن تایبەت کراون، لە دوای ناسینی کەماڵی زات دەگەڕێنەوە بۆ سەر سیفەتەکانی خودای موتەعال و ئەوجا گەڕانەوە بۆ سەر ناوە جوانەکانی و پاشان گەڕانەوە بۆ ئاسارەکان(دروستکراوەکان)ی خودای موتەعال.

**سالیك:** بە پێچەوانەی مەجزوبەوە گەشتەکەی دەست پێدەکات، لە ئاسەوارەکانەوە (دروستکراوەکانەوە) دەست پێ دەکات و بەڵگە و نیشانەکانی ناو ئاسەوارەکان دەکاتە بەڵگە لەسەر کردارە پڕ لە زانست و حیکمەتەکانی خودای موتەعال و لەوێوە ناسینی ناوە جوانەکانی خودای موتەعال و لە ناوە جوانەکانەوە ناسینی سیفەتە بەرز و بڵندەکانی خودا و لەوێشەوە ناسینی زاتێکی خاوەن کەماڵ کە زاتی خودای موتەعالە.

۞ ئەم دوو جۆرە لە مورید لەوانەیە لەسەر ڕێگە بەیەکتر بگەن، سالیك لە بەرزبوونەوەدا و مەجزوب لە دابەزیندا، سالیك لە ئاسەوارەوە بۆ لای زاتی خاوەن کەماڵی خودای موتەعال بەرز دەبێتەوە و مەجزوبیش لە زاتی خاوەن کەماڵی خودای موتەعالەوە بەرەو ئاسەوارەکان دادەبەزێت، بۆیە کۆتایی سالیك دەبێتە سەرەتای مەجزوب و سەرەتای سالیك دەبێتە کۆتایی مەجزوب.

۞ سەیروسلوکی گشتی بەم جۆرەیە کە ئیبن عەتا باسی دەکات، ئەوەش بریتییە لە تێڕامان لە ئاسمان و زەوی و ئەوەی لەناو ئاسمان و زەویدایە﴿ قُلِ ٱنظُرُواْ مَاذَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ﴾ یونس: ١٠١، سەرنج بدەن و تێڕامێنن چی لەناو ئاسمانەکان و زەویدایە، هەروەها﴿ وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَأَخۡرَجۡنَا بِهِۦ نَبَاتَ كُلِّ شَيۡءٖ فَأَخۡرَجۡنَا مِنۡهُ خَضِرٗا نُّخۡرِجُ مِنۡهُ حَبّٗا مُّتَرَاكِبٗا وَمِنَ ٱلنَّخۡلِ مِن طَلۡعِهَا قِنۡوَانٞ دَانِيَةٞ وَجَنَّٰتٖ مِّنۡ أَعۡنَابٖ وَٱلزَّيۡتُونَ وَٱلرُّمَّانَ مُشۡتَبِهٗا وَغَيۡرَ مُتَشَٰبِهٍۗ ٱنظُرُوٓاْ إِلَىٰ ثَمَرِهِۦٓ إِذَآ أَثۡمَرَ وَيَنۡعِهِۦٓۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكُمۡ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ﴿٩٩﴾ ﴾ الأنعام: ٩٩، بارینی باران دەبێتە سەوزبوون و ڕووانی هەموو جۆرەکانی دانەوێڵە و ڕووەك و گژوگیا، هەروەها باخ و باخچەی پڕ لە میوە لە ترێ و زەیتوون و هەنار، لە هەموو ئەمانە رابمێنە و بیربکەرەوە، لەم تێڕامانەوە کردارە پڕ لە زانست و حیکمەتەکانی خودای موتەعال دەبینرێتەوە: ﴿أَفَلَا يَنظُرُونَ إِلَى ٱلۡإِبِلِ كَيۡفَ خُلِقَتۡ ﴿١٧﴾ وَإِلَى ٱلسَّمَآءِ كَيۡفَ رُفِعَتۡ ﴿١٨﴾ وَإِلَى ٱلۡجِبَالِ كَيۡفَ نُصِبَتۡ ﴿١٩﴾ وَإِلَى ٱلۡأَرۡضِ كَيۡفَ سُطِحَتۡ ﴿٢٠﴾ ﴾ الغاشية: ١٧–٢٠، سەرنجی خەلقی حوشتر و بەرزی ئاسمان و دامەزرانی چیاکان و ڕاخستنی زەوی بدەن، لە کردارەکانەوە ناوە جوانەکانی خودای موتەعال، سەرنج بدە چۆن لە کرداری خەلقی مرۆڤەوە لە ڕەحمی دایکدا خودای موتەعال دەگوێزێتەوە بۆ باس کردنی دوو ناوی جوانی خۆی کە "العزيز الحكيم"ن﴿ هُوَ ٱلَّذِي يُصَوِّرُكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡحَامِ كَيۡفَ يَشَآءُۚ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿٦﴾ ﴾ آل عمران: ٦، لە ناوە جوانەکانەوە بۆ سیفە بەرز و بڵندەکانی خودای موتەعال و لەوێشەوە بۆ ناسینی زاتێکی خاوەن لە کەماڵ و دوور لە نەنگی و ناتەواوی کە خودای موتەعالە.

# حیكمەتی دووسەد و پەنجا و یەك

((لاَ يُعْلَمُ قَدْرُ أَنْوَارِ الْقُلُوبِ وَالأَسْرَارِ إِلاَّ فِي غَيْبِ الْمَلَكُوتِ، كَمَا لاَ تَظْهَرُ أَنْوَارُ السَّمَاءِ إِلاَّ فِي شَهَادَةِ الْمُلْكِ))

**راڤەی وشەكان:**

**أنوار السماء:** نوورەكانی ئاسمان، مەبەستی خۆر و مانگ و هەسارە و ئەستێرەیە

**شهادة الملك:** جیهانی بینراوی مولك

**واتا ((قەدری نووری دڵ و ئەسرارەكان تەنها لە جیهانی مەلەكوتدا دەزانرێت، وەك چۆن نوورەكانی ئاسمان تەنها لە جیهانی بینراوی مولكدا دەردەكەون))**

**شرۆڤە:**

نووری دڵ سەر بە جیهانی مەلەكوتە و لەم جۆرە نوورانە نییە كە لە جیهانی مولكدا دەبینرێن، بەڵكو ئەو دوو جۆرە نوورە تەنها لە ناودا لە یەكتر دەچن، ئەگینا دوو نووری لەیەكتر جیاوازن، ئەگەر نووری جیهانی مولكی بینراو تاریكییەكانی ئاسمان ڕۆشن بكەنەوە ئەوا نووری دڵی باوەڕدار كە لە مەلەكوتەوەیە تاریكییەكانی دڵ و دەروون دەڕەوێنێتەوە، قەدر و گەورەیی نووری دڵ تەنها لە دوارۆژدا و لە جیهانی مەلەكوتدا ڕۆشن دەبێتەوە ﴿ يَوْمَ يَقُولُ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتُ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱنظُرُونَا نَقْتَبِسْ مِن نُّورِكُمْ قِيلَ ٱرْجِعُوا۟ وَرَآءَكُمْ فَٱلْتَمِسُوا۟ نُورًا ﴾ الحديد: ١٣، ڕۆژێك دووڕووانی پیاو و ژن دەڵێن بەوانەی ئیمانیان هێنا بوەستن و مۆڵەتمان پێبدەن بە هەندێ لە نوورەكەتان وەربگرین، دەوترێ بگەڕێنەوە بۆ دواوە لەوێ بە دوای نووردا بگەڕێن، ئەگەر ژیان و مانەوە و زیندەگی مرۆڤ لە دونیایەدا بەهۆی نووری جیهانی بینراوەوە بێت، ئەوا زیندەگی ڕۆح و دڵ لە جیهانی مەلەكوتدا بەپێی ئەو نوورەیە كە بەدەستی هێناوە ﴿يَوْمَ تَرَى ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ

﴿يَسْعَىٰ نُورُهُم بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَبِأَيْمَٰنِهِم بُشْرَىٰكُمُ ٱلْيَوْمَ جَنَّٰتٌ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿١٢﴾﴾ الحديد:١٢، رۆژێك باوەڕدارانی پیاو و ژن دەبینی نوورەكەیان لە بەردەمیان و لەلای راستیانەوە دەڕوات، مژدەتان لێ بێت بە بەهەشتێك رووبار بە ژێریدا جاری دەبێت و بە هەتاهەتایی تیایدا دەمێننەوە ئەوەش مەزنترین سەركەوتنە.

# حیکمەتی دووسەد و پەنجا و دوو

(( وِجْدَانُ ثَمَرَاتِ الطَّاعَاتِ عَاجِلاً بَشَائِرُ الْعَامِلِينَ بِوُجُودِ الْجَزَاءِ عَلَيْهَا آجِلاً))

## راڤەی وشەکان:

**وجدان:** بینینەوە

**ثمرات الطاعات:** بەروبوومی گوێڕایەڵییەکان(عیبادەت و کرداری چاکە)

**آجلا:** دواڕۆژ

**واتا ((بینینەوەی بەروبوومی گوێڕایەڵییەکان لە دونیادا مژدەیە بە کارکەران بە بوونی پاداشت لەسەریان لە دواڕۆژدا))**

## شرۆڤە:

کرداری چاکە لە دونیا و دواڕۆژدا بەری شیرین بە خاوەنەکەی دەبەخشێت، لە دونیادا ئارامی و دڵاوایی و بەختەوەری هاوڕێ لەگەڵ ناوی چاك و پاك، لە دواڕۆژیش بەدەستهێنانی ریزوان و بەهەشتی بەرین، هەر کاروکردەوەیەك دڵ گوشاد نەکات و ئارامی بە خاوەنەکەی نەبەخشێت، ئەو کاروکردەوەیە یان زۆر لاوازە یان لای خودا وەرنەگیراوە، چونکە عیبادەتەکان و کاروکردەوەی چاکە بەروبوومی شیرین بە خاوەنەکەی دەبەخشن، نوێژ مرۆڤ لە فەحشا و مونکەر بەدوور دەگرێت و مرۆڤ پەیوەست دەکات بە خوداوە﴿وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَۖ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ﴾العنكبوت: ٤٥، نوێژ نەهی دەکات لە فەحشا و مونکەر، هەروەها﴿وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكْرِىٓ ﴿١٤﴾﴾ طه: ١٤، نوێژ بۆ یادی من(خودا) ئەنجام بدە، رۆژوو لە خوداترسان لە مرۆڤدا دروست دەکات ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٨٣﴾﴾ البقرة: ١٨٣، ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێنا رۆژووتان لەسەر نوسراوە وەك چۆن لەسەر ئەوانەی پێش ئێوە فەرزکرا، بەڵکو بەهۆیەوە لە خودا بترسن، زەکات دڵ و

دەروون لە ژەنگ و دەرد و نەخۆشی پاك دەكاتەوە﴿ وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِلزَّكَوٰةِ فَٰعِلُونَ ﴿٤﴾ ﴾ المؤمنون: ٤، ئەوانەی چوستوچالاكانە زەكات ئەنجام دەدەن، حەج مرۆڤ بە جۆرێك پاك دەكاتەوە وەك ئەوەی تازە لەدایك بووبێت، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: ((هەر كەس حەج بكات تووشی گوناه و خراپە نەبێت وەك ئەو رۆژەی لێ دێت كە لە دایك بووە))، كەوابوو بەروبوومی كردارە چاكەكان دەبنە مژدە بۆ كەسی باوەڕدار لەسەر قبووڵ بوونی كارەكانی و بەدەستهێنانی پاداشتی گەورە لەلای خودا لە رۆژی دواییدا، بە پێچەوانەوە كەسانێك بە كاروكردەوەی گەورەوە روو لە خودا دەكەن و كارەكانیان لای خودا بێ بەهایە و هیچ سوودێكیان پێ ناگەیەنێت، بۆیە دەفەرموێ كردارە چاكەكانیان دەكەین بە تۆزی بەر با﴿ وَقَدِمۡنَآ إِلَىٰ مَا عَمِلُواْ مِنۡ عَمَلٖ فَجَعَلۡنَٰهُ هَبَآءٗ مَّنثُورًا ﴿٢٣﴾ ﴾ الفرقان: ٢٣، دەچینە پێشەوە لەو كارانەی ئەنجامیان دابوو دەیكەین بە تۆزی بەر با.

# حیكمەتی دووسەد و پەنجا و سێ

((كَيْفَ تَطْلُبُ الْعِوَضَ عَلَى عَمَلٍ هُوَ مُتَصَدِّقٌ بِهِ عَلَيْكَ؟ أَمْ كَيْفَ تَطْلُبُ الْجَزَاءَ عَلَى صِدْقٍ هُـوَ مُهْدِيهِ إِلَيْكَ؟!))

## راڤەی وشەكان:

**العوض:** لەبری(كرێ و پاداشت)

**متصدق به عليك:** خێری پێكردووی

**مهديه إليك:** هەدیەی كردووی

**واتا ((چۆن دەبێ لەسەر كارێكی باشە لەبری(كرێ) داوا بكەیت لە كاتێكدا ئەو(ﷻ) بەو كارە خێری پێكردووی؟! یان چۆن لەسەر صدقێك داوای پاداشت دەكەیت كە ئەو وەك هەدیە بۆی رەوانە كردووی؟!))**

## شرۆڤە:

كردارە باشەكانی دەرەوەی مرۆڤ لە عیبادەت و كاری چاكە تەنها لە خوداوەن و ئەو وەك خێر و چاكەیەك بە مرۆڤی بەخشیون، ویست و لێبڕانی مرۆڤ بۆ كاری چاكە لەژێر ویست و دەسەڵاتی خودای موتەعالدایە، پەیامی ئاسمانی رەوانە كردووە و هەرچی رێگەی خێرە بۆ مرۆڤ بەیانی كردووە، ژیری و بیری بە مرۆڤ بەخشیوە و بەهۆیەوە پەی بە بەرژەوەندییەكانی دونیا و دوارۆژی خۆی دەبات، بۆیە هەموو كردارێكی چاك و پاك لە خوداوەیە و رێز و شەرەفێكە بە هەندێ لە بەندەكانی بەخشیوە، هەر بەو جۆرە كردارەكانی ناوەوە(كارەكانی دڵ) لە صدق و ئیخلاص و تەوەكول و رازیبوون، هەر هەموو هەدیەی خودان و بە بەندەكەی خۆی بەخشیوە، گەر خودای موتەعال ئامادەیی لە مرۆڤدا -بۆ وەرگرتنی سیفاتی چاك و پاك- دروست نەكات ئەوا هیچ كەسێك ناتوانێت پاك ببێتەوە و بە سیفەتە باشەكان دەرەوە و ناوەوەی برازێتەوە ﴿وَلَوْلَا فَضْلُ

ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ مَا زَكَىٰ مِنكُم مِّنۡ أَحَدٍ أَبَدٗا وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُزَكِّي مَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٞ ﴿٢١﴾ ﴾ النور: ٢١، گەر فەزڵ و ڕەحمەتی خودا نەبوایە هیچ یەکێك لە ئێوە هەرگیز پاك نەدەبوویەوە، بەڵام خودا هەر کەسێکی بوێت پاکی دەکاتەوە، خودا بیسەر و زانایە، خودای موتەعال خۆی چاکەی فێرکردووین و بۆخۆشی لەسەر چاکەکان پاداشتمان دەداتەوە، بۆیە دەبێت بەندە لە خزمەتی پەروەردگاریدا خاوەنی ئەدەب بێت، بەرانبەر ئەو کەمە لە کرداری چاکە داوای کرێ و پاداشت نەکات، بەڵکو بۆ هەر چاکەیەك شوکرێك بۆ خودا پێشکەش بکات، پاشان بۆ شوکرەکەش کە فێری کردووە شوکرێکی تری پێویستە، بەو جۆرە مرۆڤ هەرگیز ناتوانێت بە تەواوی شوکری خودا بکات بەرانبەر کار و کردەوە چاکەکان، کاتێك مرۆڤ لەوە تێگەیشت کە ناتوانێت بە تەواوی شوکری پەروەردگاری بکات ئیتر چاو دەبڕێتە بەزەیی پەروەردگاری و شان لەسەر کار و کردەوەکانی خۆی دانادات، ئەمەش مەقامێکی باڵایە لە بەندایەتی﴿ وَقَلِيلٞ مِّنۡ عِبَادِيَ ٱلشَّكُورُ ﴿١٣﴾ ﴾ سبأ: ١٣، کەمێك لە بەندەکانم شوکری زۆریان پێ دەکرێت.

# حیکمەتی دووسەد و پەنجا و چوار

((قَوْمٌ تَسْبِقُ أَنْوَارُهُمْ أَذْكَارَهُمْ، وَقَوْمٌ تَسْبِقُ أَذْكَارُهُمْ أَنْوَارَهُمْ، وَقَوْمٌ تَتَسَاوَى أَذْكَارُهُمْ وَأَنْوَارُهُمْ، وَقَوْمٌ لاَ أَذْكَارَ وَلاَ أَنْوَارَ، نَعُوذُ بِاللهِ مِنْ ذَلِكَ))

## راڤەی وشەکان:

**تسبق:** پێشی دەکەوێت

**تتساوى:** یەکسان دەبێت

**((دەستەیەك نوورەکەیان پێش زیکرەکەیان دەکەوێت، دەستەیەك زیکرەکەیان پێش نوورەکەیان دەکەوێت، دەستەیەك زیکر و نووریان یەکسان دەبێت، و دەستەیەکیش نە زیکر و نە نووریان هەیە، پەنا دەگرین بە خودا لەوە))**

## شرۆڤە:

**موریدانی رێگە بەپێی سەرهەڵدانی نوور و زیکر سێ جۆرن:**

**دەستەی یەکەم:** ئەوانەن نوورییان نیشان دەدرێت و دڵیان نوورانی دەبێت و بە دوایدا دەست بە زیکر و یادی خودای موتەعال دەکەن، ئەمانە کەسانێکن مورادی خودان و لە شوێنێکی تر ئیبن عەتا بە "مەجزوبان" ناویان دەبات، ئەو کەسانەی کەماڵی زاتی خودای موتەعال دەناسن و لەوەوە دەگەڕێنەوە بۆ ناسینی سیفات و ناووکردار و ئاسەواری پەروەردگار.

**جۆری دووەم:** ئەوانەن لە زیکرەوە نووریان بۆ رەوانە دەکرێت، ئەمانە ئیبن عەتا بە "سالیکان" ناویان دەبات، ئەوانەن لە ئاسەوارەوە بۆ لای زاتی خودای موتەعال بەرزدەبنەوە.

**جۆری سێیەم** ئەوانەن کە نوور و زیکریان یەکسانە و نووریان هەیە و زیکر دەکەن و زیکریان هەیە و نووریان بۆ پەیدا دەبێت، ئەم دەستەیە باڵاترینی سێ دەستەکەن.

❁ **دەستەی چوارەم** کە ناوی موریدانیان لێ نانرێت ئەوانەن کە نەنووریان هەیە و نەزیکر، ئەم دەستەیە دەستەی بێئاگایانن، ئەوانەن کە لە لیتاوی حەزەکاندا چەقیون، پەنا دەگرین بە خودا لەو بێئاگاییە، بەڵام لە هەر ساتێکدا نوور بدات لە دڵیان لەو دۆخە دێنە دەرەوە و دەکەونە ناو زیکرەوە، یان گەر خەڵکانێکی هۆشمەندبن: لە خۆیان رابمێنن و بێز لەو ژیانە ئاژەڵییە بکەنەوە و بڕیاری یادی خودا بدەن و دواتر نووریان بۆ رەوانە بکرێت، بۆیە بە نووردا مەنازەو لە خودای بناسە، چونکە زۆرن ئەوانەی رۆژگارێك خاوەنی نوور بوون و دواتر چوونە ریزی بێئاگایانەوە، هەروەها خەڵکانێك هەبوون لە بێئاگاییدا نوقم بووبوون، بەڵام خودا نووری پێ بەخشین و چوونە ریزی یادکەرانەوە.

❁ ❁ ❁

# حیکمەتی دووسەد و پەنجا و پێنج

**((ذَاكِرٌ ذَكَرَ لِيَسْتَنِيرَ بِهِ قَلْبُهُ فَكَانَ ذَاكِرًا، وَذَاكِرٌ اسْتَنَارَ قَلْبُهُ فَكَانَ ذَاكِرًا، وَالَّذِي اسْتَوَتْ أَذْكَارُهُ وَأَنْوَارُهُ فَبِذِكْرِهِ يُهْتَدَى، وَبِنُورِهِ يُقْتَدَى))**

## راڤەی وشەكان:

**ذاكر**: یادكەر(ئەو كەسەی یادی خودا دەكات)

**لیستنیر**: بۆ ئەوەی نوورانی بكات، رۆشنی بكاتەوە

**استوت**: یەكسان بوو

**بنوره یقتدی**: شوێنپێی نوورەكەی هەڵدەگیرێت

**((كەسێكی یادكەر یادی خودا دەكات بۆ ئەوەی دڵی رووناك ببێتەوەو دەبێتە یادكەر، یادكەرێك دڵی رووناك دەبێتەوە و دەبێتە یادكەر، ئەو كەسەش كە یاد و نووری یەكسانە بە یادەكەی هیدایەت وەربگرە و شوێنپێی نوورەكەی هەڵبگرە))**

## شرۆڤە:

۞ ئەم حیكمەتە تەواوكاری حیكمەتەكەی پێشووە، بەڵكو هەمان حیكمەتی پێشووە، بەلاَم لەگەڵ هەندێ ئاماژەی ورد.

۞ كەسێك دەكەوێتە ناو یادی خوداوە بۆ ئەوەی دڵی رووناك ببێتەوە، واتە یادی خودا دەكاتە هۆكارێك بۆ رۆشنبوونەوەی دڵ و دەروونی، بەلاَم رۆشنبوونەوەی دڵ و دەروون لە خۆیدا ئامانج نییە، بەڵكو رۆشن كردنەوەی ماڵە بۆ هاتنی میوانێكی ئازیز كە خودای موتەعالە، ئەو دەیەوێت بە یادی خودا چڵك و چەپەڵییەكان لە دڵ و دەروون بسرێتەوە و نەخۆشییەكان بنبڕ بكات، چونكە دەزانێت تەنها یەك جۆر دڵ لە رۆژی دواییدا فریای مرۆڤ دەكەوێت، ئەویش دڵێكی ساغ و سەلامەتە ﴿يَوْمَ لَا يَنفَعُ مَالٌ

﴿وَلَا بَنُونَ ﴿٨٨﴾ إِلَّا مَنْ أَتَى ٱللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ ﴿٨٩﴾﴾ الشعراء: ٨٨–٨٩، ڕۆژێك ماڵ و منداڵ سوودێك ناگەیەنن، مەگەر کەسەکە بە دڵێکی ساغ و تەندروستەوە بۆ لای خودا هاتبێت، کەسێکیش خودا بۆ خۆی هەڵیدەبژێرێ و دڵ و دەروونی نوورانی دەکات و دواتر نوورەکە هۆگری بە خوداوە بۆ دروست دەکات و دڵ و زمانی دەکەونە یادی خودا، جۆری سێیەم ئەو کەسە زۆر کەمانەن کە نوور و یادیان یەکسانە و بە هەمیشەیی خاوەنی نوور و خاوەنی یادن، یادیان دەچێتە دواوە نووریان رایدەکێشێتەوە و بەرزی دەکاتەوە، نووریان دەچێتە دواوە یادیان رایدەکێشێتەوەو بەرزی دەکاتەوە، ئەم دەستەیە دەستەی پێغەمبەران(علیهم السلام) و زانایان و عاریفانن، ئەوانەن دەبن بە پێشەوای خەڵکی و پێویستە هیدایەت لە نووریان و سەرمەشقی لە یادیان وەربگیرێت.

# حیکمەتی دووسەد و پەنجا و شەش

((مَا كَانَ ظَاهِرُ ذِكْرٍ إِلاَّ عَنْ بَاطِنِ شُهُودٍ وفِكْرٍ))

## ڕاڤەی وشەکان:

**ظاهر ذكر**: ڕووالّەتی یاد، دەرکەوتەی یاد

**باطن شهود و فكر**: لە بینین و بیرکردنەوەی ناوەکییەوەیە، بینین و بیرکردنەوەی شاراوە

فکر: بیر، بەلاّم "بیر" لەلای ئیبن عەتا وەك دەفەرموێ"بریتییە لە چرای دڵ"

**واتا ((دەرکەوتەی یاد لە بینین و بیرکردنەوەی شاراوەوەیە))**

## شرۆڤە:

❁ لەم حیکمەتەدا (کە پەیوەندی بە حیکمەتەکانی پێش خۆیەوە هەیە) ئیبن عەتا دەیەوێت ئاماژەیەکی زۆر ورد بە ئێمە بگەیەنێت، کاتێ دەفەرموێ: دەستەیەك هەن یادیان پێش نوور دەکەوێت، واتە دەکەونە یادی خودا و نووریان بۆ ڕەوانە دەکرێت لەوانەیە وەهمی ئەوەمان لەلا دروست ببێت کە ئەم دەستەیە بە ویست و هەوڵ و کۆششی خۆیان کەوتوونەتە ناو یادەوەو لەو ڕێگەیەشەوە نووریان بەدەست هێناوە، ئیبن عەتا دەفەرموێت: ئەو زیکر و یادەش کە مورید پێی هەڵدەستێت لە خودی خۆیەوە نییە، بەڵکو شهود و بیرێك پێشی کەوتووە و دیسان لە خوداوەیە و لە خودی مرۆڤەوە نییە.

❁ مانایەکی تری ئەم حیکمەتە ئەوەیە کە بڵێین: تەواوی کار و کردەوە باشەکانی دەرەوە کە پوختەکەیان یادی خودایە، وەك قورئان دەربارەی نوێژ دەفەرموێ: ﴿وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكۡرِيٓ ﴿١٤﴾﴾ طه: ١٤، هەموو کاروکردەوە باشەکان لە بینینی کردار و ناو و سیفەتی خودای موتەعال و بیرکردنەوە لە ئاسەوارەکانییەوە سەرهەڵدەدەن، واتە کردەوەکان ڕۆحیان هەیە و ئەو ڕۆحەش بریتییە لە ناسینی پەروەردگار، چونکە هەر

کار و کردەوەیەك لە ئیمانەوە سەرچاوە نەگرێت پووچە و لەلای خودا بەها و ئەرزشێکی نییە.

۞ بینین(شهود) لەم حیکمەتەدا بینی دڵە و "بیر"یش بریتییە لە چرای دڵ، وەك لە حیکمەتەکانی دواتردا ئاماژەی پێ دەدات.

۞ ۞ ۞

# حیکمەتی دووسەد و پەنجا و حەوت

((أَشْهَدَكَ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَسْتَشْهِدَكَ، فَنَطَقَتْ بِإِلَهِيَّتِهِ الظَّوَاهِرُ، وَتَحَقَّقَتْ بِأَحَدِيَّتِهِ الْقُلُوبُ وَالسَّرَائِرُ))

## راڤەی وشەكان:

**أشهدك:** تۆی كرد بە شایەت

**يستشهدك:** داوای شایەتیدانت لیٚ دەكات

**فنطقت:** هاتە قسە

**واتا ((تۆی بە شاهید گرت بەر لەوەی داوای شایەتیدانت لیٚ بكات، بۆیە دەرەوە دانی بە خوایەتی خودادا نا و دڵ و پەنهانیش تاكوتەنهایی خودایان بەدەست هێنا))**

## شرۆڤە:

ئیبن عەتا لە زۆر شوێندا باسی ئەو پەیمان و شایەتییە دەكات كە لە ئەزەلەوە لە نەوەكانی ئادەم وەرگیراوە، ئەو پرسیارەی خودا لە نەوەكانی ئادەمی كرد و فەرمووی"ئایا من پەروەردگاری ئێوە نیم؟" وتیان: بەڵیٚ، تۆ پەروەردگاری ئێمەی﴿وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِنۢ بَنِىٓ ءَادَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ ۖ قَالُوا۟ بَلَىٰ ۛ شَهِدْنَآ ۛ أَن تَقُولُوا۟ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَـٰذَا غَـٰفِلِينَ ﴿١٧٢﴾﴾ الأعراف: ١٧٢.

ئیبن عەتا دەفەرمویٚ: بەر لەوەی خودا بە ناردنی پەیامە ئاسمانییەكان داوای شەهادەت لە مرۆڤ بكات لە ئەزەلەوە شایەتی لە مرۆڤ وەرگرتووە، بۆیە بەهۆی ئەو شایەتیدانەی كە لە ئەزەلەوە دراوە ئێستا دەرەوەی كەسی باوەڕدار گەردنكەچ دەبێت و عیبادەت ئەنجام دەدات و دان بە خوایەتی خودادا دەنێت، دڵ و پەنهانیش-هەر بەو هۆیەوەیە- بۆ تاكوتەنهایی خودا خۆیان رادەست دەكەن، كەوابوو تۆ دەبێت هەمیشە لە ئەوپەڕی زەلیلی و گەردنكەچیدا بیت بۆ خودا، چونكە نازانیت لەسەر لاپەڕەكانی ئەزەل چیت

تۆمار کردووە، دەبێ ئەوپەڕی کۆششی خۆت بکەی، لەگەڵ ئەوەش شان لەسەر کار و کردەوەکانت دانەدەیت، تەنها دڵت بە خودا خۆش بێت، نەك بە توانای کەموکورتی خۆت، خۆت لەو پرسیارە شەیتانییە بەدوور بگرە کە دەڵێت: خودا لە ئەزەلەوە هەموو شتەکانی نوسیوە، بۆیە پێویست ناکات مرۆڤ کار و کردەوەی چاکە ئەنجام بدات، چونکە هەر ئەوە دەردەچێت کە خودا بڕیاری لەسەر داوە، سەرچاوەی دروستبوونی ئەم پرسیارە هەمان ئەو سەرچاوەیە قسەکەی شەیتانی لێوە دروست بوو کە بە خودای وت﴿ رَبِّ بِمَآ أَغۡوَيۡتَنِي ﴾ الحجر: ٣٩، خوایە بەوەی تۆ منت گومڕا کرد، سەرنج بدە گومڕابوونی خۆی دایە پاڵ خودا، بۆیە خاوەنی بینینی ڕۆشن(**بصيرة**)بە و خۆت لەو جۆرە پرسیارانە بەدوور بگرە، شەیتان بە دروست کردنی ئەو پرسیارە لەگەڵ تۆ درۆ دەکات، ئەو-نەفرەتی خودای لێ بێت- بۆ خۆی باوەڕی باوە نییە ئینس و جین کار نەکەن و نەکۆشن، چونکە خودا هەموو شتێکی بڕیوەتەوە، چونکە گەر باوەڕی بەوە بوایە نەیدەوت: بەڵێن بێت خودایە لە هەموو لایەکەوە بۆیان بێم و گومڕایان بکەم و نەهێڵم شوکری تۆ بکەن، دیارە شەیتان باوەڕی بە هەوڵ و کۆششی خۆی هەیە، بۆیە هەوڵ و کۆششی گومڕا کردنی مرۆڤ دەدات﴿ ثُمَّ لَأٓتِيَنَّهُم مِّنۢ بَيۡنِ أَيۡدِيهِمۡ وَمِنۡ خَلۡفِهِمۡ وَعَنۡ أَيۡمَٰنِهِمۡ وَعَن شَمَآئِلِهِمۡۖ وَلَا تَجِدُ أَكۡثَرَهُمۡ شَٰكِرِينَ ١٧ ﴾ الأعراف: ١٧

# حیكمەتی دووسەد و پەنجا و هەشت

((أَكْرَمَكَ بِكَرَامَاتٍ ثَلاَثٍ: جَعَلَكَ ذَاكِرًا لَهُ، وَلَوْلاَ فَضْلُهُ لَمْ تَكُنْ أَهْلاً لِجَرَيَانِ ذِكْرِهِ عَلَيْكَ. وَجَعَلَكَ مَذْكُورًا بِهِ، إِذْ حَقَّقَ نِسْبَتَهُ لَدَيْكَ. وَجَعَلَكَ مَذْكُورًا عِنْدَهُ فَتَمَّمَ نِعْمَتَهُ عَلَيْكَ))

## راڤەی وشەكان:

**جريان ذكره:** جاریبوونی یادی خودا

**فتمم:** تەواوی كرد، كامڵی كرد

**واتا ((بە سێ جۆر ڕێزلێنان خودا ڕێزی لێناوی: تۆی كردووە بە یادكەری خـودا، گەر فەزڵی ئەو نەبوایە نەدەبووی بە ئەهلی جاریبوونی یـادی خـودا بەسـەر تـۆدا، بەهۆی زیكرەوە تۆشی گێڕاوە بە یادكراو، چونكە دەسـتەبەر كردنـی یـادی خـودا دراوەتە پاڵت، هەروەها تۆی كردووە بە كەسێك كە لەلای خۆی باست دەكـرێ، بەمەش نیعمەتی خۆی لەسەر تەواو كردووە))**

## شرۆڤە:

**خودا بۆ ئەهلی زیكر سێ نیعمەتی مەزنی هەیە:**

**یەكەم:** بە فەزڵ و منەتی خۆی تۆی گێڕاوە لە ئەهلی یادی خۆی، بەبێ ئەوەی تۆ هیچ شتێكت بۆ خودا پێشكەش كردبێت، بەڵكو تەنها فەزڵ و منەت و بەخشندەیی خودایە.

**دووەم:** كاتێك تۆ یادی خودا دەكەیت خوداش لە زاتی خۆیدا یادی تۆ دەكات، واتە خودا لە نەفسی خۆیدا یادت دەكات و ئەو كات تۆی یادكەر دەگۆڕێیت بۆ یادكراو ﴿ فَٱذۡكُرُونِيٓ أَذۡكُرۡكُمۡ ﴾ البقرة: ١٥٢، یادم بكەن یادتان دەكەم.

**سێیەم:** کاتێك کەسی یادکەر یادی خودا بە دەوروبەر دەگەیەنێت، واتە خودا بیری دەوروبەر دەخاتەوە و بانگیان دەکات بۆ لای خودا، ئەوا خودای موتەعال لە ناو فریشتەکانیدا ناوی ئەو بەندەیە دەهێنێت و یادی دەکات، بەم نیعمەتی سێیەمە نیعمەتی خودا لەسەر مرۆڤی باوەڕداری یادکەر تەواو دەکات.

# حیكمەتی دووسەد و پەنجا و نۆ

((رُبَّ عُمُرٍ اتَّسَعَتْ آمَادُهُ وَقَلَّتْ أَمْدَادُهُ، وَرُبَّ عُمُرٍ قَلِيلَةٌ آمَادُهُ كَثِيرَةٌ أَمْدَادُهُ))

## راڤەی وشەكان:

**عمر:** تەمەن

**آمادە:** ماوەكەی، كاتەكەی

**أمدادە:** سوود و پیت و فەڕی

**واتا ((لەوانەیە تەمەنێك ماوەكەی زۆر و بەرین بێت، بەڵام سوود و پیت و فەڕی كەم بێت، لەوانەشە تەمەنێك ماوەكەی كەم بێت، بەڵام سوود و پیت و فەڕی زۆربێت))**

## شرۆڤە:

❁ كۆكردنەوەی خێر و چاكە و بڕینی مەقامەكانی باوەڕ و بەدەستهێنانی پلە و پایەی بەرز بە دوورودرێژی تەمەن نییە، لەوانەیە كەسێك تەمەنێكی زۆر لەم ژیانەدا بەرێ بكات، بەڵام سوودێكی كەمی لەو تەمەنە بینیبێت، لەوانەشە كەسێك تەمەنێكی كورت لەم ژیانەدا بمێنێتەوە، بەڵام پیت و فەڕ بكەوێتە ناو تەمەنییەوە و لەو ماوە كەمەدا زۆرێك لە پلەی باڵای ئیمان بەدەست بهێنێت.

❁ زیندەگی مرۆڤ بریتییە لە زیندەگی دڵ و دەروونی، تەنها ئەو بڕە لە تەمەن تەمەنی مرۆڤە كە لە كار و كردەوەی چاكە و ئەنجامدانی بەندایەتیدا بەختی كردووە، هەڵبەت لەگەڵ بوونی دڵێكی زیندوو لە پشت هەموو كار و كردەوەكانییەوە.

❁ ئەو مرۆڤانەی تەمەن لە بێئاگاییدا بەسەر دەبەن و خودای خۆیان ناناسن و ناپەرستن، ئەوانە لەلای خودا وەك مردوو تەماشا دەكرێن و كەسانێكن خاوەنی دڵ نین، چونكە دڵێك پێی دەوترێت دڵ زیندەگی تێدا بێت﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَذِكْرَىٰ لِمَن كَانَ لَهُۥ قَلْبٌ

أَوْ أَلْقَى ٱلسَّمْعَ وَهُوَ شَهِيدٌ ﴿٣٧﴾ ﴾ ق: ٣٧، لەم قورئانەدا یادخەرەوەی تێدایە بۆ کەسانێك دڵیان هەبێت، یان گوێ هەڵبدەن و ئامادەیی بیستن لە پشتییەوە بێت، نەبوونی دڵێك لە شتەکان تێبگات و نەبوونی گوێیەك کە ئامادەبوونی لە پشتەوە بێت مرۆڤ دەباتە ریزی مردووانەوە، خودای موتەعال بە پێغەمبەرەکەی(ﷺ) دەفەرموێت: تۆ ناتوانی بە مردووەکان ببیستیت، کەسی کەڕ بانگ و هاوار نابیستێت کاتێك پشت هەڵدەکەن و دەڕۆن﴿ إِنَّكَ لَا تُسْمِعُ ٱلْمَوْتَىٰ وَلَا تُسْمِعُ ٱلصُّمَّ ٱلدُّعَآءَ إِذَا وَلَّوْا۟ مُدْبِرِينَ ﴿٨٠﴾ ﴾ النمل: ٨٠

۞ ۞ ۞

# حیکمەتی دووسەد و شەست

**((مَنْ بُورِكَ لَهُ فِي عُمُرِهِ أَدْرَكَ فِي يَسِيرٍ مِنَ الزَّمَنِ مِنْ مِنَنِ اللهِ تَعَالَى مَا لاَ يَدْخُلُ تَحْتَ دَوَائِرِ الْعِبَارَةِ، وَلاَ تَلْحَقُهُ الإِشَارَةُ))**

## راڤەی وشەكان:

**بورك له في عمره:** بەرەكەت بكەوێتە تەمەنییەوە

**يسير:** كەمێك

**مِنن:** كۆی "**مِنة**"یە واتە فەزڵ و مننەت و بەخششی خودا

**دوائر العبارة:** بازنەی دەربڕین، مەودای قسە

**الإشارة:** ئاماژە

**واتا ((هەر كەس بەرەكەت بكەوێتە تەمەنییەوە لە كەمێك لە تەمەندا ئەوەندە منەت و فەزڵی خودا بەدەست دەهێنێت كە ناچێتە ژێر بازنەی دەربڕین و ئاماژەی پێ ناگات))**

## شرۆڤە:

❁ ئەم حیكمەتە پەیوەندی لەگەڵ حیكمەتەكەی پێشوودا هەیە، هێشتا قسە لە تەمەن دەكات، ئەو راستییە بە زمانێكی تر دووبارە دەكاتەوە كە لە حیكمەتەكەی پێشوودا دەربڕی.

❁ مرۆڤ داوای تەمەنی زۆر لە خودا نەكات، بەڵكو داوای فەڕ و بەرەكەت بكات لەناو تەمەندا، لەوانەیە كەمێك لە تەمەن كە لێوانلێو دەبێت لە فەڕ و بەرەكەت لە سەدان ساڵ تەمەن بۆ مرۆڤ باشتر بێت، گرنگی لە تەمەندا ناسینی خودا و بەدەستهێنانی پلەی باڵای ئیمانە، لەوێوە بەدەستهێنانی رەزامەندی و پلە باڵاكانی فیردەوس، لەوانەیە لە شەوێكدا دەرگایەك بە ڕووی كەسێكدا واڵا ببێت كە بە حەفتا

ساڵ کڕنووش و سوژده بردن مرۆڤ پێی نەگات، لەوانەیە کەسێك هەبێت کە چەند ڕۆژێکە ئیمانی بە خودای خۆی هێناوە کەچی مردنەکەی دەبێت بە شەهادەت و سەرکەوتنی مەزن بەدەست دەهێنێت، هەموو ئەمانە فەزڵ و منەت و بەخششی خودان، کەس ناتوانێت پرسیار لە خودا بکات و بڵێت: بۆ بەمەی دەبەخشی و بەوەی نابەخشی﴿ أَمْ يَحْسُدُونَ ٱلنَّاسَ عَلَىٰ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ ۖ فَقَدْ ءَاتَيْنَآ ءَالَ إِبْرَٰهِيمَ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَءَاتَيْنَٰهُم مُّلْكًا عَظِيمًا ﴿٥٤﴾ ﴾ النساء: ٥٤، یان حەسوودی بە خەڵکی دەبەن بەوەی خودا پێیبەخشیون لە فەزڵ و بەخشش، بە ئالی ئیبراهیم کتێب و حیکمەت و موڵکی مەزنمان بەخشی.

# حیکمەتی دووسەد و شەست و یەك

> (( الْخُذْلاَنُ كُلُّ الْخُذْلاَنِ أَنْ تَتَفَرَّغَ مِنَ الشَّوَاغِلِ، ثُمَّ لاَ تَتَوَجَّهُ إِلَيْهِ، وَتَقِلُّ عَوَائِقُكَ، ثُمَّ لاَ تَرْحَلُ إِلَيْهِ))

## راڤەی وشەکان:

**الخذلان:** سەرشۆڕی و رسوایی و رووزەردی

**تتفرغ:** دەستت بەتاڵ ببێت

**لا تتوجه إليه:** رووی تێنەکەیت

**تقل عوائقك:** کۆسپ و لەمبەرەکانت کەم ببنەوە

**ترحل:** کۆچ بکەی بۆ لای

**واتا (( رسوایی، هەموو رسواییەك لەوەدایە لە مەشـغەڵەت و خەرۆکـەرەکان دەستت بەتاڵ ببێت کەچی روو لە خودا نەکەیت، کۆسپ و لەمپەرەکانت کەم ببنەوە کەچی کۆچ بۆ لای خودا نەکەی))**

## شرۆڤە:

سروشتی مرۆڤ و زیندەگی مرۆڤ مەشغەڵەت و خەرۆبوونە بە ژیانەوە، سنوورێك بۆ حەز و هەڵپەکانی مرۆڤ بوونی نییە، تەنها مرۆڤە هۆشمەند و باوەڕدارەکان دەتوانن سنوور بۆ داخوازییەکانی نەفس دابنێن، لە هەندێ باردا بۆ هەندێ کەس زەمینە دەڕەخسێ و مەشغەڵەت و ئەرك و ماندووبوونی لە کۆڵ دەبێتەوە و لەمپەرەکانی ژیانی بۆ تەخت دەبن، ئەم کەسە پێویستە حیکمەتی خودا لەو کارەدا بخوێنێتەوە، کاتێك خودا کۆسپەکانی بۆ تەخت کردووی و مەشغەڵەتی لە کۆڵت کردۆتەوە بۆ ئەوەیە خۆت بۆ خودا ساغ بکەیەوە، واتە پشت لە دونیا و خەرۆکەرەکانی دونیا بکەی و سەفەر بۆ لای خودا دەست پێبکەیت، خودا زەمینەی بۆ کۆچەکەت رەخساندووە و

پاساو و بیانووی بڕیویت، تاکو ویست و هیممەتت روو لە دوارۆژ و کۆکردنەوەی توێشووی سەفەر بکات، مرۆڤە هۆشمەندەکان لە حیکمەتەکەی خودا تێدەگەن و خۆیان بۆ لای خودا یەکلادەکەنەوە، بەڵام ئەوانەی لە جاریبوونی کار و قەدەرەکانی خودا حاڵی نابن-بەهۆی بێنیاز بوونیانەوە- سەر دەکەنە فەساد و تێرکردنی حەزەکانی دەروون و هەڵپەی زۆرتر و زیاتر، ئەمەش لە خۆیدا سەرشۆڕی و رسواییە بۆ مرۆڤ، چونکە خودا هەموو هۆکارەکانی هیدایەت و بەرەو خوداچوونی بۆ رەخساند، بەڵام نەیتوانی سوودیان لێ ببینێت، خودای موتەعال بە پێغەمبەرەکەی دەفەرموێت:﴿ فَإِذَا فَرَغْتَ فَانْصَبْ (٧) وَإِلَىٰ رَبِّكَ فَارْغَبْ (٨) ﴾ الشرح: ٧-٨، کە دەستت بەتاڵ بوو خۆت ماندوو بکە و رەغبەت و گەڕانەوەت بۆ لای پەروەردگارت بێت، هەموو فەراغێك پێویستە ماندووبوون بۆ خودا و رەغبەت بۆ لای خودا بەدوای خۆیدا بهێنێت، ئەگەر وا نەبوو ئەوا ئەو کەسە لە زیانۆمەندییدایە:

﴿وَالْعَصْرِ (١) إِنَّ الْإِنسَانَ لَفِي خُسْرٍ (٢) إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَتَوَاصَوْا بِالْحَقِّ وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ (٣) ﴾ العصر: ١-٣.

سوێند بە "عصر" هەموو مرۆڤەکان لە زیاندان جگە لەوانەی ئیمانیان هێنا و کار و کردەوەی چاکەیان ئەنجام دا و پابەندی حەق بوون و حەقیان گەیاند و لەسەر هەموو ئەوانەش ئارامیان گرت و پابەندبوون بە ئارام گرتنەوە.

# حیکمەتی دووسەد شەست و دوو

((الْفِكْرَةُ سَيْرُ الْقَلْبِ فِي مَيَادِينِ الأَغْيَارِ))

**راڤەی وشەکان:**

**سیر القلب**: ڕۆیشتنی دڵ

**میادین الأغیار**: مەیدانی نەیاران

**واتا ((بیر ڕۆیشتنی دڵە لە مەیدانی نەیاراندا))**

**شرۆڤە:**

۞ هەرچی شتە جگە لە خودا -گەر مرۆڤ لە پایاندا ڕابوەستێت و مرۆڤ ڕابگرن لە گەیشتن بە خودا- بۆ باوەڕدار نەیارە، بەڵام گەر ڕێگە خۆشکەر بن بۆ گەیشتن بەو ئامانجە باڵایە ئەوا دۆست و خۆشەویستن، جا ئەو نەیارانە ژیان و دونیا و گەردوون بن، یان بینینی ئایەتی جۆراوجۆر کە مورید بە خۆیانەوە ڕابگرن و تووشی سەرسامی و لەخۆباییبوونی بکەن و لە ڕۆیشتن بکەوێت.

۞ بیر بۆ پەند وەرگرتن بێت یان موشاهەدەی ئایات بریتییە لە گەردەش و ڕۆیشتنی دڵ لە مەیدانی نەیاراندا، بۆ سالیکان گەشتەکە لە ئاسەوار(گەردوون)ەوە دەست پێدەکات و بە گەیشتن بە زاتێکی خاوەن کەماڵی دوور لە نەنگی و ناتەواویی کۆتایی پێ دێت، بەڵام هەزاران هەزار ساڵ مرۆڤ لە پای ئەو زاتە خاوەن کەماڵەدا ڕابوەستێت هێشتا ناسینەکەی تنۆکێك ئاوە لە دەریایەکی بێسنوور، بۆ مەجزوبانیش لە خوداوە دەست پێ دەکات و دێنەوە بۆ ناو ئاسەوارەکانی پەروەردگار، ئەو کەسەی یەکەمجار خودا دەناسێ و بە خودا دەگات دواتر کە دادەبەزێت هیچ شتێك ناتوانێت ڕایبگرێت و لە خودا دووری بخاتەوە، ئەو مرۆڤەی لەلای مەلیکەوە گەڕاوەتەوە لە کوێ خەڵکانی ژێر دەسەڵاتی مەلیك دەتوانن فریوی بدەن و بە خۆیانەوە خەریکی بکەن؟!

﴿ قُلِ ٱنظُرُواْ مَاذَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ وَمَا تُغۡنِي ٱلۡأٓيَٰتُ وَٱلنُّذُرُ عَن قَوۡمٖ لَّا يُؤۡمِنُونَ ١٠١ ﴾ يونس: ١٠١، سەرنج بدەن چی لە ناو ئاسمانەکان و زەویدایە، ئایات و هەڕەشە و ترساندنەکان سوود بە کەسانێك ناگەیەنن کە ئیمان ناهێنن.

۞ ۞ ۞

# حیكمەتی دووسەد و شەست و سێ

((الْفِكْرَةُ سِرَاجُ الْقَلْبِ، فَإِذَا ذَهَبَتْ فَلاَ إِضَاءَةَ لَهُ))

**راڤەی وشەكان:**

**سراج:** چرا

**إضاءة:** ڕۆشن كردن

**واتا ((بیر چرای دڵە، گەر بیر بوونی نەبوو ڕۆشنبوونەوە لە دڵدا بوونی نییە))**

**شرۆڤە:**

دڵ و نووری ناو دڵ بریتین لە چرا و نووری چرا، بیر لە سەرەتاوە وەك چەرخ(چەخماخ) وایە بۆ داگیرساندنی دڵ، لە ئایەتی نووری سورەتی نوور رابمێنە:

﴿ٱللَّهُ نُورُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ مَثَلُ نُورِهِۦ كَمِشۡكَوٰةٖ فِيهَا مِصۡبَاحٌۖ ٱلۡمِصۡبَاحُ فِي زُجَاجَةٍۖ ٱلزُّجَاجَةُ كَأَنَّهَا كَوۡكَبٞ دُرِّيّٞ يُوقَدُ مِن شَجَرَةٖ مُّبَٰرَكَةٖ زَيۡتُونَةٖ لَّا شَرۡقِيَّةٖ وَلَا غَرۡبِيَّةٖ يَكَادُ زَيۡتُهَا يُضِيٓءُ وَلَوۡ لَمۡ تَمۡسَسۡهُ نَارٞۚ نُّورٌ عَلَىٰ نُورٖۚ يَهۡدِي ٱللَّهُ لِنُورِهِۦ مَن يَشَآءُۚ وَيَضۡرِبُ ٱللَّهُ ٱلۡأَمۡثَٰلَ لِلنَّاسِۗ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ ﴿٣٥﴾﴾ النور: ٣٥.

خودا نووری ئاسمانەكان و زەوییە، نموونەی نوورەكەی وەك تاقێك وایە چرایەكی تێدا بێت، چراكە لەناو شوشەیەكدا بێت، شوشەكە -لە پاكی و بێگەردی و درەوشانەوەدا (وەك ئەستێرەیەكی درەوشاوە وابێت، لە دارێكی زەیتوونی موبارەكەوە) كە نە خۆرهەڵاتییە و نە خۆرئاوایی (گڕ بگرێت و سوتەمەنییەكەی وەربگرێت، زەیتەكەی) لە پاكی و روونیدا- خەریكە گڕ دەگرێت گەرچی ئاگری بەرنەكەوتووە، نوور لەسەر نوور، خودا هەر كەسی بوێت هیدایەتی دەدات بۆ سەر نوورەكەی، چرا لەم شوێنەدا نووری دڵی مرۆڤی باوەڕدارە، لە بەشێك لەو فەرموودەدا كە ئەبو سەعیدی خودری ریوایەتی دەكات، پێغەمبەری خودا دەفەرموێت: ((**فأما القلب الأجرد فقلب المؤمن، سراجه فيه**

**نوره))** [٣٨]، چراکەی ناو دڵ بریتییە لە نوورەکەی، گەر بیری ڕۆشنکەر لە دڵدا سەریهەڵنەدا دڵ داناگیرسێت، بیر دڵ هەڵدەکات و دەیگۆڕێت بۆ **"فؤاد"**، چونکە وشەی **"فؤاد"** مانای گڕگرتوو دەگەیەنێت، ئەو "بیر"ە کە ئیبن عەتا باسی لەبارەوە دەکات بیرێکی پاکە و سەرچاوەکەی لە مەلەکوتەوەیە، جیاوازە لەو بیرەی لە نەفس و حەزی دونیاوە سەرچاوە دەگرێت.

۞ ۞ ۞

---

٣٨ رواه أحمد.

# حیکمەتی دووسەد و شەست و چوار

**((الْفِكْرَةُ فِكْرَتَانِ: فِكْرَةُ تَصْدِيقٍ وَإِيمَانٍ، وَفِكْرَةُ شُهُودٍ وَعَيَانٍ، فَالأُولَى لأَرْبَابِ الاعْتِبَارِ، وَالثَّانِيَةُ لأَرْبَابِ الشُّهُودِ وَالاسْتِبْصَارِ))**

## راڤەی وشەکان:

**تصديق:** بەڕاستزانین

**جهود و عيان:** کۆشش و بینین

**أرباب الإعتبار:** خاوەن پەند و ئامۆژگارییەکان

**أرباب الشهود و الإستبصار:** خاوەن موشاهەدە و داوای بینینی ڕۆشن

**واتا ((بیر دوو جۆرە: بیری بەڕاستزانین و ئیمان، لەگەڵ بیری کۆشش و بینین، یەکەمیان بۆ خاوەن پەند و ئامۆژگارییەکانە، دووەمیان بۆ خاوەن موشاهەدە و داوای بینینی ڕۆشنە))**

## شرۆڤە:

**ئەو بیرەی کە بیرێکی پاکە و سەرچاوەکەی لە مەلەکوتەوەیە دوو جۆرە:**

**یەکەمیان:** بریتییە لەو بیرەی مرۆڤە هۆشمەندەکان بە هۆیەوە لە ژیان و گەردوون و مرۆڤ رادەمێنن و سەرئەنجامەکەی بریتییە لە بەڕاست زانینی پێغەمبەران(علیهم السلام) و ئیمان هێنان بە خودای موتەعال، ئەم دەستەیە -کە پێشتر بە سالیکان ناوی هێنان- لە ئاسەوارەکانی خوداوە دەچن بۆ کردارەکانی و لەوێوە بۆ ناوە جوانەکان و پاشان سیفەتە بەرز و شکۆمەندەکانی خودای موتەعال و دواتریش ناسینی زاتێکی خاوەن کەماڵ و دوور لە نەگی و ناتەواوی.

**دووەمیان:** بریتییە لەو بیرەی مرۆڤی خاوەن موشاهەدە و بەصیرەت بەدەستی دەهێنن، ئەم دەستەیە-کە پێشتر بە مەجزوبان ناوی هێنان- زاتی خاوەن کەماڵی خودای

موتەعال دەناسن و دێنەوە بۆ سیفەتەکانی و دواتر ناوە جوانەکان و پاشان کردارەکانی خودا و دواجاریش ئاسەوارەکانی خودای موتەعال لە مرۆڤ و ژیان و گەردوون.

جیاوازی نێوان ئەو دوو بیرە وەك جیاوازی نێوان ئاسمان و زەوی وایە، **بیری یەکەمیان** وردە وردە چرای دڵ نوورانی دەکات تا دەگاتە ئەوپەڕی شەوق و نوورانی بوون، بەڵام **بیری دووەمیان** دڵی گەیاندۆتە ئەوپەڕی شەوق و نوورانی بوون و دواتر وردە وردە دادەبەزێت و بەپێی دابەزینەکە نوورەکە کەمتر و کەمتر دەبێتەوە، بەڵام خاوەنەکەی هەمیشە ئامادەیی و تامەزرۆبوونی گڕگرتنی لەلایە و لە هەر ساتێکدا خودا بیەوێت گڕ دەگرێت و دەچێتەوە ئەوپەڕی نوورانی بوونی خۆی، موسا(عليه السلام) لە دۆڵی "**طوی**"دا نووری سەر کێوی توور جەزبی دەکات و سەردەکەوێ و دەبینێت لە درەختێکی زەیتوونەوە نوور هەڵدەقوڵێ و هەموو سەر چیاکەی نوورانی کردووە، هارونیش(عليه السلام) لە نووری موسا(عليه السلام) بە خودای خۆی دەگات و دەبێت بە پێغەمبەر دوای ئەوەی موسا(عليه السلام) داوا لە خودا دەکات براکەی بۆ بکات بە وەزیر و لە باگەوازەکەیدا پشتیوان و کۆمەکی بێت:

**﴿وَهَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ مُوسَىٰ (٩) إِذْ رَأَىٰ نَارًا فَقَالَ لِأَهْلِهِ امْكُثُوا إِنِّي آنَسْتُ نَارًا لَّعَلِّي آتِيكُم مِّنْهَا بِقَبَسٍ أَوْ أَجِدُ عَلَى النَّارِ هُدًى (١٠) فَلَمَّا أَتَاهَا نُودِيَ يَا مُوسَىٰ (١١) إِنِّي أَنَا رَبُّكَ فَاخْلَعْ نَعْلَيْكَ ۖ إِنَّكَ بِالْوَادِ الْمُقَدَّسِ طُوًى (١٢) وَأَنَا اخْتَرْتُكَ فَاسْتَمِعْ لِمَا يُوحَىٰ (١٣) إِنَّنِي أَنَا اللَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدْنِي وَأَقِمِ الصَّلَاةَ لِذِكْرِي (١٤) ........ وَاجْعَل لِّي وَزِيرًا مِّنْ أَهْلِي (٢٩) هَارُونَ أَخِي (٣٠) اشْدُدْ بِهِ أَزْرِي (٣١) وَأَشْرِكْهُ فِي أَمْرِي (٣٢) كَيْ نُسَبِّحَكَ كَثِيرًا (٣٣)﴾** طه: ٩-٣٦.

((ئایا بەسەرهاتی موسات بۆ هاتووە، ئاگرێکی بینی و وتی بە خانەوادەکەی: لێرە بمێننەوە من هۆگریم بە ئاگرێکەوە بۆ دروست بووە، بەڵکو شتێك لەو ئاگرەتان بۆ بهێنم، یان رێنیشاندەرێك لای ئاگرەکە ببینمەوە، کاتێك هات بۆ لای ئاگرەکە بانگی لێکرا: ئەی موسا من پەروەردگاری تۆم، نەعلەکانت دابکەنە تۆ لە دۆڵی پیرۆزی "توا"دای، من تۆم هەڵبژاردووە گوێبگرە بۆ ئەوەی وەحیت بۆ دەکرێ، من خودایەکی تاك و تەنهام هیچ خودایەك جگە لە من بوونی نییە، بەندایەتیم بکە و نوێژ بۆ یادی

من ئەنجام بدە،.......... وەزیرێکم لە ئەهلی خۆم پێ ببەخشە، ئـەویش هـارونی بـرام بێت، پشتی منی پێ قایم بکە، و لەم کاری پێغەمبەرایەتییـەدا بەشـداری پـێ بکـە، تاکو بە یەکەوە تەسبیحاتی زۆری تۆ بکەین))

# کۆتایی

خودایە، شوکری نیعمەتەکانی تـۆ دەکـەم، تـۆ بـووی کۆمـەکت کـردم، توانـات پـێ بەخشیم، فێرت کردم، تەندروستیت پێدام تاکو بتوانم ئـەم کـارە ئـەنجام بـدەم، ئەگـەر دروستم وتبێت لە تۆوەیە، ئەگەر هەڵەم کردبێت لە نەفسی بەدکارمەوەیـە و نـەزانی و نەفامی من دەگەیەنێت، خودایە لێم قبووڵ بفەرموو بیکە بە زەخـیرەی ڕۆژی دوایـیم، خودایە ئەم کارە کەموکورتەم بکە بە توێشـوویەك بـۆ ئـەهلی ئیمـان، ئێـوەش ئـەی خوێنەرانی بەڕێز لە کەموکورتییەکانم ببوورن و لە دوعای خێر بێبەشم مەکەن.

**وصلى الله وسلم على نبينا و حبيبنا محمد–صلى الله عليه وسلم– سبحان ربك رب العزة عما يصفون وسلام على المرسلين والحمد لله رب العالمين.**

۞ ۞ ۞

**سەرلەبەیانی ڕۆژی هەینی بەرواری ۲۰۱۵/٥/۱ شەرحی حیکمەتەکانی ئیبن عەتام تەواو کرد.**

عبدالكريم فتاح.

**سلێمانی**

# وَمِنْ مُنَاجَاتِهِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ

إِلَهِي... أَنَا الْفَقِيرُ فِي غِنَايَ فَكَيْفَ لاَ أَكُونُ فَقِيرًا فِي فَقْرِي؟

إِلَهِي... أَنَا الْجَاهِلُ فِي عِلْمِي فَكَيْفَ لاَ أَكُونُ جَهُولاً فِي جَهْلِي؟

إِلَهِي... إِنَّ اخْتِلاَفَ تَدْبِيرِكَ وَسُرْعَةَ حُلُولِ مَقَادِيرِكَ مَنَعَا عِبَادَكَ الْعَارِفِينَ بِكَ عَنِ السُّكُونِ إِلَى عَطَاءٍ، وَالْيَأْسِ مِنْكَ فِي بَلاَءٍ. إِلَهِي مِنِّي مَا يَلِيقُ بِلُؤْمِي، وَمِنْكَ مَا يَلِيقُ بِكَرَمِكَ.

إِلَهِي... وَصَفْتَ نَفْسَكَ بِاللُّطْفِ وَالرَّأْفَةِ بِي قَبْلَ وُجُودِ ضَعْفِي، أَفَتَمْنَعُنِي مِنْهُمَا بَعْدَ وُجُودِ ضَعْفِي؟

إِلَهِي... إِنْ ظَهَرَتِ الْمَحَاسِنُ مِنِّي فَبِفَضْلِكَ، وَلَكَ الْمِنَّةُ عَلَيَّ، وَإِنْ ظَهَرَتِ الْمَسَاوِئُ فَبِعَدْلِكَ وَلَكَ الْحُجَّةُ عَلَيَّ.

إِلَهِي... كَيْفَ تَكِلُنِي إِلَى نَفْسِي وَقَدْ تَوَكَّلْتَ لِي؟

وَكَيْفَ أُضَامُ وَأَنْتَ النَّاصِرُ لِي؟

أَمْ كَيْفَ أَخِيبُ وَأَنْتَ الْحَفِيُّ بِي؟

هَا أَنَا أَتَوَسَّلُ إِلَيْكَ... بِفَقْرِي إِلَيْكَ.

وَكَيْفَ أَتَوَسَّلُ إِلَيْكَ بِمَا هُوَ مُحَالٌ أَنْ يَصِلَ إِلَيْكَ؟

أَمْ كَيْفَ أَشْكُو إِلَيْكَ حَالِي وَهِيَ لاَ تَخْفَى عَلَيْكَ؟

أَمْ كَيْفَ أُتَرْجِمُ لَكَ بِمَقَالِي وَهُوَ مِنْكَ بَرَزَ إِلَيْكَ؟

أَمْ كَيْفَ تَخِيبُ آمَالِي وَهِيَ قَدْ وَفَدَتْ إِلَيْكَ؟

أَمْ كَيْفَ لاَ تَحْسُنُ أَحْوَالِي وَبِكَ قَامَتْ وَإِلَيْكَ؟

إِلَهِى... مَا أَلْطَفَكَ بِى مَعَ عَظِيمِ جَهْلِى.

وَمَا أَرْحَمَكَ بِى مَعَ قَبِيحِ فِعْلِى.

إِلَهِى... مَا أَقْرَبَكَ مِنِّى... وَمَا أَبْعَدَنِى عَنْكَ؟

إِلَهِى... مَا أَرْأَفَكَ بِى... ! فَمَا الَّذِى يَحْجُبُنِى عَنْكَ؟

إِلَهِى... قَدْ عَلِمْتُ بِاخْتِلاَفِ الآثَارِ وَتَنَقُّلاَتِ الأَطْوَارِ أَنَّ مُرَادَكَ مِنِّى أَنْ تَتَعَرَّفَ إِلَىَّ فِى كُلِّ شَىْءٍ حَتَّى لاَ أَجْهَلَكَ فِى شَىْءٍ.

إِلَهِى..كُلَّمَا أَخْرَسَنِى لُؤْمِى أَنْطَقَنِى كَرَمُكَ.

وَكُلَّمَا آيَأَسَتْنِى أَوْصَافِى أَطْمَعَتْنِى مِنَّتُكَ.

إِلَهِى... مَنْ كَانَتْ مَحَاسِنُهُ مَسَاوِىَ فَكَيْفَ لاَ تَكُونُ مَسَاوِيهِ مَسَاوِىَ؟

وَمَنْ كَانَتْ حَقَائِقُهُ دَعَاوِىَ... فَكَيْفَ لاَ تَكُونُ دَعَاوِيهِ دَعَاوِىَ؟

إِلَهِى... حُكْمُكَ النَّافِذُ وَمَشِيئَتُكَ الْقَاهِرَةُ لَمْ يَتْرُكَا لِذِى مَقَالٍ مَقَالاً، وَلاَ لِذِى حَالٍ حَالاً.

إِلَهِى...كَمْ مِنْ طَاعَةٍ بَنَيْتُهَا وَحَالَةٍ شَيَّدْتُهَا هَدَمَ اعْتِمَادِى عَلَيْهَا عَدْلُكَ... بَلْ أَقَالَنِى مِنْهَا فَضْلُكَ.

إِلَهِى... أَنْتَ تَعْلَمُ وَإِنْ لَمْ تَدُمِ الطَّاعَةُ مِنِّى فِعْلاً جَزْمًا... فَقَدْ دَامَتْ مَحَبَّةً وَعَزْمًا.

إِلَهِى...كَيْفَ أَعْزِمُ وَأَنْتَ الْقَاهِرُ؟

وَكَيْفَ لاَ أَعْزِمُ وَأَنْتَ الآمِرُ؟

إِلَهِى...تَرَدُّدِى فِى الآثَارِ يُوجِبُ بُعْدَ الْمَزَارِ.. فَاجْمَعْنِى عَلَيْكَ بِخِدْمَةٍ تُوصِلُنِى إِلَيْكَ.

إِلَهِى...كَيْفَ يُسْتَدَلُّ عَلَيْكَ بِمَا هُوَ فِى وُجُودِهِ مُفْتَقِرٌ إِلَيْكَ؟

أَيَكُونُ لِغَيْرِكَ مِنَ الظُّهُورِ مَا لَيْسَ لَكَ حَتَّى يَكُونَ هُوَ الْمُظْهِرُ لَكَ؟

مَتى غِبْتَ...حَتَّى تَحتَاجَ إِلَى دَلِيلٍ يَدُلُّ عَلَيْكَ؟

وَمَتى بَعُدْتَ...حَتَّى تَكُونَ الآثَارُ هِيَ الَّتِى تُوصِلُ إِلَيْكَ؟

إِلَهِى...عَمِيَتْ عَيْنٌ لاَ تَرَاكَ عَلَيْهَا رَقِيبًا، وَخَسِرَتْ صَفْقَةُ عَبْدٍ لَمْ يَجْعَلْ لَهُ مِنْ حُبِّكَ نَصِيبًا.

إِلَهِى...أَمَرْتَ بِالرُّجُوعِ إِلَى الآثَارِ فَارْجِعْنِى إِلَيْهَا بِكُسْوَةِ الأَنْوَارِ وَهِدَايَةِ الاسْتِبْصَارِ حَتَّى أَرْجِعَ إِلَيْكَ مِنْهَا كَمَا دَخَلْتُ إِلَيْكَ مِنْهَا مَصُونَ السِّرِّ عَنِ النَّظَرِ إِلَيْهَا، وَمَرْفُوعَ الْهِمَّةِ عَنِ الاعْتِمَادِ عَلَيْهَا... إِنَّكَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ.

إِلَهِى...هَذَا ذُلِّى ظَاهِرٌ بَيْنَ يَدَيْكَ، وَهَذَا حَالِى لاَ يَخْفَى عَلَيْكَ.

مِنْكَ أَطْلُبُ الْوُصُولَ إِلَيْكَ، وَبِكَ أَسْتَدِلُّ عَلَيْكَ، فَاهْدِنِى بِنُورِكَ إِلَيْكَ.

وَأَقِمْنِى بِصِدْقِ الْعُبُودِيَّةِ بَيْنَ يَدَيْكَ.

إِلَهِى...عَلِّمْنِى مِنْ عِلْمِكَ الْمَخْزُونِ، وَصُنِّى بِسِرِّ اسْمِكَ الْمَصُونِ.

إِلَهِى...حَقِّقْنِى بِحَقَائِقِ أَهْلِ الْقُرْبِ، وَاسْلُكْ بِى مَسَالِكَ أَهْلِ الْجَذْبِ.

إِلَهِى...أَغْنِنِى بِتَدْبِيرِكَ عَنْ تَدْبِيرِى، وَبِاخْتِيَارِكَ لِى عَنِ اخْتِيَارِى، وَأَوْقِفْنِى عَلَى مَرَاكِزِ اضْطِرَارِى.

إِلَهِى...أَخْرِجْنِى مِنْ ذُلِّ نَفْسِى، وَطَهِّرْنِى مِنْ شَكِّى وَشِرْكِى قَبْلَ حُلُولِ رَمْسِى.

بِكَ أَسْتَنْصِرُ فَانْصُرْنِى، وَعَلَيْكَ أَتَوَكَّلُ فَلاَ تَكِلْنِى وَإِيَّاكَ أَسْأَلُ فَلاَ تُخَيِّبْنِى، وَفِى فَضْلِكَ أَرْغَبُ فَلاَ تَحْرِمْنِى، وَلِجَنَابِكَ أَنْتَسِبُ فَلاَ تُبْعِدْنِى، وَبِبَابِكَ أَقِفُ فَلاَ تَطْرُدْنِى.

إِلَهِى...تَقَدَّسَ رِضَاكَ عَنْ أَنْ تَكُونَ لَهُ عِلَّةٌ مِنْكَ، فَكَيْفَ تَكُونُ لَهُ عِلَّةٌ مِنِّى؟

أَنْتَ الْغَنِىُّ بِذَاتِكَ عَنْ أَنْ يَصِلَ إِلَيْكَ النَّفْعُ مِنْكَ... فَكَيْفَ لاَ تَكُونُ غَنِيًّا عَنِّى؟

إِلَهِى...إِنَّ الْقَضَاءَ وَالْقَدَرَ غَلَبَنِى وَإِنَّ الْهَوَى بِوَثَائِقِ الشَّهْوَةِ أَسَرَنِى، فَكُنْ أَنْتَ النَّصِيرَ لِى حَتَّى تَنْصُرَنِى وَتَنْصُرَ بِى، وَأَغْنِنِى بِفَضْلِكَ حَتَّى أَسْتَغْنِىَ بِكَ عَنْ طَلَبِى.

أَنْتَ الَّذِى أَشْرَقْتَ الأَنْوَارَ فِى قُلُوبِ أَوْلِيَائِكَ حَتَّى عَرَفُوكَ وَوَحَّدُوكَ، وَأَنْتَ الَّذِى أَزَلْتَ الأَغْيَارَ مِنْ قُلُوبِ أَحْبَابِكَ حَتَّى لَمْ يُحِبُّوا سِوَاكَ وَلَمْ يَلْجَئُوا إِلَى غَيْرِكَ.

أَنْتَ الْمُؤْنِسُ لَهُمْ حَيْثُ أَوْحَشَتْهُمُ الْعَوَالِمُ، وَأَنْتَ الَّذِى هَدَيْتَهُمْ حَتَّى اسْتَبَانَتْ لَهُمُ الْمَعَالِمُ.

مَاذَا وَجَدَ مَنْ فَقَدَكَ؟ وَمَا الَّذِى فَقَدَ مَنْ وَجَدَكَ؟

لَقَدْ خَابَ مَنْ رَضِىَ دُونَكَ بَدَلاً.

وَلَقَدْ خَسِرَ مَنْ بَغَى عَنْكَ مُتَحَوَّلاً.

إِلَهِى...كَيْفَ يُرْجَى سِوَاكَ وَأَنْتَ مَا قَطَعْتَ الإِحْسَانَ؟

وَكَيْفَ يُطْلَبُ مِنْ غَيْرِكَ وَأَنْتَ مَا بَدَّلْتَ عَادَةَ الامْتِنَانِ؟

يَا مَنْ أَذَاقَ أَحِبَّاءَهُ حَلاَوَةَ مُؤَانَسَتِهِ فَقَامُوا بَيْنَ يَدَيْهِ مُتَمَلِّقِينَ.

وَيَا مَنْ أَلْبَسَ أَوْلِيَاءَهُ مَلاَبِسَ هَيْبَتِهِ فَقَامُوا بِعِزَّتِهِ مُسْتَعِزِّينَ...

أَنْتَ الذَّاكِرُ مِنْ قَبْلِ الذَّاكِرِينَ، وَأَنْتَ الْبَادِئُ بِالإِحْسَانِ مِنْ قَبْلِ تَوَجُّهِ الْعَابِدِينَ، وَأَنْتَ الْجَوَّادُ بِالْعَطَاءِ مِنْ قَبْلِ طَلَبِ الطَّالِبِينَ، وَأَنْتَ الْوَهَّابُ ثُمَّ أَنْتَ لِمَا وَهَبْتَنَا مِنَ الْمُسْتَقْرِضِينَ.

إِلَهِى...اطْلُبْنِى بِرَحْمَتِكَ حَتَّى أَصِلَ إِلَيْكَ، وَاجْذِبْنِى بِمِنَّتِكَ حَتَّى أُقْبِلَ عَلَيْكَ.

إِلَهِى...إِنَّ رَجَائِى لاَ يَنْقَطِعُ عَنْكَ وَإِنْ عَصَيْتُكَ، كَمَا أَنَّ خَوْفِى لاَ يُزَايِلُنِى وَإِنْ أَطَعْتُكَ.

إِلَهِى...قَدْ دَفَعَتْنِى الْعَوَالِمُ إِلَيْكَ، وَقَدْ أَوْقَفَنِى عِلْمِى بِكَرَمِكَ عَلَيْكَ.

إِلَهِى...كَيْفَ أَخِيبُ وَأَنْتَ أَمَلِى؟

أَمْ كَيْفَ أُهَانُ وَعَلَيْكَ مُتَّكَلِى؟

إِلَهِى...كَيْفَ أَسْتَعِزُّ وَأَنْتَ فِى الذِّلَّةِ أَرْكَزْتَنِى؟

